قادر عەبدوڵڵا



# پاشا



ڕۆمانێک لەبارەی ناسرەدین شای قاجارەوە

لە هۆڵەندییەوە
شەفیقی حاجی خدر

قادر عەبدوڵڵا

# پاشا

ڕۆمانێک لەبارەی ناسرەدین شای قاجارەوە

لە هۆڵەندییەوە:
شەفیقی حاجی خدر

ناوی کتێب: **پاشا**
بابەت: **ڕۆمان**
نووسەر: **قادر عەبدوڵڵا**
وەرگێڕانی لە هۆڵەندییەوە: **شەفیقی حاجی خدر**
پیتچن: **وەرگێڕ**
هەڵەچن: **دەستەیەک**
نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: **خەلیل هیدایەت مام شێخ**
**چاپخانە: ڕۆژهەڵات – هەولێر**
نرخ: « **10000**» **دینار**
تیراژ: (**1000**) **دانە**
نۆرەی چاپ و ساڵ: **چاپی یەکەم/ ٢٠٢٢**

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی ( 876 )ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە.**



پێشــــکەشــــە بە دوو ســــەروەزیری نــاوداری ئێرانی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم:

**میرزا ئەبولقاسم قائیمقامی فەراهانی**

**و**

**میرزا تەقی خان ئەمیر کەبیر**

# ناواخن

## پێشباری وەرگێڕ

کاتێک دەگوترێ هەموو کتێبێک وەک نووسـین چیرۆکێکی خۆی هەیە، هەڵبەتە بۆ وەرگێڕانیش هەر دروستە. دوابەدوای ڕۆمانی (خانووەکەی مزگەوتێ)، ڕۆمانەکەی (خەتی بزماری)یم وەرگێڕا و بڵاوکرایەوە، لە فێیسبووک وەک ڕیکلام شتێکم لەبارەی بڵاوکردەوە، لە کۆمێنتدا و لە لایەن خاتوو (گەشـە جاف)ی خوێنەرەوە کۆمێنتێکم بۆ هات و پرسـی؛ ئاخۆ بۆچی بیر لە وەرگێڕانی (پاشـا)ش ناکەمەوە. ئەوەی ڕاسـتی بێ ئەوکات ڕۆمانەکەم نەبینیبوو، دیاربوو ئەو خوێنەرە بە هۆڵەندی خوێندبوویەوە و پێی سـەرسـام بووبوو. پاشـان بۆ بەدواداچوونی ڕۆمانەکانی دیکەی قادر عەبدوللا، (پاشا)شم پەیداکرد و خوێندەوە، هەر ئەو کات کەڵکەڵەی وەرگێڕانم کەوتەسـەر، بەڵام کارەکانی دیکەی قادر عەبدوللا و وەرگێڕانەکانی دیکەی مێژوویی، بەگوێرەی دەرفەتی چاپکردن وەها هات تا ڕۆژی بەم ڕۆژە گەیشت.

ئەگەر کاتی خۆی لە هۆڵەندا بە ناوی قادر عەبدوللا ئاشنابوویم، وەک لە شوێنێکی دیکە باسمکردووە، کەچی وەرگێڕانی پێنج لە ڕۆمانەکانی وەها کەوتەوە لە وڵات بوویم، لێ ئەمجارەیان دوای ئەوەی بۆ دووەم جار ڕووم کردەوە هۆڵەندا، ئینجا پەرژامە سـەر وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە نازدارە، هەڵبەتە ئەمەش دوای پەیوەندی پێوەکردن و پەسەندنامەی کاک قادر و نووسینی کورتە پێشەکییەکەی تایبەت بە وەرگێڕانە کوردییەکە.

لێرەدا پێویست ناکا باس لە قادر عەبدوللا بکەم، چونکە لە وەرگێڕانەکانی دیکەدا باســـکراوە، بەنیازیش نیم باس لە ناوەڕۆکی ئەم ڕۆمانە نایابەی بکەم، چونکە ڕاستەوخۆ لەبەردەستی خوێنەر دایە. لی گەلۆ لەبەرئەوەی ڕۆمانەکە مێژووییە و باس لە ناســرەدینی شـــای قاجار (١٨٣١-١٨٩٦) دەکا، کە ٤٨ ســـاڵ حوکمڕان بووە، و لەو ماوە مێژووییەدا ڕووداوی گرنگ ڕوویانداوە و ڕاستەوخۆش بەرۆکی مێژووی ئێمەشی گرتۆتەوە. بەتایبەتیش ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوللای نەهری لە سەردەمی حوکمڕانی ئەودا بووە، بۆیە بە ڕەوام زانی چەند دێڕێک وەک ڕوانین و ڕوونکردنەوەی وەرگێر تۆماربکەم.

نووســـەر لە کورتە پێشـــەکیی خۆی بۆ ڕۆمانەکە ئەوە دەڵی کە ناوی کەســـەکان و ڕووداوەکان ڕاســـتیین، بەڵام ئەوەندە هەیە، پێویســـتە بە ڕێسای وێژە و لەنێویشیاندا بە ڕێسای ڕۆمان بخوێندرێنەوە. بۆیە کاتێ ئەم ڕۆمانە دەخوێنیتەوە، وەک ئەوە وایە چەندین کتێب لەســـەر ژیانی پاشـــای ناوبراو و حوکمڕانی و مێژووی ئێران و گەمە و ململانێی سیاسیی بریتانی و ڕوسیا لەسەر ئێران و ناوچەکەدا بخوێنیتەوە.

ناسرشا زڕبرایەکی دایک کوردی دەبێ بە ناوی عەباس میرزا مولکئارا، ئەم عەباســـە لە خەجیجە خانمی چەهریقی بووە. باوکی ئەم خانمە لە مریدەکانی شـــێخی نەهری بووە. ئیدی هەم بنەچەکەی دایکی و هەم مەزهەبی ســـوننە وای کرد عەباس میرزا لە جێگرتنەوەی باوکی بۆ تەختی باوکی نەوەک هەر هەڵبواردرێ، بەڵکو مەترســـی کوشـــتنیشـــی بکەوێتە ســـەر، ئاخر مەهدعولیای دایکی ناسـر، کە لە هۆزی قاجارەکان بوو، توانی تەخت و تاجەکە بۆ کوڕەکەی مسۆگەر بکا و هەموو ئەوانی دیکەش کەوتنە بەر نەفرەتی ئەم ژنە. بۆیە زیاتر لە ٢٥ ســـاڵ عەباس

میرزا له تاراوگە ژیاوه، كه گەڕاوەتەوەش هەر متمانەی بە خۆی نەبووە. وەک مامۆستا حەمەی حەمە باقییش بۆی ڕوونکردنەوە، گوایە عەباس میرزا هەر لەبەر ترسی ناسری زڕبرای پەیوەندییەکەی خزیشی لەگەڵ شێخی نەهری و تەنانەت نامەکەشی بۆ ئاشکرا کردووە، بەمە چارەنووسی پەیوەندییەکە بە مەرەدی چارەنووسی ڕاپەڕینەکەی شێخی نەهری چووە.

شتێکی بایەخداری دیکەش، یەکێک لە کەسایەتییە گرنگەکانی نێو ڕۆمانەکە، کە عەقڵی پشت ڕاچەنین و شۆڕش بووە لە دژی حوکمڕانی پاشا، (جەمال خان) بووە. دواتر ڕیاز کاکە مەحمود، کە بە وردی بە وەرگێڕانەکەمدا چووەتەوە، گوتی کێ نالّی ئەوە سەید جەمالەدین ئەفغانی، کەسایەتییە ئیسلامییە شۆڕشگێڕە ناودارەکەی سەدەی نۆزدەهەم نییە، لە خوێندنەوەی ڕووداوەکان و هاوزەمانبوونیشیان هەر وای لێ دەخوێندرایەوە، کاتێکیش لە نووسەرم پرسی، ئەویش هەمان شتی سەلماند، کە جەمال خان، جەمالەدینی ئەفغانییە. شتێکی بەرچاویشە کە جەمالەدین ئەفغانی (١٨٣٨-١٨٩٧) لە ئەسەدئابادی ئێران لەدایک بووە، کەچی نازناوی ئەفغانی بەسەردا براوە، چ ڕۆڵێکی هزریی لە ڕاچەنینی بیری چاکسازیی ئیسلامی لە سەدەی نۆزدەهەمدا بینیوە.

ڕۆڵی ئایەتوڵڵا و مەرجەعی ئۆل لەم ڕۆمانەدا، کە مێژووش ڕاستییەکەی سەلماندووە، جێگەی هەڵوێستە لەسەرکردنە. دیارە مۆری خۆی لە هەنیەی دەوڵەتداریی ئێراندا داوە، هەڵبەتە ئەم سەرەداوەش لەگەڵ سەرهەڵدانی قەڵەمڕەویی سەفەوییەکاندا جێگەی خۆی گرت و بووە دیاردە و پاشان دەوڵەتەکەی پێ ناسرایەوە.

هەر لەسـەر پێشنیازی کاکە ریازیش ئەو چوارینەی مەحویمان لەسـەر بەرگی پشتەوەی کتێبەکە دانا، کە چۆن وردەکارانە، وەک پەند و عیبرەت ماوەی حوکمڕانی شـاناسـری دیاریکردەوە. کاتێکیش چوارینەکەم بۆ نووسەر کردە هۆڵەندی زۆری پێخۆش بوو.

ڕۆمانی مێژوویی بۆ پەردەهەڵدانەوە لەسەر کەسایەتییەکان شتێکی تازە نییە، وێڕای ڕووداوە سـەیروسـەمەرە ورووژێنەرەکانی نێو ئەم ڕۆمانە و بێگرێوگۆڵی لە بەیەکەوە لکاندنی بەندەکان، بە شـێوازێکی ئاسـان و ڕەوانیش و ڕووداوەکان دەگێڕیتەوە، نەوەک هەر بۆ خوێنەری ئاسـایی بەڵکو دەکرێ چیرۆکنووس و ڕۆماننووسەکانیشمان سوود لە شێواز و تەکنیکی گێڕانەوەکە وەربگرن.

ماوەتەوە سـەر ئەوە وەک هەر بەرهەمێکی چاپکراو، دوای ڕەشنووسـی وەرگێڕان، بۆ پێداچوونەوە و هەڵەگری و ڕاسـتکردنـدەوەی هەنـدێ دەسـتەواژە و ڕسـتە و وەرگێڕانی هەندێ دێڕە شـیعر، هەر دەبووا پەنا بۆ پۆلێک لە هـاوڕێی خەمخۆر ببەم. هەر وەرگێڕانێکم چـاپ بووبێ بە شانازییەوە بەو قۆناغەدا تێپەڕیەوە و دەستبارییان گرتووم.

بۆ ئەم جارەشـیان کاک بارام سـوبحی بە سـەر ڕەشـنووسـی یەکەممدا چوویەوە، لە هەڵەی تایپی زەق ئاگاداری کردوومەتەوە، پاشـان خاتوونە شـاعیری جواننووس مەدیحە عەبدولقادر چەلەبی ئەرکی کێشـا و لە ڕووی هەڵەگریی و ڕێزمانەوە پێیداچووەیەوە کۆمەڵێ تێبینی گرنگیشـی بۆ نووسـیم. ئینجا کـاک ڕیـاز کـاکە مەحمەد زیـاتر لە هەفتەیەکی بۆ تەرخـان کرد و کەوکوژییـانە بۆی لەبەر هەڵەی تـایپ و ڕێنووسـەوە دانیشت و لە خەمی ڕەخساند و تێبینی ئەوەشی دامێ، کە چەندین وشە

له پەراوێزدا ڕوونبکەمەوە. هاوڕێ ڕێباز مستەفاش وێڕای ئەوەی چەندین دێڕە شیعری نێو ئەم ڕۆمانە کە بۆ بنەچەکە فارسییەکەی گەڕاندنەوە و وەریگێڕان، دوا جاریش بە بەشێکی زۆری وەرگێڕانەکەمدا چووەوە تا وەهای لێهات ڕووی ئەوەی بێ بخرێتە بەردەم خوێنەری تاسەمەند و خۆشەویست.

هەڵبەتە سوپاس و پێزانینیشم بۆ هاوژینی خۆشەویستم (کنێر جەمیل) کە لە ڕەخساندنی دەرفەتی کات بۆ وەرگێڕانەکانم هەمیشە پاڵپشتێکی سەرەکییمە.

بەو هیوایەی ئەم وەرگێڕانەشیان بچێتە پاڵ ئەوانی دیکە و بە سەرنجەوە بخوێندرێتەوە.

ش.ح.خ
ئەیلوولی ٢٠٢٢، لاهای/ هۆڵەندا

## پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی کوردی

خوێنەری ئازیز!
کتێبەکانی من وەرگێڕدراونەتە سەر زۆر زمانی بێگانە، هەر هەمووشیان جوانن، من بە ژیان سوپاسگوزاریانم، بەڵام ئەوە بۆ من شتێکی زۆر خۆش بوو کە بیستم چیرۆکەکانم وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە جوانەکەی ئێوە.
هەستێکم لا دروست بووە وەک ئەوەی گەڕابمەوە ماڵەکەی خۆم.
لەکاتێکدا بەنێو مەزرا و گرد و بەرزاییە هەرە جوانەکانی کوردستاندا دەڕۆیشتم، گوند بە گوند و شار بەشار دەگەڕام، یەکەمین کتێبم بە فارسی نووسی.
سڵاوم بۆ خوێنەرانی کوردم.
ئەم کتێبە، واتە ڕۆمانی (پاشا)، دیسان هەوڵێکە بۆ گەڕانەوەم بۆ ماڵ و نیشتمان.
ئەوەی تۆ دەیخوێنیتەوە، کتێبێکی مێژوویی نییە، بەڵکو کتێبێکی وێژەییە. فیکشنێک، پێویستم پێی هەبوو تا بە دروستی شەقڵێک بە مێژوو ببەخشم.
هەرچی لەو کتێبەدا هەیە لەسەر بنەمای ڕاستیی مێژوویی ڕۆنراوە، بەڵام گێڕانەوەکە بە گوێرەی ڕێسای وێژە و ئەدەبیاتە، یان هەروەک لە کتێبە بەناوبانگە هۆڵەندییەکەی مولتاتولی بەناوی "ماکس هاڤەلار" نووسراوە "هەمووی درۆیە!"
ئەم کتێبە، ئەم چیرۆکە بۆ من بایەخێکی زۆری هەیە. ئاخر یەکێ لە کەسایەتییەکانی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی دیار لەسەر بنەمای میرزا



ئەبولقاســـم قائیمولمەقامی فەراهانییەوە بنیاتنراوە، ئەویش باپیرەگەرەم بووە، لە نێو قاجارەکانی ئێراندا سەروەزیر و لایەنگری ئەدەبیات بووە. گێڕانەوەی چیرۆکەکەی ئەو کارێکی ماڵباتییانە بوو، بۆ من شـــێوازێکی بەمیراتمانەوەی پیروکالی کۆنینەمان بوو.

من ئەم پێشـــەکییە تایبەتییە بۆ وەرگێڕانە کوردییەکە دەنووســـم، چونکە یەکەمین کتێبیشـــم هەر لەبارەی ئەوانەوە بوو تا دەنگیان ببیســـترێ. کوردســـتان بە کلتوری دەوڵەمەند و چیرۆکەکانی، بۆ من خۆشـــەویستە. حەقە ئێوەش ئەوە بزانن، بەشـــێک لە ناســـنامەی منداڵەکانم کوردییە. ئەمەش وا دەکا وەرگێڕانە کوردییەکە بۆ من تایبەتمەند بێ، بۆ ئەوەی ئەم کتێبە پێشکەشی ئێوە بکەم و پێتان بناسێنم.

سڵاوم بۆ خوێنەری کورد.

**قادر عەبدوڵلا.**

**هۆڵەندا، ٢٩ی تەمموزی ٢٠٢٢**

**کەسە گرنگەکانی نێو ئەم ڕۆمانە:**

**شا**

**مەهدولیا :** (مەهد عولیا)ی دایکی شا

**تاج سوڵتان:** کچی شا

**میرزا کەبیر:** گەورە وەزیر، سەروەزیر

**شێخ ئاغاسی:** وەزیری دنەدەری شا

**جەمال خان:** سەرکردەی گرووپی بەرگری

**میرزا ڕەزا:** دەستەڕاستی جەمال خان

## بەرایی

هەمیشـــــە لەو هەزاران ساڵـــــەی ڕابردوودا لە چایەخانەکانی ئێراندا حەکایەت لەبارەی پاشـــا کۆنەکان گێڕدراونەتەوە. حەکایەتخوانانیش لەگەڵ ڕۆژگار ڕۆیشـــتوون و خۆیان گونجاندووە و ڕکێفی خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیان شلکردووە تا ئەو مێژووە بە شێوەیەکی ڕەنگین و بە تام بگێڕنەوە. ئەوان ڕووداو و پێشـــهاتەکانیان ئاڵوگۆڕپێکردووە، لێرە و لەوێش لێیان زیاد و کەم کردووە.

وەســـتایەتی و کارامەییـان لە گێڕانەوەی حەکـایەتخوانە مەزنەکـانی ســـەدەکانی ناوەڕاســـتی ئێرانییەکان دەنواند. کاتێکیش چواردەســـەدە لەمەوبەر خۆری دەوڵەتی ئێرانی ئاوابوو، واتای ئەوە بوو لەگەڵ خۆیدا خۆری حەکایەتە گەورەکانیش ئاوابێ. ئیدی ئێرانییەکان لەو شانازییەی خۆشیان داماڵران.

لێ گەلۆ، ژیان فیردەوســـی شـــاعیری هێنایە پێشـــەوە. ئەویش کتێبێکی قەبەی نووســـی: شـــانامە، کە واتای حەکایەتی پاشـــاکان دەگەیەنێ. بۆ ئەوەی ڕوداوە چڕوپڕەکانی ســـەردەمی دێرین دابڕێژێتەوە و بەســـەریان ڕابگا، ئەوەبوو فیردەوســـی پاڵەوانێکی بەناوی ڕۆســـتەم ئافراند. لێیگەڕا ڕۆســـتەم نۆســـەد ساڵی ڕەبەق بژیێ. ئاخر تا بتوانێ هەرچی ڕۆژگاری



لەدەســــتچوو هەبوو، لە هەنـاوی تـاریکیی لەبیرچوونەوە دەربهێنێ و بیپارێزێ.

گێڕەرەوەی ئەم ڕۆمانەش بە شوێنپێی ئەم شاعیرەدا دەڕوا.

## ١

# پاشاکان

لە بەرابیەوە مانگا هەبوو، مانگا لە لایەن خواوەندەوە بوو، ئەویش ناوی ئاهورامەزدای هەڵگرتبوو.
مانگاکە هێشتا شیری نەدەدا. ئاهورامەزدا دەستی پیرۆزی بەسەر نێوچاواندا هێنا و لێی فرێسمی:[1] "ئێمە کەسمان بەسەرداری تۆ دانەناوە، ئێمە تۆمان بۆ ئەوان ئافەریدە کردووە، ئەوانەی چاویان لە چوارپەلەکان هەیە و مشووری لەوەڕگاکەشیان دەخۆن."

لەپاش یەک دوو هەزار ساڵێک لە ژیانی مرۆڤدا، کەیومەرس پەیدابوو. شەوێکیان کەیومەرس لەبەردەم ئەشکەوتەکەی وەستا بوو، تەماشای مانگ و ئەستێرانی دەکرد چۆن تیشک و تریفەیان بەسەر مانگا و خەڵک لەو چیمەنە بێکۆتاییەدا دەباراند. بیری کردەوە: خۆ هەر دەبێ شتێک ئەو تەلیسمە مەتەڵاوییە هەڵبێنێ و هەڵبسوورێنێ.
کاتێکیش لە دوای نیوەڕۆیەکی خۆرەتاودا دیسان لەبەردەم دەرکی ئەشکەوتەکەی ڕاوەستا، لەپڕ هەندێ هەوری تاریک پەیدا بوو، ئاسمانی

[1] لەسەرخوێندن بە مەبەستی پیرۆزکردن. پیرۆزکردن.

داگرت، لە هەورە ئاوسـەکەشدا باران بە بێ لێکردنەوە داباری. لافاو هەڵسـا، رووبارە هاروهاجەکان چیمەنەکانیان وێران کرد، هەموو شتێکیان بە خەڵک و مانگاکانیشەوە لەگەڵ خۆ برد.
کەیومەرس بیریکردەوە: هەر دەبێ کەسێک هەبێ رووبارەکان هەڵسووڕێنێ.
رۆژێکی دیکەیان بینی خەڵکەکە لەگەڵ یەک بەشەڕ دێن، بە تێلاو مەترەقان وەرگەڕاونەتە سەرۆپۆتاکی یەکدی و یەکدی دەکوژن. بینی ژنان دەترسن و منداڵانیش دەگریێن، ئینجا لەبەر خۆیەوە گوتی: "هەبێ و نەبێ کەسێک دەبێ ئەو ژن و پیاو و منداڵانە هەڵبسووڕێنێ و بپارێزێ."
سپێدەیەکیان، تازە خۆر هەڵهاتبوو، ئەوەبوو ئەو لە لایەن ژن و منداڵانەوە تاجێک لە چڵەدار و گوڵی بۆنداری پێبەخشرا. ئەویش تاجەکەی لەسەر نا، قۆڵەکانی بۆ هەوا بەرزکردنەوە و ئەم قسانەی کردن: "هۆ ئاهورامەزدا! دەی هێزم پێببەخشە تا سەرداریێتیی هەموو ئەو شتانە بکەم، کە لەجێی خۆیان ڕەق وەستاون و نابزوون و هەموو ئەو شتانەش کە لەسەر زەویدا دەجووڵێن."
ئینجا ئەو لە چیا هاتەخوار.
کەیومەرس حەوتسەد ساڵ حوکمی کرد. زۆر لە پاشایان بە شوێنی ئەودا هاتن. یەکێک لەوان ئاستیاگی پاشای میدییەکان بوو، ئەوەی بەسەر ئێراندا زاڵ بوو. ئاستیاگ خەونێکی بینی؛ لە زگی کچەکەی، لە زگی ماندانادا دارمێوێک شین بوو، سێبەرەکەی بەسەر هەموو دونیادا پەخش بووبوو. بۆ بەیانییەکەی ئەو لە خەونلێکدەرەوەکانی خۆی پرسی، داوای لێکدانەوەی خەونەکەی لێکردن. ئەوانیش گوتیان؛ کچەکەی ئەو کە ژنی یەکێک لە شازادە بندەستەکانی فارس بوو، ڕۆڵەیەکی دەبێ تەختوتاجی پاشا دەڕووخێنێ.

ئینجا ئاســـتیاگ فەرمانی دا دەســـتبەجێ هەر کاتێ منداڵەکەی بوو، بیکوژن، بەڵام منداڵەکە، کە ناوی (کورش)یان لێنابوو لە لایەن شوانێکەوە شاردرایەوە. پاشان، کاتێ کورش باڵق (بالغ) و هەراش بوو، ئاستیاگی کوشت و خۆیشی بووە پاشای نوێ.

کورش لە ســـەردەمی خۆیدا دەســـتی بەســـەر هەموو جیهاندا گرت. لە دوای خۆی تابلۆ قوڕینەکەی بەم نووســـینە بزمارییە بەجێهێشـــت: "من کورشم، پاشای جیهان، پاشای مەزن، پاشای زاڵ، پاشای بابل، پاشای سۆمەر و ئەکەد، پاشای چوار کەناری دنیایێ (پاشای چوار با).
هەموو پاشـــایان، ئەوەی لەســـەر تەخت دانیشـــتوون، هەر لەوســـەری ســـەرەوەی زێـوە تـــا ئەوپەڕی خـوارووی زێ، ئەوانەی لەنـــاوچە دوورەدەســـتەکان دەژین، پاشـــایانی ڕۆژئاواش، ئەوانەی لەبن چادردا دەژین، هەموویان خەراج و بەراتیان بۆ من هێناوە. لە بابلیشـــدا پێیان ماچ کردم."

کەمبوجیەی کوڕی کورش، شـــوێنپێی بـاوکی هەڵگرتەوە. لەدوای کەمبوجیەش هێشتا سێ پاشای دیکە هاتن تا ئەوکاتەی داریوشی سێیەم هاتە ســەر تەختی دەســەلات. ئەویش قەڵەمڕەوی خۆی ڕۆنا، کە هەرگیز ڕۆژی لێ ئاوانەدەبوو، تەونێکی ڕێگاوبانی نوێی لێدا تا هەر چوار لای قەڵەمڕەوییەکەی بەیەک ببەســتێتەوە. ئەو بڕیاریدا پەلاماری گریک بدا و دەستی بەسەردا بگرێ. بە لەشکرێک لە هیندی، ئەسیوپی، موشـایری، تراقی، کیسی و ئاشووری لە بەندەری ئەسینادا دابەزی.
گریک لە ترسی پەیدابوونی ئەو پاشا یەزدانییەدا هێدمە گرتی. گریکەکان زانییان ئەوان هەرگیز ئەو شـــەڕە نابەنەوە، بەلام خواوەندەکان لایەنی

ئەوانیان گرت. ئیدی بە شـــێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، ئەوان ســـوپا بەهێزەکەی ئێرانییەکانیان تێکشکاند و پاشاکەشیان هەڵات.
داریوشـــی ســـێیەم بەو هەڵاتنەی خواوەندەکانی خۆرهەڵاتی شـــەرمەزار کرد. ئەوان پێیان باشـــتر بوو پاشـــا لەوێ لە مەیدانی جەنگدا بکوژرێ، بەدیلی بگیرێ یان ئەندامەکانی جەســـتەی پارچەپارچە بکرابان. هەموو شـــتێکی لێبەســـەر هاتبا تەنیا هەڵنەهاتبا. پەندێک کە زۆر باش لەگەڵ کردەوەکەی ئەودا دەهاتەوە، وەها دەگوترا: شێرێکی کوژراو هێشتا هەر شـــێرە، شـــێرێکی زامدار هێشـــتا هەر شـــێرە، شـــێرێکی دیلکراو و لەقەفەســـنراو، هێشـــتا هەرشـــێرە، بەڵام شـــێرێکی هەڵاتوو لەچاوی دوژمنەکەی شێر نییە.
ئیدی لەوکاتەی خواوەندەکان پشـــتیان لە پاشـــا ئێرانییەکان کرد، دەوڵەتەکەیان بەرەو ڕووخان و داڕمان ڕۆیشت.

پاشـان ئەسکەندەری گەورە دەوڵەتی ئێرانی قامچیکوت کرد. سەرتاپای کۆشـــک و باڵەخانەکانی ســـووتاندن، ســـەرتاپای گەنجینە گرانبەها لەبننەهاتووەکەی تاڵانکرد و تا بەرەو هیندســـتان بڕوات و ئەوێش بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

یەک دوو ســـەدە دوای ئەوە مـحەمەدیـیەکـان بە قـورئـانە تازەنووســـراوەکەیان پەیدابوون و بەســـەر دەوڵەتە لاوازەکەی ئێرانیان دادا و گرتیان. ئەوان توانییان لەماوەی تەنیا ســـێ هەفتەدا دەســـەڵات بگرنەدەست. یەزدەگوردی پاشـای لادراو بەخۆی و ئەسپەکەی هەر بە گورگەلۆقە بەرەو ســـنووری ڕۆژهەڵات، بەرەو هەرات تێیتەقاند. بەڵکو لەوێ جارێکی دیکە لەشکر ڕێکبخاتەوە و بتوانێ عەرەب لە وڵات بەدەر بنێ. کەچی لە قووڵایی شـەودا، ئەو شـەکەت و ماندوو، بۆ حەسـانەوە

لای دایە لای ئاشـــێک. ئەوەبوو ئاشـــەوانەکەش لە شـــیرین خەودا هەڵیکوتایەسەر و ملی بادا و تاج و هەرچی زێروزیوی پاشایەتی هەبوو لەبەری داماڵی. بەم شـێوەیە ئاشـەوانێک کۆتایی بە پاشـای قەڵەمڕەویی ئێرانی هێنا.

دوای ئەوان جەنگیزخانیش لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا کشا، ئەویش بەســـەر ئێرانی دادا و خاپووری کرد، هیچی وەها لە شـــکۆ و نەمریی جاران نەمایەوە. تەنیا لە سەردەمی سەفەوییەکان بوو ولات هەڵسایەوە سـەرپێی خۆی. ئەویش هەر بۆ ماوەیەکی کورت شـکۆی بۆ گەڕایەوە. دیســـان ولاتەکە هەرەسی هێنایەوە. هۆز و تیرەکان بۆ بەدەســـتهێنانی دەسەڵات لەیەک بەربوون.

لە سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهەمدا پیاوێک ویسـتی جڵەوی دەسـەلاتی هۆزەکان بخاتە دەست خۆی.
ئەم چیرۆکە لەبارەی پاشای ئەم هۆزەیە: شازادە ناسر.

٢

# شازادە ناسر

هەبوو نەبوو شـــازادەیەک هەبوو، پاشـــان دوای ئەوەی بووە پاشـــا، سەردانی پاریسی کرد.
لەکاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ بەڵێندەرە فرەنسـییەکاندا، چاوی بە ئەندازیار گوســـتاف ئیڤل Gustave Eiffel کەوت، بەڵام ئەوان نەگەیشـــتنە ئەو بیرۆکەیەی ســـەر لە بورجە ئاســـنینە بەرزەکە بدەن. ئاخر هێشـــتا نە هەڵســـوڕێنەرانی شـــار و نە پاریســـنشـینەکان بە ئاســـنە هەراســـانەکە کەیفخۆش نەبووبوون.

شـــازادەکە بە فەرمی ناوی ناســـر محەمەد فەتحعەلی موزەفەر بوو. ئەمانەش پێشـــناوی باوک و باپیرە و باپیرە گەورە و هەرە گەورەکەی بوون.
دایکیشی مەهدولیا[٢] ژنێکی دەستڕۆیشتوو بوو.

[٢] ناوە فارسییەکە دەق (مهد علیا /مەهد عولیا)یە، بەڵام نووسەر لە هۆڵەندییەکە لێکیداوە و بە مەهدولیا نووسـیویەتی، منیش بۆ ئەوەی ئاســانتر بخوێنرێتەوە



شـــازادەکە ٣٤٧ برای هەبوون، ئاخر باوکی لە ژیانە درێژەکەی خۆیدا ١٢٠٠ ژنی هێنابوو، بۆ ڕاسـتی و درۆ، بۆ ئەوەی دەقاودەق بین، ١٢٣٥ ژن بوون.
لە سـەردەمی باپیرەی ئەو شـازادەیەدا بوو تاران کرایە پایتەختی وڵات. پێشتر تاران گوندێکی گەورەی دامێنی کێوی ئەلبورز بوو. بە خێرایییەکی یەکجار زۆر گەورە بوو، پەرەی سـەند و ئاوەدان، تا وای لێهات خەڵک بە کۆشکە نایابەکانی سەرسام بن. بازاڕەکەشی دڵی بەگوڕ و خوڕەی شارەکە بوو.
لای سـەرووی شـارەکە، شـازادەکان لە خانووی گەورۆنە گەورۆنەی ناوازەدا دەژیان، لە ناوجەرگەی شارەکەشدا دەوڵەمەند و خواپێداوەکان خانوو و تەلاری قەبە قەبەیان بۆ ماڵبات و خانەوادەی گەورە گەورەی خۆیان دروسـت کرد. باقی دانیشـتوانی شـارەکە یان بۆ بازرگانەکانی شارەکە کاریان دەکرد، یاخود دوکانی بچووک و وردەفرۆشیان هەبوو، کە دەستڕەنگینییان تێدا باڵکێش بوو. گوندنشینان بە کۆڕەو دێهاتەکانیان جێدەهێڵا، بەڵکو لە شـاردا بەختی خۆیان بۆ ژیانێکی باشـتر تاقی بکەنەوە.

ئەوکات لای سـەرووی وڵاتەکە سـنووری لەسـەر ڕوسـیا و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە لەگەڵ هیندستان و لە باشووریشەوە کەنداوی فارسی، کە بریتانییەکان بەخۆیان و کەشـتییە گەورەکانیان بۆ هیندسـتان لە جرتوفرتدابوون.
وڵاتەکە لەنێوان دوو زلهێزدا گیرۆدە بووبوو. ئێسـتاش پاشـا کۆنەکە مردووە و نۆرەی پاشـای نوێیە تا بچێتە سـەر تەختی پاشـایەتی،

---

هەر بە مەهدولیام نووسـیوەتەوە، دیارە ئەو ناوە لەم ڕۆمانەدا زۆر دووبارە دەبێتەوە. وەرگێڕ.

ڕوســیاش هەروەک ئینگلیســتان لە بێنەوبەردەی ئەوەدا بوون بەشــێکی دەسەڵاتەکە بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن.

هەرچەنــدە پــاشــــــای کۆچکردوو ٣٧٥ کوڕی هەبوو، لێ هەر بەتەنیا هەشـــتیان گرنگ بوون. ئەوانیش ئەو کوڕانەی بوون کە دایکیان ســـەر بەهەمــان هۆزی پــاشـــــا مردووەکە بوون. بەگوێرەی نەریتیش، بــاوکی شایەکە کوڕەکانی وەک والی، وەک حوکمداری بەشە گرنگەکانی وڵاتەکە دادەنا. شازادەی جێگرەوەش هەمیشە دەکرایە والی تەورێز.
شــازادە ناســریش شــازادەی جێگرەوە بوو. مەهدولیای دایکی دۆتمامی پاشا کۆچکردوو، هەروەها ژنە هەرە خۆشەویستەکەشی بوو. ئەو لەنێو دەرباری بنەماڵەی پاشــادا پێگەیەکی ناوازە و تایبەتمەندی خۆی هەبوو. لە خوێنەوە لە هەموو خزمەکانی دیکە لە پاشاوە نزیکتر بوو.
بە گوێرەی دابونەریت شـــازادەی جێگرەوە لە تەورێز دادەنیشـــت. ئەو شــارەی وەها هەڵکەوتبوو لە ســنووری ڕوســیا نزیک بێ، کە دووەمین شاری گرنگی وڵاتەکە بوو.
پاشــا کۆنەکە لەســـەر پێخەفی مەرگدا، توانی تەداروکی ئەوە ڕێک بخا، هەم ڕوسیا و هەم ئینگلستان شازادەی جێنشین بە شوێنگرەوەی خۆی بزانن و پشـــتی بگرن. شـــازادە ناســـریش هەراش و باڵق بوو، بابی ئەوەندەش ئەزمونی لە ژیان هەبوو تا وەک پاشــا بچێتە ســەر تەخت، لێ دەسەڵاتی ڕاستەقینە لەبن دەستی میرزا کەبیر، گەورە وەزیرەکەیدا بوو.

دوای مردنی پاشــاکە، ئەوە بوو ڕوســـەکان شـــازادەی جێگرەوەیان بە سەدان ئەسپ و گالیسکە و کەژاوەوە لە تەورێزەوە بۆ تاران برد، ئاخر لەوێ ڕێوڕەســـــمی تاجلەســـــەرنان بەڕێوەدەچوو. ئەمەش ختووکەی

بریتانییەکانی دا و هەراسـانی کردن. ئاخر ئەوانیش دەیانویسـت لە ڕێوڕەسمی گواستنەوەی دەسەڵاتی پاشایەتیدا بەشدار بن.
میرزا کەبیری وەزیر زانی چۆن بە ئیشـەکە ڕابگا و چارەی بکا، وایکرد تیپێکی سـەربازیی بریتانی لە قەزوینەوە تا تاران یاوەری شـازادە بکەن. باڵوێزی بریتانیاش ئەم چارەسـەرەی پێ پەسـەند بوو. ئەوەش ڕاگەیەنرا کە ئینگلسـتان وەک هێمایەکی بەشداربوون، تێچوونی بۆنەکە لە ئەستۆ دەگرێ. لە کـاتی بۆنە ڕازاوە و پڕ لە وردەکارییەکەدا، لە کۆشـکی گوڵستاندا شازادە تاجی پاشایەتیی باوکی لەسەری خۆی نا، چووە سەر تەختی پاشـایەتی و بە فەرمی بووە شـا ناسـر. نوێنەرانی ڕوس و بریتـانیـاش لە تـاران پیرۆزبـاییـان لێکرد و بە خۆیـان دیـاریی تـایبەتی مۆسکۆ و لەندەنیان پێشکەش کرد.
لە تاران بۆ ماوەی چل ڕۆژ ئاهەنگ گێڕدرا. بازاڕ ڕازایەوە، بۆ چل ڕۆژ و چل شەو هەر گۆرانی و موزیک، هەر شایلۆغان بوو. لە ناوجەرگەی شـاریشـدا چەندین چادر هەڵدران، خوان پڕ و ڕازاوە، خەڵک دەسـتە دەستە دەهاتن و نانیان دەخوارد.

لەکاتێکدا شـا ئاهەنگی دەگێڕا، میرزا کەبیر وڵاتی هەڵدەسـووڕاند. هەر ڕێک لە ڕۆژی چل و یەکەمینی دوای تاجلەسـەرنانەکە، وەزیرەکە بەرەو کۆشکی پاشا ڕۆیشت تا لەگەڵیدا کاروبارە گرنگەکانی وڵات تاوتوێ بکا. دوای کۆتایی ڕۆژێکی درێژی پڕ لە وتووێژ، ئەو پاشـای لە پرسـێکی پربایەخ و بە پەلە ئاگادارکردەوە: "هەرچەندە بریتـانی و ڕوس لەگەڵ باوکی کۆچکردووی ئێوەدا گەیشتبوونە ڕێککەوتن تا پشتی تۆ بگرن، لێ ئەوان پشتی برایەکانی تۆش دەگرن تا بەرژەوەندییەکانیان لە هیندستان لەبەرچاو بگرن."
"کامە لە برایەکانم؟"

"هەر حەوتیان. ئەوان راپەڕیون. ئەوان سەربەخۆیی خۆیان رادەگەیەنن. سێ لە برایەکانت، کە لە ناوچە سنوورییەکان حوکمڕانن، مزەفەرخان لەسەر سنووری ڕوس، محەمەدخان و جەعفەرخانیش لەسەر سنووری ئەفغانستان و هیندستان، بەشێوەیەکی تایبەتی پەیوەندییان لەگەڵ بریتانییەکاندا هەیە. خەریکە وڵاتەکە لەبارییەک هەڵوەشێ."

شا بە پەرۆشەوە گوتی: "ئەو پشتیوانییەیان لەچیەوە هاتووە؟"

"ئەوان لە لایەن ڕوس و بریتانییەکانەوە پارە و چەکیان دراوەتێ."

(شا)ش هاواری کرد: "ئای لەو ناپاکانە."

وەزیر وەبیر پاشای هێنایەوە، وەک سوپاسالاری گشتی هەقە فەرمان بدا تا ڕاستەوخۆ بە مستێکی ئاسنین ئەو ڕاپەڕینە دژوارە سەرکوت بکاتەوە. دوای ئەوەش شا فەرمانەکەی دەرکرد، وەزیر بۆی چەمایەوە، کاغەزەکانی خستنەوە نێو جانتاکەی و لە ژووری چاوپێکەوتنەکە هاتەدەر، ڕووی لەو شوێنە کرد، کە ئەسپەکەی بە زینکراوی بۆ ئامادەکرابوو.

لە کۆتاییدا و دوای ئاهەنگێکی دوورودرێژ، کاتی ئەوە هات پاشا پاڵداتەوە. ئیدی خۆی کێشایە شوێنی حەوانەوەی فەرمی تا لێی برازێ[٣] لەوێش پێخەفی ناوازە و تایبەتی لێبوو، کە جێوبالیذگانی پاشاکانی پێشووی هۆزەکەی بوون، شەویان لەوێ بەسەردەبرد.

---

[٣] ڕازان: خەوتن

## ٣

# حەرەمسەرا

شا میراتێکی بارقورسی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە.
بارودۆخی وڵات خراپ بوو، گەنجینەکەی بەتاڵ بوو، سوپا لە پەرشێکی هەژارانەدا بوو، بەشــــی هەرە زۆری خەڵکەکەشــــی نەخوێندەوار و لە هەژاری و نەداری و حاڵەتێکی دوارۆژ ناڕووندا دەژیان، هەمیشــــە شەڕوشۆڕ لەسەر سنووری هیندستان مایەی هەڕەشە و گورەشە بوو، ئەویش لەبن جڵەوی بریتانییەکاندا بوو.
ئەمانە ئەو پرس و بابەتانە بوون دەبووایە پاشــــا لە ماوەی پاشــــایەتیی خۆیدا تاوتوێیان بکا و بیانخاتە بن چاوی مشــــوورخواردنی خۆیەوە، بەڵام خۆ ئەو نەیدەزانی چۆن چۆنی بەســــەریان رابگا و یەکلایان بکــاتەوە، بۆیە هەمووی بۆ وەزیرەکەی خۆی لێگەڕابوو. بەڵێ میرزا کەبیریش نەخشەی بۆ هەموو ئەو شتانە هەبوو، نەخشەیەکی گەورە کە بۆ جێبەجێکردنی پێویســــتی بە مۆری قایلنامەی شــــاوە هەبوو. تا ئەو کاتەش بە پرســــە تایبەتییەکانی خۆیەوە ســــەرگەرم بوو، ئیدی وەزیر

دەستی کراوە بوو تا ئامادەکاریی پێویست بۆ بیرۆکەکانی خۆی لەبارەی بەدیهێنانی چاکسازی و بەرەو پێشخستنی وڵاتەوە بکا.

یەکەمین خەمی پاشـــا ئەوە بوو جێوڕێ بۆ ژنەکانی بدۆزێتەوە و هەریەکەیان بخاتە ســـەر ماڵ و حاڵی خۆی. ئاخر باوکی ئەو زیاتر لە ۱۲۰۰ ژنی لە حەرەمخانەی خۆیدا هەبوو، بەڵام شـــا هەر بەتەنیا ۲۳۰ دانە ژنی هەبوو. ئەوانیش دوو هەفتە دەبێ لە تەورێزی نزیک سـنووری ڕوسیا خەریکن بارگە و بنەیان دەپێچنەوە و بەرەو تاران دێن.
شا پێشوازی لە گەورەی حەرەم، خواجەباشـی کرد. باوکی ئەو کابرایە نۆکەرێکی دڵسۆزی پاشا کۆچکردووەکە بوو، ئەویش کوڕەکەی هەر لە منداڵیەوە خەســـاند، بۆ ئەوەی دواتر وەک خەســـێنراوێکی ناو ژنانی حەرەم خزمەت بکا. کاتێکیش ئەو منداڵە خەسـێنراوە هەراش بوو، گەیشتە تەمەنی باڵق بوون، پاشای کۆچکردوو ناردییە تەورێزێ بۆ لای حەرەمی شـــازادەی جێگرەوە. دڵســـۆزیی کابرای بابنۆکەریش وای کرد دواتر نازناوی خراجەی پێبدرێ، ئەو نازناوەش پاداشـــتێکی بەرچاوی پاشا بوو بۆ خەسێنراوێک.
خواجەباشی ڕاستەوخۆ فەرمانی لە پاشا وەردەگرت، لەدوای پاشا ئەو لەنێو حەرەمدا هەمەکارە بوو، ســـەرەداوی هەموو ئیشـــوکار لەدەســـتی ئەودا بوو. ژنەکان پێویسـتیان بە هەرچییەک هەبووایە، لەســـەر ئەو بوو مشـــوری بخواردبایە. بەبێ مۆڵەتی ئەو بۆ هیچ ژنێک نەبوو بســـتێک لە حەرەمســـــەراکە دووربـکەوێـتەوە. خـواجە چـاوی لە دەروازەی حەرامســـەرابوو. پاشـاش لە ڕێڕەوێکی حەرەمســـەراوە و بەرەو ژووری نوستنی خۆی دەچوو.

ئەوە بوو شـــا بـانگی خواجەی کرد، تـا هەواڵی نوێی لەبـارەی بەڕێوەچێبوونی ژنەکـانی پێڕابگەیەنێ. کـاتێکیش پەردەدارەکەی[4] هاتەژوور، پاشـا لەناوەڕاسـتی هۆڵێکی میناب‌ەندا وەسـتابوو، پیاوێکی کەمدوو بەخۆی و قاپووتێکی ڕەشـی تەسـکەوە هاتەژوور و لە پاشـای پرسی، کە خواجەباشی لە بەردەرکە وەستاوە، ئاخۆ بێتە ژوور. پاشاش سەرێکی بۆ لەقاند.

خواجەش لە دوای خەسـاندنەکە، ڕوخسـارێکی ناشـیرین و ناقۆڵای بێ مووی وەرگرتبوو. بە لێکردنەوەی برۆکانیش هێشــتا وای لێ نەهـات بیچمەکەی هەندێک بکەوێتە بەر دڵان. ئەو قاپووتێکی ناپێشـچاوی شینی تـاریکی لەبەردا بوو، شـــاڵێکی ســـپیی نەشـــوراویشـــی بە ملیدا شـــۆڕکردبووەوە. خواجە هەموو شـــتێکی لەبارەی جەســـتە و نهێنیی ژنەکانی شـــا دەزانی. شـــاش ناقۆڵایی و بۆگەنی خواجەکەی پێ هیچ نەبوو، ئاخر هەر بەم شـێوەیە ژنەکان لە کابرا دووردەکەوتنەوە. خواجە تێڵایەکی لەبن هەنگڵدا بوو، ئەوەش بۆ ئەوە بوو تا ژنە لاسارەکان بەڕیز بوەسـتێنێ. شـا ڕێگەی دابوو لە حزووری ئەویشـدا، تێڵاکەی هەر بە دەستەوە بێ.

هەمیشـە لەبەر قایشـە ئەسـتوورەکەی پشـتێنیدا، بازنەیەکی پڕ لە کلیلی پێبوو، کلیلەکان ئەوەندە زۆر بوون لەژمار نەدەهاتن. هەر کاتێک خواجە لە حەرەمســـەردا بجووڵابـا و لێیـان نزیـک ببـایەوە، هەمووان لە زرینگانەوەی کلیلەکانەوە دەیانزانی خواجەیە.

---

[4] پەردەدار ئەو نۆکەرە یان ئەو بابنۆکەرەی بەردەوام لەبەردەسـتی شـادا بوو، هەموو کـاروبـارەکـانی جێبەجێـدەکرد، تـاڕادەیەکی زۆریش ڕازگری بوو، بەشـێوەیەک لە شـێوەکان ڕۆڵی سکرتێری ئێستا دەبینێ، عەرەب (حاجب)یان بۆ بەکارهێناوە، بەڕێکەوت وشەکەم لە درامایەک بیست و وەرگرت. وەرگێڕ.

خواجه لەگەڵ هاتنەژووردا کڵاوەکەی لەســەر داگرت، هەر لەبەر دەرکە بە کڕنووشەوە وەستابوو.
شا بانگی کردێ: "دەی خواجە، پێم بڵێ ، ژنەکان لە کوێن؟"
"ئەوان گەیشــتوونەتە نزیک تاران، وەهـای دەبینم دەوروبەری دوای نیوەڕۆ بگەنە کۆشک."
شا پێی گوتەوە: "ئاوەها، دیارە گەشتێکی دوورودرێژ بووە، بە دڵنیاییەوە ئێستا ئەوان زۆر ماندوون."
"بەڵێ، ئەوان ئێستا حەڤدە ڕۆژە بە ڕێگاوەن. بەخۆیان و منداڵەکانیان لە گەشتێکی قورسەوە هاتوون، بەڵام پاشام خۆشبێ، خۆ ئەوان لە ڕێگا لە نێو چادرەکاندا باش حەساونەتەوە."
ئینجا شــا گوتی: "دەی دوای ئەوەی چووینە ســەرتەخت، با ئەوانیش ئاهەنگ بگێڕن.
"پایەبەرز، هەموو شــتێک ڕێکخراوە. کاتێکیش بەم زووانە گەیشــتن ئەوا خۆی ئــاهەنگێکی گەورەیە. ئەوان مــانــدوو نین، دوێنێ شـــەو لە کاروانســەرایەکی گەورە لە دەرەوەی تاران حەســاونەتەوە و گەورەی حەرەمیش ساز و ئامادەیە."

گەشتی ژنان شتێک بوو لەبیرنەدەچووەوە. بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەوان بۆیان هەبوو تەنیا یەک کورتە سەفەر بۆ شوێنە پیرۆزەکان بکەن. ئیدی باقی ژیانیان دەبووایە لەنێو چوار دیواری حەرەمســەرادا بەســەربەرن. ئێســتاش بە سواری ئەسپەوە بەناو وڵاتدا هاتوون، بەخۆیان و ڕووبەند (نیقاب)ی شـین لەبن ئەو چارشـێوە ڕەشـەی بەریان. منداڵەکانیشـیان بە گالیسکەوە و قەرەواشەکانیشیان بەسواری ئێستر لەپشتیان دەڕۆیشتن. پۆلە چەکدارێکی لەشــکریش یـاوەرییـان دەکردن. ئێســتا ئەوان لە دەروازەی تاران نزیکبوونەتەوە، یاســاوڵەکانیش ڕێگەیان بەخەڵکی دیکە

چۆڵکرد تــا ئەو کــاروانە جیــاوازە و نــاوازەیە ڕێگەی خۆی ببڕێ. ئەســپســوارێک فووی بە کەڕەناکەیدا کرد وا هاواری کرد: "هۆ خەڵکینە ئاگاتان لە ڕەفتارتان بێ، وا حەرەمی شا بەڕێوەن و بەناو شاردا دێن." تیپێکیش لە موزیکژەنەکــان بەخۆیــان و زوڕنــا و دەهۆڵ و دمبکی گەورۆنە گەورۆنە و ســـاز و ئامادە بوون. لەمبەر و ئەوبەری ڕێگە بە مەراق و تاســەوە ســەریان هەڵبڕیبوو بە چاوی زەق و مۆلەق و دەمی بەشەوە[5] سەیریان دەکرد. کوڕوکاڵیش لێیان وەسەر داروەدرەختی سەر ڕێگا و وەســـەر بانان کەوتن، تا ســـێرە لە هەموو جووڵەیەک بگرن و هیچی لەدەست نەدەن.

لە پێش کــاروانەکە تیپێک ســــەرباز، پاشــــان بەدوای ئەوانــدا ژنە سەرپۆشبەسەرەکانی شا دەرکەوتن. بە ڕیزێکی نەپچڕاوە بەنێو خەڵکی تەماشــاکەردا تێپەڕین، کەســیش نەیدەزانی چۆن بجووڵێتەوە. بێدەنگی باڵی بەســـەر ڕەوشــەکەدا کێشــابوو، گوێت لە هیچ نەدەبوو تەنیا دەنگی سمی ئەسپ و خرمە و جیڕەی گالیسکە و تایەکانیان نەبێ کە بەسەر ڕێڕەوە بەردینەکەدا دەڕۆیشــــتن. جار بە جاریش قاقای مێردمنداڵێک دەهات لەوێ لەســـــەر دارێک هەڵنیشــــتبوو. هەر بەڕاســــتێ شـــتێکی سەرنجڕاکێش بوو؛ ژنانی شا هەروەک کۆتەڵی ڕەشداپۆشراو بە خۆیان و ڕووبەندی شــینەوە لەســــەر پشــتی ئەســـپەوە بوون، کە بە ڕەنگی ئاڵووالاوە ڕازابوونەوە.

لە ڕازاندنەوەی کەژاوەی ئەسـپەکاندا مرۆ دەیزانی ئەوە بناسـێتەوە، کە کامە ژن لە ئەوانی دیکە گرنگترە. ئاخر ئەســپەکانی پێشــەوە لاســەریان لەگەڵ قایشـــــی لغاویان بە تیلماســـــکە قوماشـــــی ڕەنگین ڕازابووەوە. پەلەکانیشــــــان[6] بە هەمـان شـــێوە بە پـارچە قوماشــــی جوان جوان

---

[5] دەمی بەش: دەمی کراوە، ئیدیۆمێکە واتای سەرسامی و حەپەسان دەگەیەنێ.

[6] پەل: قاچ. بۆ مرۆڤ قاچ/ لاق و بۆ ئاژەڵش پەل بەکاردەهێنرێ.

نەخشــێنرابوو، کلکیشــیان وەک کەزی جوان جوان هۆنرابوونەوە. ئەو ژنانەی لەســەر پشــتی ئەو جۆرە ئەسپانە بوون، سـەر بە هەمان هۆزی پاشا بوون.
دەســـتەیەکیش لە گەنجە خەســـاوەکان، نۆکەری حەرەم بوون، ڕیزیان بەســتبوو. پیاوەکان هەروەک ژنان دەجوولانەوە. کاتێک ئەوان گەیشــتن و تێپەڕین، ئیدی هەمووان دایانە تریقەی پێکەنین و بەدەســـت ئاماژەیان بۆ خەساوە ژنانییەکان دەکرد.

ژنەکان بە ئاهەنگەوە گەیشـــتنە کۆشـــک و بە جۆشـــوخرۆشـــەوە پێشـیوازییان لێکرا. موزیکژەنە ژنەکان بە خۆشـی و شـادییەوە یاوەری گۆرانیبێژی حەرەمســـەرایـان کرد، بە کەیف و زەوقەوە گۆرانیی بەخێرهاتنیان بۆ دەگوتن.
ئێســـتا ئیدی هیچ پیاوێکی غەوارە و لایدە[٧]لەنێو کۆشـــکدا نەبوو، بۆیە ژنەکان دەیانتوانی ســـەرپۆش و ڕووبەند فڕێبدەن. ئەوان لەگەڵ یەک کەوتنە قسـە، پێدەکەنین و تۆزوگەردی سـەر جلەکانیان دەتەکاند. ئەوان بە مەراقەوە چاویان لە ماڵوحاڵە نوێکەیان دەکرد.
لەپڕێکیشـەوە، بێ ئەوەی ڕابگەیەنرێ، پاشـا بە خۆی و تاجی پاشـایەتیی سـەری لە سـەرووی پەیژەکانەوە لێیان وەدەرکەوت. هەر ژنان ئەویان بینی، لە خەنیوخۆشـییان لە هاواریان دا. پاشـاش دڵخۆش و ڕووخۆش بوو بەوەی هەموو ژنەکان بە ساغی گەیشتبوونە جێ، ئینجا لە پەیژەکان هاتەخوار.
منداڵان بەرەو ڕووی پاشـا غاریان دا. ئەویش باوەشـی بۆ کردنەوە. لێ باوەشـی پێدانەکردن، بەڵکو ئاماژەی بە خواجە دا تا لەگەڵ خۆیان ببا و نوقڵ و شیرینییان بداتێ.

---

[٧] لایدە: غەریبە، بێگانە، نامۆ.

ژنەکان دەوری پاشـــایان دا، پیرۆزباییان لێکرد و ســـەرســـامانە لە تاجەکەی ســـەری ڕامان. مرۆ وەهای دەزانی تاج هەر ئەو تاجەیە کە کورش، پاشای پاشایان (شاهەنشا) لەسەری نابوو.
شـــا بە دیداری جوانترین ژنانی وڵات شـــاد بووەوە. ژنەکان پێکەنین و هەندێ دەردەدڵیان لە بارەی گەشـــتە دووروودرێژەکەیان کرد. ئەویش قســـەی خۆشـــی بۆکردن و یاری لەگەڵ کردن دەســـتی لە گوپ و گەردنیانی دا. دوای کەمێک مانەوە، بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە.
دوای ڕۆیشـــتنی ژنە بێمرادەکـان لەگەڵ یەک کەوتنە دەنگەدەنـگ و هاتوهاوار، تا خواجە بانگی کردن: "خانمان."
 دەســـتبەجێ کڕ بوون، ئاخر کاتێ ئەو قســـەی دەکرد، لەخۆوە نەبوو، چونکە قسەی ئەو قسەی شا بوو: "خانمینە، ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان پایەبەرز چەند دڵخۆشـــە، شـــوکور هەمووتان بەســـاغ و ســـەلامەتی گەیشتوون. مایەی دڵخۆشی ئەوەیە هەموو شتێک بۆ ئێوە بە جوانی و ڕێکوپێکی ڕێکخراوە. ئەوەی من لە ئێوەش ڕەچـاوی دەکەم، پـابەنـدی ڕێســـاکان بن. لێرە لە تاران، بەتایبەتیش لێرە لەو حەرەمەســـەرایەدا هەموو شتێک جیاوازە لەوەی تا ئێستا لە تەورێز بینیوتانە. ئەم کۆشکە گرنگترین و جوانترین کۆشـکی وڵاتە. حەرەمســەراکەی ئێوەش لەنێویدا ســەرنجڕاکێشـترینی هەموو قەڵەمڕەوییەکەیە. پایەبەرز چیدی شـازادەی جێگرەوە نەماوە، ئەو هەنووکە پاشـــایە پاشـــا. قســـەی منیش لەمەودوا قسەی پاشایە. قسەی پاشاش قسەی خوایە. بۆیە داواتان لێدەکەم باش ئاگاداری ڕەفتاری خۆتان بن و بە وردیش گوێ لە قســـەی من بگرن. بەبێ پرس کەس بۆی نییە لە حەرەمسەردا بچێتەدەر، تەنانەت بێ پرسی من مێشـــیش بۆی نییە لێرە وەژوورکەوێ. بۆ باقی شـــتەکانی دیکەش، قســـەی دیکەمان دەبێ. ژوورەکانی ئێوە ڕێکخراوە، ڕاخراوە، حازر و

ئامادەیە، پێخەف ئامادەیە و حەمامیش گەرم. کاتی خۆتان وەربگرن و بە ئارەزووی خۆتان پشوو بدەن.
ئەو داوای لە هەموو ژنە بەمنداڵەکان کرد، بچنە لای کوڕ و کچەکانیان بوەستن، ئاخر ئەوان یەکەمین بۆ چونە هۆدەکانیان. لەدوای ئەوانیش ئەو ژنانەی ناردنە ژوورەکانیان، کە منداڵیان نەبوون، بەم جۆرە یەک لەدوی یەک چوونە هۆدەکانیان لە حەرەمسەراکە، نۆکەر و قەرەواشەکانیش یاوەرییان کردن.

ژنەکان بە حەپەساوییەوە سەیری ماڵوحاڵە تازەکەیان کرد. خۆی تەلارێکی گەورەو قەبەی سپی سێ نهۆمی، زیاتر لە سەد هۆدە و ژوور بوو. ڕێرەوی بێژمار کە هۆڵی گەورە گەورەی تێدابوو، بەدەیان هۆدەیان هاتە پێش. ژووری چالێنان، نانێن، ژووری دەرس، ژووری نەخۆشی، ژووری موزیک، ژووری شیلان، ژووری پاڵدانەوە، ژووری دەلاک، حەمامێکی یەکجار گەورەی وەها بەیەک جار سەد ژن دەیتوانی خۆی تێدا بشوا. لەبەر ئەوەی ژمارەی ژوورەکان لە ژنەکان زۆرتر بوو، بۆیە هەریەکەیان بایی خۆی و بە زیادەوەش جێگە و ڕێگەی بۆ تەرخان کرابوو.
لە پاشخانی تەلارەکەدا باخێکی گەورەی پڕ لە داری بەردار هەبوو، ڕێرەوی دووردرێژ، لەمبەر و ئەوبەری گوڵ و گوڵوک بوو، تەختەبەندی بۆ دانیشتن لێ دانرا بوو، لەبەر سێبەری داران دیمەنێکی ڕەنگینی نیشان دەدا. تەلارەکە خۆی بۆ ئەوانەی تازە هاتبوونە ناوی، وەک مارپێچی لێهاتبوو، لە هەفتەی یەکەمدا سەرنشینە تازەکان بە شوێنی خۆیان نەدەکەوتنەوە. لە ناوەڕاستیشدا ئەستێلکێکی گەورەی ئاوی تێدابوو، پڕ لە ماسیی جوان و ڕەنگین بوو، دەوروبەریشی پڕ لە سەندەلی و



تەختەبەندی لێدانیشـــتن. لە هەمووشـــی فەرش و مافووری جوان و نەخشین ڕاخرابوون، کە دامەنەکانیان بە نەخشی ورد ورد ڕازابوونەوە. ئەو ژنانەی منداڵیان هەبوو لە پشـــتەوەی تەلارەکەدا جێی حەوانەوەی فرەوان و خۆش خۆشـیان بۆ ســازوتەیار کرابوو، ئەو ژنانەش کە تازە خرابوونە سـەر حەرەمسـەراکە، لە داڵانە گەورە و بەردرێژەکەی نهۆمی یەکەمیندا جێگەیان بۆ دابینکرابوو.

زۆرینەی ژنانی حەرەمســـەرا لە دێهاتەوە هاتبوون. ئاخر شـــا لەو ســـەردانانەی خۆی بۆ دێهاتەکانی بن قەڵەمڕەوییەکەی خۆی، لەنێو ئەو کەســـانەی بۆ بینینیـان هـاتبوون، ژنەکانی لێگرتبوون و لەگەڵ خۆی هێنابوونی. ئەو ژنانەش لە بەراییەوە زۆر خۆیان بە بەختەوەر دەزانی، کە شـــا ئەوانی لێهەڵبژاردوون، ئاخر وایان دەزانی بازی خۆشـــبەختی لەسەر شان و ملیان نیشتووەتەوە. لەگەڵ هاتنیان بۆ نێو حەرەم بۆ یەک دوو شـــەو دەچووە ناویان، دەســـتگەمەی لەگەڵ کردن، دەســـتی لێدان، دەسـتبازی لەگەڵ کردن، ماچ و مووچ و دەسـت لە مەم و ڕان و سـمت، ئینجا پڕدان و سەرجێیەکی توند و بێبەزەییانە. دوای ئەوە، ئیدی هەرگیز بەلایاندا نەچووەوە. بەم جۆرە ئەو ژنە گەنجە نەخوێندەوارانە بە جارێک کەوتبوونە دۆخێکی ئاڵۆزوبڵۆزی ســـەرلێشـــوان، ســـەرگەردانی لە بیروباوەڕ، لە جادووی و خورافە، لە قسـەوقسـەلۆک، نەخۆشـی و دەرد، لیستی ژنان، شۆفاری، قسەهێنان و بردن و ڕێرەوی سیاسیی تاریک.
ئەوان بە شەو و ڕۆژ هەر لەو زیندانەدا بوون. ئەوان کاتی دووردرێژیان بە خۆجوانکردن، بە شیشەکێشان، بە خواردن و شەڕ و دەمەقاڵێ لەگەڵ یەک بەسەردەبرد.

کاتێکیش ژنەکان جێگە و ڕێگە و ژوورەکانی خۆیان نیشـان درا، خواجە چوو لە دەروازە لێیـداکوتـا. بـارکردنەکە لە تەورێزەوە بۆ تـاران بۆ خۆشـبەختیی ئەو بەبێ کێشـە و سـەرئێشـە تەواو بووبوو. نۆکەرێکی گەنج قلیانێکی بۆ هێنایە بەردەمی دەروازەکە. خواجەش ئانیشکی وەسەر سەرینێک دا و بە دەم مژلێدان سەیری ژنەکانی دەکرد، کە چۆن خەریکی ئامادەکردنی شێون.

وەردە وردە تاریکایی داهات. پێشـخزمەتان مۆم و چرای ڕاڕەوەکانیان هەڵکرد. ئیدی جۆرێک لە خەم باڵی بەسـەر حەرەمسـەرادا کێشـا. پشـیلەیەک، پشـیلەکەی شـا خۆی بەژووردا کرد بە بازێک بۆ سـەرەوە کشا. لە کزە تروسکاییەکەدا تەماشایەکی ژنەکانی خوارەوەی کرد.





# گەورە وەزیر

میرزا کەبیری گەورەوەزیر لەپاش پەسەندنامەی شا، یەک دوو یەکەی لەشکری ناردنە بەشەکانی لای ئوستانەکانی ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژئاوای وڵات تا زڕبڕا ڕاپەڕیوەکانی شا دەستگیر بکەن.

کاتێکیش باوکی شا هەستیکرد، کۆتاییەکەی نزیک بووەتەوە، لێبڕاوانە داوای لە میرزا کەبیر کرد پشتی کوڕەکەی بگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ ڕکێفی تەواوی دەسەڵات بگرێتە دەست و خاترجەم بێ.

باوکی میرزا کەبیریش وەزیری دەستەڕاستی پاشای کۆچکردوو بوو. ئەوکات میرزا کەبیری لاو یاریدەدەری باوکی بوو لە کاروبارەکانیدا. پاشان جێگەی باوکی خۆی گرتەوە و بووە وەزیر لای پاشای کۆچکردوو. ئەو زۆر باش ئاگای لە ڕەوشی سەرتاسەری وڵات بوو. میرزا کەبیر لە لایەن خەڵکەوە خۆشەویست بوو، بەڵام لەسەر ئاستی پلە باڵاکاندا نەیاری زۆری هەبوون، چاویان پێهەڵنەدەهات، لەنێو ئەوانیشدا سیاسەتوان و شازادە گەندەڵەکان بوون. ئەو ئاگای لە باری پێشکەوتنی وڵاتەکانی وەک ڕوسیا، ئینگلستان و فەرەنگستان بوو،

دەشیزانی ولاتەکەی بە بەراورد لەگەڵ ولاتە ڕۆژئاواییەکان زۆر لەپاشە. بێکاری، نەخوێندەواری، نەخۆشی و دەردوبەلا و هەژاری و نەدارییەکی زۆر لە ئێران کززەیان لە جەرگەوە دەهێنا. سەرباری ئەوەش ئەو نەیدەتوانی ڕێگە لەوە بگرێ کە دەستەبژێرێکی کەم لە ولات هەتا دێت دەوڵەمەندتر دەبن زۆریش دەستڕۆیشتوون.

یەکێک لە نەیارە بەدەسەلاتەکانی میرزا کەبیر، مەهدولیای دایکی شازادەی جێنشین بوو. ئەو ژنە حکوومەتێکی سێبەری بۆ خۆی لە سیاسییە دێرینە بە ئەزموونەکانی پێکهێنابوو. هەروەها پەیوەندییەکانی مەهدولیا لەگەڵ ئاخوندە ڕووحانییەکانیشدا هەبوو، ئەوانەی دەیانگوت گوایە دەستیان لەگەڵ هێزێکی خواییدا تێکەڵە.

وەزیرەکە هەموو شتێکی کرد کە لەدەستی دەهات، بەڵکو دەسەلاتی مەهدولیا سنووردار بکا. ئەو دەیەویست دەسەلاتی ولات دەسەلاتێکی ناوەندی بێ تا بتوانێ بە باشی ولات بەڕێوە ببا. لێ خۆ ئەوەی بۆ نەدەچووەسەر.

میرزا کەبیر وەک گەورەوەزیرێکی شا ناسر، دەرفەتێکی نوێی بینی بەڵکو نەخشە و پلانەکانی پیادە بکا. ئەو دەیەویست ڕوخسارێکی هاوچەرخانە بداتە ولات. بەنیاز بوو کارخانە دابمەزرێنێ، ڕێگاوبان لێبدا، نەخۆشخانە دروست بکا و لەسەر ڕێچکەی خوێندنی ڕۆژئاواییدا بڕوا، بەلام ئەوەشی دەزانی تەنیا لەو حاڵەتەدا دەتوانێ خەونەکەی بەدیبێنێ، کە شا پەسەندی بکا. هەرچی هیوابوو بە دەستەبژێری دەسەلاتی نەبوو، پێویستیش نەبوو. ئاخر ئەوان لەپشت مەهدولیای دایکی شاوە بوون، تا کاروبارەکانی خۆیانی پێ ڕایی بکەن. ئەو دەستەبژێرە دەسەلاتدارە لە سەردەمی باوکی شادا باش مشووری خۆیان خواردبوو، ماڵوحاڵ و دارایییەکی زۆریان بەسەریەکەوە نابوو، تەنانەت قەلا و گوندی تایبەت بەخۆشیان هەبوو. وەزیرەکەش وەها سەرپەرشتی پاشای ئایندەی

کردبوو، بەڵکو بتوانێ لەگەڵ نەخشە و پلانە نوێخوازییەکانی ئەو بڕوا و یەکبگرێتەوە.
مەهدولیاش دەیەویســـت ڕێگە لەو پیاوە بگرێ. هاتە ســـەر ئەوەی، لە پێگەی زاڵی خۆیدا باندۆر بخاتە سەر کوڕەکەی تا بیوەستێنێ. بۆیە زۆر جاران لە کاروباری کوڕەکەی کەم دەکردەوە و بە بچووک ســـەیری دەکرد و هەمیشـــە ئەو تێبینییانەی پێدەگوت: "ئەرێ خۆت بەوە دەزانی کە تۆ خۆت نیت، لەبن بەرگ و پۆشـــاکی خۆتدا نیت، تۆ کۆیلەیەکی سەردارەکەتی."
"خۆ تۆ لای خۆی پاشـــای، کەچی وەک کوڕوکاڵێکی دەمڕووتەی ئەو کابرایە دەجووڵێیتەوە. دەی ئەوەندە بۆی دامەنەوێنە."
"وەزیرەکە تۆ بۆ نەخشەوپلانی تایبەتیانەی خۆی بەکارت دەهێنێ."
"ئـاگـاداربە، ئەوە لەبیر نەکەی، ئەو دەبێ گوێڕایەڵ و ملکەچی تۆ بێ، نەوەک تۆ بۆ ئەو."

میرزا کەبیر ســـەر بە بنەماڵەیەکی دەســـترۆیشـــتووی ســـەربەخۆ بوو، پیاوانی ئەو بنەماڵەیە هەمیشـــە خوێندنی بەرز و کاریگەری ســـیاســـی زۆریان بەسەر وڵاتەکەوە هەبوو.
تـا پێنج پشـــتی میرزا کەبیر، بنەمـاڵەکەیـان هەر وەزیریـان پەروەردە کردووە و لە دەرباری پاشـــایەتیدا خزمەتی وڵاتیان پێدەکرد. هەروەها میرزا کەبیریش بە تەواوی دەیەویســـت خزمەت بە وڵاتی باوانی بکا. بەگوێرەی دابونەریت، شـــا جڵەوی تەواوی ســـەرجەم وڵاتی لەدەســـتدا بوو. وەزیر لەبن دەستی ئەودا بوو. ئەو دەبووایە هەمیشە بە وریاییەوە پاشا لە ڕووداو و پێشهاتەکان ئاگادار بکاتەوە.
ڕۆژێکیان، دوای ئەوە شا بە جوانی ڕیشەکەی قەڵەم کردبوو، وەزیرەکە پێیگوت:

"پایەبەرز، ئێمە ئێستا لەسەردەمێکی شڵۆق و هەژێنەردا دەژین. لە لای باکوورەوە ڕوسیا حازر و ئامادەیە هێرشمان بکاتەسەر. لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە سوپای بریتانیا بۆمان لەسەرپێیە. ئەوان لەبەر ئەوەدان دەست بە هەر بڕوبیانوویەکەوە بگرن تا لە ڕێی وڵاتەکەمانەوە هەبوونی خۆیان لە هیندستان ئارامتر و پڕ ئاسایشتر ڕابگرن.
پاشایەتی ئەرکێکی زۆر قورسە. من لەبارەی ڕابردووەوە زۆر بەکراوەیی و ڕاشکاوانە هەم خاڵە بەهێز و هەم خاڵە لاوازەکانی ئەوانەی پێش تۆ حوکمڕان بوون، بۆم باس کردووی. من لەمێژە چوومەتە ڕوسیا و ئاگاشم لە گۆڕانکارییەکانی ئینگلستانە. دەوڵەتمەداری ئەم سەردەمە زیاتر لە جاران لە خۆشگوزەرانیی ڕەعیەتەکەی بەرپرسیارە. ئەو زەمانی کە خەڵک بڕی خۆی بە چێڵێک و پارچە زەوییەک دەشکاند و خوری مەڕەکانی ببڕیتەوە و بیەشتێ و بڕێسێ، خەریکە بەسەر بچێ. دونیا بەرەو پێشەوە دەڕوا و ئێمەش هەر لە شوێنی خۆمان چەقیوین. پێویستە ئێمەش هەروەک ئینگلستان و ڕوسیا کارخانە دروست بکەین. بەم شێوەیە دەتوانین بەهەزاران کەس بخەینە سەر کار. پێویستە گەنجە زیرەکەکانمان بنێرینە فەرەنگستان، ئینگلستان و ڕوسیا، تا لەوێ بخوێنن و فێر بن. منداڵەکانمان پێویستە فێرە خوێندن و نووسین بن. هەر بۆیە دەمانەوێ بە یەکجار حەوت قوتابخانە لە تاران بکەینەوە. فەرەنسییەکانیش ئامادەن بە سیستمێکی نوێی خوێندن یارمەتیمان بدەن."
شاش بە لاقرتێوە گوتی: "ئەوە هەموو شتێک بوو ویستت بیڵێی؟"
"من دەمەوێ شا پشتی ئەو نەخشەیە بگرێ. تکایە گوێ بۆ ئەوکەسانە هەڵمەخە کە هیچ لەو کاروبارانە نازانن."
شا بە هەراسانییەوە وەڵامی دایەوە: "ئەرێ باشە، ئەوە وەزیر لەگەڵ کێیەتی؟"

هەرچەندە هەم وەزیر و هەم پاشاش دەیانزانی مەبەستی قسەکە کێیە، لێ ئەوان لە قسەکانیان ناوی کەسیان نەهێنا.

"ئێستا قەڵەمڕەوی ئێرانی وەک نەخۆشێکی کوشندە رادەستی ئێوە کراوە. ئێوەش هەقە وەک قرالی ڕووسیا یان وەک پاشای ئینگلستان حوکم بکەن، نەوەک باوک و باپیرانت. من بە پێداگرییەوە داوات لێدەکەم بەڵکو حەرەمسەراکەشت کەم بکەیتەوە. ئەو ژنانەی تۆ هەتن تا هەمیشە بەشت دەکەن."

شا پێیگوتەوە: "بۆ وەزیر نییە خۆی لە کاروباری تایبەتیمان هەڵقورتێنێ، وەها باشترە وەزیر سنووری خۆی بزانێ و لاقی زیاد لێ رانەکێشێ."

ئیدی لە پشتی سەرییەوە گوێی لە سەرکۆنەکردنی دایکی بوو.

"هەقە پایەبەرز لە وەزیر ببوورێ. ئەو بە ئەرکی سەرشانی خۆی رادەبێ. لە جەنابی باوکتەوە ئەو ئەرکەم پێسپێردراوە، حەق و ڕەق بم لەگەڵ ئێوەدا. لە ئەرکەکانتان ئاگادارتان بکەمەوە."

شا هاتەوە وەڵام: "ئێمە هەنووکە بووینەتە پاشا، ئیدی وەزیر هیچ ئەرکی وەهای لەسەر شان نەماوە تا ئێمە فێر بکا و دەرسمان پێدا دا."

"من دەرست نادەمێ. پێویستە پەیوەندیی وەزیر و پاشا ئاشکرا و ڕوون، پاک و کردەیی بێ. من تەنیا ئەو داوایە لە پایەبەرز دەکەم، هیچ بڕیارێک بەبێ تاوتوێکردنی لەگەڵ وەزیرەکەی نەدا."

"دەی ئەو هەموو سووکایەتییە بوەستێنە. وەزیر قسە لەگەڵ شا دەکا. ئاگات لەدەم و قسەت بێ. ئێمەین بڕیاردەدەین پێویستە چی بکەین و چی نەکەین."

"هەرگیز وەزیر ئەوەی لە کەڵکەڵەی سەردا نییە سووکایەتی بە پاشا بکا. بە پێچەوانەوە، من پێزانینم بۆ زەینڕوونی تۆ هەیە. تۆ بەڕەوانی فەرەنسی دەخوێنیتەوە، ئێمە بۆ پاشای پایەبەرز داوای کتێبی فەرەنسیمان کردووە.

ئەوان بە شـــێوەیەکی ناوازە باســـی گۆڕانکارییەکانی ئەورووپا دەکەن. پێویستە جەنابی پایەبەرز لێی ئاگادار بێ."
شاش گوتی: "ئێمە پێویستمان بە هیچ نییە."
"بە دڵنیاییەوە، پاشـــا پێویســـتی بە هیچ نییە، بەڵام دەکرێ پاشـــا ئەوە بزانێ، بە ملیۆنان لە ڕەعیەتەکەی لەلادێکاندا وەک کۆیلە بۆ ئاغا خاوەن زەوییە زۆرەکان دەڕەنجێن و کاردەکەن. ئەوان هیچیان نییە، لە کاتێکدا ئاغا سالارەکانیان لە قەڵا بەهەشتئاساکانیان دەژین.
بەڵێ شـــا پێویســـتی بە هیچ نییە، بەڵام دەکرێ شـــا ئەوە بزانێ، لەودیو دیوارەکانی ئەم کۆشـــکە، بە هەزاران خەڵکی هەژار و نەدار بۆ ژیانی خۆیان دەجەنگن، کەچی شـــازادەکان لە تاران لە ژیانی خەونەکانیاندا دەژین.
بەڵێ شـا پێویستی بە هیچ نییە، بەڵام خۆ دەکرێ ئەوە بزانێ، کە ناکرێ وەک ڕۆژگاری پاشـــاکانی پێش خۆی پاشـــایەتی بکا. خۆ ئەگەر هەر وەهاش بکەی و ئەوا لەوە دەترســـم کۆتایی بنەماڵەی پاشـــایەتی بێ. خۆشـــت دەزانی من لەو قســـەیەدا جدیم. پێویســـتە شـــا لەو هێزانە دووربکەوێتەوە کە لە دژی ئێمە کاردەکەن. من پێویســـتیم بە کۆمەکی تۆ هەیە تـا وڵات نوێ بکەینەوە، من وای بیرلێدەکەمەوە لە داهـاتوویەکی نزیکدا، گەشتێکی ڕوسیا یان فەرەنگستان بکەن."
شـا بێدەنگ بوو. ئاخر ئەو حەزی لە گەشت و سـەیران بوو، زۆریش بە نێو وڵاتدا گەڕابوو. پێشـــتر دوو جاران چووبووە ڕوســـیا. بەڵام وەک پـاشـــا زاتی ئەوەی نەکردبوو لە وڵات بچێتەدەر. ئاخر ئەو مێژووی دەزانی، ئەوەشی دەزانی چی دەقەومێ کاتێ پاشا لەوێ نەبێ.
شا ئەوەشی بۆ قسەکانی خۆی زیاد کرد: "دەکرێ پاشا بیری لێبکاتەوە."
شا زەنگەکەی لای خۆی ڕاوەشاند. پەردەدار هات و پاشاش بە دەست ئاماژەی بۆ کرد تا یاوەری وەزیر بۆ دەرەوە بکا.



# مەهدولیا، دایک

مەهدولیا هێشتا زۆر گەنج بوو کە دووگیان بوو. ئەو کوڕەکەی خۆی، شازادەی جێگرەوەی هەروەک شێرێک پاراست. هەرگیز لێینەگەڕا کوڕەکەی بەتەنیا لە شوێنێک بەجێ بمێنێ. دەترسا نەوەک ژنانی دیکە لە ئیرەییان شتێکی لێبکەن.

لەبەر ئەوەی مەهدولیا سەر بە هەمان هۆز و تیرەی پاشا بوو، بۆیە ژنێکی سەلار و بژاردە بوو، شاژنی وڵات بوو. ئەو ژنی متمانەداری پاشای کۆچکردوو بوو، بە نهێنییەکانی قەڵەمڕەویی وڵاتەکەشی دەزانی. کاتێکیش مێردەکەی نەخۆش کەوت، لەجێگەی ئەو بڕیارەکانی دەردەکرد. تاکە کەسێک کە لەسەر ڕێگەی بەربەست بوو. میرزا کەبیر بوو. هەنووکەش مێردەکەی لە ژیاندا نەماوە، تێدەکۆشێ لە ڕێی کوڕەکەیەوە وڵاتەکە بەڕێوە بیا.

مەهدولیا خۆی ڕەنگدانەوەی کاترینای قەڕاڵە ژنی ڕوسیا بوو. لە قووڵایی ناخیەوە حەزی دەکرد ببێتە کاترینای ئێران. ئەو دەیزانی دەبێ بە وریاییەوە لەنێوان ڕوس و بریتانییەکانەوە مانۆڕی خۆی بکا.

مەهدولیا بەقای[8]بە بریتانییەکان نەدەکرد. ئاخر ئەوان سیاسیی فێڵباز بوون هەر بەتەنیا بەرژەوەندیی وڵاتەکەیان لەبەرچاو بوو. خۆی ڕوسەکانیش لە بریتانیەکان باشتر نەبوون. ئەوان لە میانەی دوو جەنگی گەورەدا شاری گەورەیان لە ئوستانی ئازربایجان بۆ خۆیان دابڕی. مەهدولیا دەیزانی ئەگەر بێت و بیەوێ کاریگەری هەبێ و دەستڕۆیشتوو بێ، پێویستە لایەک لەو دوو زلهێزە هەڵبژێرێ. ئیدی ئەو لای ڕوسەکانی لێگرت.

مەهدولیا دەیەویست شا بۆ خۆی کێش بکا و بیخاتە ئەڵقەی دەستی و لە دەستی وەزیرەکەی دەربهێنێ. ئەو یەک دوو جاران بە شای ڕاگەیاند، لە ساتەوەختی شایستەی خۆیدا نهێنییەکی زۆر گەورەی بۆ دەدرکێنێ. ئیدی کات و ساتی ڕازەکە هاتبوو.
کەژاوەکەی مەهدولیا لە دەروازەی کۆشکەکەوە لە لایەن سەردەستەی پاسەوانە نوێیەکەوە ڕێی پێگیرا.
"ئەرێ کێ لەنێو کەژاوەکەدایە؟"
لێخوڕی ئەسپی کەژاوەکەش گوتی: "شاژن."
سەردەستەی پاسەوانەکان ویستی کەژاوەکە بپشکنێ. مەهدولیا بەر لەو سەری دەرهێنا، دەرگەکەی کردەوە و هاواری کرد: "ئەوە چی لە گۆڕێدایە؟"
سەردەستەی پاسەوانەکان لە سام و هەیبەتی کەسایەتیی ژنەکە حەپەسا، ئیکلامی بۆ کێشا و ڕیگەی بە کەژاوەکەدا بڕوا.

کاتێ مەهدولیا لێ وەژوور هۆڵی میناب‌ەندەکە کەوت، شا بەدەم بانگکردن "دایکە، گەورەم".

---

[8] بەقا: متمانە، بڕوا.

ئەویش بە توورەییەوە هاواری کرد: "ئەریٚ ئەوەیە ڕەوش و حال؟ شـــا لە نێو کۆشکەکەی خۆیدا زیندانیکراوە؟"

"دایکە، مەبەستت چییە؟"

"پێدەچیٚ لێرەوە کەس نەتوانیٚ بە بیٚ پرسـی وەزیر بجووڵێتەوە، تەنانەت پاشاش."

"نەخێر دایکە نەخێر، دۆخەکە بەو تۆخییەش نییە."

"من لێرە هەسـت بە ئاسـوودەیی ناکەم. لێرە دیوارەکانیش گوێیان هەیە. دەی بابچینە شوێنێکی دیکە دابنیشین."

شا یاوەری دایکی کرد بۆ ژووری قسەکردن.

"تۆ بەسەر کونەماردا کەوتووی. تۆ وەنەبیٚ هەر لە ڕوسیا و ئینگلستانیٚ دوژمنت هەبن، بەڵکو لێرەش لەژێر ئەو هەنوانەشدا دوژمنت هەن. جاریٚ لەپێشـەوە جارێکی دیکە لەو وەزیرە ئاگادارت دەکەمەوە. خەبەرهێنەکانم بەڵگەیان بۆ هێناوم، وەزیر بەنیازە دەسـەڵات بخاتە بن جڵەوی خۆیەوە. ئەو گەنجان دەنێرێتە ئینگلسـتان و ڕوسـیا تا بخوێنن. ئەو دەیەویٚ چاکسـازی بکا بە شـێوەیەک هیچی بۆ شـا تێدا نەهێڵێتەوە، هەروەها دەیەویٚ سـوپاش بگۆڕیٚ تا هەمووان ملکەچی ئەو ببن. ئەریٚ بەڕاسـت، لەونێوەدا شـا چی دەکا؟ ئەو کاغەزانە واژۆ بکا کە وەزیر مشـوری خواردوون؟"

"دایکە ئەوەی گوتت وەها نییە. من ئاگام لە هەموو شـتێکە، وەزیریش بەبیٚ پرسوڕای من هیچ شتێک ناکا. ئەو وەک باوکێک بۆ من وایە."

دایکیشی بە توندی وەڵامی دایەوە: "شا نابیٚ ڕێگە بە خۆی بدا بەو جۆرە بدویٚ."

"ئەوەی ئەو دەیکا، بۆ وڵاتەکە و بۆ ئێمەیەتی. دایکە خۆ هەردەبێ یەکێک هەبێ بیر لە خەڵکەکە بکاتەوە. کاتێک دەچمە دەر بۆ ناوخەڵک، شەرم لە خۆم دەکەمەوە، وەک ئەوە وایە من پاشای خوازخوازۆکان[9] بم."

"نەخێر تۆ وەها نیت، تۆ پاشای وڵاتێکی دڵڕفێنی، پاشای شاری ناوازەی پڕ لە بازاڕ و قەڵای نایاب نایابی. تۆ لەم کۆشکەدا دەژی کە لە حەکایەتەکانی هەزار و یەکشەوەدا وەک شتێکی تەلیسماوی وێنای کراوە."

"دایکە، وەزیر دەیەوێ کارخانان دابمەزرێنێ. ئەو دەیەوێ منداڵان بنێرێتە قوتابخانە دامودەزگا لە دەوەرە بهێنێ تا لێرە بەخۆمان بتوانین کتێبان چاپ بکەین. ئەو وا لە سەربازەکانمان دەکا یەکبەرگیی نوێ بپۆشن، بە شێوەیەکی باش و ڕێکوپێکیش چەکدار بکرێن."

"ئاوەها، باشە وەزیر ئاوای دەوێت؟ ئەدی پاشا چی دەوێ؟"

پاشا وەها وەڵامی دایەوە: "ئەو، هەموو ئەو شتانە بە ڕاوێژ لەگەڵ ئێمەدا دەکا."

"باشە هەر بە ڕاوێژی جەنابیشتان بووە کە دەرماڵەی ئێمە و شازادەکانی بۆ نیوە دابەزاندووە؟ خۆ ئەگەر پاشا وەها بیربکاتەوە، باشە ئەدی من چیدیکە بڵێم؟ باشە من بۆ لێرە بمێنمەوە، چی دەکەم لێرە؟"

"دایکە تۆ هاتووی ڕازێکم بۆ ئاشکرا بکەی."

مەهدولیا ئاهێکی هەڵکێشا بەسەر کورسییەکدا پاڵی دایەوە. پاشاش پەرداخە ئاوێکی بۆ تێکرد. بە هێواشی قومێکی لێدا، سەری هەندێک لە کوڕەکەی نزیک کردەوە، ئینجا بە دەنگێکی نەوی گوتی: "کوڕم، تۆ مێژوو دەزانی. نادری گەورە دامەزرێنەری پاشایەتیی پێشوو، زیاتر لە جارێک چووە سەر هیندستان. لە دواجاریدا پاشای هیندستان بە

[9] خوازخزۆک: ئەوەی هەر داوا دەکا، دەرۆزەکەر. سواڵکەر. وەرگێڕ.

لەشـــکرێکی گەورەو و بە فیلەوە لە بەرانبەری وەســـتایەوە، بەڵام هەر دۆڕا. ئیدی شـــای هیندســـتان لەبەردەم نادردا چۆکی دادا و تاجەکەی خۆی دایەدەست. بەم جۆرە نادر بووە شای هیندستان."

شا بە نائارامییەوە هاتەدەنگ: "دایکە خۆ دەمێکە ئەو شتە زانراوە، باشە بۆچی بەو دەنگە نەرم و نەوییەوە دەدوێی؟"

مەهدولیاش درێژەی بە قســـەکەی خۆی دا؛ "لەپاش پەنجا و هەشـــت ڕۆژان، هیندییەکان دژی ســـەربازانی ئێرانی ڕاپەڕینیان کرد. کاتێکیش بەرگرییەکە گەورە بوو توندوتیژیی زۆری لێکەوتەوە، ئیدی نادر سەری ســـەدهەزار کەســـی بە فەتەرات دا.[10] ئینجا ئەوکاتە تاجی پاشـــای هیندســتانی دایەوە، کە گەنجینەکەیانی هەڵلوشـی و دەسـتێکی پێداهێنا و بەتاڵی کرد."

شا بە قیتی لەسەر کورسی دانیشت.

دایکەکەش لەســـەر قســـەکانی خۆی ڕۆیشـــت: "بەگوێرەی بەڵگەنامەی ئەرشـیفخانەی پاشـایەتیمان، نادری گەورە ئەوکات گەنجینە گەورەکەی هیندستانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە ئێرانی."

شـا کە پێشـتر هەرگیز گوێی بە ئەرشـیف و مەرشـیف نەدابوو پرسـی: "باشـــە ئەو بەڵگەنامانە لە کوێن؟ دەی پێم بڵێ کتومت لە کوێن؟ دایکە، ئەو گەنجینە چی تێدایە؟"

مەهدولیـاش وەک ئەوەی بە قووڵی بیری لێبکاتەوە، گوتی: "من نـاوی یەک دوانێکیان دەهێنم: ســـندووقی پڕ لە زێڕ و خشـــڵ و تەڵای هیندی، سەرینێکی شاهانە کە بە زێڕ و تەڵای گەش ڕازاوەتەوە، سەندەلییەک لە شێوەی تاوسێکی گەورە کە بە زێڕ و تەڵای ڕەنگاوڕەنگ ئاوێزان کراوە. کیسەی پڕ دوڕ و گەوهەری گەورەی بریسکاوەی هیندستانی. یەک دوو کیســـە گەوهەری گەورەی بریقەدار کە بە گەورەترین گەوهەری جیهان

---

[10] سەری بەفەتەرات دا؛ بووە مایەی کوشتن و لەناوبردنی.

دادەنرێن لەنێو قوماشـیکی ئەرخەوانی تاریکی نەرم هەڵگیراون. یەکێ لە گەوهەرەکان ناوی 'دەریاییەک لە تیشـک'ە و ئەوی دیکەشـیان ناوی 'چیایەک لە تیشک'ە. هەروەها چەندین کۆتەڵی بچکۆلەی فیل، تاوس، مار و کەروێشـک... هەر هەمووشـیان لە زێڕی بێگەردن و بەردە مرواری و گەوهەریشیان تێدا ڕیزچن کراون."

شا بە کەیفەوە پرسی: "چی بەسەر ئەو گەنجینەیەدا هات؟"

مەهدولیاش بە ئارامییەوە گوتی: "لەبەردەستمان دایە."

شا بەسەرسامییەوە: "لەبەردەستمان؟"

"دەنگت کز کە. ئەو بەڵگەنامانەی من باسـیان لێوە دەکەم، باسـی ئەوە دەکەن، نابێ پاشـا هیچ دەرهەق ئەو دیارییە پاشـایەتییە بکا. تۆ دەکرێ بیبینی، بەڵام نابێ بیفرۆشـی، مەگەر لە حاڵەتی زۆر پێویسـتدا نەبێ. خۆ ئەگەر ڕوس یان بریتانییەکان پێی بزانن، وڵاتەکەمان دەپشکنن و دەست بە ڕاوڕووت و تاڵان دەکەن تا ئەو گەنجینەیان دەسـت بکەوێ. ئەمەش دەسـتکاری گەورەهونەرمەند و گەوهەرچییەکانی هیندسـتانە. لەنێو ئەو گەنجینەیەدا گیانی هیندسـتانی تێدا پارێزراوە، باوک و باپیرانت ئەو نهێنییەیان لەگەڵ خۆیاندا بردە گۆڕەوە. تۆ دەبێ دڵێکی گەورۆنەت هەبێ تا ئەم نهێنییە هەڵبگری."

پاشـا پرسـی: "باشـە بایەخی ئەو هەموو شـتە چییە کە نەتوانین بەکاری بهێنین؟"

"من تەنیا قسـەکانی باوکە کۆچکردووەکەت بۆ دەگێڕمەوە. من پەیکم هەیک. پاشـا کۆچکردووەکە گوتی: 'کوڕم، گەنجینەکەی هیندسـتان پەرجوویەکە دەبێ هەر لەژێر خاکدا بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی وڵاتەکەمان بەهێز و سـەقامیگر دەبێ. ئەوسـا دەتوانی دەریبێنی، دەنا هەمووی لەبارێک هەڵدەوەشێ و ون دەبێ."

شا نەیدەتوانی زیاتر لەسەر کورسییەکە بمێنێتەوە، حەجمانی لەبەر برا!
"دایکە، گەنجینەکە لە کوێیە؟ کێ پێی دەزانێ؟"
"هەمیشە پێویستە سێ کەس پێی بزانن."
شا پرسی: "سێیەمەکە کێیە؟"
"شیخ ئاغاسی، ڕاوێژکارەکەی باوکتە."
"باشە بۆچی ئەو پیاوە؟"
"ئاخر ئەو هێزی جادووی هەیە، هەمیشـەش لە بڕیارە سـەختەکاندا یارمەتیی باوکت و منی داوە. ئەو دەتوانێ ئایندە بخوێنێتەوە. ڕۆژێک دادێ هێز و ڕاستگۆیی و پێشبینی ئەو بەکار بهێنی."
"دایکە، باسـی شـێخ ئاغاسـی بەسـە. دەی لە کۆتاییدا پێمبڵێ ئەو زێڕ و گەوهەرانە لە کوێن؟"
دایکەکەش قورئـانێکی بچکۆلەی لە نێو جـانتـاکەی دەرهێنـا و گوتی: "کوڕم، دەی دەستت لەسەری دابنێ و سوێند بەو کتێبە پیرۆزە بخۆ، کە تۆ ئەو زێڕ و گەوهەرانە وەک بیلبیلەی چاوت دەپارێزی."
شـاش بە پڕتاو دەسـتی لەسـەر بەرگی قورئانەکە دانا و گوتی: "سـوێند دەخۆم."
"گەنجینەکە لێرەیە، لەنێو ئەم کۆشکەدا."
"چی؟ لەنێو ئەم کۆشکە؟"
"ئەم کۆشـکە لە لایەن یەکەمین پاشـای ئەم پاشـایەتیەوە ڕۆنراوە. ئەو ژێرزەمینێکی لەژێر زەمینی ئەم بـاڵەخـانەیە لێداوە. لەوێوە بووبڕێکی[11] ژێرزەمینی بەرەو شاخەکان دەڕوا."
شـا پرسـی: "لێرە، لەژێر ژێرزەمینی ئەم کۆشـکە؟ دەکرێ گەنجینەکە ببینم؟"
"ئێستا ناکرێ. دەبێ تاریکی دابێت و ناشبێ کۆشکەکە کەسی لێبێ."

[11] بووبڕ: تونێل

شا کە هەدادانی نەمابوو، گوتی: "ئاخر دایکە، تکایە."

مەهدولیاش گوتی: "ئەمە کاری پیاوانە، داوا لە شـــێخ ئاغاســـی دەکەم بەڵکو سبەی شەو بتباتە ژێرزەمینەکە."

کاتێکیش خانمەکە ڕۆیشت، پشیلەکەی شا سەری لە بن پەردەکە دەرهێنا بە پێی بە گۆرەویەوە بۆ لای ئەو ڕۆیشت.

# ٦
# شێخ ئاغاسی

باوکی شـــا، پاشـــایەک بوو باوەڕی بە شـــتی خورافیاتیش هەبوو. لە حاڵەتی چارەنووســـــازدا زاتی نەدەکرد بڕیاڕ بدا. لە زۆر باردا هەر مەهدولیای ژنی بوو وای لێدەکرد بڕیارە گەورەکە بدا. زۆر جاریش ژنەکەی ڕاویژی بە شـێخ ئاغاسـی دەکرد، ئەویش بە چاوێکی نائاسـایی سەیری شتەکانی دەکرد.
کابرا کەســێکی متمانەداری پاشـــای کۆچکردوو بوو. ئەو وەزیر نەبوو، هەروەهـا ڕاوێژکـاریش نەبوو. ئەو پەیوەنـدی بە هێزە نـادیـارەکـانەوە هەبوو. کاتێکیش پاشا لە کۆتاییدا پێویستی بە پرسوڕایەک هەبووبا، ئەوا شـێخ ئاغاســی بە تیژبینی، بە نوێژ و ویردەکانی بە نووســراوە پیرۆزە نهێنییەکانی، بە پێشـــبینییەکانی هێوری دەکردەوە. شـــا ئەوی وەک شیفاهێنەرێک دەبینی کە دەستێکی خواوەندانەی لەپشتە.
شیخ ئاغاسی ڕیشێکی ماشوبرنجی درێژی هەبوو، هەمیشەش عەبایەکی ســپی لە قوماشــی تەنکی لەبەر دەکرد. ئەوەی لەو زانرا ئەوەبوو، گوایە ئایندە دەبینێ و کەرامات و فیراســەتی هەیە. دەنگۆی وەها هەبوو، گوایە

ئەو بە خوێندنەوەی ئەستێران نەکردە دەکاتە شتێکی کردەیی. جارێکیان پاشا داوای سەری دوژمنێکی کرد و شێخ ئاغاسیش مشوری ئەوەی خوارد سەری کابرای بۆ بێنێ.
شێخ ئاغاسی لە دەرەوە، لە ماڵێکی گوندانەی قەدپاڵی شاخێکدا دەژیا، تا لەوێ خەڵوەتی گۆشەگیرییانەی خۆی بکا. ئەو زۆر سادە دەژیا و هیچ کەلوپەل و ماڵوحاڵ و دەرامەتێکی دنیایی نەبوو. پاشای کۆچکردوو کوێرانە بڕوای پێی هەبوو، هەر بۆیەش لێیگرت تا نهێنیی پاشایەتییەکەی لا بدرکێنێ. پاشای نوێش لەو شێخە ڕامنەکراوە دەترسا، لێ لەهەمان کاتیشدا ئەوەی دەزانی، دەکرێ پێویستی پێی هەبێ.

ئەو ئەنگۆرەیەی قەول وابوو شێخ ئاغاسی، پاشا بباتە سەر گەنجینە شاراوەکە، ئەوەبوو شێخ هاتە لای پاشا لە هۆڵە مینابەندەکەدا. باوکانە هەردوو باڵی بۆ کردنەوە، شاش بەرەوپیری ڕۆیشت و خۆی لەباوەش هاوێشت سەرشانی ماچ کرد. "پایەبەرز، باوکتان وەک مانگێکی پڕ ئاوابوو، تۆش وەک مانگێکی تازە دەرکەوتی."
پاشاش پێیگوت: "تۆ لای ئێمە خۆشەویستی. باوکمان ڕۆیشت و چووە ڕێگای خۆی، بەڵام خۆ ئەو تۆ و هۆشمەندیی تۆی بۆ ئێمە بەجێهێشتووە." لە ژووری پشتەوە کە شا قسە و باسی متمانەدارانەی لێدەکرد، لەوێ لەسەر کورسییەکی بەرگ ئاورشمینی سەوز دانیشت و ئاماژەشی بۆ شێخ کرد تا لەوێ لەتەنیشتی دابنیشێ.
ئینجا شا کە بە ئاستەم دەیتوانی بەسەر بێ ئۆقرەیی خۆیدا زاڵ بێ، گوتی: "دەی، گوێمان لێتە."
"دایکت ئەرکی ئەوەی پێ ڕاسپاردووم تا ژێرزەمینەکەت نیشان بدەم. بەڵام سەرەتا دەمەوێ نامەیەکی زۆر باوەڕپێکراو نیشانی پایەبەرز

بدەم، ئەویش وەســیەتنامەی باوکتە، بۆ تۆی داناوە." ئەوسـا شـێخ بە هێواشی نامەکەی لە باخەڵی دەرهێنا و دایە دەستی پاشا.
پاشاش مۆرە مۆمییەکەی لەسەر نامەکە لادا و کەوتە خوێندنەوەی، هەر بەڕاستیش نامەکە بە دەستخەتی باوکییەوە نووسرابوو: "ڕۆڵە، ڕۆژانی نەمریی قەڵەمڕەوی ئێرانی بەســەرچوون. بـارودۆخەکە منی کردە پاشــایەکی لاواز. ناچاربووم دوو بەشــی گەورەی وڵات بۆ ڕوس وازلێبێنم، ئەوەش وەک ئەوە وابوو بە بیورێک هەردوو دەســتەکانم ببڕنەوە. برین و ئازارێکی ســارێژنەکراوە، دەبێ لەگەڵ خۆمی ببەمە گۆڕەوە. خۆت دەزانی بریتانییەکان دەســتیان بەســەر هەراتی تاجی زێڕینی پاشـایەتیی ئێمەدا گرت، تا لەوێوە ڕێگەی ڕوسەکان بۆ گەیشتن بە هیندستان زەحمەت بکەن. ئەوان دەیانەوێ هەرات بدەنە ئەفغانییەکان تا بۆ هەمیشــە لەبن چاودێریی ئەواندا بمێنێتەوە. کوڕم، هەموو شـتێک بکە تا هەراتی خۆشــەویســت بگەڕێنیتەوە. دەنا هەرات بۆ هەتا هەتایە ئازارت دەدا و نەوەکانی دوای خۆشت لەسەر ئەم کارە لێت خۆش نابن. ئەو شتەش هەر زۆر سەختە، بەڵام هیوام وایە ئازایەتیی باپیرەگەورەت تێدابێ. فرمێسکەکانم بەسەر ئەو نامەیەدا ڕژان. بژی ئێران."
بەو نامەیەی ناودەســتی بۆ ماوەیەک لەســەر کورســییەکەی خۆی بێ هەســتوخوســت مایەوە. ئاخر دوا خواســتی باوکی ئەوەندە قورس بوو نەیدەتوانی هەروا بێباکانە بەلایەوە بنێ.
شیخ ئاغاسیش کە نیشانەی خەمخۆری لەسەر ڕووی پاشا بینی، ڕووی تێکرد و گوتی: "ئەستێرەکان بڕوایان بە ڕۆژگاری سەرکەوتن و شکۆی شــاوە هەیە. دایکت و من بە نـاوەڕۆکی ئەم نـامەیە دەزانین. من لە ئەستێرەکان ڕاماوم و دەزانم کە شا هەرات دەستێنێتەوە و بریتانییەکان بە بەزیوی بەرەو قووڵایی هیندستان دەنێرێتەوە."

شا چاوێکی لە شێخ کرد و مسکەیەکی بۆ کرد. ئینجا نامەکەی قەد کرد و توند لە بەرکی کەواکەی ڕاکرد.

"پایەبەرز، دەی با ئەرکەکەم بەجێ بگەیەنم. دەســـتکەوتە هیندییەکە بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەردەســـتی یەکێک لە نەوەکانی نادری مەزندا بوو، باپیرەی تۆ سەری نزیکەی هەموو پیاوەکانی پەلدا تا لە کۆتاییدا گەیشتە ئەوەی بزانێ ئاخۆ گەنجینە دەســـتکەوتەکە لە کوێ شـــاردراوەتەوە. ئەویش بووبرێکی لەبن ژێرزەمینەکە لێدا و گەنجینەکەی بۆ گواستەوە."

ئینجا شێخ ئاغاسی دەستی دایە چرایەک. شا هەر وای زانی شێخ ئەو بۆ ژێرزەمینەکە دەبا، بەڵام بۆ مایەی ســـەرســـامی، شـــێخ ئەوی بردە ژووری نووســتن و دەرگاکەشــی لە پشــتەوە گاڵەدا.[12] ئەوســا پەردەکەی دادایەوە و دۆڵابی جلەکانی پاشـــای کردەوە. هەموو جلەکانی هێنانەدەر. کلیلێکی درێژی لەنێو عەبایەکی خۆی هێنایەدەر، لەبەر تیشـــکی چراکەدا بینی دۆڵابەکە کونێکی لەپشـــتەوە تێدایە، ئەویش کلیلەکەی تێ بـادا. دەرووییەکی بچکۆلە کرایەوە، هەوایەکی سارد و شێداری لێوە هاتەژوور، کە سێبەری سەر دیوارەکانیشی لەراندەوە.

شـــێخ گوتی: "پێویســـتە پاشـــا وریا بێ." ئەو بە زەحمەت خۆی وێک هێنایەوە تا لە دەرووەکە بچێتە دەر و لەچاو ون بوو. پاشـاش بە مەراق و تاسەوە بەدوایدا ڕۆیشت.

شێخ گوتی: "ئاگادار بە، لێرەوە پەیژەیەکی بچکۆلانە هەیە."

شا ناسریش دەستی لە دیوارە شێدارەکە کوتا، بەدوای شێخ ئاغاسی کەوت.

شـــێخ گوتی: "لە کۆتایی ئەم ڕێڕەوەدا پەیژەیەک هەیە، پاشـــان داڵانێکی تەنگتر، دیســـان پەیژەیەکی دیکە و کورتە ڕاڕەوێک. ئەوســـا گەنجینەکە دەردەکەوێ."

---

[12] دەرگە گاڵەدان: دەرکە پێوەدان و قفڵکردن.



له كۆتایی كورته ڕاڕەوەكەدا دەرووییەكی بچكۆله بەدیاركەوت، شـــێخ ئاغاسی ئەو دەرووەشی بە كلیلێكی دیكە كردەوە. دیسان شا پێیدا چووە ژوور.

شـــا هێدمەگرتی بوو. ئاخر هۆدەیەكی گەورەی پڕاوپڕ له كەلوپەلی زێڕین، كاتێكیش تیشكی چراكەیان بەركەوت، بریقەیان دایەوە.

شێخ گوتی: "بەخێر بێیت بۆ ناو مێژوو."

شـا پرســی: "پەكوو لەو شــته باوەڕپێنەكراوە. ئای لەو نهێنییە، بەڵام باشە بۆچی دەرووەكەیان ئەوەندە تەسک و بچووک لێكردووە."

"بۆئەوەی ڕێگربێ لەوەی كەس بتوانێ ئـامرازی گەورە لەگەڵ خۆی بهێنێتە ئێرە. هەر بەڕاســتی دەرگەیەكی نهێنیی هەیە كە وەک دەرچەی ئێرە وایە. ئەویش بۆ حاڵەتی زۆر پێویســـت و ناچارییە، بۆ ئەوە ئەگەر شـــا ناچار بوو لەپڕ كۆشــكەكە بەجێبێڵێ. ڕێڕەوەكە دەچێتە ســـەر ئەشكەوتێكی بچووک، لەوێوە مرۆ دەتوانێ بە سـەلامەتی لێیەوە دەرچێ و ڕزگاری بێ." بەدەم ئەم قســـەیە شـێخ ئاغاســـی یەک دوو مۆمی له شوێنی تایبەتی خۆیان هەڵكرد.

شـا واقی وڕما، ئاخر له چاوتروكانێكدا بەسـەر ئەو گەنجینە پڕ له زێڕ و گەوهەرەدا كەوت. ئەو كیســـەی زێڕ و زیوی بینی دەدرەوشـــانەوە، كورسـییەكی بینی لەســەر شـێوەی تاوس بە بەردە مرواری گەوهەرداڕ ڕیزچن كرابوو. له هەموو لایەک هەر كۆتەڵ، دەفر و مۆمـدانی زێڕین بوون. شـێخ لەبەر چاوی پاشــادا ســندوقێكی كردەوە و بە ملكەچییەوە گوتی: "پایەبەرز."

كاتێک شـــا چاوی بە گەورەترین گەوهەری شـــینباوی جیهان كەوت، حەپەسا، ئەوەی ناوی "دەریایەک له تیشک" بوو. ئاخر ئەو نەیدەزانی كە گەوهەرێک بەو قەبارە گەورەیە و بەو جادوویەی خۆی له دونیادا هەبێ.

پاشان شێخ سندوقێكی دیكەشی كردەوە و گوتی: "سەیركە پایەبەرزا"

لەوێدا پەرجووی گەوهەری دووەم بوو، یەکێک بوو لە گەورەترین گەوهەرەکانی دنیا، ناویشی "کێوێک لە تیشک" بوو. دیسان شا چاوزەق و مۆلەق و زاربەش ما، قسەی بۆنەهات. هەر سەیری دەکرد.
هەروەک دایکی پێیگوتبوو، تاجی پاشـــایەتیی کۆن و عەنتیکە، بازن و خەناوکە و گوارە، هەموو ئەو شـــتانەی هی شـــاژن و پاشـــا هیندییەکان لەو گۆڕە لەبەردەستیدابوو. شا ناسر کیسەیەکی کردەوە پڕ لە یاقوت و زمرود، لەنێو پەنجەکانی بریسـکەیان دەهات، لە شـــاگەشـکەییان گوتی: "نازدارە". ئینجا چووە لای تەختەخەوێکی گەورە، کە زۆر وەســـتایانە لەبەردە گەوهەر دروستکرابوو. دەستی لێدا و باری پێتەوییەکی پشکنی، بە درێژی لەسەری پاڵی دایەوە.
بە واقوڕماوییەوە گوتی: "زۆر ناوازەیە، وەک ئەوە وایە لەنێو حەکایەتێکی ئەفسانەییدا بین."
بە پاڵدانەوە ســـەیری ئەو هەمو شـــیر و قەڵغان و ئاوێنە و شـــوشـانەی کرد، کە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوون. خۆ ئەم داراییە خودایيە هی شـا و شــــاژنەکان نەبووە، بەڵکو هی خواوەندەکان بووە. ئەوانە بەشـــێکی مێژوو، بەشـــێکی ژیان بوون. بەخت ئەو گەنجینەی هێناوەتە ئێرە تا بە پـــارێزراوی بمێنێتەوە. هەنووکەش ئەو دەبێ گەنجینەکە وەربگرێ و بیپارێزێ.
شـــا لەبەرخۆیەوە گوتی: "ئەمە گیانی هیندســـتانە. ئەو هیندســـتانەی کە بریتانیا و ڕوس دەیانەوێ بۆ ئەوان بێ. نابێ کەس بەوە بزانێ کە چی لێرە شـــــاردراوەتەوە. هەر هیچ کەس نابێ بزانێ. ئەوە هی ئێمەیە، هی ئێرانییەکانە."
شـــێخ ئاغاســـیش بەســـەر لەقاندنەوە کلیلی دووەمیشـــی ڕادەستی شـــا کردەوە.

# ٧

# هەرات

لەبەرئەوەی پاشای کۆچکردوو ژمارەیەکی زۆر ژنی هەبوون، زەوەزەی[12] زۆر، سەدان کوڕ و نەوەی لێکەوتبوونەوە، بۆیە سەدان ماڵبات سەر بە بازنەی ماڵی پاشایەتییەوە بوون. هەموویان بەیەکەوە چینێکی نەجیبزادانەیان لەنێو کۆمەڵگە پێکهێنابوو، کە بەدوای مەهدولیا کەوتبوون. ئەوان لە کاروباری سیاسی، لە سوپا، لە بازرگانی لەنێو قەلەمڕەوییەکەدا پێگە و پایەی گرنگ گرنگیان هەبوو. نزیکەی هەر هەمووشیان ژێربەژێر پەیوەندییان بە باڵوێزخانەکانی بریتانیا و روسیاوە هەبوو. ئەو زنجیرە ڕێوشوێنانەی وەزیر گرتبوونیەبەر تا دەسەلاتی خانەوادەکە سنووردار بکا، تووشی ڕووبەڕووبوونەوە هاتەوە. ئەوان ڕوون و ئاشکرا ناڕەزایی و ناڕەحەتی خۆیان نیشانی شا دا.

---

[12] زەوەزە: تۆرەمە، کوڕ و نەوەی زۆر.

شـــا بانگی وەزیری کرد تا بۆی ڕوون بکاتەوە ئاخۆ چی لە گۆڕێدایە. سـەر لە ئەنگۆرەوە میرزا کەبیریش بە سـواری ئەسـپەکەیەوە گەیشـتە کۆشـک. سـەرۆکی پاسـەوانانی کۆشـک هەوسـاری ئەسـپەکەی گرت تا وەزیر لێی دابەزێ. ئەوان بە کورتی لەگەڵ یەک دوان، تەنـانەت ئەو قسانەش گەیشتنەوە گوێی شا. ئاخر ئەو لە ژوورەوە لە پشت پەردەوە ڕێرەوەکەی خستبووە بن چاودێری خۆیەوە.

وەزیر لە کۆشک وەژوور کەوت. سەردەستەی پاسەوانانی پاشا سڵاوی لێکرد، سـەری بۆ دانەواند ، چاکەتەکەی لێوەرگرت و ئینجا یاوەری کرد بۆ هۆڵە گەورە میناپەندەکە.

میرزا کەبیر جلی سـەروەزیری لەبەردابوو، کڵاوێکی درێژیشـی لەسـەر نابوو. بەردە گەوهەرەکانی دامێنی جلەکانی لەبەر تیشـــکی چلچراکەدا دەدرەوشـانەوە. ئەو بە نائارامی دەسـتی لە پشـت خۆی گرێدابوو، یەک دوو جار ڕاوێچکەی بەنێو هۆڵەکەدا کرد. پشـــیلەکەی پاشـــاش لەگەڵ تارمایی ئەودا دەهات و دەچوو. ناوبەناو وەزیر لەبەردەم ئاوێنەیەکی گەورەدا دەوەسـتا و تەماشـایەکی خۆی دەکرد. بەو کڵاوە قووچە و بەو بەرگەی بەری و بەو ڕیشە ماشوبرنجییە درێژەیەوە، بەو وێنەیە دەچوو کە جارێکیان تابلۆکێشـێک بۆ باوکی ئەوی کێشـابوو. ئەوە زۆر پەسـتی کردبوو کە شـــا زۆر جاران لێیدەگەرا بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە و چاوەڕێ بکا.

هۆڵە میناپەندەکە نموونەی هێز و ڕونـاکی هونەرییـانەی دەســـتکردی ڕۆژهەڵات بوو. دیوارەکانیش بە هەزاران ئاوێنۆکەی بچکۆلە بە شەقڵێکی تەلیسـماوی ڕازابوونەوە. وەزیر بە هەراسـانییەوە سـەیری ئەو هەزاران پارچە ئاوێنەی دەکرد کە خۆی تێدا دەبینییەوە.

هونەرمەندە ناودارەکانی ئێرانی دیوار و بنمیچی هۆڵەکەیان بە دیمەنی جەنگ وێنە کێشـــابوو. ئەوانەش جەنگە گرنگەکانی مێژووی وڵاتی باوک

و باپیران بوو. هەرچی ناوکەوەکەش بوو مافوور و ڕایەخی تایبەت بە ڕەنگی بنەوشـــەیی و زومردی دروســـتکرابوون، وەزیر خۆی خەڵکی فەراهان بوو، ئەو شوێنەی جوانترین مافووری وڵاتی لێدروست دەکران، لە دونیادا وێنەیان نەبوو. ئەو لە بەرانبەر مافوورێکی ئاودامان زێڕ و کەسک و شینێکی تاریکدا چەمایەوە بەدەست هەستی بە وردی داوەکان کرد کە پێی چنرابوو. پشیلەکەی پاشاش خۆی هاویشتە باوەشی وەزیر، وەزیریش پشیلەکەی گرت و دەستی بە پشتی داهێنا.

"وای لەو ملوانکە تەلایەی لە ملتە، هەردەڵێی خاتوونە شازادەی."

ئەوە بوو سـەردەسـتەی ئێشـکچییان پێی ڕاگەیاند کە شـا لە ژوورەکەی خۆی چاوەڕێی دەکا، میرزا کەبیر جارێکی دیکە ســـەیری ئاوێنەکەی کردەوە و بەرەو ژووری وتووێژی شا ڕۆیشت.

شـــا ناســـر بە جلی یەکپۆشـــی ســـەربازی پێشـــوازی لە وەزیر کرد و دەسـتیشـی لەسـەر کالانی شـمشـێرەکەی بوو. کەشـوهەوا وروژاوبوو.

میرزا کەبیر کڵاوەکەی داگرت، کڕنووشی برد و گوتی: "پایەبەرز!"

شـــا ڕووی خۆی لێ وەرگێڕا، بە شـێـوەیەک قســـەی لەگەڵ وەزیر کرد وەک ئەوەی پشتی لەو بێ: "ئەرێ ئەم شتانە چین واتای چی دەگەیەنن؟ وەزیر کەســـانی بازنەکەی ئێمە لێرە لادەبا و کەســـانێکی خزمی خۆی لەجێگەی ئەوان دادەنێ. تۆ بڵێی لەنێو بازنەی ماڵی خۆشـماندا چاودێری بکرێین."

"پایەبەرز، تۆ تووڕەی، بەڵام بەرچاوڕوونییەکەت دروست نییە. تۆ دڵ و مێشـــکی ئەم وڵاتەی. ناپاک و دوژمنان تێدەکۆشـــن لێت نزیک ببنەوە. ئەوە ئەرکی منە کە ئەوان بخەمە دەرەوەی کۆشـــکەکە. ئەوەی من دەیکەم، بۆ تۆیە. من وەزیری تۆم، هەر بۆیە لە بەردەم ئێوەدا هیچ شتێک ناشاردرێتەوە. من هەمیشە بە ڕێز و پێزانینێکی زۆرەوە لەبەردەم باوکت وەسـتابووم. لەبەر ئەوەی ئێوەش پاشـان، پێویسـتە ڕاسـتییەکەت

پێبڵێم. دەرباری پاشـای خوالێخۆشـبوو پڕ بووبوو لە سـیاسـیی گەندەڵ، کە تەنیا و تەنیا بیریان لە بەرژەوەندیی خۆیان دەکردەوە. باوکتان بە دز و دەبەنگ و ئاخوندە خورافیگۆ و سووسەکارانی ئینگلستان و ڕوسیا دەورەدرابوو. من هەموو ئەوانەم لە قافدا گرتن. هەر بۆیە زۆر دوژمنم بۆ خۆم پەیداکردوون، بەڵام تا پاشـا لە پشـتم بێ من باکم بەوان نییە و لێیان ناترسم.

"ئاخر وەزیر داهاتی دایکم و ئەندامانی خانەوادەکەمی کردووەتە نیوە. باشە ئەوانیش دز و هاوپشکی شەڕانگێزەکانن؟"

"من ڕێز و پێزانینم بۆ دایکتـان هەیە، بەڵام بەو خەرجییەی ئەو دەیکـا، دەکرێ من کارخانە دروســـت بکەم تا ڕەعیەتەکەی تۆ بۆ کار بەگەڕ بخەم. هەقە شا ڕاستییەکە بزانێ. کۆشکی دایکت بووەتە لانەی ئەو پیاوە کۆنانەی لە دەسەڵات لادراون."

شا بە پەستییەوە بەسەریدا هاواریکرد: "وەزیر ئاگات لەدەم و قسەکانت بێ، چی دەڵێی."

وەزیریش وەها کەوتەوە قســـە: "من لەبـارەی پایەبەرزەوە، لەبـارەی وڵاتەوە قسەدەکەم، مەبەستم هیچ شتێکی تاکەکەسی و تایبەتمەند نییە."

شا وەڵامی دایەوە: "ئاخر ئێمەش دەنگۆی تەواو پێچەوانە دەبیستین."

"هۆ پایەبەرز، کامە دەنگۆ؟"

"ڕێـک ئەوەی کەوا وەزیر خەریکە بەرەی دەســـەڵات لەبن پێی ئێمە دەربهێنێ."

"پایەبەرز، ئەمانە قســـەی دوژمنەکانی منن. ئەوانە تینووی خوێنی منن. من دەمزانی شـا ئەو پرسـە دەوروژێنێ، هەربۆیە قورئانێکم لەگەڵ خۆم هێناوە."

وەزیر قورئانێکی لە نێو جانتاکەی هێنایەدەر. دەستی ڕاستی لەسەر دانا و گوتی: "من بەم کتێبە ســـوێند دەخۆم، کە ئەوەی دەیکەم هەمووی

لەپێناو شکۆی پاشایە. خۆ ئەگەر ئەمەش بەس نەبێ، ئەوا هەر ئێستا دەست لەکاردەکێشمەوە، با پاشا یەکێکی دیکە بکاتە وەزیر."

شا ئاماژەیەکی بۆ وەزیر کرد کە دەکرێ قورئانەکە هەڵگرێتەوە. دیاربوو قسەکانی وەزیر متمانەی بۆ شا گێڕابووەوە.

شا بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت، کەمێک پەردەکەی تی دا،[14] ئەو پێویستی بە ڕاوێژی وەزیر هەبوو.

ئینجا شا ڕووی قسەی تێکرد: "باوکم لە پاش مەرگ نامەیەکی بۆ بەجێهێشتووم، نامەیەکی زۆر کەسیی و تایبەتە. ئەو لەبارەی هەراتەوە زۆر بەخەم بوو. داوای لێکردووم هەموو شتێک بکەم بۆ ئەوەی شارەکە وەربگرمەوە."

وەزیریش بە هاوڕاییەوە گوتی: "هەرات برینی نیشتمانیمانە، بەڵام خۆ ئێمە لەو هێز و پێگەیەدا نین بریتانییەکان لە هەرات وەدەربنێین. وێرای ئەوەش، ڕۆژگاریش گۆڕاوە. ئەفغانستان بووەتە دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری و ئینگلستانیش هەموو سەرکردەی هۆز و تیرەکانی چەکدار کردوون. لەسەرووی هەمووشیانەوە، لەشکری هیندستانیشیان لەوێ جێگیرکردووە. ئێمە ناتوانین بە هێزی چەک ئەو شارە بگێڕینەوە سەر ئێران."

ئینجا شا پێیگوتەوە: "کەواتە وەزیر ئەوە دەڵێ کە ئێمە دەبێ بۆ بریتانییەکان دەستبەرداری شارە خۆشەویستەکەمان بین؟ خۆی مەبەستەکە خودی شارەکە نییە، بەڵکو شکۆی وڵاتەکەیە. پێم سەیرە کە وەزیر هەست بەو شتە ناکا."

"بە دڵنیاییەوە هەستی پێدەکەم. لێ تەنیا یەک چارەسەر هەیە؛ ڕێگەی دیپلۆماسی. ئێمە دەبێ هەروەک بریتانییەکان مەکرۆ و کەمۆ[15] بین."

---

[14] تیدان: کەمێک کردنەوە. کەمێک هەڵدانەوە

[15] مەکرۆ و کەمۆ: فێڵزان و زۆرزان.

شــا هاتەوە قســە: "هەر پاشــایەک لە ژیانیدا ئەرکێکی لەســەرشــانە. ئەرکەکەی ســەرشــانی منیش گەڕاندنەوەی هەراتە بۆ نێو باوەشــی نیشــتمان. ئێمە دەبێ ئەو کارە بکەین، ئەوســا بەهەر نرخێکەوە بێ. من نامەوێ وەک پاشایەکی ترسنۆک بچمە نێو مێژووەوە."

"منیش لەگەڵ خەمخۆریـت دام، بەڵام خۆ جەنـابی پـایەبەرز ئەوەش دەزانێ کە وڵاتەکەمان لەو ماوەی ئەو هەزار و چوارســەد ســاڵەی ڕابردوودا هەر لە جەنگدا بووە. ئێمە داهێزراوین و شــەنکوکوڕمـان[١٦] لەبەر بڕاوە. بە هەڵگیرســاندنی جەنگێکی دیکە لەبری ئەوە شــکۆ بەدەســتبێنین لەدەســتی دەدەین. بریتانییەکان هەموو هیندســتانیان لەبن دەســتدایە. نەوەک هەر هیندســتان وڵاتی دراوسـێی لای خۆرهەڵاتمانە، بەڵکو ئەوە ئینگلســتانە. ڕوس و بریتانییەکان تۆپ و تفەنگ و چەک و تفاقی جەنگی دیکەیان هەیە کە ئێمە هەر پەیشی پێنابەین. سوپاکەی ئێمە ســوپای دەرۆزەکەرانە. ڕۆڵی ئێرانییەکان لە مەیدانی جەنگدا دەســتی لێشوراوە. جەنگ هەڵگیرساندن لەگەڵ ئەفغانستانی دراوسـێمان، ڕێک ئەو شــتەیە کە ئینگلیزەکان خواخوایانە و دەیانەوێ. ئەمە هێڵێک بە ژێر پلانە نوێخوازییەکانمان دا دێنێ. من زنجیرە پرۆژەیەکم بۆ شــارەکان هەیە..."

شــا بە گومانێکەوە پرســی: "کامە پرۆژە؟ باشــە بۆچی ئێمە هیچی لەبارەوە نازانین؟"

"هەر کاتێک بەرەوپێشــەوە چووین ئەوا بەتەواوی لە وردەکارییەکانی ئاگادار دەکرێیتەوە. ئێســتا ئێمە ســەرقاڵی ســەرکوتکردنەوەی ئەو ڕاپەڕینەین کە لەدژی تۆ ســەریهەڵداوە. ئێمە نەمانـدەزانی کە بەرگرییەکەیان ئەوەندە کات و ئەو هەموو زەحمەتییەی لەشــکرەکەمانی دەوێ. هەر کاتێک لەوە بووینەوە، ئەوسا دەستمان بۆ پرۆژەکانی دیکە

---

[١٦] شەنکوکوڕ: هێزوتین

والا دەبێ. ئیدی شـــتەکان بەم جۆرەن. ئێمە وەهـا بیردەکەینەوە کە پێویســـتە پشـــتی پێشـــخســـتنی بەرهەمە خۆماڵییەکانمان بگرین و گەورەتریان بکەین هەروەک چۆن وڵاتە زلهێزەکان دەیکەن."
"کامە بەرهەمی خۆمان؟"
"بۆ نموونە مافوور، ئاخر لە هەموو جیهاندا وەک ئەوەی ئێمە یان باش نییە. زافەرانەکەمان، کاڤیار، فستەق/پستە، گیاچا، توتن، خورما، هێشتا زۆری دیکەش، کە هەموویان لە جۆری نایابترینیانن. خۆ ئەگەر ئێمە ئەو بەرهەمـانە بە ڕێژەیەکی زۆر بهێنینە کـایە ئەوا دەبێتە یـارمەتیـدانی هەزاران کەس. ئێمە لەگەڵ وەبەرهێنەرانی وڵاتانی ئەورووپی بۆ هاوکاریی ئەم بابەتە لە دانوســـتاندایـن. کانەکانمان بە زێڕ و زیو و مس و بەردە گرانبەهاکانی دیکە دەوڵەمەندن..." وەزیر پشـــوویەکی دا هەناســـەیەکی قووڵی بۆ هەڵکێشایەوە ئینجا لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:
"من هەواڵی باشـــم بۆ شـــا هەیە. بەر لە مردنی باوکتان ئێمە لەگەڵ فرەنســـییەکان لە وتوویژی ئەوەدا بووین ســـوپاکەمان بە پێوەرەکانی هاوچەرخ چاک و نوێ بکەینەوە. ئێمە پێشـنیازەکەمان لە پاریس تاوتوێ کرد. کاردانەوەکەش ئەرێنییە. پاشـەڕۆژ گەشـە. ئێسـتا هەڵگیرسـانی هەر جەنگێک کێفەڕاتە[17] خۆ ئەگەر وتوویژەکان بەر بگرن، ئەوا لەیەککەیشـتن و ڕەشنووسی ڕێککەوتنەکە بۆ تاوتوێکردن دێتە بەردەستی پاشا."
ئینجا شـــا هەڵیدایێ: "هەرگیز فرەنســـییەکان هی باوەڕپێکردن نەبوون. ئەوان زۆر جاران باوکمیان هەڵخەتاند. ئەوان ڕێککەوتنیان لەگەڵ ئێمەدا کرد، لێ هەر دۆســـتە ڕوســـەکانیان گرت، ئیدی وازیان لە بەڵێن و گفتەکانیان هێنا."
"ئەوەی شـــا دەیڵێ زۆر ڕاســـتە، بەڵام فرەنســـا باشـــترین وڵاتی هاوپەیمانمانە. ئەو چەند دژی بریتانیایە ئەوەندەش دوژمنی ڕوســـیایە.

[17] کێفەڕات: کارەسات، کوێرەوەری.

فرەنســـــییەکانیش وەک هەر وڵاتێکی دیکە دەیانەوێ بکەنە هیندســــتان، وڵاتی ئێمەش بۆ ئەو مەبەســــتە کورتترین ڕێگەیە بۆ گەیشــــتنە ئەوێ. ئێمە دەبێ ڕەوتی ســیاســییانەی تایبەت بە خۆمان هەبێ و دۆســتایەتیی هەمووانیش ڕابگرین. فرەنساش باشترین هەڵبژاردەیە.

پێویست ناکا ئێمە هیچ چەکیان لێ بکڕین، ئەوان پێویستە خۆیان کارگە بۆ ئێمە دروســــت بکەن، بۆ ئەوەی خۆمان چەک و فیشــــەکی خۆمان دروســــتبکەین. پیشــــەســــازییەکەی ئەوان فرەلایەنە، ئەوان مۆبیلیات و کاشــــی و فەخفوری. پێســــتە و ئاوریشــــمە بەرهەم دەهێنن. ئەوان وردەکارترین پیشـەزانن لە جیهان و فرەنسییەکان دەزگایەکیان داهێناوە کە بە شــێوەیەکی ســەیروســەمەرە خێرا جلوبەرگ دەدروێ. هەروەها ئەوان دەزگایەکی ڕســتن و چنینی وەهایان هەیە لە ماوەیەکی کورتدا و لەیەک کاتدا بەقەدەر سەد ژن دەڕێسێ و دەچنێ.

دەکرێ ئێمە ئەو هەموو دەزگـا و زانیـارییـانە بهێنینە وڵاتەکەمـان. فرەنســــییەکان ئامادەن کارمان لەگەڵدا بکەن. خۆ گەر خەڵک هەبێ بیانەوێ لە ڕێی ئێرانەوە دەســــتیان بە دەوڵەمەندیی خۆرهەڵاتدا ڕابگا، ئەوا پێویســــتە ئێمە لێی ســــوودمەند بین تا جارێکی دیکە وڵاتەکەمان لەسەر پێی خۆی بوەستێتەوە.

شــا بە بێدەگی گوێدێر بوو. پشــیلەکەی، کە لە پشــت پەردەکەوە خۆی گرمۆڵە کردبوو، هەســــتیکرد گفتوگۆکە کۆتـایی هـاتووە. ئینجـا شــــا ئاماژەیەکی بۆکرد و ئەویش بە بازدانەوە خۆی هاویشتە کۆشی شاوە.





# ٨

# پشیلە شەرمین

کات ئەنگۆرە[18]بوو. شا لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو، خەریکی خوێندنەوەی کتێبێک بوو لەبارەی ناپلیۆن. ئەو زۆر بە ستراتیژییە زیرەکەکەی ئەم پاڵەوانی مەیدانی جەنگە سەرسام بوو. باپیرەکەی ئەو جارێکیان ناپلیۆنی بینیبوو، ئیدی هەمیشە باسی کاریگەریی لسەکانی ئەو قڕاڵەی فەڕەنگی دەکرد. کاتێکیش لە خوێندنەوە ماندوو بوو، چاوەکانی هەڵگلۆفتن و لەوکاتەشدا پەردەدار هاتەژوور.

شا پێی گوت: "قلیانێک."

کابرا قلیانی هێنا. شا چووە ئەو جێگەی کە تایبەت بوو بە شیشەکێشان، نێرگلە دەستکردە جوانەکە کە چواردەورەکەی نەخشێنراوبوو، لەسەر سینییەکی مسین لەوێ لەسەر مافوورەکەی دانرا، هەر لەوێش چەند پارچە نوقڵ و نەباتی شیرین لەسەر مێزێک دانرابوون. پێشخزمەتەکە چادانە گەرمەکەی گواستەوە سەر ئاگردانێکی مسین، لە پاشای پرسی ئاخۆ دەیەوێ بۆی تێکاتەوە.

---

[18] ئەنگورە: ئێوارەیەکی درەنگ، سەروبەندی بولێڵ.

شا گوتی: "حەکایەتخوانەکە!" ئینجا سەرە قلیانەکەی بۆ دەمی برد. زۆر شت هەبوون پێیەوە سەرقاڵ بوو، نەشی دەزانی بۆ باری پێویست بڕوا بە کامیان بکا. تۆبڵێی بڕوا بە دایکی بکا یان بە وەزیرەکەی. بەگوێرەی ڕای دایکی بێ، کابرای وەزیر دژی لەشکرکێشیە بۆ سەر هەرات، گوایە دەستی لەگەڵ بریتانییەکان تێکەڵ کردوە. بەوپێیەش بێ وەزیر هەموو فەرماندەکانی هێزی چەکدار دەگۆڕێ و کەسانێک دادەنێ کە کوێرانە جێگەی بەقای وەزیرن و شوێنکەوتەی ئەون.

ئەوەبوو لە دەرگە درا.

شا گوتی: "وەرە ژوور."

حەکایەتخوانەکە پیاوێک بوو لەسەرووی پەنجا ساڵە. عەبایەکی جیاوازی تایبەتی لەبەردابوو، دامەنی بە داوی ئاوزێڕ نەخشابوو، کڵاوێکیشی لەسەر بوو، بە گوێرەی دابونەریتی حەکایەتخوانەکان بوو کە لە چاخانەکان لەسەری دەنا کاتێ حەکایەت و داستانی دەگێڕایەوە. پیاوەکە لە کتێبە گەورەکەی فیردەوسی، لە شانامەدا، حەکایەت و داستانی لەبارەی پاشا ئێرانییەکانی سەردەمی شکۆمەندیی وڵات بۆ دەگێڕانەوە.

شا گوێی لە حەکایەتی پاشا زاڵ گرت بەو هیوایەی بەڵکو وەڵامێک بۆ پرسیارەکانی خۆی تێدا بدۆزێتەوە. حەکایەتخوانەکە وەهای گێڕایەوە: "شا سام هیوای وابوو کوڕێکی پەیدا ببێ، بەڵکو بتوانێ یارمەتی بدا و قەڵەمڕەوەکەی لە لەیەکترازان و پارچەپارچەبوون بپارێزێ، لێ گەلێ، بەخت شتێکی دیکەی هێنا. ئەو کوڕێکی پەیدابوو، سەرتاپای خۆڵەمێشی و ناوی زاڵیشی بەسەردا برا.

شا لەو "منداڵە دێوەزمەیە" زەندەقی چوو، فەرمانی بە نۆکەرێک کرد بیبات لە چۆڵاییەک بیکوژێ و لە کۆڵی کاتەوە، لێ نۆکەرەکەی منداڵەکەی نەکوشت. لەجیاتی بیکوژێ و ساردی بکاتەوە، بەدزییەوە کۆرپەلەکەی لە ئەشکەوتێکدا دانا. لەوێش، سیمرخ، باڵدارە ئەفسانەیەکە پەیدابوو، زاڵی

هەڵگرت و لەگەڵ خۆی بردییە هێلانەکەی و خواردنی دایێ. ئیدی زاڵ گەورەبوو، بووە خورتێکی ناوازە. شەوێکیان پاشا خەونی بینی، کە زاڵ هێشـــتا ماوە، ئەو لەنێو کێواندا لەگەڵ مەلێکدا دەژی. بە دڵێکی پڕ لە خۆشـــییەوە بەرەو کێوەکان ڕۆیشـــت . قەدەر وایهێنا کوڕەکەی لەوێ دۆزییەوە و هێنایەوە و تاجی پاشایەتیشی لەسەر نا.
دوای یەک دوو ساڵ، زاڵ بەخۆی و لەشکرێکەوە بەرەو کابولستان کشا تا لە دژی دوژمنەکانی بجەنگێ و بەرپەچیان بداتەوە. لەوێ ڕودابەی بینی، ڕودابە کچە هەرە شۆخوشەنگەکەی پاشای کابولستان بوو. ژیان ئەو جووتەی بۆ یەک دانابوو. کەچی لەبەر دوژمنایەتیی کۆنینەی نێوان هەردوو وڵات، خۆشەویستی لەنێو ئەو دوو کەسەدا بڤە بوو. ئەوە بوو شەوێکیان ڕودابە کەزییە ڕەشە درێژەکانی لە پەنجەرەی ژوورەکەی لە قەڵاکەی بەردایەوە خوارێ. زاڵیش بە کەزییەکـانـدا هەڵگەڕا و خۆی گەیاندە هۆدەکەی. لەوێدا یەکێ لە خۆشـــترین شـــەوانی ڕۆهەڵاتیانەی ژیانیان بەسەر برد. لەپاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژان منداڵی پەرجووی ئەوان پەیدابوو. لێ کۆرپەلەکە ئەوەندە گەورە بوو، لەدایکبوونەکەی ئەســـتەم بوو، ڕودابە لەگەڵ مەرگدا لەململانێدابوو. لەپڕ زاڵ بەبیریکەوتەوە، ئاخر کاتی خۆی ســـیمرخ پەڕەمووچەیەکی خۆی دابویێ، بۆ حاڵەتێک بوو ئەگەر زۆر تەنگانە و پێویست بووایە. سیمرخ پەیدا دەبوو. باڵدارەکە بە زاڵی گوت پێویســتە چی بکا: "شـەرابی زۆر دەرخواردی ڕودابە بدا. بەم چەقۆیە زگی ڕوودابە هەڵبدڕە و کۆرپەلەکەی لێ دەربهێنە، پاشـــان برینەکەی بە داوێک بدوورەوە."
ئەم منداڵە پەڕجوویە لەدایک بوو و ناوی لێنرا ڕۆســـتەم. لەدواییدا ئەو شکۆی بۆ ئێران گەڕاندەوە و تاجی پاشایەتییەکەشی پاراست."
شـــا بایی پێویســـت گوێی گرت، لێ نەیدەزانی ئاخۆ تاچەند حەکایەتەکە یارمەتی دەدا تا بەگوێرەی هەڵبژاردنەکەی بڕیاری یەکلاکەرەوە بدا. ئەو

یەک دوو دراوی بۆ حەکایەتخوانەکە فڕێدا. پیاوەکەش پوولەکەی هەڵگرتەوە، کڕنووشێکی بۆ برد و لەوێ ڕۆیشت. شا وازی لە قلیانکێشان هێنا و لە شوێنی خۆی هەڵسا، بەنێو ڕاڕەوکانی کۆشکدا قەدەمی لێدا.
لەوێوە بانگی کرد: شەرمین، هۆ شەرمین، لە کوێی؟"
لێرە و لەوێ دەرگای دەکردەوە و سەری دەبردە ژوور و بە نەرمی بانگی دەکرد: "پشی پشی، پشەکە، شەرمین!"
ئینجا بینی شەرمین لە یەکێ لە پەنجەرە کراوەکان هاتەژوور.
"ئەوە لە کوێ بووی؟ لە دەرەوە بووی؟ تێبگە، بۆت نییە وا بکەی، شتی قۆڕ بکەی." ئەمەی پێگوت و خۆی نەوی کردەوە و دەستی دایە و لە زەوی بەرزی کردەوە.
هەمیشە شەرمین لەگەڵ شادا دەبوو، یاوەرییەکەی لێ خۆش هاتبوو، لەسەر پێخەفیشدا لەگەڵی دەنووست. ناوبەناویش بۆ ماوەیەکی درێژ دەڕۆیشت، بەڵام هەر دەهاتەوە لای شا.
شا بە پشیلەی باوەشییەوە بەنێو داڵانەکانی کۆشکدا پیاسەی دەکرد. "دایکە پێگوتم دەبێ ئاگاداری وەزیر بم، بەڵام خۆ وەزیر باشترین پیاوی ئێمەیە، تۆش پێت وا نییە؟ تۆش ئەوت خۆشدەوێ. دایکم دەڵێ ئەو پیاوە شتێکی لەبن سەردایە، ئەو نەخشەی هەیە تەخت و تاجم لەبن دەست دەربهێنێ. ئەرێ بڕوا بە قسەی دایکم دەکەی؟"
وەزیر زۆر شتی خراپ لەبارەی دایکمەوە دەڵێ.
شەرمین هەر تۆ جێگەی بەقای منی. تۆ شۆفار و سووسەکاری کەس نیت، تۆ تەنیا هی منی، سندوقی ڕازەکانی منی."
کاتێک ئەوان بەرەو لای ناندینەکە ڕۆیشتن، پشیلەکە لە باوەشی خۆی فڕیدا و بەدوای کاباندا دەگەڕا، کە هەمیشە هەر شتی خۆشی دەدایێ.

ئەنگۆرەیەکی درەنگ بوو. شـاش زەوقی نەبوو بە تەنیا بێ. ئیدی چووە نێو حەرەمسەرا.
جاران شـا هەر لە خۆیەوە خۆی بەنێو حەرەمسـەردا نەدەکرد. خواجەباشی، سەرۆکی حەرەمسەراکە پێشەوەختە دەیزانی ئاخۆ پاشا کەی دێتە ئەوێ. ئینجا ژنەکانی ئاگادار دەکردنەوە، خۆیان بۆ پاشـا ئامادە بکەن. لێ ئەم شەوە شا وەهای نەکرد.
خواجەباشی، ئەو کەسەی هەمیشە لای دەرگاکە دادەنیشت و شیشەی دەکێشـا، لە کۆتاییدا بە هێدمەگرتنەوە لە شـوێنی خۆی ڕابوو. بەهەڵەداوان بەدوای قاپقاپەکانی گەڕا. "من لە خزمەت پاشـام، چی دەفەرمووێ؟"
شـا ناسـر هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئاسـایی دەستی لە پشتەوەی خۆی دانـابوو، لێوەژوور حەرەمسـەراکە کەوت. ژنەکانیش، کە چاوەڕێی پاشایان نەدەکرد بە حیتە و پێکەنینەوە بە غار بۆ ژوورەکانیان کشان تا وا نەکەن لەپڕ بە ژێرکراسەوە بیانبینێ.
ژووری ژنەکان بە هێمای تایبەتی بە کەلتووری تایبەتی خۆیانەوە ڕازابووەوە. ژنە ئازەرییەکانی تەواو لەگەڵ ژنەی کوردی جیاواز بوون، هی ژنی کوردیش لە ژنی بلوجی ئایەر بۆو[١٩]. تامی ژنانی کابولی لەگەڵ ئەوانەی خەڵکی هەرات تێکی نەدەکردەوە. زۆر جاریش ئەو ژنانە لە زمان و کەلتووری یەکدی نەدەگەیشـتن. بەڵام ئەوان بە زمانێکی شارستانییانەی فارسی قسەیان دەکرد، بە شانازییەوە ڕەفتاریان دەنواند بۆ ئەوەی بالاتر لە ژنانی ئاسایی دەربکەون.
بە چوونی لەناکاوی پاشـا، جۆرێک لە پاشـاگەردانی لە حەرەمسـەراکە دروست بوو. هەر یەکێکیان دەیەویست خێرا بە خۆی ڕابگا و دەستێک

[١٩] ئایەربوو: جیاواز بوو.

بەخۆیدا بێنێ و ئارایشت بکا تا سەرنجی شا بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، بەڵام خۆ شا مەیلی لە ژن نەبوو.

خواجەباشی لە دووری شاوە بە ئەدەب و ملکەچییەوە بەدوایدا دەڕۆیشت و پاکانەی دەکرد بەوەی ئەو بۆ ئەو هاتنە لەهیکەوەی هیچ ئامادەکاری نەکردووە.

خواجە هەوڵیدا بڵێ: "تۆبڵێی دڵی پایەبەرز کامە ژنی بوێ؟"

کەچی ئەو هیچ وەڵامی وەرنەگرتەوە، چەند شا زیاتر بەنێو حەرەمسەراکەدا دەڕۆیشت، ئەوەندە بەبێ باکی سەیری دەرگای داخراوی ژوورەکانی دەکرد.

ئەوسا خواجەباشی بە وریاییەوە گوتی: "جەنابی پایەبەرز هێشتا لەگەڵ چەند ژنێکدا نەنوستووە."

"لەنێویاندا ژنێکی هەراتی هەیە؟"

"من... ئەز ... جارێ نازانم." خواجەباشی زمانی تێکئالا؛ "ئەگەر پایەبەرز بخوازێ، هەر ئێستا ویدەکەوم."

شا بێدەنگ بوو، ئیدی خواجەش خێرا بەرەو ژووورەکەی خۆی غاریدا.

ئێستا دەرگای ژوورەکان یەک لە دوای یەک کرانەوە، ئەو ژنانەی شا ویستی لەگەڵیان بێ هاتنە بەردەم دەرکە و وەستان.

کاتێک شا بەلایاندا تێپەڕی ژنێک بە دووچاوی ڕەشی پڕ لە پرسیارەوە چرپاندی: "پایەبەرز."

کەچی شا هەر سەریشی بڵند نەکرد.

ژنێکی دیکە، کە جلی ڕەنگاوڕەنگی ڕازاوەی لەبەردابوو گوتی: "پاشا، وای تۆ چەند نازداری."

شا وەڵامی ئەویشی نەدایەوە.

خانمێکی دیکە بە خۆی و پرچی ڕەش و لێوی سوور و نیوە فستانێکەوە گوتی: "خۆ ئەگەر پێشوازی لە پاشا بکەم، ئەوا هەر شیعرەکانی خۆی بۆ دەخوێنمەوە."
شا وەستا. ژنەش شیعراندی:

***جمشید کوجا رفت؟ چە شود تاج و کولامەش؟***
***کو فەری فەرەیدون و کو حیشمەت و جامەش؟***
***ئایا بە کوجایەند کەز ئیشان خەبەری نیست؟***
***کو دەولەتی گرشاسب و گەلەیی سوپامەش؟***
***بیژەن بە کجا ڕەفت گرفتاری چامەش***
***ئایا بە کجایەند کەز ئیشان خەبەری نیست؟***

شا حەزی لە شیعر بوو، خۆێشی دەیهۆنیەوە. هەندێ شەوان کە لەگەڵ ژنەکانی بەسەری دەبردن، بە خۆشییەوە هۆنراوە نوێیەکانی خۆی بۆ دەخوێندنەوە. لەپاڵ شیعریشدا حەزی لە ڕۆژژمێریش بوو، لەوێدا بە دەستخەتی خۆی ڕووداوەکانی بۆ ئایندە هەڵدەگرت.
ژنە یەکێ لە هۆنراوە هەژێنەرەکانی شای خوێندەوە، ئەو هۆنراوەیەی لەبارەی پاشا ئەفسانەییەکانی بەرێ بوو. لە شیعرەکەدا ئەو لە خۆی دەپرسی، تۆ بڵێی ئەوان لە کوێ بن، تەخت و تاجیان لە کوێیە، هێزی ئەفسوناوی خواوەندانەیان لە کوێ ماوە.
شا گەڕایەوە لای ژنەکە، ئەویش یەک دوو هەنگاو چووە پشتەوە تا ڕێگەی شا بدا بچێتە ژوورەکەی. لێ ئەو نەچووە ژوور، بەڵکو لە تەنیشت ژنەکە وەستا و بە پشتەدەستیشی گەمەی لەگەڵ قوڵی چەپەی ژنە کرد. ژنەش زانی ئەوەی کرد دەستی شا توند بەخۆیەوە بگیرسێنێ،

شـــاش بۆی شـــل کرد به هێواشـــی ڕوخســـاری له باوەشـــی ژنه نزیک کردەوە، بۆنی ماڵەکەی کرد و درێژەی به ڕێڕۆیشتنەکەی دا.
شـــا به شـــێوەیەک که دەســـتی خۆی لەپشـــتەوە دانابوون بەدەم قەدەملێدانەوە گەیشته لای ئەو ژنەی به شـەرمنییەوە لەبەردەم دەرکەی هۆدەکەی خۆی وەستابوو. بێدەنگیی ژنه شای وروژاند.
تازە خواجەباشی به خۆی و لیستی ناوی ژنانی حەرەمسەرا گەیشتەوە لای شـــا. کاتێکیش بینی شـــا مەیلی به لای ئەو ژنه شـــەرمنەدا چووە، به سـرتەوە گوتی: "پایەبەرز هێشـــتا ســـەرجێی ئەو خاتوونەی نەکردووە. ئەمەیان له ئازەربایجانەوە هاتووە، خەڵکی ئەو بەشـــەیه که ڕوســـیا داگیری کردووە. هیچ فارسیش نازانێ. ژنه چاوێکی قاوەیی کاڵی هەبوو، جلوبەرگیشـــی هەروەک ژنه دێهاتیەکی ڕوســـی بوو. شـــا دەســـتێکی به کەزییه کەژەکـانی [20] داهێنـا. کەپووی له گەردنی نزیـک کردەوە و بۆنی پێوەکرد. بەدەســـتی ڕاســـتی یەکێ له کەزییەکانی گرت، ســـەری بۆ لای خۆی ڕاکێشـــا دەمی لەســـەر لێوه ســـوورەکانی دانا و گەزتی. ژنه به فارسییەکی شەقوشڕەوە چرپاندی: "ئێس، دەمهێشێ!"
ئینجا شـــا دەســـتی بردە بن فیســـتانەکەی و به بەرخۆی وەنا و توند به چوارچێوەی دەرکەی وەنووســـــاند و ســـــەری بەنێو مەمکەکانییەوە گیرســـاند، به جۆرێک کڵاوە قووچەکەی لەســـەری بەربووە خوار. ئینجا ژنەی بەردا. هەوەسەکەی دامرکایەوە. خەم و پەژارەی بۆ گەڕایەوە.
هەر خێرا خواجەباشی پڕی دایه کڵاوەکە و دایەوە دەستی شا، که یەک دوو هەنگاو دوورکەوتبووەوە.
ئینجا چاوی شا کەوته سەر چاوی ژنێکی گەنج، به خۆی و دوو چاوەی ناوازەی ئەفغانییەوە. جوانیی ئەو ژنه هەر جادووی کەشـــخەیی لێدەڕژا، وەها دیار بوو هەر دەتگوت تازە له حەکایەتی ئەفسـانەیی بەربووەتەوە.

---

[20] کەژە: مووزەرد

باشــه شــا بۆچی پێشــتر ئەو شــۆخەی نەبینیبوو؟ بە چاوی پرســیارەوە تەماشایەکی خواجەباشی کرد.
خواجەباشیش هەڵیدایێ: "ئەمەیان ماوەیەکی درێژە لێرەیە و لەگەڵماندایە، بەڵا هێشــــتا منداڵ بوو. کەچی لەپڕ، بەڵێ لەپڕ هەڵیدا و جوان بوو. پایەبەرز تکایە لێم مەگرە. خۆی دەبووایە پێشـــتر بمبینیبا و بمزانیبایە، ئاخر لێم مەگرە، بە ناشـوکری نەبێ خۆ ئەوەندە ژنە لەو حەرەمســەرایە هەن و لەپڕ دەبینی یەکێکیان وەک گوڵ شکۆفەی کردووە."
"خەڵکی کوێیە؟"
"پایەبەرز، لە هەراتەوە هاتووە." خواجەباشـــی بەم شــێوەیە بە دوودڵی وەڵامی دایەوە، پێدەچوو بۆیە وەهای گوتبێ تا شا بەختەوەر بکا.
کاتێک خواجە ناوی هەراتی لەدەم دەرچوو، شــا تروســکەیەکی گەشــی پەڕیە چاوان.
لە ژنەی پرسی ئاخۆ ناوی چییە.
ژنە لەکاتێکدا ســـەری بەردابووەوە و ســـەیری بەرپێی خۆی دەکرد بەترسەوە گوتی: "جەیحون."
ناوەکە مەیلی بزواند، خۆی ئەمە ناوی ڕوبارێکی ئەفســـووناوی بوو لە ئەفغانســتان، ئەو ناوەی کە ڕودەکی شــاعیر بەر لە هەزار ســاڵ پێشـتر هۆنراوەیەکی لەبارەیەوە نووسیبوو، کە هی لەبیرکردنەوە نییە.
شا ناوقەدی کچەی گرت و بەرەو لای خۆی کێشی کرد.
کیژۆڵەکە بە زاراوەیەکی شیرینی ئەفغانی گوتی: "پایەبەرز ، دەترسم."
ئەم ترسە و ئەم شێوە زاراوەیە هێندەی دیکەی مەیلی شای تیختیخە دا. دەمی ماچ کرد لەسەر سوخمەکەی گەمەی لەگەڵ مەمکەکانی کرد.
کیژە بانگی کرد: "خوایە، لە هانام وەرە."
شا پاڵێکی پێوەنا بۆ نێو هۆدەکەی ڕاکێشا و سوخمەکەی لەبەر داڕنی. مەمکەکانی هاتنەدەر.

"پایەبەرز، هێواش بە لەگەڵم، بوەستە، جارێ کەمێک بوەستە."
خواجەباشی دەرکەی پێوە دایەوە لە پشتی دەرکەوە ڕاوەستا.
نوزە و هـاوارێـک لە ژوورەکەوە هـات، کە بەرەو لای کەیف و زەوق دەیشکاندەوە. حەرەمسەرا کش و مات و ژنەکانیش دەرکەی هۆدەکانیان پێوەدایەوە.

# ٩

# برایەکان

وەزیرەکە لە دوو بەرەوە خەریکی ئەوە بوو بەڵکو مەترسـی برا یاخیبووەکان بەلایەکدا بخا. لە سـەریکەوە بە خۆی و لەشـکرەوە بەربەرەکانێی دەستە و تاقمە چەکدارەکانی سەرکوت دەکرد، لەسەرێکی دیکەشـەوە لە تاران بە تایبەتیش لەگەڵ باڵوێزخانەی بریتانییەکان بەدوای ئەوەدا دەگەڕا، بەڵکو هەرا و هەنگامە و پشێوییەکانی نیشتمان چارەسەربکا. ئەو لەوە دڵنیابوو بریتانییەکان لە لای خۆرهەلاتی ولاتەوە دەستیان لە پشتی برا یاخیبووەکانی پاشا داوە. بۆیە زۆر پێداگرانە لەو بارەیەوە هیچی بۆ دانەنەواندن و لە دانوستاندا لەگەڵ بریتانییەکاندا توند و شێلگیرانە بوو تا ئەوان واز لەدەستلەپشدانی براکانی پاشا بۆ ڕاپەڕین و یاخیبوون بهێنن.

خۆی ئەمە یەکێک بوو لەو شـەڕە کەمانەی وەزیر هەڵیدەسـووڕاند، مەهدولیای دایکی پاشـاش بە تەواوی پشـتی گرتبوو و زانیاریی زۆر

سوودبەخش و گرنگیشی بە وەزیر دابوو. لەشکرکێشی هێزی پاشا بۆ بەسەرداداان و چوونە نێوشارەکان و ئەو ڕەفتار و هەڵوێستە توندەی وەزیر لە بەرانبەر نوێنەرانی هەریەک لە بریتانی و ڕوسەکان کردی، بە ئەنجامی باش گەیشت و سەری بۆ ئەوە کێشا، هەر حەوت برا یاخیبووەکە ببەزن و خۆیان بەدەستەوە بدەن. هەر هەمووشیان بە دەستبەستراوی بۆ تاران ڕاپێچکران.

شا بە بەرگی سەربازییانە و بە دەبدەبەوە[21] لە یەکێ لە بارەگا سەرەکییە سەربازییەکانی دەرەوەی تاران چاوەڕێی وەزیری دەکرد. دەستی چەپەی لەسەر کالانی شمشێرەکەیدا بوو. بە دەستی ڕاستەشی تۆپە قەبە ڕەنگ قاوەییە تۆخەکەی گۆی زەوی دەسووڕاند، لەکاتێدا گوێی بۆ وەزیر شلکردبوو، چۆن باسی شەڕەکە و گرتن و ڕاپێچکردنی براکانی بۆ دەگێڕایەوە.

خۆی ئەوێ ئەو ژوورەبوو کە بڕیارە گرنگەکانی جەنگی لە دەیەکانی ڕابردوودا لێ دەدرا. گۆی زەوییەکەش دیاری ناپلیۆن بوو. شا ناسر لە بەردەم تابلۆیەکی زەیتوونی وەستابوو، تابلۆی باوکی بوو بەخۆی و جلوبەرگی سەربازی بە سواری ئەسپێکی ڕەنگ زیوین. ئەو کڵاوێکی قووچی قیتی لەسەر بوو، شاڵێکی سووری بەسەر چاکەتەکەی بەسەر شان دادابوو، بە با دەشنایەوە. تابلۆکەش وێنەیەکی لەبەرگیراوەی تابلۆیەکی ناپلیۆن بوو، کە بە دەستێکی جڵەوی ئەسپەکەی توند گرتبوو، بە دەستی دیکەشی ئاماژەی بۆ شوێنێکی دوور دەکرد، لەپشت سەریشی پەڵەهەور بوون، ئەسپەکە بە سوارەوە لەسەر پاشوو وەستابوو، هەر بینا هەڵمەت بیا.

---

[21] دەبدەبە: هەراوزەنا

باوکی شا زۆر حەزی لەو تابلۆیە بوو، هەر بۆیە داوای لە سەردەستەی تابلۆکێشـــەکانی کرد، ئەویش بەهەمان ڕەفتار و جووڵەی تابلۆ ماکەکە، نیگارەکەی کێشابیوو.

لە کتێبخانەی کۆشـــکیش کتێبێک داندرابوو، ڕیزێک تـابلۆی ناپلیۆنی تێدابوو. زۆر جاران شـا کتێبەکەی لە چەکمەجەی کتێبخانەکە دەردەهێنا و پەڕەکـانی هەڵدەدانەوە و تێر ســـەیری دەکرد. هەر زوو وەزیر لە ڕۆژگاری کوڕوکاڵێتی ئەوەی فێری شــا کردبوو، کە هەمیشــە ســەیری نموونە بەرز و مەزنەکانی مێژوو بکا تا لە خۆیدا بەرجەستەیان بکا.

وەزیر باســـوخواســـی دانوســـتانەکانی لەگەڵ بریتانییەکان بۆ پاشـــا گێڕایەوە، بەوەی بەڵێنی مســـۆگەری ئەوەشـــی داوە هەڵگەڕاوەکان ســزا نەدرێن.

شـا بە بێزارییەوە لەئاست ئەم باسـوخواسـەی وەزیر هاتەدەنگ: "کەواتە هێشتا هەر ئەوان بڕیار دەدەن."

"بریتـانییەکـان هەموو توانـای خۆیـان بەکاردەهێنن تـا پێگەی خۆیـان لە هیندســـتان ســـەلامەت ڕابگرن. پێویســـتە ئێمەش لەو ڕاســـتییە ڕابێین و لەگەڵیدا هەڵبکەین. ئـاخر ئێمە خەریکی ئەوەین ڕووێکی هـاوچەرخـانە بدەینە وڵاتەکەمان. ناکرێ ڕێ بە پشـــێوی و ئاژاوە بدەین. هەر حەوت برا یاخیبووەکە دەهێنرێنە بەردەم پاشـــا، ئەوان دێن و کڕنووشـــت بۆ دەبەن و داوای لێبوردنت لێدەکەن. پایەبەرزیش لەبەر خـاتری برایەتی لێیان خۆش دەبێ. بەم جۆرە ئارامی بۆ وڵات دەگەڕێتەوە."

شا بە تووڕەییەکەوە گوتی: "برایەتی؟ ئەوانە برای ئێمە نین. ئەو کەسەی لە باوک و دایکی ئێمە نەبێ، برای ئێمە نییە."

"ئەمە باشترین چارەسەری کێشەکەیە. خۆی ئەوە زۆر باش دەبێ ئەگەر قســـە بۆ براکانت بکەی و بەرژەوەندیی وڵاتەکە لە ســـەرووی کاروباری

خانەوادەیی دابنرێ. دایکیشت بە لێخۆشبوون قایل نابێ. لێ خۆت باش ئەوە دەزانی، ئەمەیان بڕیارێکی حەکیمانەیە."

ئەم قسانەی وەزیر تووڕەیی پاشای دامرکاندەوە. ئیدی براکان چۆکی بۆ دادەن و لێی دەپاڕێنەوە بەزەیی پێیاندا بێتەوە.

دوابەدوای ئەم قسانە، وەزیر چاکسازییەکانی خۆی لەبارەی سوپا بۆ پاشا ڕوونکردەوە، پێشتر شا بەڵگە و کاغەزەکانی چاکسازییەکەی تاوتوێکردبوو. فرەنسەییەکان کاری باشیان کردبوو، لێ هێشتا تێچوون و خەرجییەکان زۆر قەبە بوون.

شا هەڵیدایێ و گوتی: "بەڵێ، خۆی ئەم شتە مایەی بایەخ و سەرنجدانمە؛ باشە تێچوونەکەی چۆن دابین بکەین؟ وەزیر هەمیشە کارێکی وەها دەکا کە گەنجینەمان بەتاڵوحەتاڵ بێ."

وەزیریش بە خەندەیەکەوە هاتە وەڵام: "پایەبەرز، خودا وڵاتەکەمانی خۆش دەوێ. ئەم دەوڵەتە زۆر دەوڵەمەندە. دەوڵەمەندیمان لەڕادەبەدەرە. لە هەموو لایەکمان بەردە گەوهەر، زێڕ و زیو وەک کانزایەکی خاو لە ژێر خاکماندا هەن. فرەنسییەکانیش ئەمە دەزانن. ئێمە ئێستا لە گفتوگۆ و ڕاوێژ داین، هەر کاتێک لێی بووینەوە، بەدرێژی پێشنیازەکانمان بە جەنابی پایەبەرز ڕادەگەیەنین."

شا ئەو ڕەفتارەی وەزیری پێ پەسەند بوو.

ئێستا شا میزاجی باشە، ئیدی وەزیریش ئەم هەلەی قۆستەوە تا زیاتر لەگەڵ شا بدوێ و شتی دیکەشی پێ بڵێ: "ئێمە وڵاتێکی جوان، وڵاتێکی دەوڵەمەندمان هەیە، بەڵام لە سەدەکانی ڕابردوودا حکوومەتێکی سەقامگیرمان نەبووە. ئێستاش بەختی ئەم وڵاتە کەوتووەتە دەستی پاشا. خانەوادە دەوڵەمەندەکان هەر بەتەنیا لە خەمی خۆیان دان، هەر بیر لە خۆیان دەکەنەوە. ئەوان ڕێگە لە نەخشە و پلانەکانمان دەگرن. لەکوێ ئێمە بەنیازی دانانی کارخانەیەک بین، ئەوان ڕەتی دەکەنەوە،

تەنانەت دەستبەرداری یەک گەز لە زەویەکانیشیان نابن. کەچی ئەوەندە زەوییان هەیە، ئەوەندە ماڵ و گوندیان هەن، بۆ چییانە؟ ئەوان مامۆستای زمانی فرەنسی لە دەرەوەڕا دەهێنن تا منداڵەکانیان فێرە فرەنسی و زانستی هاوچەرخ بکەن، کەچی جوتیارەکانیش هەر بە نەخوێندەواری و دەبەنگی دەهێڵنەوە.
هەموو هیوای من بە گۆڕانکاری لەسەر جەنابی پایەبەرز ڕۆنراوە. منیش بە هیوای دەستی هاوکاریی بەڕێزتانم."
شا کە بە کشوماتی گوێی لە هەموو قسەکانی وەزیر گرت، بە سەرگێژییەکەوە گوتی: "زۆر جاران وەزیر هەر هەمان ئەم قسانەی بەگوێماندا داوە. ئیدی گوێمان لێبوو. دەتوانی بڕۆیت."

کاتێک پاشا لە کۆتایی ئێوارەکەدا گەیشتەوە کۆشکەکەی خۆی، لە سەردەستەی نۆکەرانی پێیڕاگەیاند، شاژنی دایک لە هۆڵی مینابەندەکەدا چاوەڕێی دەکا.
"دایکە، خێرە بۆچی لێرەی؟"
دوای ئەم پرسیارەی باوەشێکی بە دایکیدا کرد و نێوچاوانی ماچکرد. ئەویش لە حەسرەتان گڕی گرتبوو، یەکسەر تەقییەوە.
"بیستم بەیانی زڕبرا هەڵگەڕاوەکانت دێنە بەردەمت تا لێت بپاڕێنەوە و لێیان خۆش ببی. بۆیە من ئەو هەموو ڕێیەم بڕیوە و هاتوومەتە ئێرە."
پاشاش هەوڵیدا بەرگری لەخۆی بکا: "ئێ خۆ ئەوان برای منن."
"ئێ خۆ پاشا ئاگای لە مێژووی بنەماڵەکەی خۆی هەیە. ئەوانە برای تۆ نین. کاتی خۆی باوکت دەستێکی توندی لە براکانی خۆی وەشاند، باپیرەشت براکانی خۆی سەربڕین، ئاخر ئەوان داوای بەشێکی دەسەڵاتیان دەکرد. هەمووان پێیان سەیرە پاشا پێشوازیی لەو پیاوە قێزەونانە بکا. چیرۆکی براکان لە مێژووی ئێراندا حەکایەتێکی ناسراوە،

هەمیشـــە پاشـــاکان بێبەزەییانە براکانی خۆیانیان لەناوبردوون. هەنووکەش هاتووەتە سەر تۆ، خۆ ئەوان بێ هیچ دوودڵییەک دەستیان بڕوات پشـــتت توند بەزەویدا دەدەن. ئەوە چەندەمین جارە پێت بڵێم، وەزیر کەسێک نییە متمانەی پێبکەی و ریشی خۆتی بدەیتە دەست. تۆ پاشـای، تۆ نوێنەری خواوەندی لەسـەر زەوی نەوەک ئەو. شـتەکە بە تاجەوە پەیوەسـتە و تاجەکەش هەر بەتەنیا هی تۆ نییە، بەڵکو هی ئەوانەشە کە لە دوای ئێمەوە دێن. نابێ بەزەییت هەبێ. پێویستە بەزەیی لە خودا داوابکرێ."

شا هیچ وەڵامی نەدایەوە. ئاخر ئەو قسانەی دایکی بەردی نەرم دەکرد. بەڵام خۆ بەڵگەوبەندەکانی وەزیریش هەروابوون.

دایکی درێژەی بە قسـەکانی دا: "کوڕم گوێبگرە. زڕبراکانت پارە و چەکیان لە بریتانییەکان وەرگرتووە و وەزیریش ژێربەژێر نوێنەرایەتیی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا دەکا. هەر بۆیە هەوڵ دەدا شتەکە چارەسەر بکا. دەی، ئەو برایانەت یەک لەدوای یەک لە دار بدە، ئامۆژگاریی شـێخ ئاغاسـیش هەر ئەمەیە. تۆ پاشـایت. ئەوەی لەسـەرم بوو بیڵێم، گوتم." خانمەکە ئەوەی گوت و پاشای لەنێو گێژاوی گومانەوە بەجێهێشت.

شا لە نێوەڕاستی هۆڵە مینابەندەکەدا وەستابوو. دەستی دایە پشیلەکەی، کە خۆی لە لاقەکانی دەخشـاند. "ئەرێ گوێت لێبوو؟ ئەو خوێنی دەوێ برژێ. ژنان دایکی هەموو کوێرەوەرییەکن، ئەرێ شـەرمین، باشـە من ئێستا چیبکەم؟"

پشیلەکەش سەری بۆ لای کتێبخانەکە بەرزکردەوە.

"باشە بۆ پەنا بۆ حافز نەبەین؟"شا بەدەم ئەم قسەیە دەستی شلکرد تا پشیلەکە لە باوەشی بازبدا و بڕوا. دیوانە شعری شاعیری سەدەکانی نـاوەڕاسـت بۆ هەموو ئێرانییەک بە دارا و نەدارییەوە، لەکاتی



تەنگەتـاوبوون و گرێکوێرەی مەتەڵی ژیـانـدا، پەنـاگە و ڕاوێژ بوو. بەگوێرەی دابونەریت، پاشا بەرگی کتێبەکەی ماچ کرد، چاوی نوقاندن و هەر لە کۆترەوە لاپەڕەیەکی کتێبەکەی لێککردەوە.

*میبارد باران رحمت خودامان*

**خوادایە ببارێنە، بەسەر مندا باران**

**ڕەحمەتی خۆت لەنێو هەوران**

**بارانی لێبووردەی بڕژێنە سەرمان**

**کاتێ بەسەر گۆڕەکەمدا دەبارێ**

**وەک تۆز و گەردی بە با**

**لە گولەگەنمەوە تا کا**

**هەڵسە و ڕاکە، زانیاری ئەودیوی مرۆڤ، بەباکە**

زۆر بێ باوەڕانە جارێکی دیکە پاشـا ئەم شـیعرەی خوێندەوە. حافز بە زمانێکی ڕوون و ڕەوان قسەی لەگەڵ شادا دەکرد. ئەو زۆر ڕاشکاوانە دەربـارەی لێبوردن بوو، تەنـانەت لەبـارەی بـارانی لێبوردەیی و ڕێبەرایەتیی بەزەییپێداهاتنەوە بوو.

ئەو یەک دوو جار بەو کتێبەی دەسـتی بەسـەر ناوکەوی هۆڵەکەدا هات و چوو. تۆ بڵێی بۆ جـارێکی دیکە بۆ زیـاتر دڵنیـابوون، هەوڵێکی دیکە نەداتەوە. خۆ ئەگەر جـارێکی دیکە حـافز لەبـارەی بەزەیی دوا، کەواتە ئەویش دەبێ بـارانی بەزەیی هەڵبڕێژێ. بە ویردێکەوە ئەو دێڕانەی دووبارە خوێندنەوە:

**هەرگیز شیرینی ئەو ئایەتانەم نەبووە**

**ڕووبەڕووی تۆیە حافز**

**دەوێرم سوێند بەو قورئانە بخۆم**

**کە لە سینگتدا هەڵتگرتووە...**

حافز رایەکەی ئەوی نەگۆڕی، بەڵکو ئامۆژگاری شای کرد پەنا بباتە بەر قورئان. ئاخر ئەو زۆر ڕوون و ئاشـــکرا ناوی قورئانی هێنا. دیوانە شـیعرەکەی ماچ کرد و خسـتیەوە سـەر ڕەفەی کتێبان، ئینجا سـەیری قورئانەکەی کرد، لە بەرگێکی کەســک گیرابوو، لەولا بە تەنیا لەســەر مێزێک داندرا بوو. شـا چووە ژووری خواردن و لەبەر شـێرەی[٢٢] زێڕینی بچکۆلە دەستنوێژی هەڵگرت، دەست و چاو و پێی وشککردنەوە، ئینجا گەڕایەوە لای کتێبخـانەکە و دەسـتی دایە قورئـانێ. بە هێواشـی قورئانەکەی لەنێو بەرگەکەی دەرهێنا، ماچێکی لێ کرد و چاوی خۆی نووقاند، بە ڕێزەوە کتێبەکەی لێککردەوە و بە وردی لە سـورەتەکە ورد بووەوە:

**تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ...**
**بشکێن دەستەکانی ئەبولەهەب**
**ئەو خۆی بفەوتێ و نەمێنێ.**
**ماڵوحاڵی، کاروکردەوەی شەفاعەتی بۆ ناکەن.**
**ئەو بەرەو گوڕەی ئاگرێکی لرفاوی دەبرێ.**
**ژنەکەیشی داروپەردوو بۆ خۆشکردنی ئاگرەکە دێنێ.**
**پشتێنێکی لەکەمەر بەستووە، لە ڕیشاڵی داری خورما دروستکراوە.**

ســـورەتەکە لەبارەی مامی پێغەمبەر بوو. ئاخر ئەبولەهەب بە هەموو توانایەکیەوە تێکۆشـا محەمەد و پەیامەکەی لەبەین بەرێ، جارێکیشـیان پیلانێکی وەهای دانا محەمەد بکوژێ.

ڕاوێژی قورئانیش زۆر ڕوون و ئاشـکرا بوو، شـا هەسـتیکرد ئەو بارە قورسەی سەرشانی لاکەوت. ئەو، کتێبەکەی ماچ کردەوە، خستیەوە ناو بەرگەکەی و لەســـەر مێزەکەی خۆی دانـایەوە، ئینجـا بەرەو ژووری

---

[٢٢] شێرە: بەللوعە، حەنەفیەی ئاو.

خواردن ڕۆیشــت. لەوێ دانیشــت و چاوەڕێ بوو تا ســەردەســتەی نۆکەران خواردنی بۆ بێنێ.
لێ گەلۆ، دیســان دوودڵی بەرۆکی پێگرتەوە، ئەرێ باشــە، ئەو گوێ لە کێ بگرێ، گوێ لە حافز بگرێ یان لە قورئان؟ تۆ بڵێی محەمەد بە دەســت و مســتی خۆی مامەکەی خۆی ســزا دابێ؟ ئەو قســەی توندی پێگوت و خواســتی دەســتەکانی بشــکێن، بەڵام خۆ ئەو دەســتەکانی نەشکاندن. ئیدی ئێستا ئەو چی لەو حەوت زڕبرایەی بکا؟
مجێزی خواردنێی نەما. شــا ناســر بەرەو ژووری نوســتنی ڕۆیشــت. کاتیش هی نوســتن نەبوو، هەر بە جلەکانی بەرییەوە خۆی خزاندە نێو پێخەفەکەی.

خەڵکی دەســتەبژێری ئێران و پاشــاکانیان بە شــێوەیەکی ئاســایی دیندارێکی لەخواترســی دڵســۆز نەبوون. ئەوان ڕێزێکی زۆریان بۆ دەقەکانی قورئان هەبوو، بەڵام نەیاندەویســت هیچ پەیوەســتییان بە کەلتووری عەرەبەوە هەبێ، ئاخر هەر عەرەب بوو قەڵەمڕەویی ئێرانیان ڕوخاند. هەر بۆیەشە پەیڕەوی ڕێوڕەسمی عەرەبەکانیان نەدەکرد.
وەزیر بە خۆی نوێژی نەدەکرد و کاتی خۆی پاشاشی لەسەر نوێژکردن ڕانەهێنابوو، لێ ئەوەندەی فێرکردبوو، هەر کاتێک ترس و نائارامی دایبگرێ، هەروەک پاشاکانی دیکە ڕوو بکاتە خوا.
شا لەنێو نوێنەکەی خۆی هەڵسا، دەستوچاوی خۆی شوشت و ڕووی لە مەککە کرد.

بۆ بەیانییەکەی دوای گەرماوکردن چووە هۆڵی مینابەندەکە. چێشــتەنگاوێکی[23] باشــی خوارد، بۆ ماوەیەکیش خۆی بە وێنەکێشــان

---

[23] چێشتەنگاو: نانی بەیانی بەڵام هەندێک بە درەنگەوە.

سەرقاڵ کرد. بۆ ئەوەی جڵەوی دەمارگرژیی خۆی بکا، وێنەی چادانێک[٢٤] و سێوێکی لەسەر تەرازوویەکی میوە کێشا. ڕۆژ لە گوریسێک پتر لە ئاسمان بەرز بووبووەوە. ئینجا بەرگی سەربازییانەی خۆی پۆشی و شمشێرەکەی لە کالان دەرهێنا و لەبەردەم ئاوێنەکەدا هەندێ یاری پێکرد.

پەردەدار هاتەژوور، پێی ڕاگەیاند، هەر حەوت زڕبراکەی لە هۆڵی زێڕین چاوەڕوانی دەکەن. هۆڵی زێڕینیش ئەو شوێنە بوو، کە شا ئاهەنگە گشتییەکانی تێدا دەگێرا و ئەفسەر و بازرگانانی لەوێ دەبینی.

جارێکی دیکە شا لەبەردەم ئاوێنەکەدا چاوێکی لە خۆی کردەوە، بە دەستکێشی سپیی دەستییەوە، دەستێکی بە سمێڵیدا هێنا و بەرەو هۆڵەکە هەنگاوی نا، لەوێ یەک دوو ئەفسەر چاوەڕێیان دەکرد.

گەورە ئەفسەرێک بانگی کرد: "پایەبەرز!"

سەربازێک فیری کردە کەڕەناکەی و شا لێ وە ژووری هۆڵەکە کەوت، چەند ئەفسەرێکیش بە ئاڵای قەڵەمڕەوی ئێرانییەوە یاوەری بوون.

بە دەرگەکردنەوە نیگـایەکی لە حەوت براکەی بڕی، ئەوان لەوێ بە سەری نەوییەوە وەستابوون. بە ئاماژەیەکی گەورە ئەفسەرەکە هەر هەموویان بەیەک جووڵە کڕنوشیان برد وەک نیشانەی سەرشۆڕی سەریان گەیاندە سەر زەوی.

"دەی هەڵستنەوە!" شا وەهای پێگوتن، دەنگیشی نەرم و نیان و دۆستانە بوو، کەشوهەوای توندوڕەقی ژوورەکەشی ڕەواندەوە. ئینجا براکان زاتیان کرد سەیری نێوچاوی پاشا بکەن. ئەویش ڕووی قسەی تێکردن: "ئەمە ساتێکی پیرۆزە. دیسان نیشتمان یەکدەگرێتەوە، ئێمە دڵخۆشین. پێویستە براکانم لەوە تێبگەن، ئەوەی من دەیکەم، ئەوەی ڕاستی بێ لە پێناوی نیشتمانە، ئەمەش ڕێک و پوخت لەگەڵ ئەوە دێتەوە کە پاشاکانی

---

[٢٤] چادان: چایەدان، قۆری چا تێ لێنان.

پێشـــینازمان کردوویانە. ئەو بڕیارەی دراوە، بڕیارێکی خواوەندە بۆ نیشتمان."

ئینجا دەستی درێژ کرد، براکانیشی یەک بەدوای یەکدا هاتن و دەستیان ماچ کرد. پاشـــان چووە لای مێزێک، کە پەڕەمووچەیەکی قاز و کاغەز و مەرەکەبی لەسەر داندرابوو. شا دەستی دایە پەڕەکاغەزەکە و ڕستەیەکی کورتی لەسـەر نووسـی. لەژێر مۆری ئەنگوسـتیلەکەیشـی بە دەسـتخەتی خۆی واژۆی لەســەر کرد. کاغەزەکەشــی لوولدا و هەر بەدەســتی خۆی دایە دەستی گەورە ئەفسەرەکەی خۆی.

هەر هەمان شـــەو براکانی شـــا لە گۆڕەپانی شـــاردا لەدار دران. بۆ بەیانییەکەی خەڵک کە بۆ ناو شـــار و بازاڕ دەهاتن و دەچوون، بینیان تەرمی حەوت کەس بە قنارەکانەوە هەڵواسراون.

کاتێکیش وەزیر هەواڵی لەسـێدارەدانەکەی بیســت، بە پەلەپرووزێ خۆی گەیاندە کۆشکی شا.

لەوێ ئەو وەهای بە شا گوت: "باشە ئەمە چۆن ڕووی دا؟"

شا هیچ وەڵامی نەدایەوە.

"من داوام لێکردی لێبوردننامەیان بۆ دەربکەی. شـــا بەم کردەوەیەی پاشـــاگەردانی لە وڵات پەیدادەکا. هەمووان دەترســـن. ئیدی کەس متمانەمان پێناکا. ئەسـتەم دەبێ بە ئاگر و ئاسـن وڵاتەکە بەیەکەوە گرێ بدەین، ئێمە دەبێ سـیاسـەت بکەین. باشــە بۆچی شــا ئەم ڕێگەیەی لێ هەڵبژارد؟"

"ئێمە پاشـاین! با ئینگلسـتان بەرەو دۆزەخ بڕوا. پێویسـت ناکا پاکانە بۆ هیچ کەسێک بهێنینەوە."

وەزیریش بە تووڕەییەکەوە هاتەوە وەڵام و گوتی: "بەڵام خۆ دەبێ وڵات بەڕێوەببردرێ!"

شـا بە بێدەنگی گەڕایەوە پشـت پەردە و وەزیری بە بێدەسـەڵاتی لەو گۆڕە لە هۆڵی مینابەندەکەدا جێهێڵا.

# ١٠

# تاج، کچەکەی شا

پاشـــا زۆر کیژی هەبوون، بەڵام بچکۆلەکەیان بەناوی تاجولســـەلتەنە جیاواز بوو. ئەو کچە لە ئەنجامی ژنومێردایەتیی ناســـر و فروغ لەدایک بووبوو، فروغیش ژنێکی ســـەر بە هۆزی قاجارەوە بوو، واتە هەمان هۆزی پاشا. فروغ دۆتمامی شا بوو.

دەبووایە فروغ بۆ جێگرتنەوەی پاشـــایەتی کوڕێکی ببێ، تا دواتر لەجێی باوکی ببێتە پاشا. ئاخر ئەو دەیان کوڕی لە ژنەکانی دیکەی هەبوون، لێ بەدەردیان نەدەخوارد. تەنیا کوڕێک لە فروغ دەبووە شازادەی جێنشین. کەچی بەخت وەهای هێنا فروغ دووگیان نەبێ. هەموو پزیشـــکەکانی دەربـار ژنەیـان پشـــکنی و داودەرمـانیـان بۆ دیـاریکرد، هەموو ژنە بەتەمەنەکانی هۆزەکە لەدوای نوێژەکانیاندا دوعایان بۆ دەکرد و بۆی دەپـاڕانەوە بەڵکو خوا کوڕێکی پێببەخشـــێ. هەموو ژنە حەکیمەکـانی قەڵەمڕەوییەکە لەهەر چوارکەناری وڵاتەکە بۆیان هەبوو سەری فروغ لە

ژوورەکەی خۆیدا بدەن و داودەرمانی بدەنێ، تا لە کۆتاییدا دوو گیان بوو. بەم هەواڵە شـــادمانییەکە زۆر گەورە بوو. لێ لەبری ئەوەی ژنە کوڕێکی ببێ، کچێکی بوو، کە ناوی تاجولسەڵتەنە(تاج سوڵتان)یان لێنا.
بەر لەدایکبوونی تاج، هیوایەک پەیدابوو، بۆیە زوو زوو پاشـــا لەســـەر جێی فروغ دەبینرا، کەچی بۆ مـایەی بێ هیواییەکی زۆر، هەر جـارێک فروغ دووگیان دەبوو، هەر کیژی دەبوون. دوای لەدایکبوونی دوا کیژی، چیدی پاشا نەچووە لای ژنەکەی و سەرجێیی لەگەڵدا نەکرد.
فروغیش سکاڵای بردە لای شـاژنی دایک، ئەویش بانگی پاشـای کرد و گوێی ڕاکێشا: "ئەرێ چۆن دەوێری؟ نابێ بۆ دامرکانەوەی ئارەزووەکانی پەنـا بۆ ژنێکی دیکە ببەی. فروغ دەبێ مشـــووری ئەوەت بۆ بخوا جێنشینێکت بۆ دروست بکا."
شاش پێیگوتەوە: "من چی دی ناتوانم و چیدی ناچمە لای."
"چیدی ناتوانم مانای چییە؟"
"ناتوانم جارێکی دیکە لەگەڵیدا بخەوم."
دایکیشی بەسەریدا هاواریکرد: "بۆ نا؟"
شاش دانیپێدانا: "من پیاوم و چیدی لەگەڵ فروغم پێناکرێ
"بیری لێبکەوە، دەنـا کوڕەکـانی دیکەت کە لە ژنەکـانی دیکەن لێـت هەڵدەگەڕێنەوە و ڕادەپەڕن و وڵاتەکەش پارچەپارچە دەکەن."
"ئەمە هیچ لە شـــتەکە ناگۆڕێ. خۆ ئەگەر من نەتوانم، کەواتە ناکرێ و نابێ. بە دڵنیاییەوە دیارە ئەمە خواستی خودایە. ئێمە نابێ ناشوکور بین، بەڵکو ژیان وەها بخوازێ کچەکەمان، تاج سـوڵتان کوڕێک بۆ ئێمە بێنێتە سەر دونیایێ."
"شا پێویستە واز لەم قسە پڕوپووچانە بێنێ، ئەو هێشتا منداڵە."

"ئەگەر هەراش بوو هاتە سەر گەیی مێردی[٢٥] لە هۆزەکەی خۆمانەوە پیاوێکی شایستەی بۆ دەبینینەوە. خۆ خۆت باش ئاگاداری مێژووی، ئەم جۆرە شتانە هەر ڕوودەدەن. باوکمان نموونەیەکی باش بوو، ئەو خۆی کوڕی پاشای کۆچکردووی پێش خۆی نەبوو، نەخێر، ئەو کوڕی برای پاشای پێش خۆی بوو. ئێمە مێژووی ڕازەکانی ژیان نازانین، دەی با جارێ ئارام بگرین و چاوەڕێ بکەین."

ئیدی لەوکاتەوە وەک پارچە گەوهەرێکی هەرە بایەخدار سەیری تاج دەکرا.

هەمیشە، هەر کاتێک شا غەمگین بووبووایە، حەزی لێبوو کیژەکەی ببینێ. نەریتەکە وەها بوو، ئەو ژنەی جێگری پاشای دەهێنایە سەر دونیا لەنێو حەرەمسەردا نەژیێ. منداڵەکانی ئەو وەک شازادە دەبینران. لەبەر ئەوەی تاج سوڵتان کچە خۆشەویستەکەی پاشا بوو، ئەویش هەرگیز جێگرەوەیەکی بۆ پاشا نەهێنایە سەر دونیا، ئیدی ئەو لە حەرەمسەرا و لەگەڵ ژن و منداڵەکانی دیکەدا نەدەژیا. ئەو خانوویێکی بە جیای بۆ خۆی هەبوو، لەوێ کەسە بەتەمەنەکانی جێبڕوای شا ئاگایان لێدەبوو، مشووریان وەها دەخوارد وەک ئەوەی شاژنێک بێ بۆ خۆی.

ئەو شەوەی هەر حەوت زڕبرای پاشا لە داردران، شا خەوی لێنەدەکەوت. مۆتەکەی بۆ پەیدابوو، خەونی بینی خۆیشی بە پەتی قنارەوە کراوە و (با)ش یاری بە لاشەکەی دەکا. هەرچەندە ئەویش هەڵواسراو بوو، لێ هێشتا هەر لە ژیاندا مابوو. لە بەرزی قنارەکەیەوە دەیبینی خەڵکێکی زۆر لە خوارەوە سەیری دەکەن. هەوڵیدا هاوار بکا تا بەهانایەوە بچن، لێ ئەو پەتەی لە ملی کرابوو، توند قوڕگی گرتبوو، دەنگی پێ دەرنەدەهات و دەستیشی لەپشتەوە بەسترابوونەوە.

---

[٢٥] سەر گەیی مێردی: واتە کاتی مێردکردن

خەریکبوو گیانی لە جەســـتەی دەربچێ. ئینجا هەموو هێزوگوڕی خۆی کۆکردەوە تا قاچەکانی بجوولێنێ، بەم شـێوەیە وەها نیشـان بدا هێشـتا هەر ماوە، بەڵام بەم هەل و تەکاندانە تا دەهات پەتەکەی لە ئەســـتۆدا کشتتر دەبوو. بە ئارەقەدەردانێک، بە حەپەساوییەوە لەخەو رابوو.

بە سەرگێژییەکەوە بەرەو ئەو مێزە ڕۆیشت، کە گۆزەیەکی ئاوی لەسەر داندرابوو، دوو پەرداخ ئاوی لەسەریەک خواردنەوە و پەردەکەشی لادا، هێشـــتا دەرەوە هەر تاریک بوو. وردە وردە ئەو هەســـتەی بۆ هات، نەدەبووایە برایەکـانی لەدار بـدا، ئـاخر ئەم کردەوەیەی لە هەموو وڵاتەکەوە هەر دوژمنی بۆ پەیدا دەکا، خواش لەسەر ئەم کارە بە توندی سزای دەدا. هەق بوو گوێی لە وەزیرەکەی خۆی بگرتبایە.

شا دەستی دایە چرایەک و پشیلەکەش بە پرسنییەوە بەدوایدا. بەڕێگەی دەرکەی پشتەوە خۆی گەیاندە باخچەکە، کە دەیبردە سەر ئەو شوێنەی کیژە خۆشـــەویســـتەکەی لێ نوسـتبوو. بە وریاییەوە دەرکەی کردەوە، دەستبەجێ قەرەواشە پیرەکەی کچەکەی بێدار بووەوە.

شـا بە چرپەیەکەوە: "ئەو نوســتووە؟ زۆر باشــە، لێیگەڕێ با بنوێ. من لێرە پاڵدەدەمەوە."

دەستبەجێ ژنە قەرەواشە بەتەمەنەکە دۆشەکێکی بۆ پاشا لە تەنیشت پێخەفی کچەکەی لەسەر ناوکەوەکە ڕاخست.

شا لەسەر دۆشەکەکە ڕاکشا و پشیلەکەش خۆی لە پێیەکانی هەڵسووی.

پیرەژنەکەش پەتۆیەکی بەسەرردادان و دەرکەی لەسەر پێوەدانەوە.

بەیانی، ســـەر لە زوو پیرەژنە قەرەواشـــەکە بە هێواشـــی و وریاییەوە کچەی لە خەو هەڵساند: "پاشا لێرە ڕازاوە."

کیژەش بە خەندەیەکەوە لەنێو نوێنەکەی خۆیەوە هەڵسا و خۆی لەگەڵ پاشادا خستە ناوجێ. ئینجا چرپاندییەوە گوێی باوکی: "**بۆنژور مسیێ**."[26] پاشاش چاوی کردنەوە و باوەشی تێوەرێنا![27] **بۆنژوور، مەدام**...بەیانیت باش خاتوون، چۆنی کیژەکەم؟"[28]

"باوکە، باشم."

"ئەرێ فرەنسی باش فێربووی؟"

"بەڵێ، باوکە."

"ئەدی ئینگلیزی؟"

"باوکە شا، باش نا."

"بۆچی نا؟"

"هەر کاتێک پزیشکەکەت ببینم بە فرەنسی لەگەڵم دەدوێ، منیش پێم خۆش و سەیرە، بەڵام ئینگلیزیم پێ خۆش نییە."

"خۆش بێ و خۆش نەبێ: فێری زمانەکەیان ببە، چونکە پێویستت پێی دەبێ."

کچەکە کەوتە هەڵرشتنی دەردەدڵ: "ئاخر باوکە، زمانەکە زەحمەتە."

"دەی بەسە، هەڵسە، پشتم بشێلە." ئەمەی گوت و خۆی وەرسووڕاندە سەر زگ.

کیژەش چووە سەر پشتی، بە پێیەکانی شان و ملی شێلان.

شا بە خۆشییەکەوە گوتی: "ئای چەند خۆشە کچێکی وەهات هەبێ."

---

[26] نووسەر دەستەواژەکەی هەر بە فرەنسی نووسیوە bonjour monsieur (بەیانیت باش ئاغا) وەرگێڕ.

[27] باوەشی تێوەرێنا: باوەشی پێداکرد، لە ئامێزی گرت.

[28] ئەم دێڕە وەڵامەی پاشاشی هەر بە فرەنسی نووسیوە: bonjour, madame, comment ca va ma fille,

کیژەش بە خەنــدەوە پێیگوتەوە: "بەڵام خۆ تۆ هەرچی زۆرە کچی زۆروزەوەندت[29] هەن."

"ئەمە وا نییە. ئەوانە کیژی ژنەکانی منن. من هەر تەنیا یەک کچم هەیە، ئەویش تۆی، کیژەکانی دیکە هی من نین."

تاج سوڵتانیش بەسەرسوڕمانەوە گوتی: "بۆچی هی تۆ نین؟"

شا وەڵامی دایەوە: "چونکە من تەنیا تۆم خۆشدەوێ."

"چما؟"

"تۆ هەم نۆبەرەی و هەم لە خوێن و گۆشــتی منی. با ڕازێکی خۆمت بۆ بدرکێنم. دەمەوێ قانون وەها بگونجێنم، دواتر تۆ ببیتە پاشا."

"پاشا؟"

"لەدواییدا تۆ جێگەی من دەگریتەوە."

"بەڵام خۆ ئەوە ناکرێ، ئاخر من کیژم."

"خۆ کاتریناى شـــاژنی ڕوســـیاش هەر ژنە، کەچی بووەتە یەکێ لە دەسەڵاتدارترین ژن. من دەمەوێ تۆش بەهێز و دەسەڵات بی."

"باشە بۆ ئەوەی پێویستە چی بزانم؟"

"هەموو شتت فێردەکەین."

هەر بەڕاستیش شا دەیەویست مشووری دەرسەکانی بخوا.

"بەڵام خۆ من نامەوێ ببمە شاژن، دەکرێ تۆ داوا لە دایکم بکەی."

"دایکت؟ باشە حەوجەمان بەو چییە؟"

"هەروەها داپیرەشم؟ خۆ ئەو لەمێژە شاژنە؟"

"بەڵام بەرلەوەی بمرم ئەوان هەموویان نەماون."

کچەکە بە نارازیبوونێکەوە پێیگوتەوە: "تۆ نابێ بەم شێوە باسی دایکم و دایکی خۆت بکەی."

---

[29] زوروزەوەند: زۆر زۆر.



شـــــا بێـدەنـگ بوو. ئەوەی پێ خۆش بوو کە کیژۆڵەکە ڕای خۆی ناشارێتەوە و یەکسەر بەڵێکۆ نییە.

پیرەژنە قەرەواشـــەکە لەو دەمەدا هاتەژوور و بە شـــای گوت: "ڕۆژ هەڵاتووە و دونیا ڕوناکە."

ئینجا شـــا کیژەکەی ماچکرد و بە دڵخۆشـــییەوە لەوێ دەرچوو. بە تێلا پاشاییەکەی دەستی و بە بن دارەگەورەکاندا گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، لەوێش پەردەدارەکە نانی سبەینێی بۆ ئامادەکردبوو.




# تۆپەکە

پرسی لەداردانی زڕبراکان، وەزیری ڕاهەژاند. ئاخر تا دەهات کاریگەریی مەهدولیا لەسەر شادا پتر و پتر دەبوو. دەبووایە وەزیر ئەو پشێوی و ئاژاوەیەی دوای لەداردانەکە کپ بکاتەوە، بەڵام خۆ دەبووایە ئەو بۆ ئەو پاشایەی لە شکان نەدەهات وریا و لەسەر پێ بووایە. خواستی سەرلەنوێ گرتنەوەی هەراتیش هێشتا هەر لە کەڵکەڵەی سەریدا مابوو.

وەزیر خۆی دەرسی ژیانی بە پاشا دابوو، فێرە زۆر شتی کردبوو، بەڵام ئەو بایی ئەوەندە ئەزموونی هەبوو تا بزانێ هەندێ خاسیەتی منداڵ هەن بە دەرسودەور ڕاست نابنەوە. پاشاش کوڕی باوکی خۆی بوو، لاواز بوو. لەهەمان کاتیشدا کوڕی دایکیشی بوو، ئەوەی بەدوای تۆڵەدا دەگەڕا، هەڵوەدای دەسەڵات و سەرڕەق و خۆگر بوو. هەروەها ئەو نەوەی باپیرەگەورەی خۆیبوو، ئەو کەسەی جەنگاوەرێکی ئازا بوو، ئەو پیاوە توندوبەندەی خواستی ئەو بۆ خۆی قانون بوو.

خۆی دەبوایە وەزیرەکە لەگەڵ ئەو هەموو دژبەرییانەی هەڵبکردبایە. ئاخر خۆ شتەکە هەر بە شاوە پەیوەست نەبوو، هەروەها بە وەزیریش بەند نەبوو، بەڵکو پرسەکە پرسی وڵاتەکە بوو. خۆی دەیزانی لەوانەیە لەپێناو هزرە نموونەییەکانی پێویست بکا سەری خۆیشی لەپێناودا دابنێ. لەونێوەشدا شا پرس و خەمی ئەوی لەسەری دەرهێنابوو. ئەو بە خۆشی و ڕابواردنی خۆی سەرقاڵ بوو، چوو بۆ ڕاووشکار. بەردەوامیش تۆپەکەی خۆی لەگەڵ خۆی دەبرد و دەیتەقاند. ئەو تۆپەی ناپلیۆن دوای لەدایکبوونی بۆ شازادەی ناردبوو.

جارێکیان قڕاڵی فرەنسی نامەیەکی بۆ باوکی شا نووسیبوو:

*لە بۆناپارت، قڕاڵی فرەنسییەکانەوە بۆ شای ئێران.*

*سڵاوی منتان لێبێ.*

*تۆ پاشای وڵاتێکی خانەدانی، کە خواوەند ئاماژەی پێداوە و ڕەحمەتی خۆی بەسەردا ڕژاندووە.*

*دانیشتوانی ئێران خاوەن دڵێکی گەورەن، زیرەک و ئازان، ئەوان شایستەی پاشایەکی باشن، بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین، کە پاشاکانی پێش ئێوە باکیان بە وڵاتەکە نەبوو، پشتگوێیان خستبوو.*

*من لێرەوە یەکێ لە باشترین ڕاوێژکارەکانت بۆ دەنێرم، هەڵگری بیرۆکە و هەستی منە بۆ وڵاتەکەت تا بە شێوەیەکی تایبەتی پەیامەکەت پێ ڕابگەیەنێ. تۆش دەتوانی هەرچییەکت بوێ پێی ڕابگەیەنی. ئەو کەسێکە باوەڕپێکراوی ئێمەیە.*

*خوا ئێران بپارێزێ.*

*ناپلیۆن بۆناپارت.*

ئەوەی بریتانی و ڕوس لە ئێرانیان دەویست، شتێکی نوێ نەبوو. ناپلیۆن بۆناپارتیش دەیەویست لە ڕێی ئێرانەوە بەرەو هیندستان بڕوا، هەوڵیدەدا لە پشــــت ســـەری ڕوس و بریتانییەکانەوە لەگەڵ باوکی پاشـــا هاوپەیمانییێکی نوێ پێکبهێنێ. پاشاکەش دەیەویست بە پاڵپشتیی ناپلیۆن لەشکرکێشی بکاتە سەر ڕوسیا و ئەو بەشە داگیرکراوەی ئازەربایجان لەبن دەستـی ڕوس دەربهێنێتەوە. لێ ناپلیۆن ناچارکرا واز لەخەونەکانی بهێنێ. ئەو بەڵێنەکانی نەگەیاندنە ســەر و ئێرانی بۆ بەختی خۆی جێهێڵا. ڕوســیاش ســزای پاشــای ئێرانی دا، پارچەیەکی دیکەشــی لە وڵاتەکە داگیرکرد.

هەنووکەش ناپلیۆن بووەتە مێژوو، بەڵام خۆ ئەو شتێکی هەستپێکراوی بۆ ئێران لەپاش خۆی بەجێهێشــتبوو. لە میانەی لەشــکرکێشــییەکەی بۆ ســەر ڕوســیا، دیارییەکی بۆ ئێران ناردبوو. دیارییەکەش تۆپێک بوو، بۆ شـــازادەی جێگرەوە دیارییەکی جیاواز و ناوازە بوو. نمایشـــی تۆپەکە نوێ بوو، تۆپەکە دوو تایەشـی هەبوو، ناپلیۆنیش ناوی شـازادەی جێگر و چەکی پاشایەتی بە زێڕ لەسەر تۆپەکە هەڵکۆڵیبوو. زۆر لە نەخشە و نیگارەکانی ســەر تۆپەکە دەردەســت ئەوەیان ڕووندەکردەوە کە تۆپەکە تۆپێکی شازادەییە.

کاتێکیش ناسر وەک شـازادەی جێنشـین چووە تەورێز، تۆپەکەی لەگەڵ خۆی بردبووە ئەوێ. لە دوای مردنی باوکیشـــی تۆپەکەی لەگەڵ خۆی هێنایەوە تاران. تۆپەکە هەمیشــە بە چەورکراوی لە کۆشـکی گوڵسـتاندا ئامادە و تەیار بوو. هەرکاتێک کۆشـــکەکەی بەجێهێشـــتبا، تۆپی تایبنی لەگەڵ خۆی دەبرد.

شا بانگی پشیلەکەی کرد: "شەرمین؟"

پشیلەکەش لەسەر کورسییەکە بازی دا.

"دەی بابچین بەسەر گردەکان بکەوین." بەسەر پەیژەکاندا هەناسەیەکی قووڵی دایەوە، ئینجا گوتی: "چەند نایابە، بۆنی دارەکان بکەی، وای لەو بۆنە!"
سێ لە نۆکەران خزمەتی پشیلەکەیان دەکرد و هەڵیانگرت و خستیانە نێو سەبەتەیەک، کە بە قوماشێکی تەنکی سپی داپۆشرابوو. بە ئەسپاییەوە سەبەتەکەیان لەسەر پشتی گالیسکەیەک دانا، کە تایبەت بۆ پشیلەکە ڕێکخرابوو.

شا خۆی هەڵدایە سەر زینی ئەسپەکەی و سەیری کرد ئاخۆ تۆپەکەی ئامادەیە. بە کارامەییەوە ئاوزینگی بەرەو دەروازە لێدا و بەدوایدا چەندین پاسەوان دەڕۆیشتن. دوو ئەسپ تۆپەکەیان بە گالیسکەیەکی ڕازاوەوە ڕادەکێشا. پاشاش بە زەوق و کەیفخۆش دیاربوو.
کاتێک شا لە کۆشکەکە تێپەڕی، دەهۆڵ و شەیپور جاڕیان دا، تا شارەکە بزانێ شا لە گەشت و گەڕانی خۆی دایە. بۆ ماوەیەکی درێژ بوو، ئەوە یەکەمین جاری بوو، شا خۆی نیشانی گەلەکەی بدا. ئەو دوای لەداردانی براکانی دەترسا نەوەک پشێوی وڵات بگرێتەوە، بەڵام هەردوای تەنیا یەک هەوڵی هەرانانەوە، وڵات کش و مات و ئارام بووەوە. ئەویش وەهای لێکدایەوە، گوایە ڕەعیەتەکەی لەگەڵ بڕیارەکەی هاوڕا بوونە. ئەو بۆ ڕاووشکار بەرەو گردەکانی دەرەوە هەڵکشا، بەڵام خۆ لە ڕێگەیدا دەبووایە بەلای چەند شەقامێکی جەنجاڵدا بڕوا.
دەهۆڵژەنەکان توندتر دەیانکوتا و جاڕچییەکانیش هاواریان دەکرد: "بەکوێرایی چاوی دوژمن، پاشامان وا لە ڕێیە!"
خەڵکەکەش دەیانەویست نیگایەک لە پشیلەکەی شا ببڕن، ئەوەی لەنێو کەژاوەی پاشا دایە. تا دەشهات ڕێوبانەکە جەنجاڵتر دەبوو، ئەو ئەفسەرانەی پێشقەرەوڵ و سەرقافڵە بوون، دەبوایە خەڵکەکەیان بە

نووکی نیزه و شـمشـێرەکانیان بەملا و ئەولادا بردبا تا شـا بەنێویاندا تێبپەڕێ. بەسـەدان کەسـی نابینا، کەم ئەندام و ناکام لە کۆلان و بازاڕدا سـوالیـان دەکرد و بەدوای لەتەنـانێکدا دەگەڕان، ئیدی لەو بۆنـانەدا هەولیاندەدا بایی ئەوەندە لە شا نزیک ببنەوە و هاواربکەن: *"جاوید شاه، جاوید شاه*، بژی شا، بژی شا."

سـەربازەکانیش بە قۆنداغەتفەنگ لە سـوالکەرەکانیان دەدا، بەلام ئەوان کە خۆیان لەبەر پێی ئەسـپەکان بەردەدایەوە بە گریانەوە دەسـتیان بەرزدەکردەوە و لە شا دەپاڕانەوە.

شا لەناخی دلییەوە هەستی بە بەدبەختی کرد. دواجار لای دایکی سکالا و دەردەلی خۆی هەلڕشـت: "هێشـتا ئەو هەسـتەمان هەر ماوە، کە ئێمە پاشای کاروانێکی بێ کۆتایی خەلکی هەژار و نەدارین."

دایکیشی وەها دلی دەدایەوە: "بەلێ تۆ وەها سکالا دەکەی، بەلام ئەوەی دەیلێی ڕاست نییە. "تۆ پاشای ولاتێکی ناوازەی. پاشای ئەو شازادانەی کە لە کۆشکی جادووییدا دەژین، پاشای ژنە ئێرانییە ئەفسووناوییەکانی، پاشای بازرگانە دەولەمەندەکانی مافوور و ڕایەخی شارە جوانەکانمانی، هەروەها پاشـای هەزاران ئاغای گوند و دێهاتی. لەبیریشـت نەچێ، تۆ پاشای دایکتی."

پاشـا دەسـتی بۆ کیسـە دراوەکەی تەنیشـتی برد و پارەی بەسـەر خەلکەکەدا پڕژاند. خەلکەکیش هەر قەراپەسـتانێ و تێکقژقزانیان[30] بوو تا دەستیان بگاتە دراوە هەلڕێژراوەکان.

ئاپۆراکە هەر هاواری دەکرد: *"جاوید شاه، جاوید شاه."*

دیسـان شـا ناسـر مشـتێک دراوی بۆ فڕێدان. دەهۆلەکانیش توندتر لێیان دەدا و شـەیپوریش پتر دەیفیڕاند. شـا هەروەک ناپلیۆن لەسـەر پشـتی ئەسـپەکەی، بەدەسـت ئاماژەی بۆ شـوێنێکی دوور کرد. سـوارەکانیش

[30] تێکقژقزان: لە نێو ئاپۆرا و گوڕدەمی خەلکدا خۆبردنەپێش.

دەوروخولی شـایان دا، ئینجا بە وێلغە و گورگەلۆقە[31] لە دەروازەی شـار ڕوەو گردەکە تێیانتەقاند.
یەکەوڕاستیش شا بۆ دامێنی گردەکە ملی لێنا، بەدوای ڕاوی کەڵەکێویدا گەڕا. لەو کاتەی ئەسپەکەت لە غاردایە، ئەوا تەقەکردن لە نێچیر یەکێ لە هونەرەکانی ئەسپسوارانی ئێرانی بوو. هیچ کەسێک وەک سەربازێکی ئێرانی نەیدەتوانی بە چەشنی ئەو نیشانەکەی بپێکێ. هەر لە ڕۆژگاری منداڵییەوە ئەو پاشایەی دوارۆژ فێرە ئەو کارامەییە کرابوو. شازادە بچکۆلەکان لەکاتی ڕاووشکاردا مەشقیان لەسەر ئەو شتە دەکرد و شـا ناسریش لەوەدا باڵادەست بوو. ئەوە بەوە دڵخۆش و بەختەوەر دەبوو کاتێ لەسەر پشتی ئەسپەکەی نیشانەی لە ئاژەڵێک دەگرت و دەیپێکا.
شـا حەزی لە شەڕیش بوو. کە هەندێک جار لە کۆشکدا دەترسا، لەبەرەکانی شەڕ ئازایەتی دەنواند. ئەو لەگەڵ باوکیدا لە یەک دوو جەنگدا بەشداری کردبوو. یەکەمین جار ئەوان لە بەرانبەر ڕوسەکاندا شکان. جاری دووەمیش جەنگی هەرات بوو، بە کێفەڕاتێک کۆتاییپێهات، بریتانییەکان دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت و دایانە دەست سەرۆک هۆزەکانی ئەفغانی.
هەمووانیش دەیانزانی، پاشـای کۆن لە داخ و خەفەتی لەدەستدانی هەراتەوە سەری نایەوە.

ڕاووشکار شتێک بوو لە خوێنی شادا بوو. پێشان ئەو لە دارستانی لای تەورێزەوە بەدوای ڕاوی شێر و پڵنگەوە بوو. هەنووکەش دەبێ بە بزنەکێوی لای تاران قایل بێ. لەکاتێکدا ئەو ڕاوەدووی ئاژەڵەکانی دەنا، پاسەوانەکانی تۆپە خۆشەویستەکەیان بۆ سەر گردەکە ڕادەکێشا.

[31] وێلگە و گولگەلۆقە: دوو جۆرە غاردانی ڕەوتی ئەسپن.

کاتێک ئەوان دەگەیشتنە ئەوێ، عەریفێک توند بە دەهۆڵەکەی دەکێشا، ئاماژەبوو بەوەی هەموو شتێک ئامادەیە. ئینجا شا بەرەو گردەکە لێیدەخوڕی، بە ئارەقە دەردانەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەی بازیدەدا و باڵەکانی لە هەوا لەیەک دەکردنەوە: "ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر تایبەتە، هەست بە باشی دەکەم."

ئەو دەستێکی لەسەر لوولەی تۆپەکە دا. یەکێ لە پاسەوانەکان گوللەتۆپێکی دایەدەست، پاشاش گوللەتۆپەکەی ماچکرد و خستییە لوولەکە و نیشانەی لە گردێکی بەرانبەری گرت. مەشخەڵێکیان ڕادەست کرد تا گوللەکە گڕ بدا. ئینجا بە هەردوو دەستی گوێی خۆی گرتن و هەندێک خۆی نەوی کرد. ئیدی تۆپەکە تەقی.

دوای ئەوەی حەفت تۆپی تەقاندن، ئەفسەرێک پاڵتۆیەکی بەسەر شان و ملی پاشادا دا تا سەرمای نەبێ. ئاوێکی شیرینی گوڵیشیان گەیاندێ.

پاشان بەرەو مێزێک ڕۆیشت کە پڕ لە دەفری شیرنەمەنیی خۆش خۆش بوو، دەنکە خورمای بە کاکڵەگوێز و کێکی بادەم، زەنجەفیلی کوڵاو بە نویشک و هەنگوینەوە.

کاتێکیش نۆکەرەکان نێچیرەکەیان لەسەر پشتی گالیسکەکە دانا، ئینجا شا خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکەی و شۆڕیکردەوە. ئەو خوازیار بوو بۆ ماوەیەکی درێژتر بمێنێتەوە، بەڵام لە چاوی پشیلەکەی ئەوەی بینی وەها باشترە بگەڕێتەوە ماڵێ.



## ١٢



# چاكسازييەكان

وەزیر ڕێنمایی بۆ حوکمڕانانی ناوچە خۆجێیەکانی وڵات دەرکرد، بەڵکو کارخانەی مافوورچنین دروست بکەن تا بە سەدان مافوورچن بتوانن تێیدا کار بکەن. لە باکووری وڵات و لەسەر کەناری دەریای لەزوێن کارخانەی بچووک بچووک هەبوون، وەستایانە کاڤیاریان دەخستە نێو گۆزە و سندوقەوە بۆ بەشەکانی دیکەی وڵاتیان دەنارد.

وەزیر خەونی وەهای دەبینی بەڵکو بێکارەکانی وڵاتەکەی هەروەک کرێکارانی بریتانی لە کارخانەکاندا کاربکەن و بژێوی ژیانیان پێ پەیدا بکەن. خەونی ئەو وابوو بەڵکو کچانی وڵاتەکەی هەروەک کچانی مۆسکۆیی بچنە قوتابخانە. ئەو لەبەر ئەو هەموو پلان و پرۆژەی کارانەی لە کەللەی دابوو، خەوی لێنەدەکەوت.

لەو نێوەشدا نەیار و ناحەزەکانی، هەموو هەوڵ و کۆششی خۆیان دەدا تا بەرە لەبن پێی دەربێنن.

ئەویش نەخشە و پلانەکانی خۆی بۆ ڕاوێژکارەکانی ڕوونکردەوە.

"من زۆر خەونم بۆ ئەم وڵاتە هەیە، بەڵام خۆ نابێ لەیەک کاتدا زۆر شتمان بوێ." ئەمە قسەی ئەو بوو لە کۆبوونەوەی دەستەی وەزیراندا بە وەزیرێکی گەنجی گوتبوو. "ئێوە لە دەرەوەی وڵات خوێندووتانە، بەڵام وڵاتەکەمان ڕوسیا نییە، چ جای ئینگلستان. لەو وڵاتانەش دەسەڵات ناوەندە. لای ئێمە زۆرینەی خەڵک لە لادێکاندا دەژین. ئێمەش دەسەڵاتمان بەسەر دێهاتەکاندا ناشکێ، لەوێ هەموو شتێک لەبن دەستی ئاغا گەورەکانە، ئەوانەی خاوەنی زەویی زۆروزەوەندی ناوچەکانن."
(تەقی خان)ی وەزیر لە دانیشتنەکەدا هەڵیدایێ و گوتی: "ئێمە واقیعەکە فەرامۆش ناکەین، هەر بۆیە چاومان هەر لەسەر شارە گەورەکانە، نەخاسمە تاران."
"ڕاست و دروست تاران سەخترین شوێنە، لە هەموو لایەکەوە لە ڕێی چین و توێژی دەستەبژێرەوە ڕێگەمان لێدەگیرێ، ئەوانەی خاوەن زەویوزارەکانن."
ئەمیر، ڕاوێژکارە گەنجەکەی وەزیریش وەها هاتە قسە: "ئێمەش پێویستە هەروەک وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بۆ لەیەکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان تێبکۆشین. ئەمەش مەرجە بۆ ئەوەی نەخشەکانمان جێبەجێ بکەین."
وەزیریش بە مەبەستەوە هەڵیدایێ و گوتی: "نابێ ئێمە دەستەبژێرەکە بترسێنین. پێویستە زۆر وریابین، بە ئەسپایی هەنگاوەکانمان بهاوێژین. لەوبارەیەوە قسە لەگەڵ شادا دەکەم."

کارتی براوەی ئێران دەوڵەمەندیی کانە زێڕەکان، ڕۆبیان، بەردەگەوهەر، بەهارات و ئەو شتانەش بوون، کە پورتوگالییەکان ناویان لێنابوو "زێڕی ڕەش". هەر زوو پێشتر پورتوگالییەکان هەوڵیاندابوو ئەو زێڕە ڕەشەی کانە نەوتەکان دەستبەسەردابگرن و بەکاری بهێنن. بۆ بەدەستهێنانی

ئەو شلە جادووییە، لێرە و لەوێ لە ئێراندا کونیان لە جەرگی خاکەکەیدا کردبوو. لێ هێشتا هیچیان نەدۆزیبووەوە.

پاشـــان کابرایەکی گەڕیدەی ســـەرچڵ لە نیوزێیلاندەوە بەناوی ن. ر دارسی هات. گەشتە گەڕان و سوڕانەکانی بۆ شتدۆزینەوە، کە لە لایەن کارخانەیەکی داودەرمانەوە پشـــتگیری دارایی کرا، دەســـتپێکرد. بەدوای ســـەرچاوەی نەوتدا گەڕا، بەڵام ئەوەی دۆزییەوە شـــتێکی وەها نەبوو بایەخدار بێ. ئەوە بوو ئەویش بەدەســـتی بەتاڵ گەڕایەوە وڵاتەکەی خۆی.

لەو ســـەردەمدا کەســـانێک لە وڵاتەکانی ڕۆژئاواوە بەهای نەوتی ژێرخاکیان بۆ دەرکەوت. لە دۆڵێک لە ویلایەتی پەنسلڤانیای ئەمریکییەوە، بیرێکی حەڤدە مەتریان لێدابوو. بۆ ڕۆژی پاشـــتر بینییان چاڵەکە پڕ لە نەوتی خاو بووە.

لە پارێزگا باشـــوورییەکەی ئێرانیش، شـــلەیەکی ڕەش بە بەردەوامی لە زەوییەوە هەڵـــدەقوڵا. خەڵکی خۆجێیی ئەوێ نـــاویـــان لێنـــابوو قیر، شتەکەیان لەناو سندوقدا هەڵدەگرت و تایەی گالیسکەکانیان پێ سـواق دەدا.

گەورە وەزیریش داوای لە فرەنســـییەکان کردبوو، بەڵکو کارخانەیان بۆ دابمەزرێنن، چاکســـازییان لە ڕیزەکانی ســـوپا بۆ بکەن و زانســـتیان بۆ بخەنە نێو قوتابخانەکان. چەند دانەیەکیشـــیان لە لایەن فرەنســـییەکانەوە ئەرکێکی ژێربەژێریـــان پێســـپێردرابوو، بەڵکو بەدوای نەوتی خـــاودا بگەڕێن. فرەنســـییەکان داوای ئەوەیان لە دەســـەڵاتدارانی ئێرانی کرد، لەپاڵ چالاکیی کانەکان ڕێگەیـان پێبدرێ زەویش هەڵبکەنن و بەدوای نەوتدا بگەڕێن. هێشـــتا کەس نەیدەزانی ئاخۆ لەژێر ئەو چینە زەوییەی ئەوێدا گەورەترین کانی نەوتی دونیای تێدایە.

هەڵکەندنی زەوی بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشــت، هەر بۆیە فرەنســییەکان وازیـان لەو چـالاکییە لاوەکییەی خۆیـان هێنـا. کـاتێکیش لە یەکێک لە بیرەکاندا ئەو مادە ڕەشــەیان بینی دەبریقایەوە، دیســان دەســتیان بە هەڵکەندن و لێدانی بیری زیاتر کردەوە. لەمەشیان ئەنجامێکی بەهاداریان دەســتنەکەوت. ئەو نەوتەی لە بیرەکە هەڵێنجایان لە بەرمیلی داردا و بە کەشتی بۆ فرەنسایان گواستەوە. بەڵێ ئەوە شتێک بوو، بەڵام ئەوەنەبوو بەوەی چاوەڕوانی لێدەکرا بەراورد بکرێ.

وەزیر داوای زۆری کرد، بەڵام ئەو چاوتێبڕینە لە گەنجینەی ژێر زەوی و دەرفەتی دەســەڵاتشــکان بەســەر ســوپای ئێران هی ئەوە نەبوو فرەنســییەکان مرخی لێخۆش نەکەن. ئیدی ئەوان بە مەرجەکان قایل بوون و وەزیریش لیســتێکی بەو پڕۆژانە ئـامـادەکرد، کە دەبووایە جێبەجێبکرێن:
دامەزرانـدنی قوتـابخـانەی تەکنیکی لە هەریەک لە تـاران و تەورێز و ئیسفەهان.
کتێبخانەیەکی گەورە بە کتێبی زانستی نوێ لەبارەی تەلارسازیی شار و ڕێگاوبانی تاران.
دامەزراندنی قوتابخانەیەکی کانی کانزایی لە شاری سوڵتانئاباد.
دامەزراندنی پێنج چاپخانە لە پێنج شاری گەورەدا.
دامەزرانـدنی نەخۆشــخـانەیەک لە تـاران و نۆڕینگەیەکی ژنـانەش لە تەورێز.
قوتابخانەی سەرەتایی جۆراوجۆر لە تاران. کارخانەی پێستە و پێڵاو.
دامەزراندنی پەیمانگایەکی سەربازی بۆ گەنجان.
دامەزراندنی قوتابخانە بۆ وێنە و تابلۆکێشان.
دامەزاندنی دوو هەتیوخانە لە تاران.

کارخانەی شـوشـەوات، ڕسـتن و چنین، کاغەز. مس، شـەکر و توتن لە شارە جیاجیاکانی وڵات.
کارخانەیەکی بچووکی هۆیەکانی گواستنەوە بۆ دروستکردنی گالیسکە و کەژاوە لە شیراز.
لە کۆتاییشـدا دروسـتکردنی کارخانەیەک بۆ دروسـتکردنی کاتژمێری قەبارە مامناوەند بۆ شارەکان.
لەسـەرووی هەمووشـیانەوە داواکاریی گەورە و قورسـی ئەوەبوو چەندین کارگەی دروسـتکردنی تۆپ لە تاران و ئیسـفەهان و شـیراز دروست بکرێ، بۆ ئەوەی سوپا چیدی پشت بە تۆپی ڕوسی و بریتانی نەبەستێ.

وەزیر پەی بەوە بردبوو، ئەو هەموو نەخشـە و پلانانە هی ئەوە نین لە ماوەی ژیانی ئەودا ببنە ڕاسـتی و جێبەجێ بکرێن. ئەوەشـی دەزانی ئاستەنگی گەورە گەورەی دێنە سەر ڕێگا، بەڵام خۆ هەر بەلای کەمییەوە حەزی دەکرد تا لە ژیاندا ماوە سێ لەو خەونانەی بێنەدی.
یەکەمینیان خوازیاربوو هەموو منداڵانی وڵاتەکەی لە دژی دەرد و بەڵای سـووریژە بکوترێن. بۆ ئەوەی ئەو دەردەکوێرەی تا دەهات ژمارەکەی زیاتر دەبوو، بوەستێ.
خەونی دووەمیشـی قوتابخانەیەکی تەکنیکی بۆ منداڵە بەهرەدارەکان دابمەزرێ، کە دواتر دەبێتە پاڵپشتێک بۆ نەخشەی پەرەپێدانی وڵات.
سـێیەمین خەونیشـی خەونێکی زۆر تایبەت و کەسـی بوو. کاتێک ئەو هێشـتا لە تافی لاویدا دابوو، ئەو لای باوکی کاریدەکرد، باوکیشـی لە کابینەی پاشای پێشوو وەزیر بوو، دواتر هەر خۆیشی بووە سەرۆوەزیر. لەدوای گەشتێک بۆ ڕوسیا، باوکەکە باسی ئەو کاتژمێرانەی بۆ کردبوو، کە لە سـەرووی کڵێسـاکانەوە جێگیر کرابوون. زەنگی ئەو کاتژمێرانە

ئەوەندە دەنگدەرەوە بوو، هەموو شــارەکە گوێی لێدەبوو. پاشــان ئەمیر کەبیر وەک پیاوێکی گەنج بە نێردەیەک چووە مۆســـکۆ. لە کرەملین بۆ یەکەمین جار گوێی لە زەنگی ئەو کاتژمێرانە بوو، کە پێشتر باوکی بۆی باس کردبوو. ئیدی لە خۆشـیی هەسـتکردن بە کات دڵی گەش بوو. ئەو کاتەی دەڕوا و ئەوکاتەش کە تێپەڕیوە.

ئەو خەونەی تـافی لاوێتی هیچ کـات لێی جیـانەدەبووەوە. ئەو لەگەڵ ئەندازیاری کارخانەی کاتژمێری فەرەنســـی قســـەی کردبوو، چۆن لە هەموو شــارە گەورەکانی وەک تاران، ئیسـفەهان، شـیراز و تەورێزدا چەندین کاتژمێری وەها دابندرێ. هەڵبەتە نەشـــدەکرا ئەو کاتژمێرانە لەســـەر منــارەی مزگەوتەکــانــدا قــایم بکرێن. چونکە زیــاتر بە لاساییکردنەوەی کڵێساکان دەچوون و خەڵک تووڕە دەبوو.

بۆیە وەزیر بیریکردەوە، بەڵکو کـاتژمێرە گەورەکـان لە گۆڕەپـانی گەورەی بازاڕی شــارە گەورەکانی وڵاتدا دابندرێن. هەندێک جار کە بۆ بـازاڕ دەچوو، لە خەیـاڵی خۆیـدا گوێی لە دەنگی زەنگی کـاتژمێرەکـان دەبووەوە.

کات لە وڵاتەکەی ئەودا چەقی بەســتبوو، لە شـوێنی خۆی وەســتا بوو. ئەویش دەیەویست بە دەنگی ئەو کاتژمێرانە بیجووڵێنێ.

ئەو خەونەکەی بەڕادان دا. ئەنـدازیـارەکە کـارخـانەیەک دادەمەزرێنێ و هەر کـاتیش وڵات ئـارام بووەوە، خەریکی دامەزرانـدنی کـاتژمێرەکـان دەبن.

خۆی کێشـــەیەکی گەورە هەبوو، ڕەوتی پەرەســـەندنەکانی خاوکردەوە؛ وڵاتەکە ڕێگەوبانی باشـی نەبوون، هەموویان ڕێچکەی باریکی ئەسـپ و گالیســکەکان بوون، کە ســروشــتکردانە هەبوون. خۆی هەر ئەو وڵاتە گەورەترین ڕێگەوبـانی لە دونیـادا هەبوو، بەڵام ڕۆژگـار و جەنگی

بەردەوام و داشـــۆران و ڕنـوو و چەنـی[٣٢] زەوی، شــــوێنەواری کوێرکردبوونەوە.
بۆ ئەوەی لە لایەن خەڵکەکەوە خۆیان خۆشـــەویســـت بکەن و ئەو دڵەڕاوکێ و نـائـارامییەی لە هەبوونی فرەنســـییەکـان پەیـدابووبوو برەوێنێتەوە، وەزیر داوای لە ڕوســـەکان کرد، ڕێگاوبان بۆ شـــارەکانی وڵات لێبدەن و شـــارەکان هەموویان بە تۆڕێکی ڕێگاوبانەوە بەیەکەوە ببەستنەوە.
ئەوانیش دەســـتبەجێ خســـتنەڕووەکەیان پەســـەندکرد و دەســـتیان بەکارکرد. لەم کارەشـــدا ئەوان شـــارە باشـــوورییەکانی وڵاتیان پشـتگوێخسـت و ڕوویان کردە ئەو شـارانەی لە سـنووری هیندسـتانەوە نزیکن و ڕێگاوبانی ئەوێیان لێدا.
وەزیر ئەمەی دەزانی، بەڵام هەستیکرد، ئەوەی ڕوسەکان دەیکەن هێشتا بۆ وڵاتەکە باشە.
هەبوونی ڕوســـەکـان لە بەشـــی بـاکوور و ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئێران تیختیخەی بێزاری و هەسـتیاریی بریتانییەکانی دا. ئەوان هیچ شـتیان لە وەزیر هەڵنەکراند، کە دەیەویسـت دۆسـتایەتیی هەموو لایەک بکا. ئاخر ئەو ســـەر بە ماڵباتێکیش بوو نەدەکردرا. ئیدی بریتانییەکان بڕیاریاندا چـاوەڕێ بکەن. ئەوان هۆز و تیرەکـانی ئەفغـانیـان پڕچەک کردن و ڕاوێژکاری ســـەربازییان بۆ ناردن بۆ ئەوەی لە کاتی پێویســـتدا و لە حاڵەتی لەشکرکێشیی ڕوسیا بۆ سەر هیندستان، بەرپەچی بدەنەوە.
بریتـانییەکـان لەهەمـان کـاتیشـــدا لە ڕێی پیـاوە نزیکەکـانیـان زیـاتر مەهـدولیـایـان لە دژی وەزیر هـانـدەدا. ئەوان هەواڵی هەڵبەســـتراوی

---

[٣٢] ڕنوو دارمانی کەویە بەفری گەورە. چەنی: دارمانی زەوی بەهۆی بنکۆڵبوونی بە ئاو.

وەهایان دەنارد، گوایە لە نەخشە و پلانی وەزیر دایە وردە وردە پێگە و پایەی شا ناسر لاواز بکا.

مەهدولیا بە ئاخهەڵکێشــانێکەوە لای شــێخ ئاغاســی، ئەو پیاوەی لە هەمووان زیاتر جێگەی باوەڕی بوو، وەها دەردەدڵی خۆی دەکرد: "ئەو کوێرانە هەر کاغەزێک وەزیر لەبەردەمیدا بنێ، یەکسەر بێ چەندوچوون واژۆی دەکا."

شێخ ئاغاسی ئەشهەدوویەکی بۆ لێدەدا: "هەر بەڕاستی ئەم شتە مایەی خەملێخواردنە. زۆری پێناچی شا دەســەلاتی خۆی لەدەست دەدا، بۆیە ئەرکی تۆیە شا ڕاست بکەیتەوە."

مەهدولیاش گوتی: "من دەچم و قســەی لەگەڵدا دەکەم. بەڵێ پێویســتە بچم و پێی بڵێم."

# ١٣

# ڕوس

زۆر جاران شـا بەنێو وڵاتدا گەشـتی دەکرد، هەمیشـە لەو گەشـتانەیدا دەسـتەیەک لە ژنەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد. لە میانەی ئەو گەشـتانەیدا خۆی نیشـانی ڕەعیەتەکەی دەدا تا ئەوانیش پێی سـەرسـام بن و کڕنووشـی بۆ ببەن و لەو شـوێنانەی سـەردانیشـی دەکرد پێشـوازیی لە حوکمڕانە خۆجێیەکـانی دەکرد. بە بەردەوامیش سـەردانی قەڵا و سەربازگەکانی دەکرد.

هەندێک جار حەزی لێبوو پاشا نەبووبا. ئاخر ئیرەیی بەو پیاوانە دەبرد، کە سـەربەسـتانە بەسـەر جادە و کۆڵاناندا گوزەریان دەکرد و بۆ بازاڕ جرتوفرتیـان بوو، یـان هەروەک جوتیـارێـک لە زەوییەکەی خەریکی کاروباری کشتیاری خۆی بوو.

ناوبەناویش هەڵوەدای ئەوە بوو نوێنەرانی توێژ و چین و فەرمانڕەواکانی خۆی ببینێ. بەردەوامیش مێوانی لە ئاخوند و کەسـانی ڕوحانی دەهاتن. شتێکی سـوودبەخش بوو پەیوەندیی لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە ببەستێ.

ئەو ئاخوندانەی سەر بە دەربار بوون، لە جەژنەکاندا پێشوازی لێدەکردن. هەروەک ڕۆژە پیرۆزەکانی مەولود و کۆچی دوایی پێغەمبەر و ئیمامی عەلی.
کاتێکیش ئەو ئاخوندانە دەهاتن، ئەوا هەمیشە سەردەستەی نۆکەران دەیبردنە هۆڵە زێرینەکە و لەوێ ماوەیەکی درێژ چاوەڕێیان دەکرد تا شا دەهاتە لایان. لەکاتی چاوەڕوانیشدا بە چەندین جۆرە شیرنەمەنی فەرمووویان لێدەکرا و خزمەت دەکران. کاتێکیش شا دەهاتە هۆڵەکە، ئاخوندەکان لەبەری هەڵدەستان و یەک لەدوای یەک دەستیان ماچ دەکرد. ئینجا شا کورتە دوانێکی دەدا، پاشان لەگەڵ چەند کەسێکیان دەمەتەقێیەکی کورتی دەکرد، داوای لێدەکردن بۆ ئەو و بۆ شانشینەکە دوعا بکەن، ئەوسا چەند دراوێکی تایبەتی ئاڵتونی دەدانێ، ئەو دراوەی پەیکەری خۆی لەسەر هەڵکەنرابوو، بەم شێوەیە خواحافیزی لێدەکردن. پاشان بەگوێی شەرمیندا دەیچرپاند: "ئەمانە کۆمەڵێک گەلحۆن، بۆنی کشپلی بزنیان لێدێ."

زۆر جاران شا لە کۆشکەکەیدا هەستی بە بێزاری دەکرد، چونکە پێیوابوو ڕۆژەکان هەروەک خۆیانن و دووبارە دەبنەوە. ئەو دەیخوێندەوە، دەینووسی، لە بەڵگەنامەکانی وەزیر ڕادەما و لێی دەکۆڵینەوە، نانی دەخوارد، هەندێ شەوی لە حەرەمسەرادا بەسەردەبرد. ئەو پیاسەی دروروودرێژی دەکردن و سەری دایکی دەدا ناوبەناویش چاودێریی کیژەکەی دەکرد ئاخۆ لە دەرس و دەورەکانی خۆیدا چۆنە و بە باشی فێربووە.
ئەمڕۆ چووە خانووە جوانەکەی پشت قۆپەنی دارەکان، ئەوەی وەک تەختەڕەشەکە ناسراوە. ئەو ژوورەی بە کەلوپەلی فەرەنسی ڕاخراوە، لە هەموو لایەکی خانووەکەش تابلۆی ناوازەی هونەرمەندی بەناوبانگی

ئێرانی کەمالولمولک هەڵواسرابوون. لەسەر دیوارەکەش تەختەڕەشێک داندرابوو کە بە فرەنسی "tableau noir" پێیدەگوترا. ئەمەش بۆ قوتابییەکان بوو، هەمووشیان منداڵی شا بوون، لەو ژنانەی سەر بە هۆزەکەی ئەو بوون، بۆ ئەو منداڵانە کورسی داندرابوون.
باوکی شا کاتی خۆی ئەو ژوورەی دروستکردبوو، کوڕەکەشی، واتە شا ناسر لەوێ لە کاتی منداڵییدا فرەنسی و بیرکاری لەسەر دەستی خانمە مامۆستایەکی بەتەمەنی فرەنسی، فێربووبوو. هەمیشەش مامۆستاکە یان خانمێکی فرەنسی، ژنی یەکێک لە کارمەندەکانی باڵوێزخانەی فرەنسی، یان خانمێک دەبوو، کە تایبەت لە فرەنساوە بۆ مەبەستی فێرکردنی شازادە هێنرابوو.
هەنووکەش تاج سوڵتان دەرسی زمانی فرەنسی لەو ژوورە لەسەر دەستی خانمە مامۆستایەکی فرەنسی دەخوێند. ئەو مامۆستایە نوێ بوو، وەزیر لە ڕێی باڵوێزخانەی فرەنسی ڕێکیخستبوو. ئەو خانمە مامۆستایە لە خانووەکانی فرەنسییەکان دەژیا و ڕۆژانە یەک دوو سەعات دەرسی بە تاج دەگوت.
لە پەنجەرەکەوە شا بینی خانمە مامۆستا لە بەردەم تەختەڕەشەکە وەستاوە. ئەو خۆی هەم نوێ و هەم شەرمنیش بوو. شا دودڵ بوو لەوێ ئاخۆ بچێتە ژوور یان نا. هەر زوو پشیلەکە لەباوەشی پاشا بازی دا و خۆی گەیاندە لای تاج.
مامۆستاکەش تا لای دەرکە هات. سڵاوی لە پاشا کرد و کەمێک ئەژنۆکانی بۆ چەماندنەوە. ئینجا خۆی لە دەرکەکە کەلی[٣٣]گرد بەڵکو شا بێتە ژوور، بەلام ئەو هەر لە شوێنەکەی خۆی مایەوە.
پاشا بە فرەنسی پرسی: "ئەرێ هەمووشتێک بەپێی خواست باش دەڕوا؟"

---

[٣٣] خۆ کەلیکردن: خۆلادان، خۆ تیدان.

مامۆستاش وەلامی دایەوە: "بەڵێ، بەدڵنیاییەوە."
ئینجا گوتی: "زۆر باشە. ئەریّ تاج قوتابیەکی باشە؟"
"هەڵبەت. ئەو زیرەکە، بیرتیژە، هەر بەڕاستی شازادەیە."
"تۆ ئێمەت دڵخۆش کرد. هەر شتێکت بویّ، دەکریّ ئاگادارمان بکەیتەوە."
ئینجا شا بانگی شەرمینی کردەوە و بەنێو باخەکەدا قەدەمی لێدا.

بۆ ئەوەی بەسەر پەستی و بێزاریی خۆیدا زاڵ بیّ، هەندێک جار تابلۆی دەکێشـــا. کەمالولمولک کاتی خۆی مامۆســـتای بوو. ســـاڵێکی رەبەق نیگارکێشـەکە هەموو ڕۆژێک دەهاتە کۆشـک بۆ ئەوەی نیگاری پاشـا لە هۆڵی مینابەندەکەدا بکێشـێ. کەمالولمولک بنمیچ و دیوارەکانی هۆڵەکەی بەو ســـەدان پارچە ئاوێنە لە تابلۆیەکدا بە قســـە هێنابوو. هەروەها ئەو پەردە کەسکە قورسە گەورەیەی، هەموو جارێک شا بەوێدا دەردەکەوت و هەر بەوێشـــدا دەڕۆیشـــت و لەبەرچاو ون دەبوو، لەگەڵ مافووری قورمزی تۆخ و شـــینی تاریک لەگەڵ ئەو ســـەدان بیچمۆکانەی ســـەر مافوورەکان لەسەر تابلۆکەی ئەودا بە جوانترین شێوە ڕەنگی کردبوون، وای لێکردبوون لەگەڵ مرۆ بکەونە قســـە. لە دواییشـــدا مامۆســـتای نیگارکێش کورسییە شاهانەکەشی لەیاد نەکردبوو.
پاشـــاش لە تابلۆکان ڕادەما و تەکنیکی جۆربەجۆریان لیّ فێر دەبوو، کە هەر بەخۆیشـــی بە چاک یان بە خراپ لە تـابلۆکـانی خۆی بەکـاری دەهێنان.
خۆی هەر دەبووایە شـــەرمین یەکەمین نموونەی تـابلۆی بووایە. بە تابلۆکەشـی زۆر دڵشـاد بوو، ڕاسـتەوخۆ بە دیواری ژووری کارکردنی هەڵواسیبوو.
جارێکی دیکە هەوڵیدا لە تابلۆیەکدا تاج ســـوڵتانی تێدا ڕەنگ بداتەوە، بەلام تێیدا سەرنەکەوت.

کەمالولمولک لەبارەی تابلۆکەوە بە شـــای گوت: "ئەمە کارێک نییە لێی بێهیوا بیت. شا دوو ئاڵنگاری لەپێشن، کە هی بەسەردازاڵبوون نین."
"یەکەمیان ئەوەیە، کیژەکەت تا بڵێی جوان و نازدارە. دووهەمیشیان ئەو هیچ چرچ و لۆچی لە سـەر دەموچاودا نین. من پێشـنیاز بۆ شـا دەکەم نیگاری دایکی خۆی بکێشـــێ. ئەویش نموونەی خەونە. نازدارییەکەی لە ڕێگەی چرچولۆچییە شـــاهانەییەکەی بەدیار دەکەوێ، ئەو هەر هێز و دەسەڵاتی لێدەبارێ و لێبژاردنی جلوبەرگیشی تەواوعەیارە."[34]
پاشـاش وەڵامی دایەوە: "ئەمەیان ناکرێ. ئاخر لە شـوێنی خۆی تک نادا،[35] ناتوانێ یەک خولەک بێدەنگ بێ. ئەو هەر بەدوای شـــتدا دەگەڕێ تا بیکاتە پاکانەی لۆمە و سـەرکۆنەکردنی شـتێک. ئەو لەسـەر کورسـییەک دابنیشێ و منیش فڵچەم بەدەستەوە بێ، خۆی ئەوە لەپێش چاوە، ئەوسا دەبێتە جەنگ و هەرا."
شا هەر بەتەنیا بە نیگارکێشانی پشیلەکەی و ژیانێکی وەستاو وازیهێنا. ئەو بەدزیش هەوڵیدەدا بەڵکو نموونەیەک لەبەر تـابلۆی ئەسـپەکەی ناپلیۆن بگرێتەوە، بەڵام هیچی پێنەدەچوو.
لەبەردەم تابلۆکە بەخۆی گوتەوە: "خۆی ئەمە ئەسـپ نییە، بەڵکو بوەتە کەر. لێ هەرچۆنێک بێ خۆشیمان لێبینی."
شـا هەرگیز نەبووە تابلۆکێشـێکی سـەرنجڕاکێش، بەڵام ئەو شـاعیرێکی ڕاســتەقینە بوو. هۆنراوەکـانی خســتبوونە ســەر کـاغەز، بەڵام زەحمەتییەکەی ئەو لەوەدا بوو وشەکانی قافیەڕێژ بکا. خۆ ئەگەر ئەو بە ئەنجامەکەی خۆشـحاڵ بووبایە و هەموو وشـەیەکی لە شـیعرەکەدا لە شـوێنی خۆی دابنابایە، ئەوا ئەو شـەوە وازی لە ئیشـوکارەکانی دیکەی دەهێنا و بانگی نووسەری دەرباری دەکرد کە بە خۆی و چراهەڵگرەکەی

[34] تەواوعەیار: کامڵ، بێ خەوش.
[35] تک نادا: واتە ناتوانێ نەجووڵێ.

بێن و بە کاغەزی فەرمی شــــیعرەکەی بۆ تۆمـار بکەن. یەکێـک لەو شیعرانەی کە بەم شێوەیە لەدایک بوو، ئەمەی خوارەوەیە:

*خەونم بینی، تەرمی باپیرەم بووە خاکوخۆل*
*تەنیا چاوەکانی نەبێ*
*ئەوانەی لە پێڵووی چاویدا بە خڕی دەخولانەوە*
*هەموو شتێکیان گرتە خۆ.*
*حەکیم هات و خەونەکەمی لێکدایەوە:*
*چاوی ئەوە ناسرەوێ*
*تا بەشی دیکەی وڵات داگیرکرابێ.*
*ئەو هەر بیر لە هەرات دەکاتەوە.*

دوای تۆمـارکردنی ڕســـــتەی یەکەم، نوســــەری دەربـار بە ســــەری شــــۆڕبووەوە دانیشـــت. ئاخر ئەو یەکەمین کەس بوو، کە هۆنراوەکانی شـــــای گوێ لێدەبوو. بە مەراقەوە شـــــا چاوەڕێی کاردانەوەی کابرای دەکرد.
نووســــەری دەربـاریش دڕی بە بێدەنگییەکەی دا: "پایەبەرز، وای لەو شیعرە شاهانەیە، بەڕاستی سەرسامم پێی."
خەندەیەک پەڕیە ســــەر ڕوخســـاری شــا و یەک دوو دراوی زێڕینی بۆ نووسەرەکە فڕێدا.

وەزیر کە خۆیشـــی حەزی لە شــیعر بوو، جارێکیان دیوانەشــیعرێکی جزوبەندی ڕازاوەی، هی شـــاعیری فارســـی ســـەدەی ناوەڕاســـت 'ئەبو عەبدوللا ڕودەکی' پێشـــکەشـــی شـــا کردبوو. ئەو شـــیعری کلاســـیکی

دەخوێندنەوە و زۆریشـی لەبەر کردبوون. شـیعر بۆ ئەو لەکاتی شـەوە درێژەکانی بێزاری و پەستی لە کۆشکەکەدا دڵنەوا و فریادرەسی بوون. ئەو ئەم شـاکارانەی بە سـەرنجەوە دەخوێندنەوە و لە هیکەوە چاوی بە جوانترین دیوانە شیعری فارسی کەوت:

*بویی جوی مولیان آید همی*
یاد یار مهربان آید همه
*در فرخار بر فغفور بستی*
*به جوی مولیان بر پل شکستی*
بۆنی جۆگەی مولیان دێ
یادی یاری میهرەبان دێ

شـا زۆر باش کەوتە بن باندۆری و لە ڕۆژژمێرەکەی بە درێژی ئەمەی نووسـی: "هەرات ئۆقرەی لەبەر هەڵگرتووین. هەرچی ئێمەش دەیکەین، ئەو شـارە هەر لە نێو یادەوریيماندا نغرۆ دەبێ. ئەمڕۆ هەرات شـاکارانە لەنێو شـیعری ڕودەکییدا خۆی نواند. شـیعرەکە لەبارەی ڕووبارە خۆشەویستەکەی (ئامو)ەوەیە. کاتێک شیعرەکەمان خوێندەوە، فرمێسکی بەچـاودا هێنـاینەخوار، بە درێژایی ئەمرۆژە هەر ئەو شـیعرەمـان خوێندووەتەوە:

*"با بۆنی ڕوبارە ماڵییەکەی لەگەڵ خۆی هێنا*
*هەروەها یادەوەری خۆشەویستانیش.*
*هەرچەندە ڕووباری ئاموی بندینێکی بەردەڵانی هەیە*
*لێ من دەمەوێ بچمەوە ماڵێ*
*ئاخر ئەو بندینە وەک پەڕی مەل وایە لەژێر پێم*
*شا مانگە*
*ماڵیش ئاسمان*

*مانگیش هەر بۆ ئاسمان دەگەڕێتەوە:*

زستان هات، پاشاش نەیدەزانی ئاخۆ شەوە دووورودرێژەکانی زستان چۆن بەسەر ببا. ئەو لەپڕ بە بانگهێشتنامەیەکی ڕوس سەرسام بوو.
لەسەر فەرمانی وەزیر دووساڵ بە شەو و ڕۆژ خەریکی لێدان و چاککردنی ڕێگاوبانی نێوان شارەکان بوون. بۆ ئەوەی بەر لەوەی سەرماو سۆڵەی چلەی زستان دابکا، بە دیارییەکی نایاب دڵی شا خۆش بکا.
خۆی دەکرا ڕێگەوبانەکان لە ڕێی خەڵکی خۆجێیشەوە لێدرابان و خۆشکرابان، بەڵام ڕوسەکان ئەو شتەیان هەبوو کە ئێرانییەکان نەیانبوو: دیسپلین و کۆڵنەدان. ڕابردووی سەخت و شەکەت، جەنگ و هەرای لەبننەهاتوو گەلێکی وەهای لێکەوتبووەوە کە چیدی زات نەکەن چاو ببڕێتە دوارۆژێکی گەش و ڕوناک.
لە مەزارگەیەکی دەروەی تاران عەبدولداود نێژرابوو، یەکێک بوو لە نەوەکانی محەمەد پێغەمبەر. بەدرێژایی بەشێکی زۆری ساڵ، خەڵکی تاران دەچوونە سەر مەزارە پیرۆزەکە. عەبدولداودیش شوێنە دڵڕفێنەکەی شا بوو. لە ساتە تەنیاییەکانیدا بەرەو ئەوێ لێیدەخوڕی و لەوێ لەپاڵ گۆڕی چاکدا چۆکی دادەدا دەردەڵی لە ژیان دەکرد.
ڕوسەکانیش زانییان ئەو مەزارە چەند لای شا گرنگ و پیرۆزە، چەند شتێکی ڕوحی باڵایە لای. لە زستانانیشدا ڕێگەی گەیشتنە ئەوێ سەخت و نەکردە بوو، هەموو بەردەڵانی و دژوار بوو، کەس نەیدەوێرا بە خۆی و ئەسپ و گالیسکەوە بەوێدا بڕوا. هەر بۆیە ڕوسەکان ڕێگەیەکیان بۆ شا لێدا، کە هەمیشە بۆ هاتوچۆ لەبار و کراوە بوو. ڕێیەکە وەک مارێک وابوو بە نێو گاشە بەردەکاندا دەخشا.



له دوازده شوێندا پرد بەسەر ڕێڕەوی ڕووبارەکەدا هەڵنران. بە هەزاران جوتیاری بەشـــان و بازوو، گردە مەترســـیدارەکانیان تەختکردن و ڕێگەکەشـیان بەردرێژ کرد. ناوبەناویش چایەخانە و شـوێنی خواردن و نوێژگەیان لێ دامەزراند.
هەرچەند ســـاڵ ســـاردیش دەبوو، هێشـــتا ڕوســـەکان توندتر و ماندوونەناســـانەتر کاریان دەکرد. ئاگری گەورە گەورەیان دەکردەوە و لەگەڵ جوتیارەکان لە کار و چالاکیی خۆیان نەدەکەوتن.
ڕێگەکە تەواو بوو، بەفریش هات و سپیپۆشی کرد.

وەزیر وەهای ڕێکخســت کە پاشـا لە ســەز یەکەم گردی پەرگەی تاران کرێکارە ڕوســـەکان ببینێ ئەوانەی ڕێگەکەیان لێدا. خۆیشـــی بەســواری ئەسپەکەیەوە یاوەری شای کرد و لەڕێگاش باسوخواسی ڕوسەکان و خەریکبوونیان بە ڕێگاوبانەکان لە سەرتاسەری وڵات بۆ کرد.
پاشاش ئەو سەرنجەی دا: "گوێمان لێبوو ئەوانە خەڵکی ماندوونەناسن."
وەزیریش پێی گوتەوە: "ئێمە خۆمان هیچ ناکەین و هەر پشـــت بە خوا دەبەستین."
شـا هەسـتیکرد کە مەبەسـتی وەزیر شـێوەژیانی پاشـایە بۆیە باسـەکەی گۆڕی.
"ئەرێ ئێمە لەنێو ئەو بەفرەدا چی دەکەین؟"
وەزیریش بۆی ڕوونکردەوە: "ئەنـدازیـارەکـان دەیـانەوێ ئەو ڕێگەیەی لێیانداوە نیشانی پاشای بدەن."
پاشاش بە دەردەدڵێکەوە پرسی: "جا هەر دەبوو ئەمڕۆ بووایە؟"

کاتێکیش ئەندازیارەکان پاشـــایان بینی بەرەو ڕوویان دێ، ئەوا بە نیوە بازنەیەک وەستان. پاشاش بەو تێڵایەی دەستی لە دووری ئەوان وەستا.

وەزیریش ئەندازیارە ڕوسـەکانی بە شـا ناسـاند. سـەردەسـتەی ئەندازیارەکانیش کەمێک سەری بۆ پاشا دانەواند، بەرەو لای شا هات و بەڵکو لەگەڵ ئەو بڕوا تـا ڕێگـاکەی نیشـان بدا و چۆنیەتییەکەی بۆ ڕوونبکاتەوە. ڕێگەی چوونە لای مەزارە پیرۆزەکە بە بەفر داپۆشرا بوو، ئیدی شـاش نەیدەزانی ئاخۆ وەزیر باسـی چی بۆ دەکا. ئەو بێباکانە نیگایەکی لە گردە بەفرواییەکە بڕی و بە چاوی پرسـیارەوە لە وەزیری ڕوانی.

ئەندازیارەکەش گوتی: "ئەگەر پاشـا ڕێگە بدا، دەکرێ بەرەو مەزارگەی ببەین."

پاشاش بە دوودڵیەکەوە پرسی: "بەرەو کوێ؟"

کابرای ڕوس قسەکەی خۆی دووبارەکردەوە: "بەرەو مەزارەکە."

"کامە مەزار؟"

"سەر گۆڕی عەبدولداود."

پاشاش بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ""بەم بەفرە؟ بۆ سەر عەبدولداود؟"

"پێموایە ئەسپەکەی پاشا لەبارێکدایە تا لەنێو بەردا بەگورگەلۆقێ بڕوا."

"ئەسپەکەی ئێمە ئەسپێکی بەهێزە، بەڵام خۆ درەنگە و زۆریشی پێناچی تاریکایی دادێ."

"ئەرخاین بوو، بەر لەوەی تاریکی دابێ، خاوەنشکۆ گەڕاوەتەوە کۆشک."

شا بە چاوێک سەیری کرد، بڕوای بە قسەکەی نەهات.

ئینجا پاشا ڕووی قسەی لە وەزیر کرد و گوتی: "ئەرێ وەزیر بەم قسە و بەڵێنە ئاگادارە؟"

میرزا کەبیریش سەری بۆ لەقاند.

شا ناسر بە بێدەنگی ڕێگەی گرتەبەر.

ئینجا لەپڕ بە کابرای ڕوسی گوت: "تۆ پێشکەوە! بزانم چۆنە!"

سەردەستەی ئەندازیارانی ڕوسیش جڵەوی بۆ ئەسپەکەی شلکرد و تا توانای تێدا بوو کەوتە غار. پاشـــاش بەدوایدا لەپاڵ گابەردە زلەکاندا بە ئاسانی بە ڕێگەیەکی پێچخواردوودا ئاوزینگی لێدا و ئەسپەکەی هاژۆت. بە بێ دوودڵی بەسەر گردەکەدا لێیخوڕی و بەلای یەک دوو چاخانەشی ڕەت دا. ئەوەشـــی پێی هەرس نەدەکرا چۆن بەو متمانەبەخۆبوونەوە بەســەر پشــتی ئەســپەکەیەوە بەســەر ئەو ڕێیە و بەنێوبەفردا بڕوا، بێ ئەوەی پێش خۆی بە باشی ببینێ.

پاش کەمێک ئەسپسواری، لە دوورەوە شا چاوی بە گومبەزە زێڕینەکە کەوت. خۆ ئەمە هیچی کەمتر نەبوو لە پەڕجوویەک. ئاخر لە هاویندا ڕۆژێکی ڕەبەقی پێدەچوو تا کەسێک دەگەیشتە سەر مەزارەکە. کەچی ئێستا کەمتر لە نیو سەعاتی خایاند.

کابرای ڕوس لە نزیک مەزاری عەبدولداوددا هێواشـــی کردەوە و ئەسپەکەی ڕاگرت. پاشاش هەر بە گورگەلۆقە لێی تێپەڕی و بەرەو ناو مەزارەکە ملی لێنا.

# ١٤

# ئاهەنگی بەهار

بەهار بوو، شا ویستی ئاهەنگی سەری ساڵی ئێرانی بکاتەوە، هەروەک چۆن پاشا کۆنەکانی ئێرانی یادیان دەکردەوە.
ئاهەنگی ساڵانی ڕابردوو زۆر گەورە و بەجۆش نەبوو، ئەمساڵ حەزی دەکرد تۆڵەی ساڵانی پێشتر بکاتەوە. ویستی لەسەر ئەو تەختە ئاڵتوونییە دانیشێ، کە لە ڕۆژگاری خۆیدا پاشاکانی فارس و میدییەکان لەسەری دانیشتبوون. خۆی بەتەنیا هەر گەورە پاشاکانی وەک کورش، کامبوجی و داریوش لەسەردەمی خۆیاندا ئاهەنگی وەهایان گێڕاوە. شتەکەش سادە بوو بەڵام کورسییەکی جادوویی بوو، کە لەسەر یەکێ لە دیواری کەلاوەکانی کۆشکی پێرسیپۆلیس نەخشێنرابوو. لەسەر مێزە ناودارەکەدا، داریوش و شاهەنشا دەبینرا دابینیشێ، ئەوەش لەکاتی ئاهەنگی سەری ساڵدا بوو، کە پێشوازی لە پاشاکانی دیکەدا دەکرد، ئەوانەی بە بۆنەی ساڵی نوێوە دیارییان پێشکەشی پاشا دەکرد.

جارێکیان ئەسـکەندەری کۆشـکە گەورەکەی ئەوێی ئاگر تێبەردا، بەلام هەبوو بە کورسییەکە ڕابگا لە وێرانبوون و سوتان بیپارێزێ.
بەگوێرەی سـاڵنامەی ئێرانی، ئەوسـاڵ بەهار لە سـەعات دەی بەیانی دەستیپێدەکرد. ئەو کەسانەی بۆ بۆنەکە بانگهێشتکرابوون، لە بەیانییەکی زووەوە بەرەو کۆشک بەڕێکەوتبوون. ئەو خزمەتکارانەی جلی ئاهەنگیان پۆشـیبوو، یـاوەری میوانەکـان بەگوێرەی پلەوپایەیـان بۆ شـوێنی دەسـنیشـانکراو ڕێنوێنی کران. میوانەکان بە دوو ڕیز لە بەرانبەر یەک وەستابوون، تا پاشا بتوانێ بەناویاندا ڕێبکا و سڵاویان لێبکا. بەتەمەن و ئەندامە هۆشمەندەکانی خانەوادەکەی هۆزی شا لەپێشەوە بوون، لەدوای ئەوانەوە نوێنەرانی هێزە بیانییەکان دەهاتن. لە بەرانبەری ئەوانیشـدا سـەردارانی جەنگ و پۆلێک لە ئیمام و ئاخوندەکـان بە ڕابەرایەتی ئایەتوڵڵای تاران بوون. لە تەنیشـت مەلاکانیش سـەربازەکان بوون. بەدوای ئەوانیشـدا نوێنەرانی بازاڕ و کارمەند و پیشـە سـەربەخۆکان بوون. هەر هەمووشـیـان جلوبەرگی سـاڵی نوێیـان لەبەردابوو، هەمووشیان ڕیشی خۆیان قەڵەمکردبوو و بە باشی سەروپرچی خۆیان داهێنـا بوو. مرۆ لەوێ هەر بۆنی گوڵ، بخوری سـووتێنرا و مۆمی دەکرد، بە چەندین داودەرمانی بۆنخۆش بەسەر ئاگرەکەوە بڵاوبووبووە. لە هەموو لایەکەوە هەر گوێـت لە دەنگی خۆش و موزیـک و گۆرانی دەبوو. هەموو شتێک نیشانەی ئەوەی دەدا، هەربینا پاشا لەپشت پەردە کەسـکە نوێیە درێژەکەوە دێتەدەر و خۆی نیشـانی ئامادەبووان دەدا، بەلام خۆ چاوەڕوانییەکە لەبەر نوێنەرانی هێزی وڵاتە بیـانییەکـان بوو. دیاربوو شتێک لە ئارادا بوو. بەڵێ ئەوان گەیشتبوون، بەلام هێشتا هەر لای ئەستێلکی ئاوەکەوە وەستابوون.

پاشـــاش لە دواخســـتنەکە ئاگادارکرابووەوە، لەپشـــت پەردەکەوە، لە ناوەوەی هۆڵەکە، لە ئامادەبووەکانی دەڕوانی. ســەرنجی دا وەزیرەکەی لە گفتوگۆیەکی چڕوپڕدایە لەگەڵ باڵوێزی بریتانیا.

ئەوەبوو شا لە سەرۆکی نۆکەرانی پرسی: "چی لە گۆڕێیە؟"

"دیارە ناکۆکییەک لەنێوان وەزیر و نێردەی بریتانیدا هەیە."

"لەبارەی چی؟"

"بریتانییەکان دەیانەوێ بەخۆیان و چەکمەکانیان بێنەژوور."

"بەڵام خۆ ئێرە تەویلە نییە؟ هەموو جارێک کە هـاتوون پێڵاوەکـانیـان داکەندووە، چما ئەمجارەیان وا ناکەن؟"

هەر کەســێک هاتبایە نێو کۆشــکەکە. پێڵاوەکانی دادەکەند. هەر بەتەنیا پاشا بوو پێڵاو یان قاپقاپەکەی دانەدەکەند.

دیـاربوو بریتـانییەکـان بەم شــێوازە نـاڕەزایەتیی خۆیـان لەبـارەی چالاکییەکانی ڕوس و فرەنســییەکان دەربڕی. ســەرەتا وەها دیار بوو شــتێکی بچکۆلە و لاوەکییە، بەڵام دواتر دەرکەوت شــتەکە ئاڵۆز و هەستیارترە. وەزیریش تێگەیشت، شتەکە پەیوەندی بە چەکمەکانیانەوە نییە. ئەو لە هەوڵی ئەوەدا بوو بەســەرخۆیدا زاڵ بێ، لێ لە هەناویدا دەکوڵی. ئەم ڕووقایمیەی بریتانییەکان ســەرەتا بە هۆی دانپێدانانیان بە سەروەریی ئەفغانستان دنەی تووڕەیی وەزیریان دابوو.

وەزیر بە ئارامییەوە بە باڵوێزەکەی گوت: "خۆی دەبێ چەکمەکانت لێرە دابنێی ئینجا بچییە ژوور."

"هەروەک چۆن ئێرانییەکـان دابونەریتی خۆیـانیـان هەیە، ئێمەش هی خۆمـانمـان هەیە." بەم جۆرە کـابرای ئینگلیز وەڵامی وەزیری دایەوە. ئینجا زیاتر لەســەری ڕۆیشــت: "بریتـانییەکان لە هیچ شــوێنێک چەکمەکانیان دانانێن، لەوەش هەر گەڕێ لە ئاهەنگێکی پاشـــای ئێرانی وەها بکەن."

ئەم وەڵامە وەزیری دەهریتر کرد.
وەزیر بە پێداگرییەکەوە گوتی: "ئاخر لە بۆنەی دیکەدا بە بێ پێڵاوەوە هاتووی و سڵاوت لە پاشا کردووە."
باڵوێزەکەش لە وەڵامدا گوتی: "ئاخر بۆ بۆنەی جیاواز جیاواز ڕێسای جیاواز جیاواز هەن."
میرزا کەبیر ڕووبەڕووی کێشەیەکی زۆر سەخت بووبوەوە. کاتیش تا دەهات تەنگتر دەبوو. بەهار هات، ساڵنامەی نوێ دەستیپێکرد، سەدان مێوان لە هۆڵەکە وەستاون و خەریکبوو پاشاش حەجمانی لەبەر دەبڕا.
هەر دەمودەستیش مێوانەکان بە کێشەکەیان زانی، دەنگودۆ لەناو هۆڵەکەدا بڵاوبوونەوە.

- "بە پێڵاوەوە؟"
- "ئای لەو سووکایەتییە."
- "ئەو بریتانیانە چەند لووتبەرزن."
- "هەق نییە هەرگیز شا ڕێگەیان بدا."

ئاخوندەکانیش بە ڕوونی ئەوەیان دەربڕی، کە ئەم حاڵەتە قبوڵ ناکەن.
ئایەتوڵڵای تاران هاتەدەنگ: "ئەم شتە قەدەغەیە. شا سایەی خوایە لەسەر زەوی. کۆشکەکەی ئەو هەروەک پەرستگا پیرۆزە. خۆ ئەگەر بریتانییەکان نەیانەوێ بێنە ژوور، با نەیەن."
وەزیر وازی لە بریتانییەکان هێنا لە شوێنی خۆیان بوەستن و ڕووی لە نوێنەرانی بیانی دیکە کرد و لەگەڵیان کەوتە قسە.
عوسمانییەکان لە ماڵی خۆشیان لێ ڕاهاتبوون پێڵاوەکانیان دابکەنن. باڵوێزی فەرەنساش بە وەزیری گوت، فەرەنسییەکان هەمیشە لە ئەفریقادا و لەبەر ڕێزگرتن لە چوونەژوورەوەی ماڵاندا پێڵاوەکانیان دادەکەنن. ڕووسەکانیش کە زانییان بریتانییەکان جەنەیان گرتووە[٣٦] پێڵاوەکانیان

---

[٣٦] جەنەگرتن: لە ڕق ڕاچوون و پێچەقاندن لەسە هەڵوێستێکی نابەجێ.

داکەند و بە گۆرەوییەوە بەسەر مافوورە جادوویەکاندا ڕۆیشتن و تورک و فرەنسییەکانیش بەدوایاندا هەنگاویان نا.
وەزیر ڕووی لە باڵوێزی بریتانی کردەوە و پێی گوت: "کات وا دەڕوا."
بابای بریتانیش پێیگوتەوە: "ئێمە لەوە دەگەین، بەڵام ئێمە ڕێنمایی دەقاودەقمان لە لەندەنەوە پێگەیشتووە، دەبێ پێیەوە پابەند بین. بریتانییەکان پێڵاوەکانیان داناکەنن."
وەزیریش پێیگوتەوە: " جووت گۆرەویەکی شاهانەت بۆ دەهێنم، دەکرێ لەسەر چەکمەکانت بیانکەیتە پێت."
کابرای بریتانی گوتی: "هەر بیریشی لێمەکەوە."
وەزیر بینی کە شا لایەکی پەردەی لاداوە.
ئینجا وەزیر بە باڵوێزەکەی گوت: "میواندارێتی ئێرانییەکان لە جیهاندا ناسراوە، بەڵام شا بڕیاری دا، تا ئێرە و بەس."
ئینجا باڵوێز ئاماژەی بۆ نێردەکەی کرد و ئەوانیش بەبێ خواحافیزی گەڕانەوە لای ئەسپ و گالیسکەکانی خۆیان.
وەزیر وەستا تا ئەوان ڕۆیشتن، ئینجا خێرا بەسەر پەیژەکاندا سەرکەوت، چەکمەکەکانی داکەندن و لێ وەژوور هۆڵەکە کەوت. تۆپەکان بۆ سڵاوکردن تەقێنران، تیپی موزیک دەستی پێکرد، بەهار هات. شا ناسریش بەرەو کورسییە شاهانەکەی خۆی هەنگاوی نا.
ئەو تاجێکی کۆنینەی قەڵەمڕەویەکەی لەسەر نابوو، کەوایەکی شۆڕەی ئاودامێن تەلا و بەردی مرواری پۆشیبوو. ئەوەش ئەو شتانە بوو کە نادری گەورە لە هیندستانەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونیەوە دوای ئەوەی بەسەر دەلهیدا زاڵ بووبوو. ئەوە یەکەم جار بوو کەلوپەلی گەنجینەی هیندی بۆ خەڵک دەربکەوێ. هەمووان بە شێوەیەکی سەرسامانە تەماشای شایان دەکرد.

کاتێکیش شـاهەنشـا لەسـەر جێگەکەی خۆی دانیشـت، ئینجا بواری دا هەموویان یەک لەدوای یەک بێن و پیرۆزبایی سـاڵی نوێی لێبکەن و خۆشـبەختیی بۆ بخوازن. لەو باولە[٣٧] پڕ لە زێڕەی لای خۆیشـی، وەک دیاریی ساڵی نوێ دراوی زێڕینی بە ئامادەبووان بەخشیەوە.

---

[٣٧] باول: باهۆڵ، سندوق

## ١٥

# سوپا نوێیەکە

فرەنسییەکان لێهاتووانە هەوڵیاندا پارچەی ئەو کارخانانەی بەتەمابوون لە ئێران بنیاتی بنێن، لە ڕێی کەنداوی فارسییەوە بیگەیەننە بەندەر عەباسی پەرپووت. لەوێشەوە بە پشتی هێستر و بەو گالیسکانەی کە هێسترەکان ڕاپاندەکێشا بە ڕێگە ناخۆشەکان، بەو ڕێگایانەی بە ئاستەم بەنێو دارستان و چیاکان بگەیەننە تاران، ئیسفەهان، شیراز و تەورێز. بەهەمان کارامەییشەوە کاریان لەسەر هاوچەرخکردنی سوپای ئێرانی کرد و وایان لێکرد ببێتە سوپایەکی کارامەی جەنگاوەر.
بەشێک لە کارخانەکان دەمودەست کەوتنەکار. ئیدی وەزیر بەرهەمی خۆمانەی بەچاوی خۆی بینی و بەدەستی خۆی دەستی لێدا، زۆر شاناز بوو. پاشان بەوەی بە چاوی خۆی بینی هێدمەگرتی بوو: سوپایەکی گەورەوگران لەبن یەکبەرگییەکی زۆر ڕێکوپێک. هەموو شتێکیان هەر لە سوپای فرەنسی دەچوو، هەروەک لە کتێبی مێژووی فرەنسییەوە

خوێندبوویەوە. ئینجا دەستی دایە داری دووربین تا وێنەی چەند سەربازێک بهێنێتە پێشەوە و وردتر لێیان ڕابمێنێ. یەکێکیان بە نیوە دەمکردنەوە سەرسامبوونەکەی لێ تۆراند. ئەو سەیری شەپقەکانیان، چاکەت، چەکمە بریقەدار و تفەنگەکانیان کرد، مرۆ وشەی "زۆر سەیرە"ی لە لێوەکانی بەدیدەکرد. نیگای پاشا کەوتە سەر ڕیزە تۆپێکی نوێ بە گریسی خۆیانەوە، لەبەر ڕۆژی پایزەدا دەبریسکانەوە.

وەزیر بە سواریەوە بۆ سەر گردەکە ڕۆیشت، بایەکی نەرم یاری بە دامەنی کەواکەی پاشا دەکرد. کاتێکیش وەزیر گەیشتە لای لەشکرەکە، ئەفسەرە فرەنسییەکە هاواری کرد: "ئامادە بن!"
لەپڕ سەربازەکان تفەنگە نوێیەکانیان لەسەر شان دانا.
شا سەیری ڕوخساری وەزیری کرد و خەندەی لەسەر لێو بەدیکرد. وەزیر لەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە بە دەستی ئاماژەی بۆ شوێنێکی دوور کرد و بانگی کرد "ئاگر دەن!" ئەوانیش پلیان لە پەلەپیتکە گیرکرد و دەنگی تەقە هات. ئەسپەکەی شا حیلاندی و خەریک بوو هەڵسێتە سەر پاشوو. پاشا بە نەرمی دەستێکی لە کەمەری دا و هێوری کردەوە. بە ئاماژەیەکی وەزیر پۆلێک لە عەریفەکان بەرەو تۆپەکان غاریان دا و لوولەیان بەرەو ئاسۆ ڕاگرت. وەزیر هاواری کرد : "بیتەقێنن!"
ئیدی بۆ حەوت جار لەسەر یەک تۆپ هاوێشتران. شا دەبووایە توند جڵەوی ئەسپەکەی بگرێ و ڕکێفی توند بکا و بیسەنگرێنێتەوە.[٣٨] ئینجا لە گردەوە شۆڕبووەوە.
ئەفسەرە فرەنسییەکان سڵاویان کرد و فەرمانیان پێدرا لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بن. ئینجا ستونی لەشکر، هەنگ بە دوای هەنگ بە بەردەم شادا ڕەت بوون و ئەویش بەردەوام دەستی تا ئاستی کڵاوەکەی بۆ بڵند

---

[٣٨] سەنگرانەوە: هێورکردنەوە و ڕاگرتن.

کردبوون. ڕوون و ئاشـکرا ئەو لەبن باندۆری نمایشـەکەدا بوو. وەزیر کاریگەری باشی کردبوو، لێ شا لای خۆی ڕەتیکردەوە پەسنی بدا. لەبری ئەوە گوتی: "هەموو لەشکر بەم شێوازە ڕێکخراوەتەوە؟"

"نەخێر، جەنـابی پـایەبەرز، هێشــتـا هەمووی نـا! ئێمە بە تەواوی لێ نەبووینەتەوە، کاتی زۆرتری دەوێ تا بە تەواوی بگەینە ئەو ئاستە."

ئەو ئامادەباشـییەی لەبەرچاوی پاشـا ڕووی دا، زۆر مایەی سـەرنج و ڕامان بوو، پێی سـەرسـام بوو، ئیدی شـا بیری لە دیسـپلینی سـوپای ڕوسـی کردەوە، ئەو کاتەی کە خۆی و باوکی لە دژی ئەوان شـەڕی کردبوو. ئەوەش ڕوون و ئـاشــکرا بوو، وەزیر کـاریگەرییەکی زۆری بەسـەر سـوپاوە هەبوو. دیاربوو ئەو سـوپاسـالاری گشـتیی هێزەکەیە نەوەک پاشا خۆی.

لە مێشـکی شـادا پیلانیک سـاز بوو. بەو هێزە تۆکمەیە دەتوانێ هەرات لەبن دەستی بریتانی و ئەفغانییەکان دەربهێنێ.

وەزیر ئەفسـەرەکانی بۆ ڕیزی پێشـەوە هێنا و کورتە گفتوگۆیەکی بە زمانی فرەنسی لەبارەی ئەو چالاکییانەی لێبوونەتەوە کرد ئینجا ئەوانی بە پاشا ناساندن.

پاشـاش دەسـتی بۆ بەرکی کەواکەی بردەوە و هەر ئەفسـەرێک چنگێک دراوی زێڕینی پێدان، ئەو دراوەی وێنەی خۆی لەسەر هەڵکەنرابوو.

# ١٦

# ڕوس بەدوای پەیوەندیدا دەگەڕێن

شـــۆڤار و ســـووســـەکارانی بریتانی لە هەموو کاتێک چالاکتر و کاراتر بوون، خواخوایان بوو زانیاریی زیاتر لەبارەی هاوکاریی ئێرانییەکان لەگەڵ فرەنسی و ڕوسەکاندا خڕبکەنەوە.

ئاخر لە وڵاتەکەدا هیچ کەســـێکی دەســـتڕۆیشـــتووی ئەرســـتۆکرات نەمابووەوە، بریتانییەکان نەیانکڕیبێ. هەر کەســـێک گەر بۆ کەمێکیش مرخی لە ســـیاســـەت خۆشـــکردبا و چاوی تێبڕیبووایە، دەیزانی بەبێ دەستلەپشتدانی بریتانییەکان نەدەگەیشتە هیچ دەستکەوتێک.

لە مـاوەی ئەو پەنجا ســـاڵەی ڕابردوودا، ئینگلیز نەوەک هەر لەگەڵ کەســانی ناو بازنەی دەســەڵات، بەڵکو ڕایەڵەی پەیوەندییان لەگەڵ ئیمام و ئاخوندی مزگەوتەکان و ســەرۆک هۆز و تیرەکانی هەر چوار کەناری وڵاتەکەوە ڕاچاندبوو. بریتانییەکان هیچیان باز نەدەدا.

وەزیریش تەونی خۆی لە سووسەکاران هەبوو، زانیارییان بۆ کۆدەکردەوە. لەوانەوە سەرەداوی ئەوەی بۆ هات، کە مەهدولیا بە دزییەوە لە نێو حەرەمسەرادا لەگەڵ شا سرتەسرتیان بووە و دیارە شتێکیان لەبن سەردا هەبووە. گومانی ئەوەی کرد، ئەو دیدارەیان لەبارەی پرسێکی هەستیارەوە بێ.

ئەو کەسەی ئەم هەواڵەی بۆ وەزیر بردبوو، پیرەژنێکی ناو حەرەمسەرابوو، ئەو پیرەژنەبوو کە موو و گەندەمووی دەموچاوی ژنانی حەرەمسەرای هەڵدەگرت و پاکیدەکردنەوە. جارێکیان بینی دایکی شا کە بەتەواوی چارشێوێکی بەخۆیدا دابوو، هەروەک یەکێک لە ژنەکانی حەرەمسەرابێ، لەیەکێ لە ژوورەکانی پشتەوەی کۆشکەکە چووبووە ژوور. ئەوکات پیرەژنەکە خۆی لەپەنا دۆلابێک حەشار دا تا بزانێ ئاخۆ چی دەگوزەرێ. بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پاشاش هاتە ژوورەکە. پیرەژنەکە ئەوەندە شڵەژابوو، تەنانەت سەری لێ تێکچوو، نەیتوانی گوێی لێبێ ئاخۆ لەو دانیشتنەدا چی گوترا. دەبووایە وەزیر خۆی مەتەڵەکە هەڵبێنێ و بەدوایدا بچووبایە. ئەو ئەوکاتە زانی، ئەوکاتیش هەم بۆ ئەو و هەم بۆ وڵات کارلەکار ترازا بوو. گەر وەها نەبووایە، ئەوا گوێی لەمەی خوارەوە دەبوو:

شا بە دایکی گوت: "باشە دەتەوێ چیم پێ بڵێی؟"

"باڵوێزی ڕوسیا پەیامێکی بۆ تۆ هێناوە."

شا پرسی: "لە کێوە؟"

"هیچ ناو نەهێنراون، بەڵام واپێدەچێ لە قرالی ڕوسەوە بێ."

"دەیانەوێ لەبارەی چییەوە قسە بکەن؟"

"هێشتا ناوەڕۆکەکەی نەزانراوە."

پاشا پرسی: "کێ پەیامەکە دەگەیەنێ؟"

"ئەگەر پاشـــا ڕێگە بدا، ســـیاســـەتوانێکی ڕوســـی پلەباڵا لەبن بەرگی بازرگانێکدا لەگەڵ کۆمەڵێ شـــتکڕ دێنە تاران. ئیدی ئەو لەباتی قڕاڵ دەیەوێ لەگەڵ پاشادا قسە بکا. بەهیچ شێوەیەک نابێ بریتانییەکان پێی بزانن."
دیسان شا پرسییەوە: "شتەکە لەبارەی چییەوەیە؟"
مەهدولیاش گوتی: "من گومانی خۆم هەیە، بەڵام وەها باشـــترە ئارام بگری تا لە دەمی خۆیانەوە دەیبیستی."
شا پێیگوتەوە: "لەکوێ ئێمە ئەوان ببینین؟"
"باشـترین شـوێن شـوێنی حەوانەوە لاپەڕگەکەی شـێخ ئاغاسـییە. ئەو کەسـێکی ناسـراوی ئێمەیە، زۆریش باوەڕپێکراوە. پێمباشـە ئێمە بچینە باخە ئاڵووباڵووەکەی ئەو. خۆ ئەگەر شا ژنەکانیشی لەگەڵ خۆی ببا ئەوا وەک سەیرانێکیشی لێدێ."
شا بێدەنگ بوو. مێشکی بیرۆکەکەی گرت.
ئینجا مەهدولیا پرسی: "دەکرێ من دیدارەکە ڕێکبخەم؟"
شا وەڵامی دایەوە: "باشە، ڕێکیبخە."
ئەوسا مەهدولیا دەستی شای گرت و بە سینگی خۆیەوە توند گوشی.

کاتێک مەهدولیا لەوێ ڕۆیشـــت، پاشـــاش گەڕایەوە هۆڵی میناباندەکە و داوای قلیانی کرد. چوو لەسەر دۆشەک و لەنێوان سەرینەکاندا دانیشت. لەکاتێکدا قلیانی دەکێشا لەگژ هزران ڕاچوو.
هەرگیز دایکی بە خۆێ ڕەوا نەدەبینی وەک پەیک و تەتەر بکەوێتەگەڕ مەگەر پرســـەکە زۆر گرنگ و هەســـتیار نەبێ. شـــا بڕیاری دا جاری چاوەڕێ بکا و هیچیش لای وەزیرەکەی نەدرکێنێ.

# ١٧

# باخی ئاڵوباڵو

ئاڵوباڵوش هەر گێلاسە، بەڵام سوورتر و ناسکتر و بەتامترە. خۆشترین جۆری ئاڵوباڵو لە دەرەوەی تاران لە بەرزاییەکانی ئەلبورزدا هەیە. لە شـــارەکانی دیکەدا ئاڵوباڵو لە کۆتایی حوزەیراندا پێدەگا، کەچی گێلاســـەکانی تاران لە کۆتایی هاویندا پێدەگەن و لە ســـەرەتای پایزدا بەتەواوی لە هەڕەتی خۆیان دان. ســـروشـــت کاتی خۆی وەردەگرێ تا بەتەواوی چێژ و تامیان بداتێ.
ئاڵوباڵو لە میوە هەرە خۆشـــەویســـتەکانی عاشـــقە لاوەکانی ئێرانە. کیژوکاڵ و ژنانی گەنج ئەو گێلاســـانە لەبەر گوێیان دادەنێن و کوڕوکاڵیش بەدوایان دەکەون تا ئاڵوباڵوەکە لێبکەنەوە.
ئاڵوباڵو میوە هەرە شـیرین و خۆشـەویسـتەکەی شـا بوو. نەوەک هەر کەســـانی دەوروبەری ئەو دەیانزانی، بەڵکو بازرگانە دەوڵەمەندەکانی بازاڕیش دەیانزانی، ئەوانەی باخی گەورەی ئاڵوباڵویان لە دەرەوەی شـــاردا هەبوو. هەر بۆیە لە کاتی پێگەیینی ئاڵوباڵودا شـــا و ژنەکانیان بانگهێشـــتی باخەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی ڕۆژێک لە نێو ئاڵوباڵو و

گێلاسەکاندا بە خۆشی بەسەربەرن. هەروەها ئەو خانەوادە ئەرستۆکراتیانە لەو گردانەی دەوروبەر قەلا و خانووی گەورە گەورەیان دروستکردبوو، هاوینانیان لەوێ بەسەر دەبرد. هەر بەڕاستیش ئەو شوێنانە مێرگێکی بەهەشت بوون بۆ خۆیان، باخەکانیشیان بەگوێرەی ئەندازیاریی باخی ئێرانی لێدابوو.
شیخ ئاغاسیش یەکێ لە باشترین باخی ئالۆبالۆی لە تاران هەبوو.
ئەو لەوێ هەموو ئامادەکارییەکی کردبوو بۆ ئەوەی ئەو دیدارە نهێنییەی نێوان شا و ڕوسەکان بە باشی بەڕێوەبچێ. شەوێ پێشتر شا لەناو پێخەفەکەی خۆیدا بوو. غەریبی شەرمینی دەکرد. زۆر بەدرەنگەوە پشیلەکە لە ژووری نوستنی شا وەژوورکەوت. شا هەستی بە نائارامیی پشیلەکە کرد.
"شەرمین ئەوە لە کوێ بووی؟"
پشیلەکە خۆی خزاندە سەر جێی پاشا، ئەویش دەستێکی بە سەر تووکی سەریدا هێنا هەستی کرد پارچە کاغەزێکی لولدراوی بە ملەوەیە.
"ئەوە چییە بە گەردنتەوە؟"
بەڵێ ئەو لەبەر تیشکی مۆمەکەدا پارچە کاغەزێکی لوولدراوی بینی. چەند وشەیەکی لەسەر نووسرابوون، بە ئاستەم دەخوێندرانەوە. "بەیانی! ئاگات لەخۆت بێ!"
ئای لەمە؟ ئەوە چی دەگەیەنێ؟ تۆ بڵێی کێ نووسیبێتی؟ باشە بۆچی ئەو ئاگای لەخۆی بێ؟ ئایا ئەمەیە هۆشدارییەکە، گەفە یان گاڵتەیە؟ تۆ بڵێی کێ زاتی ئەوە بکا، پشیلەکەی ئەو وەک پەیک بەکاربهێنێ؟
ئەو پارچە کاغەزەکەی لە بەرکی چاکەتەکەی دانا و دیسان پاڵکەوتەوە. "شەرمین، ئەرێ کێ ئەوەی کردووە؟ دۆست بوو؟ دوژمن بوو؟ ئەو هەر دەیپرسی: "ئەوەی ئەم شتەی کرد، یەکێ بوو لە ژنەکانی حەرەمسەرا؟ دیارە ئەو ئیرەیی بەتۆ دەبا، چونکە تۆ هەموو شەوێک

لەگەڵم دەخەوی؟ تۆ بڵێی فروغ بێ و لەبەر ئەوە وای کردبێ کە من لەمێژە بەلایەوە نەچووم و ســـەرجێیم نەکردووە؟ بەڵام خۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر بۆم دەردەکەوێ، ئەوســـا هەر کەســـێک بێ: ئەوا من هەر لەسەر بانەوە فڕێیدەدەمە خوارەوە تا هەپروون بە هەپروون ببێ.
ئێمە بە تەونێک لە نەیار و دوژمن دەورە دراوین، ئاسـایشـمان پارێزراو نییە. ئەم پارچە کاغەزەی ملی پشیلەکە بەڵگەیە. بەڵێ بەڵگەیە، لەوە زیاتر هیچی دیکە نییە. پاشـا هەمیشـە لە مەترسـیدایە، هەرگیز ئەو ناتوانێ بە ئارامی لێی بخەوێ."

بۆ بەیانییەکەی، شـــا زوو بێدار بووەوە. بەرچاییەکەی ئامادە کرابوو. یەکێ لە نۆکەران لەسەر دەفرێکی گەورەی زیویندا خواردنی پشیلەکەشی هێنا. شـــیری تەڕوتازەی لە فەخفوریەکی چینی و گۆشـــتی کوڵاوی بەرخیشـــی لەســـەر دەفرێک بۆ هێنا دامێنەکەی بە بازنەیەکێ زێڕین نەخشـــابوو، یەک دوو پارچە نان بە کەرە چەورکراو لەگەڵ بادییەک[٣٩] ئاو.
شـــا ســـەیری پشـــیلەکەی دەکرد کە خواردنەکەی دەخوارد و لەهەمان کاتیشدا چاوێکیشی لەسەر خزمەتکارەکە بوو. خۆ هەر دەبێ یەکێک لەو کۆشکە بێ کاغەزەکەی لە ملی ئەو بەستەزمانەوە کردبێ.
دوای نانی بەیانی پەردەدار جلە دوراوە تازەکانی هێنان کە زۆر بەجوانی بەقەدکراوی لەســـەر دەســـتی دانابوون. کابرا هیچی لەبارەی دیدارە چاوەڕوانکراوە نهێنییەکەی شـــای لەگەڵ ڕوســـەکان نەدەزانی. شـــا پێی گوت: "نا ، نەخێر، دەبێ جلی فەرمیتر بێ."
پیاوەکەش بە ئەسپاییەوە گوتی: "بەڵام جەنابی شا زۆری پێناچێ دەچێتە نێو ئاڵوباڵوان، لەوانەیە وەها باشتر بێ، ئاخر...."

[٣٩] بادی: دەفرێکی قووڵە بۆ ئاوخواردنەوە بەکاردێ.

شا لەسەر قسەکەی مکوڕبووەوە بێ ئەوی چاو لە کابرا بکا پێی گوتەوە:
"جلی فەرمی."
کەمێک پاشـــتر، پەردەداری بابنۆکەر بەخۆی و قاتێکی فەرمی گەڕایەوە.
بە دوودڵیەکەوە قاتەکەی نیشانی شا دا.
شاش گوتی: "تەواوە، ئەمەیان باشە."
ئینجا قاتەکەی بەدەستەوە گرت و لەبەر ئاوێنەکە وەستا و تەماشایەکی خۆی کرد و گوتی: "ئەمەیان نایابە، وا دەڕۆین جلمان دەگۆڕین."

تا ئەوکاتیش شوێنی حەوانەوە لاپەڕگەکەی شێخ ئاغاسی بۆ هاتنی شا و ژنەکانی حەرەمســـەرا ئامادەکرا. لە تاران گەرما بوو، بەڵام لەقەدپاڵی شـــاخی ئەلبورزدا هەوایەکی فێنک بوو. لە باخەکەی شـــێخ ئاغاســـییدا چڵەدارەکـانی دار ئـاڵوبـاڵو لەبەر مێوە ســـوورە گەییوەکە شـــۆڕ بووبوونەوە، بۆن و بەرامەیەکی نـایابیـان لێوەدەهـات. شـــا هەروەک منـداڵێـک کەوتە ڕنینەوەی ئـاڵوبـاڵوەکـان. ئەو هەرگیز دەســـتەکـانی بەکارنەدەهێنان، بەڵکو دەچووە ژێر لکە شـــۆڕبووەکەوە و بەدەم و لێو ئاڵوباڵوەکانی لێدەکردنەوە.
شیخ ئاغاسی دەیزانی چۆن شا دڵخۆش بکا. ئەو بانگی پیرە نانەوایەکی بازاڕی کردبوو تا ئاڵوباڵوەکان لەگەڵ شـەکر و شتی بۆنداردا تێکەڵ بکا و شـــیرینتر و بەتامتریان لێ بکا. شـــێخ ئاغاســـی مافوور و ڕایەخی گەورۆنەی لە باخەکەدا ڕاخست و تەختەبەندی بە سەرینی ڕەنگاورەنگ لەوێ دانان، بۆ ئەوەی شا و ژنەکانی لەوێ هەست بکەن لەماڵی خۆیانن و ئازادیی خۆیان وەربگرن.

شـــا لە ڕێ بوو بگـاتە ئەوێ. لەدوای ئەو حەفتـا و پێنج ژن لە حەرەمســـەراکەوە بە تـایبەت بۆ ئەو بۆنەیە لێگیرابوون. ژنەکـان



چارشـــێوپۆش بوون و ڕووبەندیان دادابووەوە و هەر یەکێکیشـــیان دووربینێکی لەمل کردبوو، ئەمەش دیاریی کونســـولی ئینگلیز بوو بۆ ژنانی ئەوکاتی شازادەی جێگرەوە.

دووربینەکان لە ســـندوقێکی داردا بوون و بە ئینگلیزی لەســـەریان نووســـرابوو: "لە خاتوونە شـــازادەکانی ماڵی پاشـــایەتیی بریتانیاوە بۆ شـــازادەکانی ئێرانی. لە دڵەوە." کاتی خۆی دەقەکە نەوەک دووربینەکان جێگەی دڵخۆشیی شا بوون.

هەر کاتێک ئەو لەگەڵ ژنەکانی بە گەشـــت یان ســـەیرانێک دەردەچوو، لێدەگەڕا دووربینەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیان بهێنن بۆ ئەوەی لە ڕێگا خۆیان پێوە بخافڵێنن.

ئەو ژنانەی دەرفەتیان بۆ ڕێککەوت لەگەڵ شـــادا دەربچن، ژیانی خۆیان هەبوو. ئەوکاتانە خۆشترین ساتەوەختی ژیانیان بوو. باوکی شا هەرگیز ئەو زەحمەتییەی نەدەدایە بەرخۆی تـــا لە گەشـــتەکـــانیـــدا ژنەکـــانی حەرەمسەرا لەگەڵ خۆی ببا، ئاخر ئەو تەداروکە زۆری دەخایاند.

شـــا بۆ پێشـــەوە لێیدەخوڕی. مایەی ســـەرنجیش بوو شـــەرمینی لە ماڵ بەجێهێشـــتبوو. ژنەکان بیچمی پاشـــایان بینی زیاتر بە پەســـت و تووڕە دەچوو، بۆیە هەوڵیان دەدا خۆیان لە شەڕی لابدەن.

ژنەکان بە چرپەوە:

- "خۆ پشیلەکە ژیری کردبووەوە."
- "لەوانەیە ئێستا غەریبیی پشیلە خۆشەویستەکەی بکا."
- "باشە بۆچی لە ماڵەوە بەجێیهێشتووە؟"

ژنێکیش بە پێکەنینەوە هەڵیدایێ: "پێدەچێ پشیلەکە تەواو نەبێ."

- "ئەو زۆر بەز و گۆشتی دەدرێتێ."

- "خۆ ئەگەر نەخۆش بکەوێ، ئەوا پایەبەرز لەماڵ دەرنەدەچوو، پشیلەکە نەساغ نییە، من ئەمڕۆ لەسەر بانەکە بینیم، ئەو لە غیابی پاشا لەگەڵ پشیلە تورییەکان خۆش ڕادەبوێرێ."

ژنێکی دیکە بە چرپەوە گوتی: "کەواتە شتێکی دیکە لە ئارادایە."

"چییە دەڵێی بە دڵت نییە؟ شـــا گوللەتۆپی زیاتری بۆ تۆپەکەی خۆی لەگەڵ خۆی هێناوە."

ژنەکان دەستیان دایە داری دووربینەکەیان و چاویان پێ لە تۆپەکە کرد. یەکێک لە ژنەکان بە قرتەوە: "ئەو ئێمە دەباتە بەرەی پێشەوەی جەنگ."

لە دەرەوەی تاران، ئەو شـــوێنەی دەرفەتێکی وەها نەبوو، تا ژنەکان تووشـــی کەســـانی لایدە بین، بۆیە ڕووبەندەکانی خۆیان لادا و بایەکی گەرم لە سەری دان. بەم جۆرە ڕۆیشتن تا گەیشتنە هاوینەهەواری شێخ ئاغاسی. ژنان هەموویان شێخیان دەناسی. لەبەر ئەوەی ژنەکان دایکی پاشایان خۆشنەدەویست، بۆیە حەزیشیان بە چارەی شێخ نەدەکرد.

- "ئەو شتێکی لەگەڵ شاژن هەیە."
- "هەمیشە کابرا لای شاژنە."

ئەوان بە چاوداگرتنێکەوە گوتیان: "شـــاژن زۆر جاران پێویســـتی بە ڕاوێژی شێخ هەیە."

"یەکێک لە ژنەکان لاســـایی دایکە شـــاژنی کردەوە و گوتی: "دەی وەرە، ئامۆژگاریم بکە. دەی توخوا وەرە، پاشـــەڕۆژم بۆ بخوێنەوە، وەرە ئەستێرەکانم نیشان بدە."

شێخ ئاغاسی لە دەروازە لە پێشوازیی شادا ڕاوەستابوو. ئەو جلێکی هـاوینەی تەنکی لەبەردابوو، ڕیشـــەکەشـــی کە تاســـەر ســـینگ شـۆڕبووبووەوە، زۆر بەجوانی شانەی کردبوو. خێرا بەرەو پیلی شـا

غاریدا، کە هێشتا هەر لەسەر ئەسپەکەی دانەبەزیبوو، دەمی خستە سەر چەکمەی ڕاستی و ماچیکرد. شا لە ئەسپەکەی دابەزی و شێخ ئاغاسیش جڵەوی ئەسپەکەی بۆ گرت.

دیسان ژنانی پاشا ڕووبەندیان پۆشی و چاوەڕێی ئاماژەی شا بوون.

شێخ ئاغاسی پێیگوت: "ڕوسەکان بۆ دوای نیوەڕۆ دەگەن. بۆیە جەنابی پایەبەرز کاتی تەواوی خۆی لەبەردەستە تا لەگەڵ حەریمەکانی لە باخەکەدا پشوو بدەن. کەشوهەوا زۆر خۆشە و هەموو شتێکیش بۆ جەنابتان ساز و ئامادەیە. ئەگەر پاشا ڕێگەم بدا، تا نێو باخەکە یاوەری دەکەم."

پاشاش سەری بۆ لەقاند ئاماژەی بە ژنەکان دا لەسەر پشتی ئەسپەکانیان داببەزن.

شێخ ئاغاسی دەروازەی باخەکەی کردەوە و گوتی: "فەرموو بۆ ژوورەوە و باخی مسکێنی خۆت پیرۆز بکە."

شا بەو دیمەنە سەرسام بوو. لک و چڵی دارەکان لەبن ئاڵوباڵووە سوورەدا شۆڕبووبوونەوە، بە جۆرێک شا لەسەر پەنجەکانی بوەستێ بە هەندێک لەخۆکردنەوە دەیتوانی بە دەمی ئاڵوباڵووەکان لێکبکاتەوە. ژێر دارەکانیش بە مافوور و ڕایەخی جوان و نەخشین ڕاخرابوو، سەریشیان پڕ لە دۆشەک و سەرینی ئاوریشمینی ڕەنگین بوو. چادری گەورە گەورەش سێبەریان بەسەر مێزی گەورزۆنە گەورزۆنەدا کە پڕ لە خواردن و جۆربەجۆر، شەربەتی میوە، سەوزە و ساردەمەنی جۆراوجۆر بوو. بۆنێکی زۆر خۆش و ناوازە دەمار دەمار لەو شوێنەوە دەهات.

شا ڕووی لە شێخ ئاغاسی کرد و گوتی: "ئێمە ئێرەمان زۆر پێخۆشە."

"ئاغاسیش وەها وەڵامی دایەوە: "مسکێنەکەی خۆت هیوای پشودانێکی خۆشت بۆ دەخوازێ. با حەریمەکانیش لێرە هەست بکەن هەروەک

ئەوەی ماڵی خۆیان بێ. هیچ کەسێکی لایدە لەو ناوە نییە، منیش هەرزوو ئێرە جێدێڵم و دەچمەوە ژوور. هەر کاتێکیش پێویستت بە ئێمە هەبوو، ئەوا دەردەست دێمە خزمەتت."
شێخ بە کڕنووشێکەوە گەڕایەوە نێو خانووەکەی خۆی.
کاتێکیش ئەو ڕۆیشت، ژنەکان بە حەپەسانەوە بەنێو باخەکەدا بڵاوبوونەوە. چاویان بەو مێوانە ئەبڵەق بوو، بەڵام دەستیان بۆ نەبرد تا شا ئاماژەی بۆ نەکردن کە دەتوانن لەو خواردن و خواردنەوەیەدا بخۆن و بخۆنەوە. لێ شا خەیاڵی هەر لای ڕووسەکان بوو و بەزموورەزمی ژنەکانی لەبیرچووبووەوە. یەکێ لە ژنەکان زاتی کرد ئاگاداری شا بکاتەوە ئاخۆ دەتوانن دەست بۆ ئاڵوباڵووەکان ببەن.
ئینجا شا ئاوڕی لە ژنەکان و لە ئاڵوباڵوەکان دایەوە. دەستی بردنەوە پشتەوە و بە بندارەکاندا قەدەمی لێدا بەدوای گەورەترین ئاڵوباڵودا گەڕا. ئەو دەنکە ئاڵوباڵوەش زۆر بەزر بوو. لەسەر پەنجەی پێ هەوڵیدا دەمی پێبگا، بەڵام نەکرا. بۆ دووەم جار هەوڵیدایەوە، ئەمجارە دەمی گەیشتێ. ژنەکانیش بە کەیفەوە تیختیخەیان دەدا. ئینجا ئەویش دیسان تەکانێکی بەخۆی دا و خۆی تا هێزی توانی درێژ کردەوە. دەتبینی پێیەکانی لەبەر کشتکردنی دەمارەکانی ڕانی دەلەرزین، خەریک بوو دەنکە ئاڵوباڵووە خەپەکە بخاتە ناو دەمی و لە هاواریش نەدا. خۆی ئەوە ڕووداوە یەک جار دەقەوما. خۆی نەدەبوو کەس پاشا بە سەری کۆتەوە ببینێ. هەر بۆیە یەکسەر ژنەکان ڕووی خۆیان وەرگێڕا. بەڵام خۆ برووسکە ئاسا لە نیگایەکدا بینیان سەری پاشا کەمێک کەچەڵ و کەمێکیش ماشوبرنجی بووە. ئینجا ئەویش کڵاوەکەی خستەوە سەری و بە چاوێکی تووڕەوە لە ژنەکانی ڕوانی. کەشوهەوای ئاهەنگ ئامێز ڕەوایە. هێشتا دەنکە سووورە ئاڵوباڵوە خەپەکە هەر بە چڵەکەوە مابوو. ئەمجارەیان دەستی بۆ برد و لێیکردەوە و بە نێو پەنجەکانی یاری پێدەکرد. تۆ بڵێی

بیپلیشـــێنێتەوە و فڕێیبداتە ســـەر زەوی یان بیخاتە نێو دەمی؟ پاشـــان دەنکە ئاڵوباڵوەکەی خستە دەمی و قەپاڵی لێگرت. تامەکە هەموو شتێکی نەرم کرد.

ئینجا شا گوتی: "نایابە ، زۆر نایاب."

نانەواکە وەستایانە کاری خۆی کردبوو. پاشاش لە ئاستی شیرینییەکان وەستانی بۆ نەبوو. ئەو بیری لەو ئامانجەی نەدەکردەوە کە بۆی هاتبوو، بەڵکو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا تا زگی هێشا یەک لەدوای یەک ئەو شتە خۆشانەی لەسەر مێزەکە دانرابوون، خواردی.

بە ناڵینێکەوە بانگی کرد؛ "چایەکی گەرم بە قەندەوە."

هەر بەڕاســتیش ئەمە هەوڵێک بوو بۆ ســووککردنی ئازاری زگ، چونکە زۆر ئاڵوباڵوی خواردبوون. کاتێکیش چایە شــیرینەکەی لەســـەر کرد و ئێشی زگی هەندێک سووک بوو، ئەوجا بە پاڵکەوتنەوە سەیری ژنەکانی دەکرد کە ئاڵوباڵویان لێدەکردنەوە.

شــا لە شــوێنی خۆیەوە بانگی ژنەکانی کرد و ئاماژەی بۆ دەکردن: "نا ، نەخێر، وەها نا، بە دەست نا، بەدەمتان بیگرن و لێیبکەنەوە."

ژنەکانیش دەستیان لەپشت خۆیانەوە گرت و لەبن دارەکان وەستان. شا بە پێکەنینەوە ســـەیری لێوەکانی ئەوانی دەکرد، کە بەهۆی قەپاڵگرتن لە ئاڵوباڵوەکان ســوور هەڵگەڕابوون. ئەمە ئەوی شــێت کرد. بانگی یەکێک لە ژنەکانی کرد و لێوەکانی مژین. یەک دوو گێلاســـــی گرتن، بەســــەر دەموچاو، بەســــەر لامل و ســــینگ و مەمکیدا پلیقاندییەوە. ژنەکان خۆشــــییان لەو مەیلەی شــــا بۆ ئەوان بینی. ئاخر ئەمە یەکێک بوو لە ساتەوەختە دەگمەنەکان کە شــایان تێدا خۆشــدەویســت. ئەو ئێســتا هی هەمووانە، لێوی هەر ژنێکی ماچ دەکرد کە دەســتی دەگەیشــتێ و بەلایدا ڕەت دەبوو. کاتێکیش گەڕانەوە کۆشک، ئەوا ئەو شتەی ئێستا بینیویانە کردوویانە دەیگێڕنەوە کە چەند چێژ و خۆشــــییان لێ بینیوە. ئەمەش



ئیرەیی لەنێوانیان دەوروژێنی، ئاخر لەو ســـاڵە هەبوو لە لایەن شـــاوە ئاوڕی لێنەدرابووەوە و ماچ نەکرا بوو. ئەو ماستە بێ موو نەبوو.
شا یەک دوو پیاڵە چای خواردنەوە ئینجا قیت لەسەر تەختەبەندەکە لێی ڕاکشا. چاوەکانی داخستن بەو نیازەی هەندێک چاوی گەرم بکا.

بێدەنگییەک باڵی بەسەر باغەکەدا کێشا. ژنەکان چوونە سەر تەختەبەندە گەورەکان دانیشـــتن تا نێرگەلە بکێشـــن. شـــا بە نائارامی نوســـت، چەند جارێک خۆی وەرگێڕا. لە ساتەوەختێکدا هەڵسایەوە. ژنەکانی لە شوێنی خۆی جێهێڵا خۆیشـــــی چووە نێو ئەو خـانوەی کە زۆری پێنەدەچوو نێردەکەی ڕوسی دەگەیشتێ.
شێخ ئاغاسی پێیگوت: "ئەرێ جەنابی شا هێشتا دەخوازێ پشوو بدا؟"
ئەمەی گوت و یاوەریکرد بۆ ژوورێکی تایبەت.
شـــا دەســـتی دایە کتێبێک کە لەســـەر مێزەکە داندرا بوو، چوو لەســـەر کورسییەک لێی دانیشت، پێیەکانیشی خستنە سەر کورسییەکی دیکە و پەڕەکانی کتێبەکەی هەڵدانەوە.
"ئەرێ جەنابی پایەبەرز پێویستی بە شتێکی دیکە هەیە؟"
شا ئاماژەی نەخێری بۆ کرد، ئیدی شێخ کشایەوە و بەجێیهێشت.

دوای کەمتر لە سەعاتێک شێخ گەڕایەوە، بەنەرمی لە دەرکەی دا و دوای مۆڵەت وەرگرتن لە شـــا پیاڵە چایەکی بۆ هێنا. پاشـــان یاوەریی کرد بۆ دیوەکەی دیکەی خـــانووەکە، لەوێ دەبووایە پێشـــــوازی لە نێردەی ڕوســـەکان بکردبایە. ئەوانیش لەســـەر هاتن بوون، لێ پێدەچوو هەندێک دواکەوتبن.
شـــا لە ژووری مێوان و ئاغاســـیش لە دەرکەی پشـــتەوە چاوەڕێ بوو، بەڵام هیچ ســـۆراغی ڕوســـەکان دیار نەبوو. شـــا لە درزی پەردەکەوە

سەیری چیمەنەکەی دەکرد، ئەو شوێنەی قەولوابوو نێردەکەی پێدابێ. بۆ دیدارێکی لەم ئاستەدا ئەوا دواکەوتن بەبێ خەبەردان شتێکی نەخوازراو بوو. شا لەنێو ژورەکەدا هەر ڕاوچکەی دەدا جارێکی دیکە لە درزی پەردەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. شێخ ئاغاسیش دەمێک بوو وەک بت لە دەرکە وەستا بوو. زاتی نەدەکرد لە شا بچێتە ژوور.

شا بەخۆی بە دوای شێخ ئاغاسیدا گەڕا.

لێی پرسی: "چییە، کێشەیەک قەوماوە؟"

"نەخێر. تا ئەو ڕادەی من بیزانم هیچ نەبووە. هەموو شتێک لەگەڵ دایکت بە وردی تاوتووێ کراوە."

شا پێی گوتەوە: "لەوانەیە ڕێگەیان هەڵە کردبێ؟"

شێخ وەها وەڵامی دایەوە: "باڵوێزی ڕوسی دوێنێ بەخۆی هاتە ئێرە تا ڕێگەوبان شارەزابێ." شا بەدەست گرێدان لە پشتەوە گەڕایەوە ژوری چاوەڕوانی میوانان. هەر کەمێک دوای ئەو بەلای شادا هات و پیاڵە چایەکی دیکەی بۆ هێنا.

شا بەدەستێک پیاڵە چایەکەی لادا و گوتی: "باشە دەبێ چەند پیاڵە چا بخۆینەوە؟"

شێخ کە لە تووڕەیی شا دەترسا، خۆی کێشایەوە. بە ئاستەم توانی دەمارگرژییەکەی خۆی جڵەو بکا.

شا نەیتوانی زیاتر خۆی بگرێ، هەدادانی نەما. چووە نێو هۆڵەکە و لەوێوە چاوی لە ژنەکان بوو، کە لە سایەی دارەکاندا پشوویان دابوو. دەستی بۆ بەرکی چاکەتەکەی برد و هەستی بە پارچە کاغەزەکە کرد. ئەو دیسان شتەکەی لەبیر چووبووەوە، ئەو پارچە کاغەزەی بە ملی پشیلەکەی وەکرابوو. "سبەینێ! ئاگاداربە!"

لە شوێنی خۆی حەپەسا، توبڵێی ئەم هۆشدارییە بۆ دەرچوون لە کۆشک پەیوەندی بە ڕوسەکانەوە هەبێ؟ دیسان گەڕایەوە ژووری

چاوەڕوانی میوانان، پەردەکەی هەندێک هەڵدایەوە دەســـتی دایە داری دووربینێ. هیچ شـــتێکی لێدیار نەبوو، لە هەموو لایەکەوە هەر بێدەنگی بوو.
لەپڕ گوێی لە تەقەیەک بو لە دوورەوە هات. تۆ بڵێی سەرچیخ نەچووبێ؟ تۆ بڵێی شـــێخ ئاغاســـیش گوێی لەو تەقەیە بووبێ؟ پەنجەرەی کردەوە گوێی هەڵخست. دیسان گوێی لە دەنگی تەقەیەکی دیکە بووەوە.
شا بانگی کرد: "شێخ؟"
دەستبەجێ شیخ ئاغاسی گەیشتە لای. "ئەرێ گوێت لێبوو؟"
"لەچی؟"
"تەقەکان. دوو جاران گوێم لێبوو."
شـــێخ ئاغاســـی کە زۆر جوان دیار بوو پەشـــۆکا بوو، چووە لای پەنجەرەکەوە وەستا. دیسان دەنگی تەقەیەکی دیکە هات.
ئەمجارەیان شـــا ســـێ و دووی لێنەکرد و فەرمانی بە ژنەکان کرد: "ئامادەبن، دەگەڕێینەوە کۆشک."
لە دەرەوە بووە هەراوزەنا، ژنەکان ڕووبەندیان دادایەوە و هەریەکە و خێرا بۆ لای ئەســـپەکەی خۆی ڕۆیشـــت. بە دەورەدراوی بە تیپی پاســـەوانانی خۆی، ئەوەبوو شـــا بەخێرایی کەوتە خۆ تا بەرەو تاران بگەڕێتەوە. پاســـەوانانی دیکە بە کورتە ڕێگەدا یاوەریی ژنەکانی شـــایان بۆ گەڕانەوە بەرەو کۆشک کرد. دوای ئاوزینگ لێدان لە لەئەسپەکان، شا و پاسەوانەکانی بە خێرایی گەیشتنەوە کۆشک. ئەو دەمودەست هەستی بە جۆرێک پشێوی کرد. خەڵکی چووبوونەوە ماڵەکانی خۆیان و لەپشت پەنجەرەکانەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد.
بە شا ڕاگەیەنرا، تەقە کراوە و یەک دوو کەسیش کوژراون، بەڵام کەس نەیدەزانی ئاخۆ کتومت چی قەوماوە. ئەو ویســـتی یەکســـەر بەرەو مەیدانی شـــار لێبوخوڕێ، لێ پاســـەوانەکانی ڕێگەیان نەدا، بە نابەدڵی

گەڕاندیانەوە کۆشک. لەوێوە بانگی سەرۆکی پاسەوانەکان دەکا تا بچێ وەزیر بێنێتە لای ئەو. پەیکەکە بەو هەواڵە هاتەوە، کە وەزیر بەرەو لای مەیدانی بازاڕ ڕۆیشـــتووە، کە لەوێ ڕووداوەکەوە قەوماوە. هەر بۆیە وەزیر پێینەکرا بوو لەبەردەم شـــا ئامادەبێ، ئاخر چوونی وێ بۆ لای ڕووداوەکە زۆر پێویست بوو.

شا کەوای بیست بانگی کرد: "باشە چ بووە؟"

پەیکەکە وەها وەڵامی دایەوە: "دەقاودەق زانیارییم نییە، بەڵام بیسـتوومە کوژراوێکی زۆر لەوێ کەوتوون."

- "چەند کەسن؟"
- "زیاتر لە بیست کەس. لەوانەیە سیش بن."
- "سی کوژراو؟ کێ تەقەی کردووە؟ کوژراوەکان کێن؟"
- "ئەوەی من دەیڵێم بەگوێرەی دەنگۆ و بەنـدوبـاوە." پیـاوە پەیامهێنەکە بە وریاییەوە وەهای بە پاشا گوت.

شاش بە تووڕەییەوە پێی گوتەوە: "دەی پێم بڵێ، دەنگۆکان دەڵێن چێ؟

- "دەنگۆکان باسی ئەوە دەکەن، زیاتر لە بیست ڕوسی کوژراون."
- "چی؟ ڕوسی؟ چۆن وا دەڵێی کە کوژراوەکان ڕوسن؟"

پەیامهێنەکە قســـەکەی خۆی دووبارە کردەوە: "من یەکێ لە دەنگۆکانم گێڕایەوە."

ئینجا شا فەرمانی پێکرد: "دەی خێرا برۆ، ڕاستییەکەم بۆ بێنەوە."

لە کۆشـــکدا کەس نەیدەزانی چی لە گۆڕەپانی ناوبازاڕدا ڕوویداوە. خۆ ئەگەر یەکێکیش هەبووایە بیزانییـایە، نەیدەوێرا دەمی خۆی لێکبکاتەوە، دەترسا بەر قین و تووڕەیی شا بکەوێ.

خۆ گەر بێت و دەنگۆکە ڕاســـت بێ و لە ڕوســـەکان قەومابێ، کەواتە نوێنەرە تـایبەتییەکەی ڕوس ســـەری تێدا چووە. ئەوکـات ڕوســـیـا بەرپرســـیاری پەلاماردانەکە دەخاتە ســەر ملی پاشـا. ئەویش نەیدەزانی

چی بکا. ئەو ئێستا ئامادە بوو بە لەسەرچۆک ڕۆیشتینیش بێ بهێنێتە سەر مەزاری عەبدولداود بەڵکو لەوێ بپاڕێتەوە و هەموو شتێک ڕاست بکاتەوە.
پێدەچوو پەیکەکەش نەوێرێ جارێکی دیکە بگەڕێتەوە لای پاشا. بێ هیچ سێ و دوویەک پرسەکە ئاڵۆزوبڵۆز بوو، خۆ ئەگەر وەها نەبا، ئەوا وەزیر دەستبەجێ دەگەیشت و ڕووداوەکەی بە پاشا ڕادەگەیاند.
ئەو گومانی لەوەدا نەبوو، کە دایکی فڕی بەسەر ئەو پیلانەوە نییە. دیدارەکەی ئەو لەگەڵ ڕوسەکاندا بە توندوتیژترین شێوە لەبار برا. پاشا و دایکی و ڕوسەکانیش کەوتبوونە داوەوە. باشە ئەگەر هات و نوێنەری ڕوس کوژرابێ، ئەوسا چی بکا؟
کۆشکی دایکی بە تەونێک لە سووسەکار و شۆڤار تەنرا بوو، کونی مارە ڕەشە ژەهردارەکان بوو، ئەمەش هەمووی بە هاوکاریی ئیمامە ئاخوندەکان و هەواڵگرانی بریتانی. "گێل و گەمژە، بەڵێ ئەو گێل بوو، تێیکەوت." ئەو لەخۆی پەست بوو، لە دایکیشی تووڕە بوو.
بە دەنگی بەرزەوە بانگی کرد: "جادووگەر، قەحپە!"
کاتێکیش گوێی لە دەنگی سمی ئەسپێک بوو لە حەوشەی کوشک بوو، سەیری دەرەوەی کرد و تەتەرەکەی خۆی بینی. شا جڵەوی خۆی گرت. چووو لە نێوەڕاستی هۆڵەکە وەستا، چاوەڕێی پەردەداری کرد تەتەرەکە بێنێتە ژوور و خۆیشی بڕوات.
شا ئۆقرەلێبڕانەوە پرسی: "دەی، بیڵێ."
"من ئەمەی خوارەوەم بە چاوی خۆم بینی و بەگوێی خۆشم بیست: سیوچوار ڕوسی کوژراون، لە نێویاندا سی و یەک کەسیان کارمەندی باڵوێزخانەی ڕوسی بوون و سێ کەسی دیکەشیان بازرگانی ڕوسی بوون."

شـــا گوێی لە هیچی دیکە نەگرت، پەیکەکە بینی ڕەنگی پاشـــا گۆڕا و لە شوێنی خۆی بەلادا هات. پیاوەکە ویستی بانگی پەردەدار بکا.
ئینجا شا بانگی کردێ: "دەی زیاتر بگێڕەوە!"
"خەڵک دەڵێن دوێنێ شـەوێ سـێ ژنی ئێرانی لای ڕوسـەکان مابوونەوە. ئایەتوڵڵای تاران، حاجی میرزا مەسـیح ئەو دەنگوباسـەی بەرگوێ کەوتبوو. ئەویش لە کاتی خوتبەی ڕۆژی هەینیدا باسـی کردبوو، لە خوتبەکەدا فتوای جیهادی دابوو. ئەوەبوو بە ڕابەرایەتیی ئاخونـدێکی گەنج، خەڵکەکە جۆشـدراوە کە ئەمڕۆ بەسـەر شـوێنی مـانەوەی ڕوسـەکانیان دادابوو. ڕوسـەکانیش دەروازەی بـاڵوێزخانەکەیـان داخسـتبوو، خۆیـان چووبوونە نێو بـاڵوێزخـانەکە و پەردەکـانیـان دادابوونەوە. ئیـنجـا بەردیـان تـێگرتبوون، دەرکە و پەنجەرەی باڵوێزخانەکەیان شکاندبوو. ئەو ئاخوندە گەنجەی پێشڕەویان بەسـەر شـوورەی بـاڵوێزخـانەکە کەوت و خەڵکیش بەدوایدا. لەو نێوەدا، لە شـوێنێکی نادیارەوە تەقە کرا، هەرچەندە ئیمامەکە لە پشـتەوە پێکرا، کەچی خەڵکەکە هاواری کرد، گوایە لەنێو باڵوێزخانەکە تەقەی لێکراوە. بەمجۆرە شـورە و پەرژینی باڵوێزخانەیان بەزاند و خەڵکەکە بەسـەری دادان. بازرگانێکی ڕوسی هەندێ دراوی زێڕینی بەسەر خەڵکدا پڕژاند تا تووڕەییان هێوربکاتە و هەندێ کات بەدەسـتبێنێ، بەڵکو لە دەرکەی پشـتەوە ڕابکەن و دەربازیان بێ. لێ خەڵکەکە کردبوویانە قەڕاپەسـتانی بەسـەر باڵوێزخانەیاندا دا و ڕوسـەکانیش تەقەی هەواییان بەسـەردا کردن. ئەمەش خەڵکەکەی دەهریتر کرد و کار لەکار ترازا. لە ئەنجامدا پێنج لە خەڵکی ئێمە و هەر بیست و چوار کەسـەکەی ئەوانیش سـەریان تێداچوو. قەحپەکانیش دەرچووبوون.
شـــا لە شـوێنی خۆی لە تووڕەییان دەکوڵا: "دڕنـدەن، ئەوانە هەر هەموویان دڕندەن."

پەیکەکە لە شوێنی خۆی لە ترسان زەندەقی چووبوو، ئینجا پەردەدارەکە هات و ئەوی لەێ لابرد.

شـــا بەنێو دالآنی کۆشـــکەکەدا هەر هاواری دەکرد: "ژنان هەموویان جادووگەرن، هەر هەموویان! هەر لە شـاژنەوە تا دەگاتە قەحپەیەک هەر هەموویان."

•

# ١٨

## ترس

ئێوارەدرەنگ وەزیر گەیشتە کۆشک. پاشای لەسەر کورسییەکەی خۆی بینی. کاتێک ئەو دەرکەوت، یەکسەر پشیلەکە لە باوەشی پاشاوە خۆی هەڵدا و چووە لای وەزیر، خۆی لە قاچەکانی خشاند. وەزیریش شەکەت و ماندوو. دەستێکی بە سەری پشیلەکەدا هێنا: "شەرمین چۆنی؟"

وەزیر لە خانەوادەیەکی وەها بوو، تووشی ئەم جۆرە ڕووداوە قورسانە بووبوو. بەتایبەتیش ئەوەی لە باڵوێزخانەی ڕوسی قەومابوو، لێکەوتەی گەورەی بەدوادا دەهات.

"ئەگەر پایەبەرز ڕێگە بدا، دەمەوێ دووبەدوو لە ژووری تایبەتی خۆت قسەبکەین."

پاشا لە شوێنی خۆی هەڵسا و وەزیریش بەدوایدا ڕۆیشت. دەرکەیان لەسەرخۆیان پێوەدایەوە، لەسەر مێزی گفتوگۆ جێگەی خۆیان گرت.

وەزیر بەکورتی سەری قسەی داهێنا: "ئێمە کەوتینە داوی بریتانییەکانەوە."

شا گومانێکی لەوە هەبوو، بەڵکو وەزیر بە دیدارەکەی لەگەڵ ڕوسەکان زانیبێ.
وەزیر وەها کەوتە قسە: "ئێمە بە یەکدی تۆمەتبارکردن شتەکە چارەسەر ناکەین. ئەم کارەیان تەنیا کێشەکانمان قووڵ و قووڵتر دەکاتەوە. بەدکارێکی سەر بە باڵوێزخانەی بریتانی ڕاستەوخۆ هەواڵی هەبوونی ژنانی ئێرانی لە باڵوێزخانەی ڕوسی بە ئایەتوڵڵا گەیاندبوو. ئایەتوڵڵاکەش پەیوەندیی باشی لەگەڵ بریتانییەکان هەیە و پارەیان لێوەردەگرێ. کاتێک ئەم هەواڵەیان پێداوە، بێ ئاوخواردنەوە جووڵاوە. بەیانی هەواڵی مەرگی سی و چوار ڕوسییەکە دەگاتە مۆسکۆ. بریتانییەکان ویستوویانە ڕوسەکان تووڕە بکەن، بەڵام هەرگیز بیریان بۆ ئەوە نەچووە کردەوەکەی ئەوان بیگەیەنێتە ئەو کێفەڕاتە. ئێستاش بە دڵنیاییەوە باڵوێزخانەی بریتانی شایی و لۆغانیانە. ئەوان گورزی خۆیان وەشاند."
شا لە وەزیری پرسی: "مەبەستت لەوە چییە؟"
وەزیر وەڵامی دایەوە: "لە ماوەی داهاتوو شا ناتوانێ هیچ بکا. بەڵام من پرسیارێکم هەیە. ئەو دیدارەی لەگەڵ نێردەی ڕوسی هەبوو، لەبارەی چییەوە بوو؟"
شا بە شڵەژاوییەوە تەماشای کرد و گوتی: "ئێمەش نازانین چی بوو. کابراش ئێستا مردووە."
وەزیر تێبینی ئەوەی کرد، پاشا شتێکی هەیە لێی دەشارێتەوە. ئەو هەستێکی وەهای بۆ هات پرسەکە لەبارەی هەراتەوە بووبێ. ویستی زیاتر بپرسێ، لێ بینی شا پەشێوحاڵە. وای بەباش زانی کاتەکەی گونجاو نییە تا زیاتر بەرەی لەسەر هەڵداتەوە.
وەزیر گوتی: "وەها باشترە پاشا بچێتەوە ناو جێگەی خۆی. ئێمە نازانین ئاخۆ بەیانی چی لەبن سەردایە."

وەزیر خواحافیزی کرد و ڕۆیشت. شا لە جاران پتر هەستی کرد وەزیر چەند دەسەڵاتدارە و خۆیشی لە بەرانبەردا کەسێکی چەند بێدەسەڵاتە. ترس باڵکێش بوو.

شا دەیزانی زۆر لە ئایەتوڵڵا و شازادەکان پارەیان لە ئینگلستانەوە بۆ دەهات، بەڵام ئەو هەرگیز ئەوەی لەپێش چاوی خۆی دانەنا بوو، ئەوان بەم شێوەیە ئایەتوڵڵا هەڵبسووڕێنن و پیلانەکانی خۆیانیان پێ جێبەجێبکەن. وەزیریش زۆری قسە نەکرد، بەڵام ئەو سەرنجەی دەرخست چۆن لەو پرسەدا پاشاش بەکارهێنراوە. باشە تۆ بڵێی وەزیر مەبەستی چیبێ، کاتێ بە پاشای گوت، ئێستا هیچ دەرەتانی بۆ نەماوەتەوە؟

شا بانگی کرد: "شەرمین! شەرمین!"

پشیلەکە بەپیر دەنگییەوە نەهات.

شا ماندوو بوو، بەڵام خەوی نەدەهات. سەری لەنێو گێژاوێکی بێ کۆتاییدا بوو. لە هۆڵە نیوە تاریکەکەدا تەماشایەکی ئاوێنەی کرد و پەنجەی دۆشاومژەی وەک هەڕەشەیەک هەڵبڕی: "بەیانی دەرسێک بە ئایەتوڵڵادا دەدەین. سەری بە پەتی قەنارەوە دەکەین. بەڵام باشە ئەدی چی لەو سی و چوار تەرمە بکەین؟"

ئاوێنەکە تیشکی چرای ڕەنگ دەدایەوە. شا یەکسەر تەماشایەکی کرد و بەرەو لای پەنجەرە ڕۆیشت. حەوشەکە کشومات، بەڵام لە دەروازەکەوە پاسەوان لەجاران پتر وەستا بوون. بینی چۆن دوو لە پاسەوانەکان پاڵ بە تۆپێکەوە دەنێن. هەروەها یەک دوو پاسەوانی دیکەی بینین لەسەر دیوارەکە بە خۆیان و چەکی دەستیان وەستابوون. نیگای چاوی پەڕییە سەر تەویلەکەش، چەند ئەسپێکیش لەوێ تەیار و ئامادە بوون، ئەو گەڕایەوە ژوورە تایبەتییەکەی خۆی، لەوێوە باشتر دەروازەکەی لێوە

دیار بوو. کاتێک سایەی کڵاوە درێژ و قیتەکەی وەزیری لەسەر دیواری دەروازەوە بینی، ترپەی دڵی زیاتر لێدا. شـــتێک بەر پێیەکانی کەوت، سڵەمییەوە، بەڵام هیچ نەبوو، شەرمین بوو.

"چییە ئێمەت ترساند، ئەوە لە کوێ بووی؟ دەی وەرە با بڕۆین، ئەمشەو نابێ ئێمە لێرە بمێنینەوە." بەدەم ئەم قســـەوە، دانەویەوە و پشـــیلەکەی لەســـەر ناوکەوەکە هەڵگرت و لە باوەشـــی کرد. "پێموابێ وەزیر ئێمەی دەستبەسەر کردووە. لەوانەشە وەها نەبێ، ڕەنگبێ هەموو شتێک بکا تا ئێمە بپارێزێ."

ئەو بۆ ژووری نوستنەکەی ڕۆیشت، شـەرمینی لەسـەر پێخەفەکە دانا، هەموو کورســـییەکانی ســـووڕاندن، بەردەمی دۆڵابی جلەکانی واڵاکرد، دەرووی دۆڵابەکەی کردەوە، دەرووە نهێنییەکەی کردەوە، کە بە ڕێڕەوێکی تەنگەبەر دەیبردە ســـەر گەنجینەکەی. لەوێ چەکمە و تفەنگەکەی ئامادەکرد.

لەو کاتەوەی شـــێخ ئاغاســـی ئەو داڵانە تەنگەبەرە نهێنییە تا ســـەر گەنجینەکەی نیشـــان دابوو، زۆر جار شـــا بۆی دەچوو. لەو کاتەوەش وەزیر دەرماڵەی پاشـــا و دایکی و خزمەکانی تا نیوە دابەزاندبوو، تێچووی حەرەمســـەراشـــی کەم کردبووەوە، ناو بەناو شـــا بە داڵانەکەدا دەچووە ژێرزەمینەکە تـــا دراوە زێڕەکـــانی دەربێنێ. ئەو دراوەکـــانی دەتاواندەوە و دراوی گەورەتری لێ دەروستدەکردن تا بتوانێ خەرجییە گەورەکانی پێ پەردەپۆش بکا. لەو ماوەیەشـــدا شـــا یەک دوو ســـندوقی زێڕی هیندی کردنەوە.

هەروەهـا ئەو چـارپـایە زێڕینەی ژێرزەمینیشـــی، هەمووی بە زێڕ و بەردەگەوهەر ڕازابووەوە، ڕێکخســـتەوە، بۆ ئەو حاڵەتەی ئەگەر هات و مـاوەیەکی زیـاتر لە ژێر زەمینەکە بمێنێتەوە. بۆ هـەر جـارێکیش بـایی خۆی خواردنی لەگەڵ خۆی دەبردە ئەوێ.

جارێکی دیکە دەرکە و پەنجەرەکانی ژووری نووســتنی پشــکنی، ئینجا چووە سەر تەختە خەوەکەی لێی ڕاکشا.

"شــەرمین ئاگادار بە، هەر کاتێک گوێت لە دەنگی پێ بوو لە هۆڵە مینابەندەکەدا، پێویســتە دەســتبەجێ ئاگادارم بکەیتەوە، ئینجا بەیەکەوە هەڵدێین."

هەر ئەوەندە بوو شا سەرە ماندووەکەی دانایە سەر سەرین، خەوێکی قووڵی لێکەوت.

# ١٩

# ئەو ئایەتوڵڵایەی ناپاکیی کرد

ئەو شـــەوە شـا خەونێکی بینی؛ خۆی و پشـیلەکەی بەرێگەیەکی نهێنییدا بەرەو شــــاخەکان هەڵاتن و لەوێ لە ئەشـــکەوتێکی بچووک داڵدەیان وەرگرت، ئەشکەوتەش کۆشکەکەی لێوە دیار بوو.
شــــا لەوێوە بە دووربین هەموو جووڵەیەکی کۆشـــکی خســـتبووە بن چاودێری. بینی وەزیر بە خۆی و دەســـتەیەک لە ئەفســـەران چووە کۆشـک. کڵاوە قووچەکەی لەســـەر بوو، لێ کاتێ لە کۆشـک هاتەدەر، لەجیاتی کڵاوەکەی خۆی، تاجەکەی شای لەسەر نابوو.

ئەوی ڕاســـتی بێ، ئەو شـــەوە هیچ ڕووی نەدا. شـــا و پشـــیلەکەی لە شـەوانی پێشـتر زووتر و باشـتر خەویان لێکەوت. ئەمەش بەهۆی ئەو شـــنەبایەبوو کە لە دەرووی داڵانەکەی دەچووە ســـەر ژێرزەمینەکەوە دەهاتە ژوور. ئەم نەرمەبایە وایکرد پاشـــا و پشـــیلەکەی خۆیان لەنێو

لیفەی گەرمونۆڵ بئاڵێنن و خەوێکی قووڵیان لێبکەوێ، وەک دەڵێن لە حەفت خەوان ڕاست بوونەوە. بۆ بەیانی، پشیلەکە پاشای بەئاگا هێنا. ئەویش لەنێو جێگەکەی ڕابوو، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد، بینی ئاڵاکان تا نیوە دابەزێنراون.

"دیارە ئێمە لەخەودا مابووینەوە." شا وەهای بە پشیلەکەی گوت، کە لای دەرگەکە وەستابوو، چاوەڕێ بوو بچێتەدەر.

لەو کاتەدا لە دەرگە درا.

شا بە چاوی خەواڵووەوە بانگی کرد: "کێیە؟"

"خاوەنشکۆ...؟" دەنگەکە لە دەنگی پەردەدار دەچوو، شپرزە دیاربوو.

شا وەڵامی دایەوە: "باشە، وا دێین."

ئیدی زانی چی لەپێشە بیکا.

زۆری پێنەچوو، شا بە بەرگی سەربازییانەی خۆیەوە لە هۆڵی مینابەندەکە ئامادە بوو. هەرچەندە شوێنەواری خەوە قووڵەکەی هێشتا هەر بە ڕوخسارەوە مابوو، کەچی ڕێک و ڕەوان دەڕۆیشت، وەهای نمایش کرد گوایە ئەمڕۆ ئامادەی کاری گرنگ و چارەنووسسازە.

شا بڕیاری خۆی دابوو، نەدەبوو وەها نیشان بدا لاوازە، بە دڵنیاییشەوە نەدەبوو لەپێش وەزیردا لاواز دیار بێ. زۆر جاران وەزیر وای لێکردبوو باوەڕ بەوە بهێنێ کە ڕۆژگار گۆڕاوە، ئەو سەردەمە نەماوە کە هەر بە تەنیا پاشا بە تاقی تەنیا بڕیار بدا، پێویستی بە ئەنجوومەنی وەزیران هەیە، بەڵام ئەوە واتای ئەو ڕاستییەی دەگەیاند، کە وەزیر بە نیازە لە دەسەڵاتەکانی دابماڵێ. ئەو بووبووە ئەو پاشایەی هەر بڕیارەکانی وەزیری پەسەند دەکردن، پاشایەک هەر بە تەنیا بەڵگەنامە مۆرکراوەکانی ئەوی واژۆ دەکردن. ئیدی دەبێ ئەو دۆخە ببێتە شتێکی ڕابردوو.

هەر بۆیە ئەو جلی سەربازییانەی خۆی پۆشیبوو. ئەوەش ڕاستی بوو جاران زۆر بایەخی بە قاوەڵتی بەیانی دەدا و چێژی لێ دەبینی، کەچی ئەمڕۆ هەر ئاوڕیشی لێنەدایەوە. بە زگێکی بەتاڵەوە بانگی کرد: "دەی بانگی سەرکردەی هێزی ئاسایش بکە."
پەردەدار دەستبەجێ فەرمانەکەی بەجێهێنا.

زۆری پێنەچوو شا گوێی لە دەنگی پێی ئەفسەری بەرپرسی هێزی ئاسایش بوو لە پەیژەکان سەردەکەوت. هەر کابرا پێینایە نێو هۆڵەکە، دەستی چەپەی خستە سەر شمشێرەکەی و سڵاوی لە پاشا کرد و بێئاسا لە شوێنەکەی خۆی وەستا.
شا بە گەفەوە قسەی لەگەڵ کرد: "تۆ بەرپرسی هێزی ئاسایشی ناو شاری؟"
بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، خاوەنشکۆ."
"لەژێر بەرپرسیارێتیی تۆدا ئەو سی و چوار ڕوسە کوژران؟"
پیاوە لەرزۆکەکە بێدەنگ بوو، سەری بەسەر سینگیدا بەردایەوە.
ئینجا شا فەرمانی پێکرد: "دەی شمشێرەکەت لەخۆت بکەوە و لێرە لەسەر زەوی دایبنێ."
بە دەستێکی لەرزۆکەوە ئەفسەرەکە شمشێرەکەی لە خۆی کردەوە و لەسەر ناوکەوەکە لەبەردەم پێی پاشادا داینا.
ئینجا شا پێیگوت: "دەی جلە سەربازییەکەشت داکەنە."
پیاوەکە نەیدەزانی ئاخۆ بە باشی گوێی لە قسەکەی پاشا بوو یان نا.
"دەی هەموو شتێک داکەنە، تۆ چیدی سەرباز نەماوی، بەڵکو تەنیا شکستخواردوویەک!"

به ڕوخسـارێکی ڕەنگبزڕکاوەوە کابرا جلە فەرمییەکانی لەبەرداکەندن و هەر بەتاوی[10] دەرپێ مایەوە.
ئەوسا شا بەسەریدا شیڕاند: "دەی لەبەرچاومان ون بە، دەنا مەرگی خۆت بە چاوی خۆت دەبینی."
پیاوەکە بە پڕتاو بەرەو دەرەوە تێیتەقاند. پەردەداریش جل و شمشێری کابرای لەگەڵ خۆی برد.
پاشا بانگی کردێ: "بانگی پەیکەکەم بۆ بکە!"

شا ئەو ئەرکەی بە تەتەرەکەی سپارد: "هەر ئێستا برۆ و مەوەستە، بگەرە لای شەعبان، ئەم شتەی خوارەوەی بە گوێدا بدە: خۆت و دەستەیەک لە پیاوەکانت برۆنە سەر ماڵی میرزا مەسیح. مێزەرەکەی لەسەر بکە و بیخە ملی، لە دوای خۆی ڕابکێشە تا گۆرەپانی باڵوێزخانەی ڕوسیا، لەوێ بە بەرچاوی خەڵکەوە سزای بدە. تۆ دەبێ ئەوەندە ئەشکەنجەی بدەی و سووکایەتی پێبکەی، بە شێوەیەک هەر بەیانی هەواڵەکە بگاتەوە مۆسکۆ."

شەعبان تاوانکارێک بوو، هەندێ جار فەرمانە دژوارەکانی شای جێبەجێ دەکرد. ئەو بە شەعبانە بێ موخ، پیاوی بێ مێشک ناسراو بوو. ئەو سەردەستەی کۆمەڵە کەسێکی شەڕانگێز بوو، هەموو شتێکیان لە پێناو پارەدا دەکرد. دوای گەیشتنی پەیامەکە، شەعبان دەستبەجێ بە کارەکەی خۆی هەڵسا.
پیاوەکانی شەعبان بە خۆیان و تێلا قورسەکانیان لەبەردەم دەروازەی ماڵی ئایەتوڵلا ئامادەبوون. شەعبان هەر لە دەرکە وەستابوو، لەکاتێکدا پیاوەکانی لەناکاو بەسەر پیرەپیاوەکەیاندا دا، ئەو هێشتا هەر دژداشە

[10] هەر بەتاوی...: واتە بەتەنیا هەر بەوەوە.

سپییەکەی خەوتنی لەبەردابوو، لای حەوزی ئاوی حەوشەکەی وەستابوو. ئایەتوڵڵا هەوڵیدا بەسەر بانی خانووەکەی خۆی دەربازبکا، بەڵام بەر لەوەی بگاتە سەر دیوارەکە، یەکێ لە پیاوەکان غاری داێ و پێیەکانی گرتن. ئینجا پیاوێکی دیکە مێزەرەکەی سەری گرت و لە ئەستۆی وەرئاڵاند و ئایەتوڵا پیرەکەی بۆ دەرەوەی ماڵەکەی ڕاپێچ کرد. ئایەتوڵڵا بێدەسەڵاتەکە هەر هەڵدەلەرزی و هاواری دەکرد: *ئەلئەمان*: خوایە بمانپارێزە، بمپارێزە![*]

پیاوەکانی شەعبان هیچ گوێیان بە هاتوهاوار و پاڕانەوەکەی کابرا نەدا و بەدوای خۆیاندا ڕایانکێشایە گۆڕەپانی بەردەمی باڵوێزخانەی ڕوسی. خەڵکی ئاسایی سەر جادەوبەریش، کە ئەم شتەیان بەچاوەکانی خۆیان بینیی، بڕوایان نەدەهات.

بۆ ئەوەی پاشا شتەکان بخاتە ژێر چاودێریی خۆی و ئاگای لە هەموو شتێک بێ، شێخ ئاغاسی بە پەیامێکەوە ناردە گۆڕەپانی باڵوێزخانەی ڕوسی: بڕۆ بزانە ئایەتوڵڵا ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجە بدرێ تا دەنگی گریان و فوغانی دەگاتە مۆسکۆ.

شێخ ئاغاسی بە شێوەیەک چووە ئەوێ کەس دەرکی پێنەکا، بەڵام مشووری ئەوەشی خوارد لە شوێنێک بوەستێ هەموو شتێکی لێوە دیار بێ.

دەنگوباسی ئایەتوڵڵا گەیشتە بازاڕ، دوکاندارەکان بەوەی گوێیان لێبوو سەرسام و هێدمەگرتی بوون. ئاخر ئەمە سووکایەتییەکی بێ پێشینە بوو بە ئیسلام بکرێ، بەوەی ئایەتوڵڵایەک بەمجۆرە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ. ئیدی وازیان لە دوکانەکانیان هێنا و بەرەو باڵوێزخانەی ڕوسی ڕۆیشتن. پیاوەکانی شەعبان ئایەتوڵڵا پیرەکەیان لەسەر زەوی

بەپشتدا دابوو، پێیەکانیان بە دارێک توند بەستبووەوە، ئینجا بەتوندی لە بەرپێیە ڕوتەکانیان دەدا.
ئایەتوڵڵا پیرەکەش هەر دەینالآند: "لا ئیلاهە ئیللەڵڵا.. لا اله الا الله."
یەک دوو لە دوکاندارەکان، کە لەنێو حەشـاماتەکەدا شـێخ ئاغاسـییان بەدی کرد و ناسـییەوە، بەرەو ڕووی چوون و داوای یارمەتییان لێکرد. بەلآم ئەو پێیڕاگەیاندن ئەمە بەفەرمانی ڕاسـتەوخۆی پاشـایە، ئەو هەر دەتوانێ چاودێری بکا و هیچی لە دەسـت نایە و بۆشـی نییە خۆی تێهەڵقورتێنێ.
کۆمەڵە کەسـێک هەوڵیاندا ئایەتوڵڵا لەدەسـتی ئەشکەنجەدەرانی ڕزگار بکەن، بەلآم ڕاسـتەوخۆ کەوتنە تەقەکردن. ئەوان ڕوون و ئاشـکرا ئەوەیان دەربڕی، هەر کەسـێک خۆی تێهەڵبقورتێنێ و یەک هەنگاو بچێتەپێشەوە، دەمودەست سزای ئەویش دەدەن.

ئەوە بوو دوکاندارانی بازاڕ لە ڕێی گالیسـکەکانەوە بەرەو کۆشـک ڕۆیشـتن تا قسـە لەگەڵ وەزیر بکەن، بەلآم ئەو لەوێ نەبوو. ئەو کۆبوونەوەیەکی نهێنی لە ژووری ئامادەکاریی جەنگ، لە قەلآیەکی دەرەوەی شار لەگەڵ جەنگاوەراندا هەبوو.
دوکاندارەکان بە دەسـتی بەتاڵەوە گەڕانەوە مەیدانی باڵوێزخانەکە و دیسان لە شێخ ئاغاسی پاڕانەوە بەڵکو شتێک بە شتێک بکا و یارمەتی ئایەتوڵڵا بدا.
شێخ ئاغاسیش پێیگوتن: "باشە با بزانم ئاخۆ چیم پێدەکرێ."
ئینجا چووە لای شەعبان و قسەی لەگەڵ کرد.
شەعبانیش بانگی پیاوەکانی کرد: "دەی ئەوەندە بەسە! ئەو دەرسی خۆی وەرگرت."

ئینجا ئەو پەتەی پێی ئایەتوڵلایان پێبەســتبوو، لێیان کردەوە و لەســەر زەوی درێژیان کرد.

پاشــان ئایەتوڵلا حاجی میرزا مەســیح خرایە ســەر دووشــکەیەک بەرەو ماڵەوەیان بردەوە.

ئەو ڕۆژەش وەک نارەزایەتی دەربڕین دوکانەکان داخران.

## ٢٠

# پرسە

سـێ ڕۆژی ڕەبەق تێپەڕی. هێشـتا بازاڕی تاران هەر داخرابوو. لە مزگەوتی شـارەکەدا، ئەو مزگەوتەی جاران ئایەتوڵڵا پێنج فەرزە نوێژی تێدادەکرد، ئەوەندە پڕ بوو قەت جەنجاڵیی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو. پیاوە پیرەکەش هی ئەوە نەبوو لەسـەر پێی خۆی بوەسـتێ. ئەو بە دارەبازێک دەهێنرایە مزگەوت، ئیدی لەوێ هەر بە دانیشـتنەوە نوێژی دەکرد، لە کاتێکدا بە سەدان نوێژکەر لەپشتە ئەودا نوێژیان دابەستبوو. لەشـکریش خرابووە حاڵەتی ئامادەباشـییەوە تا ئەگەر هات و ڕوس لەشکرکێشییان بۆ سەر وڵاتەکە کرد، لەشوێنی خۆیدا ڕایبگرن.
لە ترسـی ئەوەی نەوەک نـاڕەزایەتیی بـازاڕ لە تـارانەوە بتەنێتەوە بۆ شارەکانی دیکە و ڕەشەبای تووڕەیی هەڵبکا، ئەوە بوو وەزیر وتووێژی لەگەڵ نوێنەرانی بـازاڕدا کرد. ئەو توانی هەنـدێ ئـارامیـان بکـاتەوە،

بەجۆرێک وڵات نەکەوێتەوە سەختانگێکی[41]دیکە. دوای ئەوە وەزیر چووە لای ئایەتوڵڵا بەتەمەنەکە، دەستی ماچکرد و داوای لێبوردنی لێکرد.
دوکاندارانی بازاڕیش ئەو پاکانەیەی وەزیریان پەژراند و مانگرتنەکەیان شکاند و گەڕانەوە سەر کاروکاسبیی خۆیان، جارێکی دیکە دوکانەکانیان کردنەوە.

لەو نێوەشدا شا پەنای بۆ لای شێخ ئاغاسی برد. پیاوەکەش بەهرەی ئەوەی هەبوو کەسێکی شپرزە و ئۆقرەلێبڕاو هێور بکاتەوە. بە ڕۆژ و شەو ئەو لە کۆشک نەدەڕۆیشت. ئامادەبوونی ئەو وەک ئامرازێکی هێورکەرەوە وابوو.
شێخ ئاغاسی وای پێباش بوو بۆ ئەوەی ئاماژەیەکیش بێ بۆ مۆسکۆ، بەگوێرەی دابەونەریتی ئێرانی پرسە بۆ کوژراوە ڕوسەکان دابنرێ. ئیدی چادری گەورۆنە گەورۆنەیان لە لای باڵوێزخانەکەدا هەڵدران، ئینجا ئەو لەباتی شا داوای لە هەموو خەڵکی کرد بەڵکو لە پرسەکەدا بەشدار بن و یادی کوژراوەکان بکەنەوە. لەوێ مەنجەڵی گەورە گەورەی بە زنجیر لەسەر ئاگر دانران ژەمی زۆروزەوەندیان ئامادەکرد تا خەڵکی سەرپرسە بە یەکەوە نان بخۆن.
ئایەتوڵڵاش لە فەقێ و سوختەکانی خۆی قەدەغەکردبوو بچنە سەر پرسەکە. ئاخر شتێکی ناماقووڵ بوو بچێتە پرسەی کەسانێک، کە ژنی ئێرانییان بردبوونە ماڵی خۆیان و لەگەڵیان ڕابواردبوون. ئەوەش دەگوترا گوایە لەو شەوەدا ژنەکان شەرابیان خواردووەتەوە و ئینجا چوونەتە باوەشی ئەو دەستە بازرگانەی ڕوسی. بەمجۆرە ڕوسەکان ئابڕووی ژنە ئێرانییەکانی بردبوو. ئایەتوڵڵاش بیستبوویەوە و قسەی

---

[41] سەختانگ: تەنگژە، قەیران.

لەو بارەیەوە کردبوو. ئیدی تەنانەت بۆ سـوالکەرانیش نەبوو، بەلای ئەو چادرە گەورانەدا بچن کە خوان و سفرەی ڕازاوەش ڕاخرابوو.
بۆ ئەوەی ڕێ لەوە بگیرێ لەبەر نەچوونی خەلکەکە، پرسەکە سووک و ڕیسـوا بکرێ، شـێخ ئاغاسـی ڕێنمایی بۆ سـوپا دەرکرد بە جلی مەدەنییەوە بچنە پرسـەکە، هەروەها بانگهێشـتی شـا و تەواوی حەرەمسەراکەی بۆ سەر تازیەکە کرد.

کاتێکیش دوای نیوەڕۆ شـا بە جلێکی تەواو ڕەشـپۆشـەوە بەرەو بالوێزخانەی ڕوسـیا جوولا، بەدوایدا ژنەکانیش بە بێدەنگی خۆیان چارشێو و ڕووبەندی ڕەشـەوە چوونە ئەوێ. تیپێک لە سـەربازەکانیش لە پێشـیاندا بەخۆیان و بە ئالای نیوەنزمکراوەوە چوونە ئەوێ و سـەردولکەی[42] فارسـیش لەوێ خوێندرانەوە. کاتێکیش پاشـا گەیشـتە دەروازەی بالوێزخانەکە، وەزیر بە پرتاوەوە خۆی گەیاندە لا.
وەزیر کڕنوشـێکی بۆ پاشـا برد و بە نەرمییەکەوە پێیگوت: "ڕوسـەکان لەشکرکێشییان کردووەتە سەر ولات."
ئیدی شـا بێ بیرکردنەوە، ژنەکانی لەوێ بەجێهێشـت و لەگەل وەزیر بەرەو سەربازگەکە ڕۆیشت.
لە ژووی کۆبوونەوەی کاروباری جەنگدا، شـا پرسـی: "ئایا ڕوس بە شێوەیەکی فەرمی جاڕی شەڕیان لە دژدا داوین؟"
وەزیریش وەها وەلامی دایەوە: "نەخێر، هیچ شتێک لەو بارەیەوە ڕووی نەداوە. ئەوان دەسـتیان بەسـەر بەشـێک لە ئازەربایجاندا گرتووە. ئێمە سـالەهای سـالە شـەڕ لەسـەر ئەو ناوچەیە دەکەین. زۆر جاران ئێمە بردوومانەتەوە و هەندێ جاریش دۆڕاندوومانە. بەلام ئەم جارەیان شتێکی دیکەیە."

---

[42] سەردولکە: ئەو بەندانەی وەک شین لە پرسە و ماتەمدا دەگوترێ.

"شتی دیکه چییه؟"

"ڕوسیا ڕوسیای جاران نییه. ئەوان بوونەتە یەکێ لە خاوەن بەهێزترین سوپای سەر زەوی. سوپای ئێمە لەچاو هێزەکەی ئەوان لەبەر پێیان دەچێ."

شا لە بەرسڤدا گوتی: "ئێ باشە ئەدی فرەنسییەکان چاکسازییان لەنێو سوپاکەماندا نەکردووە؟"

"ئێمە ئەزموونمان نییە و بە سواری ئەسپ و سەد دووسەد تۆپی فرەنسی ناتوانین ئەم جەنگە ببەینەوە. هەر بە تەنیا تفەنگ و گوللە نایخوا، بەڵکو لەشساغیی وڵات و ورەی لەشکر دەیخوا. وڵاتەکەمان کێشەی پارەی هەیە، سیاسییەکانی گەندەڵ بوونە، ئیمام و ئاخوندەکان دەکرێدرێن و خەڵکەکەش لاواز و زەبوون. ئێمە لەسەر لێواری خەرەندی تێچوونین."

شا پێیگوتەوە: "ئەرێ وەزیر بۆ ئەوە ئێمەی هێناوەتە ئێرە تا ئەو شتەمان پێ بڵێ؟"

وەزیریش وەها وەڵامی دایەوە: "ئەو جۆرە ڕاستییانە هەر دەبێ لە ژووری جەنگ تاوتوێبکرێن، چونکە جەنگ ڕێگەیەکی دروست نییە. ئێمە دەبێ چارەسەرێکی سیاسییانە بۆ ئەو کێشەیە بدۆزینەوە. مایەی هۆشمەندییە نێردەیەکی پلەباڵا بنێرینە مۆسکۆ، تا بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون بکەنەوە و بێتاوانی ئێمەش لەو پرسەدا بسەلمێنن. خۆ ئەگەر جەنابی پایەبەرز پەسەندی بکا، ئەوا ڕاستەوخۆ نێردەکە پێکدەهێنم. دواتر کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ وەزیر و سەردارانی جەنگ هەیە، من هەر خێرا لە ڕاوێژەکان ئاگادارتان دەکەمەوە."

شا بێ ئەوەی تەماشای وەزیر بکا، وەها وەڵامی دایەوە: "دیارە وەزیر پێشتر بڕیاری خۆی داوە."

"نەخێر، خاوەنشکۆ، بە دڵنیاییەوە نەخێر. ئەوە تۆیت بڕیار دەدەی."

ئینجا شا پێیگوتەوە: "بیرێکی لێدەکەینەوە."
پاشا بە دەورەدراوی بە پاسەوانەکانی گەڕایەوە کۆشک.

لە کۆشکیش شاژنی دایک چاوەڕێی هاتنەوەی کوڕەکەی دەکرد.
لە پشت پەردەوە هەموو شتێکی کردبوو تا لەگەڵ ڕوسەکان پەیوەندی بکا و بسازێ، بەڵام ڕوسەکان هەموو دەرگەیەکیان بە ڕوودا داخستبوو. ئەوان وەها هەستیان کرد گوایە لە ڕێی خانمی شاژنەوە لەخشتەبراون. بۆ ئەوان شتێکی حاشاهەڵنەگر بوو بە چاوی زەقەوە بەسەر تەپکەدا کەوتبوون. هەر بۆیە وەڵامی ئەو پەیامانەی مەهدولیا بۆی ناردبوون، نەدابووەوە.
تەنانەت شا بە خۆیشی نەیدەویست لەگەڵ شاژن بدوێ. ئاخر ئەو بێهوودە چەندین جار داوای کردبوو بیبینێ و قسەی لەگەڵدا بکا.
مەهدولیا هەواڵی لەشکرکێشییەکەی ڕوسی بۆ ئازربایجانی بیستبوو، هەروەها دەشیزانی وەزیر لە ژووری جەنگدا لەگەڵ شا وتووێژی کردووە. هەنووکەش ئێستا ئەو لە کۆشکە تا لەگەڵ شادا بدوێ. پاشاش پشتگوێی خستبوو، بەڵام خۆ ئەو بەدوایدا هاتبووە هۆڵی ئاوێنەبەندەکە.
مەهدولیا بە پەرۆشییەوە بە شای گوت: "دەبینم شا خەمبارە، دەی قسەم لەگەڵ بکە، خەمەکەت هەڵڕێژە و بەبای کە."
"بە گوێرەی قسەی وەزیر بێ، ئێمە پێشوەختە جەنگەکەمان دۆڕاندووە، ئەو وەهای دەبینێ، پێویستە نێردەیەک بنێرینە مۆسکۆ. لەم ساتەوەختەدا کۆبوونەوەیەکی خێرا و ناکاو لەنێوان وەزیرەکان و سوپاسالارانی جەنگدا هەیە."
مەهدولیاش وەها هاتەدەنگ: "وەزیر ڕاست دەکا. جەنگ لە دژی ڕوس هی ئەوە نییە ئێمە بیبەینەوە. ناردنی نێردەیەک بڕیارێکی ئاوەزمەندانەیە، بەڵام پێویستە شا خۆی سەرکردایەتی شاندەکە بکا."

"ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ من خۆم بچمە مۆسکۆ تا داوای لێبوردنیان پێشکەش بکەم؟"
"پێویست بەوە ناکا. من لە باتی شا دەچم."
ئەو پێشنیازە بۆ شا سەرسوڕهێنەر بوو.
ئینجا شا بە هەستیار و وریژێنەرانە وەلامی دایەوە: "ئاخر خۆ تۆ سەری بەلاکە بووی."
دایکیشی بە توندی وەلامی دایەوە: "ئەوە بۆ شا گونجاو نییە بەم چەشنە لەگەڵ ئێمە بدوێ. من دایکی تۆم، تۆ گۆشت و خوێنی منی. ئەوەی من دەیکەم دەستپێشخەرییە بۆ بەختەوەرکردنی منداڵەکەم. کەس ناتوانێ من بە کێفەڕاتەکە تاوانبار بکا. ئەوەی من کردم، بۆ چاکە و بەرژەوەندیی شا بوو."
"کامە چاکە و کامە بەرژەوەندی؟!" شا لە شوێنی خۆیەوە قیژاندی.
"کۆشکەکەت لانەی شۆڤار و هەواڵدزانە. لە دەوروبەری تۆدا هەموویان لە لایەن بریتانییەکانەوە کڕدراون."
"بریتانییەکان لە هەموو شوێنێک هەن. ئەمە خۆی ڕاستییەکە حاشای لێناکرێ، تەنانەت لە کۆشکی پاشاش. ئێمە دەبێ لەگەڵ ئەو ڕاستییە هەڵبکەین. دەی بمنێرە مۆسکۆ، ئەمەش هەر لە نێوان من و تۆدایە و هەرگیز نابێ بریتانییەکان پەی پێ ببەن."
شا لەسەر کورسییەکەی دانیشت، هەوڵیدا هزرەکانی خۆی کۆبکاتەوە و ڕێکیان بخا.
مەهدولیا لە پاڵ کورسییەکە هاتەسەرچۆک، دەستی توند گرت و بە نەرمی پێیگوت: "گوێم لێبگرە، من خانەوادەی پاشایەتیی ڕوسی دەناسم، دایکم کاترینیای بینیبوو. بە منداڵی لەوێ بووم. ئەگەر یەکێک کاریگەریی بەسەریانەوە هەبێ، ئەوا منم. خۆ ئەگەر وەزیر بڕواتە مۆسکۆ و قەناعەت بە ڕوسەکان بێنێ بگەڕێنەوە ئەودیوی سنووری پێشوو،

ئەوسا تۆ ئەو دەکەیتە پاڵەوان. من دیاریی شاهانە بۆ قراڵ، بۆ ژنەکەی، بۆ دایکی و بۆ کچەکانی دەبەم و کێشەکە چارەسەردەکەم."

پاشا بە دوودڵییەوە پرسی: "دیاریی شاهانە؟"

"بازنە و ملوانەکەی هیندی ئەوانەی لە ژێرزەمینەکەن، لەگەڵ شمشێری تەلایی."

"باسی ئەوە هەر مەکە! زێڕ و گەوهەری هیندی هەر شایستەی ئێرەن و لێرە دەبێ بمێننەوە. ئەوە میراتی ئێمەیە و ئەرکی سەر شانیشمانە بیپارێزین."

شاژن بەمجۆرە هەڵیدایێ: "من ئەوە دەزانم، بەڵام پرسەکە پرسی مان و نەمانە. تۆ زێڕ بە خاکەکەمان دەگۆڕیتەوە. خۆی شتێکی دیکەش لە گۆڕێدا هەیە، ئەو شتەش لەوە گرنگترە خۆت و وەزیر لە جەنگدا بیدۆڕێنن."

ئینجا لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە سەرپێ و درێژەی بە قسەکەی دایەوە: "ڕوسەکان دەیانەوێ لەگەڵ شا قسەبکەن، هەر بۆیە نێردەیەکیان بۆ تاران نارد. هەرچەندە پەیامهێنەکە کوژرا، لێ پەیامەکە هەر ماوە. قراڵی ڕوس ویستوویەتی شتێکی گرنگ بە شا بڵێ. دەی من وەک پەیکێک بنێرە مۆسکۆ. دەچم گوێ لە قراڵ دەگرم."

پاشاش لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵسا. دایکە شاژن بە ڕووی خەنییەوە، شانی ماچ کرد و بە چرپەوە پێیگوت: "من هەمیشە لە پشتی تۆم."

# ٢١

# باب

شا ویستی گەشتەکەی دایکی بۆ مۆسکۆ لە چاوی وەزیر بشارێتەوە. بەلام خۆ هیچ شتێک لە چاو و ئاگاداریی ئەمیر کەبیر بزر نەدەبوو. هەر بۆیە دەبوو شا ئەرکەکەی مەهدولیا بۆ وەزیر روون بکاتەوە.
وەزیریش هەموو هەوڵێکی خۆی دا تا شـــا بهێنێتە رەداین بەوەی مەهدولیا بۆ ئەو ئەرکە سیاسییە ئالۆزە تێکچرژاوە قورسە دەست نادا تا بچێ لەگەڵ روسەکان بکەوێتە گفتوگۆ و دانوستان. وەزیر بە راوێژ و گفتوگۆ لەگەڵ وەزیر و سـوپاسـالارەکانی ئامادەیان بەوەدابوو بە نیازە لەگەڵ روس لەسەر مێزی گفتوگۆ دابنیشێ.
"بڕیارەکە دراوە. وێرای ئەوەش خۆ دایکمان هەر بەتەنیا ناچێتە ئەوێ، ئێمە شـێخ ئاغاسـاییمان لەگەڵ ئەودا بەرێکردووە. هەر وەزیریش بەم شتە دەزانێ. هەر کاتێکیش مەهدولیا بە دەستی بەتاڵ گەرایەوە، ئەوسا نۆرەی وەزیر دێ ئەسپی خۆی لەو مەیدانە تاوبدا."

بەم قسەیە شا کۆتایی بە تاوتوێکردنی پرسی چوون و نەچوون بۆ مۆسکۆ هێنا.

لە دەرەوەی کۆشک وەزیر تووشی پەیکێک بوو تازە لە شارەوە هاتبوو. سەر و شان و ملی تۆزاوی بووبوو. ئەسپەکەی بەرەو لای وەزیر لێخوڕی و چرپاندییە گوێی وەزیر: "باب ڕاپەڕیوە." بە دەم ئەم قسەیەوە زەرفێکی نامەشی دایەدەست.
باب سەرکردەیەکی گەنجی ئەفسووناوی بوو لە شیراز. شارەکەش دەکەوێتە لای باشووری وڵات، سەروبەندی هەزار کیلۆمەترێک لە تارانەوە دوورە. کاتی خۆی پایتەختی بنەماڵەی دەسەڵاتداری زەندییەکان بووە، ئەم دۆخە درێژەی کێشابوو تا سوڵتان مەحمودی ئەفغانی بەسەریدادان و هەموو شتێکی لەناوبرد. شیراز دوو شاعیری مەزنی هێناونەتە دونیا: حافز و سەعدی. هەردووکیشیان لەوێ نێژراون.
کەسانی دەوڵەمەند و بازرگانەکانی ئەوێ کۆشک و تەلاری جوان و ڕەنگینیان لەوێ بنیاتناوە. ئەوانە جۆرە خانوویەکن زیاتر لە خەونی بەهەشتاوی دەچن لەوەی شوێنێک بن بۆ ئەوەی ئادەمیزاد تێیدا بژیێ. ئەوان ناوجەرگەی شیرازیان وەک شوێنگەیەکی خوایی لێکردووە، هونەری تەلارسازیی ئیسلامی لەوپەڕی شکۆ و هێز و کەشخەییدا خۆی تێدا نمایش کردووە.
ڕاپەڕینی باب لەوێ بۆ وڵات هێشتا لە لەشکرکێشیی هێزی بێگانە بۆ سەر وڵات دژوارتر بوو، چونکە ڕاچەنین و یاخیبوونێکی ئۆلییانە[٤٣] وڵاتی لە نێو خۆیدا هەلابەهەلا[٤٤] دەکرد.

---

[٤٣] ئۆل: دیین، ئایین.

[٤٤] هەلابەهەلاکردن: پارچەپارچەکردن.

باب ویستی به تەواوی ڕێگەیەکی دیکە لەوەی تا ئێستا وەک نەریتێکی شیعە گیراوەتەبەر، لێبگرێ و لەسەری بڕوا. چەندین سەدەیە شیعەکان چاوەڕێی فریادڕەسێک دەکەن، چاوەڕێی مەهدی دەکەن و وەک ڕزگارکەرێک لێی دەڕوانن. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون، دوای محەمەد پێغەمبەر، دوازدە ئیمامەکەی بەدوادا دێن، کە دوازدەهەمینەکەیان مەهدییە.

چواردە سەدە لەمەوبەر محەمەد بانگی هەوادار و شوێنکەوتووەکانی خۆی کرد لە دەوری کۆببنەوە. ئینجا چووە سەر پشتی وشترێک و فەرمووی: "هۆ خەڵکینە! ئەوەی منی خۆش دەوێ، پێویستە عەلیشی خۆش بوێ. عەلی گیانی منە، گیانی من و شوێنکەوتەی منە."

عەلی زاوای محەمەد بوو. پاشان بووە چوارەمین خەلیفە لە جیهانی موسڵمانێتیدا. شەوێکیان لەکاتی نوێژکردندا و هەر لە مزگەوت شیرێکیان لە پشتی ملی دا و کوشتیان.

ئێرانییەکان، ئەوانەی دژی عەرەبەکان وەستانەوە، عەلییان لێهەڵبژارد، لە دوای ئەویش حەسەنیان وەک شوێنکەوتەی ئەو لێگرت، بەڵام عەرەب ئەم لێگرتنەیان ڕەتکردەوە. حەسەن تا لە ژیاندا مابوو حوکمی دەستبەسەریی بەسەردا درا. ئینجا حوسێن، کوڕەکەی دیکەی عەلی، دوای باوکی وەک سێیەمین کەسی شوێنکەوتووی پێغەمبەر ڕاپەڕی، کەچی لە ئەنجام و لە شەڕێکدا سەریان لێکردەوە. باقری کوڕی حوسێن وەک چوارەمین شوێنکەوتە داوای دەسەڵاتی کرد، بەڵام ئەویش بە ڕۆژ نەیدەتوانی خۆی لە کەس ئاشکرا بکا و هاموشۆی مزگەوتێ بکا تا قسە بۆ خەڵکەکەی خۆی بکا و بۆ بانگەوازەکەی خۆی دنەیان بدا. جەعفەری کوڕی موساش، هەروەک باوکی حوکمی ئەوەی بەسەردا سەپا تا لە ژیاندا ماوە نابێ قسە و وتار بدا. کازمی کوڕی جەعفەریش بەشی هەرە زۆری ژیانی خۆی لە زینداندا بەسەربرد و ڕەزای کوڕیشی بە ترێ

دەرمانخوارد کرا. هەرچی دەربارەی تەقییشـــە، واتە کوڕەکەی ڕەزا و نەقی کوڕی تەقی و ئەســـغەری کوڕی نەقی شـــتێکی وەها نەزانراوە. مەهدیش کوری ئەســغەر بوو، ئەمەیان دوازدەمین شــوێنکەوتەیان بوو، ئەو توانی لە کوشت و کوشتارەکان ڕابکا و پەنا بۆ ئێران ببا. لەو کاتەی مەهدی هەڵاتووە، هەزار و سەد و ئەوەندە ساڵە تێپەڕیون، ئیدی ئەمەیان باوەڕێکی نوێی لە ئێران پەیداکرد، دواتر بە شیعە ناسـرا. ئەفسـانەیەکی بەهێزیش بۆ مەهدی دروســـت کرا. خەڵک وا دەزانێ ئەم پیاوە چاکە و پیرۆزە خۆی لەناو بیرێک حەشــاردراوە، لەوێ چاوەڕێ دەکا تا خودا بانگی بکا، ئەوسا بێتە سەر زەوی.
مەهدی مژدەدەری فریادڕەس بوو. گوایە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر لە بیرێ دێتەدەر و جیهان لە دەســـت ئەو کوێرەوەرییەی تێدایە، ڕزگار دەکا. لە زۆر جێگە و بۆ هەمیشـــە هەر بۆنە و ئاهەنگی جۆراوجۆری دینی بۆ ڕێک دەخرێن، لەو بۆنانەدا بڕوادارەکان لەیەک کۆدەبنەوە لە مژدەدەرە فریادڕەسەکە دەپاڕێنەوە بەڵکو خێرا بێتەدەر و ڕەعیەتەکەی ڕزگار بکا.

ئێستاش باب لە ڕژێم هەڵگەڕاوەتەوە.
ئەو وەهای دادەنێ گوایە خۆی فریادڕەســـەکەیە، ئەوەی دەمێکە خەڵک چاوەڕوانییەتی. ئێستاش ئەو پیاوە دەرکەوتووە، نەخۆش چاک دەکاتەوە و نان و گۆشت و سەوزە و میوە بۆ هەمووان دابین دەکا.
وەزیر بابی بە یەکێک لە ئاخوندەکان دەبینی، کە زۆر جار پێ لێهەڵدەبڕن و خۆیان بە گەورە و پیرۆز دەزانن. خۆی ئەمەش دیاردەیەکی کاتییە و هەڕەشـــەیەکی جدی نییە. بەڵام باب شـــتێکی دیکەیە، ئاخر ئەو وەک ســـەرکردەیەکی تەلیســـماوی خۆی دەردەخا و دەم لە ســـۆفیگەرێتی وەردەدا و ڕۆژ بە ڕۆژیش کۆمەڵەی دەورەی زیاتر و زیاتر دەبوون.

کاتێکیش ئەو هەواڵە گەیشت، کە خەڵک دەورەی (باب)یان داوە بە خۆیان و تفەنگە نوێیە بریقەدارەکانی بەنێو شاردا دەسووڕێنەوە، ئیدی یەکسەر وەزیر فیتەی عەڕامزادەیی ناسییەوە زانی چەکەکان چەکی ئینگلیزن.

"ئێمە ناتوانین ئۆباڵی ئاژاوە و پشێوییەکە بخەینە ئەستۆی بریتانییەکان." ئەمەش قســـەی ئەمیری ڕاوێژکارە گەنجەکەی وەزیر بوو، کە بە ئەمیر کەبیری گوت. ئەو درێژەی بە قسەکەی خۆی دا: "خۆی کێشەکە هەژاری و نەدارییە. لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا لە ڕێی گۆڕانکارییەکان هیوا هەروەک ڕۆژ هەڵدێ و بەرزە. ئێمەش لێرەدا هیوامان لەدەســـت دەدەین. بۆ گەلی ئێمە پاشەڕۆژ دیار نییە. هەر بۆیە ئاخوندێکی وەک باب لە شوێنی خۆی وەک قـارچـک لەنێو خەڵکەکەدا قیـت دەبێتەوە. خۆ ئەگەر ئێمە بتوانین ژیان و گوزەرانی خەڵکەکە چاک بکەین، هیچ کەســـێک بە ڕەوا نابینن دوای یەکێکی وەک باب بکەوێ."

وەزیریش بەمجۆرە وەڵامی دایەوە: "منیش هەر هەمـان ڕام هەیە، بەڵام خۆ ئەمە شـــتێکی ئاســـان نییە. من هەر تەنیا کلکی گایەکەم لە دەســـتە، باقی دەســـەڵاتەکە لە دەســـتی ئەوانی دیکەیە. باشـــە ئێمە دەتوانین چی بکەین بۆ ئەوەی سەرنجی هەوادارانی باب بۆ شتێکی دیکە ڕابکێشین؟"

"ئێمە دەبێ خودی باب بگرین! ئەوسا خەڵکەکە لە خۆیەوە تێدەگا کە ئەو مەهدی نییە."

لەبەر ئەوەی شـــا زیـاتر خەمی ڕوســـەکـانی بوو لەوەی خەمی یـاخیبوونەکەی بـابی هەبێ، بۆیە وەزیر ڕێگەی تایبەتی خۆی هەڵبژارد. ئەو سـوپای نـاردە شـیراز تا جووڵانەوەکە بە دەسـتێکی توند سـەرکوت بکا. پەیامەکەشـــی ئەوەبوو باب بگرن و بۆ تاران ڕاپێچی بکەن. لێ خۆ ئەمە بێ شەڕوشۆڕ مەیسەر نەدەبوو.

باب له قسەکەرە لەبلەبانەکان بوو، ئەو هەموو ئەو خاسییەتانەی تێدابوو کە لە مەهدییەکی ئێرانی ڕەچاودەکرا. ئەو سەرکردەیەکی کەشخە، دووچاوی ڕەشی گەش، پرچێکی ڕەشی درێژ ڕەشی نیوە ماشوبرنجی بوو. ئەو شاڵێکی سەوزی بەسەر شانوملیدا دەدا، سواری ئەسپێکی بۆرەی عەرەبی بووبوو، بە شمشێرە چەماوەکەشی ئاماژەی بۆ خەڵکەکەی دەکرد. ئەو شمشێرە کۆنینەشی ئاماژە بوو بۆ ئەوەی بۆ شوێنکەوتەکانی بسەلمێنێ ئەو لە زەوەزەی[٤٥]عەلییە، ئاخر خۆ عەلییش بە شمشێرێکی ناوازە شەڕی دەکرد، شمشێرێک کە سەرەکەی دوولابوو. لە زمانی ئەژدیها دەچوو.

کاتێ خەڵکەکە ڕابەرەکەیان وەها بینی، لە خۆشیان دەلەرزین و هاواریان دەکرد: "ئا ئەمەیە شمشێرەکەی ئیمامی عەلی."

"تەماشاکەن، هەموو ئیمامەکانی پێش باب، ئەو شمشێرەیان هەڵگرتبوو."

خەڵکەکە بە گریانەوە دەیانگوت: "پاش هەزار ساڵ بە مرازی خۆمان گەیشتین."

هەموو بەرەبەیانی ڕۆژانی هەینی بە هەزاران جوتیار لە لادێکانەوە بە سواری گوێدرێژ دەهاتنە ناوشار تا لە مزگەوتی گەورەی شاردا بە دیداری باب شادبن و بە چاوی خۆیان پەرجووەکە ببینن.

لەکاتی وتارە ئاگرینە پڕ جۆشوخرۆشەکانی بابدا، ئامادەبووانی مزگەوت بە گوێی یەکدیدا دەیانچرپاند؛ "بەڵێ هەوە، خۆیەتی، ئەمە مەهدییە."

"ئەو دەبێ خۆی خۆی ئاشکرا بکا کەوا مەهدییە، بەڵام خۆ ئەوەش پێویست ناکا، لە ڕەنگ و ڕوویەوە دیارە خۆیەتی."

ئەو چاوەڕێ بوو شوێنکەوتەی زیاتری پەیدادەبن، ئینجا ساتوکاتی شادمانی بە هەمووان ڕادەگەیەنێ و خۆی ئاشکرا دەکا.

---

[٤٥] زەوەزە: تۆرەمە، وەچە، نەوە، نەسل



شــار لە حەشــامات ســیخناخ بوو، هیوا لە چاوی هەمواندا بریســکەی دەدایەوە، هەموو شتێک ئاماژەبوو بۆ کۆتاییهاتنی کوێرەوەری. خەڵکەکە بە زەوق و کەیف بوو، دەگەیشــتنە یەک و تەوقەیان لەگەڵ یەک دەکرد، یەکدییان لەباوەش دەگرت و هیوای خۆشــی و بەختەوەرییان بۆ یەکدی دەخواست. دەیانگوت دوای قسەکانی باب بۆنی گوڵان دەکەین.

لەو کاتەش مەهدولیا گەیشــتە مۆســکۆ، باب خۆی بە ســەرداری شــیراز دانا. سەری ئەوانەی پێشتر شارەکەیان دەپاراست، ئێستا لەبەردەم بابدا لە کڕنووشــدان و کاتێکیش بە ســەدان پیاوی چەکداری لە دەوری خۆی بینی، تفەنگەکەی لە تەنیشت خۆیەوە دانا. باب دەستی بە ســەر قەڵاکەدا گرت و پیاوەکانی بۆ ئەوە ئامادەکرد بەرەو ئیســـفەهان بکشـــێن. خۆ ئەگەر بیتوانیبا دەســـت بەســـەر ئەو شـــارەشـــدا بگرێ، ئەوا زەبرێکی کوشندە دەوەشاند، ئەوکات سوپای شا نەیدەتوانێ بیوەستێنێ.
باب لەگەڵ پاسەوانەکانی، لەگەڵ ئاخوندی چەکدار لەبارەی کشان بەرەو ئیســـفەهان کەوتە ڕاوێژ و گفتوگۆ، هەینێ گوێی لەوە بوو ســـوپایەکی گەورە لە تارانەوە بەرەو شیراز بەڕێکەوتووە. وا مەزندەدەکرا بۆ بەیانی سەربازەکانی شا بگەنە دەروازەی شار.
هەر بەڕاســتیش پێشــقەرەوڵی لەشــکر زووتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا گەیشــت. بەشــێکی دیواری شــارەکەیان بەر گوللەی تۆپیان دا و ئیدی ســەرباز بەناو شــارەوە وەربوون. کەچی شتێکی ڕەچاونەکراو، کە بووە مایەی ســەرســامیی فەرماندەی لەشــکرەکە، ڕوویدا، ئاخر ســەربازەکان ڕەتیانکردەوە لە دژی باب بجەنگن. کاتێک بینیان باب بە ســـەربازانی لادێی و شوێنکەوتووانی دەورەدراوە. کە گۆرانییەکی پیرۆزی عەرەبییان دەگووتەوە، دەســـتبەجێ زانییـــان کـــابرا خۆی مەهـــدییە. ئەوەبوو لەبەردەمیدا چۆکیان دادا و چەکیان دانا.

دوای ئەوەی وەزیر هەواڵی ئەوەی پێگەیشت، کە پیاوەکانی خۆی خۆیان ڕادەستی باب کردووە، دەستبەجێ بەخۆی و سوارچاکەکانی ڕووەو شیراز کشا. لەوێ دەیزانی چۆن قەناعەت بە سەربازەکانی بهێنێ گوێی لێبگرن و فەرمانەکانی جێبەجێبکەن. ئەو خۆی ئامادەکردبوو لەوێ وتارێکی بە جۆش بدا و بیسەلمێنێ باب مەهدی نییە، بەڵکو ناپاکیی لە گەل و نیشتمان کردووە.

وەزیر بانگی سەربازەکانی کرد و قسەی بۆ کردن: "سەرنجی ئەو تفەنگە بریقەدارە نوێیانەی پیاوەکانی باب بدەن! ئەوە ئەو چەکەیە لە ئینگلیزەکانەوە هاتووە، مەبەستیش لێی ئەوەیە وڵاتەکەمان لەباریەک بترازێنن. دەی شەڕ لە دژی ئەو ساختەچییە بکەن و چەکی بکەن. خوا ئێوە و پاشاکەتان پاداشت بداتەوە!" ئەوەبوو قسەکانی وەزیر تینوتاوی دایەوە بەر سەربازان، ئەوسا ئەوانیش هۆشیان هاتەوەبەر و ئامادەبوون لوولەی چەکەکانیان لە باب بگرن و شەڕی لەگەڵدا بکەن.

ئەوە بوو شەڕێکی قورس لە نێوان لەشکری وەزیر و چەکدارە شوێنکەوتووەکانی ئاخوندەکە بەرپابوو، هەموو شوێنە گرنگەکانی شاریش بە کیسەی خۆڵ ئاستەنگ کرابوو تا هێزی سەربازی بە ئاسانی پێیدا نەڕوا. وەزیر بە خۆیشی لە هێڵی پێشەوە دەجەنگا. لە هەردوو لاوە کەسانێکی زۆر کوژران و بریندار بوون، شەڕەکە سێ ڕۆژ درێژەی کێشا تا لە دواییدا دوا مۆڵگەی چەکدارانی باب دەستی بەسەردا گیرا. لە دواساتەکانی شەڕەکەدا بۆ یەکەمین جار بوو وەزیر سەرکردەی یاخیبووەکان، باب ببینێ. وەزیر بابی بە خۆی و شاڵە سەوزەکە و شمشێرەکەی ناسییەوە، هەروەک ئەوەی مەهدی ڕاستەقینە بێ، شەڕی دەکرد.

وەزیر تفەنگەکەی بەلاوە نا و شمشێرەکەی لە کالان دەرهێنا و هەڵمەتی بۆ سەر باب برد. ویستی بیگرێ و لەگەڵ خۆی بیباتە تاران. بەڵام ئەو

توانی ڕابکا. ئاخر ئەگەر ئەو دەرچووبا و لە شـــەڕەکە ڕزگاری بووبا، ئەوا شـــوێنکەوتووەکانی دەیانکردە ئەفســـانە، بۆیە وەزیر کۆڵی نەدا و بەدوایدا ڕۆیشـــت. لێ باب دەیزانی چۆن خۆی دەرباز بکا، ئەو ناوچەکە بەڵەد بوو، کاتێکیش شەو داهات، توانی خۆی بشارێتەوە.
وەزیریش بە ئەفسەرەکانی خۆی گوت: "پێویستە بیدۆزینەوە، خۆ ئەگەر وەک مارێکیش خۆی کێشابێتەوە کونەکەی، هەر دەبێ دەریبێنین."
وەزیر فەرمانی دا هەموو ماڵ و کێڵگەکانی دەوروبەری ئەوێ بپشـــکنن. دوای یەک دوو ڕۆژ بابی لە بیرێکی ئاو لای مێگەلە بزنێکی شـــوانێک دۆزییەوە. لە بیرەکە دەریانهێنا و بە دەستبەستراوی بەرەو شار بردیان. لەوێش پشتاوپشـت سواری گوێدرێژێکیان کرد و بەنێو هەموو کوچە و کۆڵانەکانی شـــیرازدا گێڕایان تا نیشـــانی خەڵکەکەی بدەن، ئەو ئاخوندە ڕاســـتەقینەکە نییە، بەڵکو پێغەمبەرێکی درۆزنەیە. پاشـــان وەزیر بابی لەگەڵ خۆی بردەوە تاران لەوێ فڕێیدایە کونجی زیندان. بە دەســـتی خۆیشی قفڵێکی ئەستووری لە دەرگای زیندانەکەی دا و کلیلەکەشی دایە دەسـتی سـەرۆکی زیندانەکە و پێیگوت: "خواردنی بدەرێ و بە باشـیش لەگەڵیدا بجووڵێوە. ئەو دەبێ لە ژیاندا بمێنێ."

کاتێکیش بە شـــا ڕاگەیەنرا کە باب لە تاران خراوەتە کونجی زیندان، ویســـتی بیبینێ. ئاخر دەرکەوتنی مەهدی دنەدەری هەموو حەکایەتە مەزنەکانی ئێرانی بوو. پاش هەموو ئەو شتەی لەبارەی بابەوە گوترابوو، شا ویستی ئەو "پێغەمبەرە درۆزنە" لە نزیکەوە ببینێ.
پاشـا لە ئێوارەیەکی درەنگدا بە یاوەری دەسـتەیەک پاسـەوانی چەکدار بەرەو زیندان لێیخوڕی. سـەرۆکی زیندان بە مەشـخەڵێکەوە بە پێشـی کەوت بەرەو بنەبـانی[٤٦] زینـدانێ. ئەوان بە بەردەم یەک دوو دەرووی

[٤٦] بنەبان: ئەوسەر، قووڵایی.

شێداری تاریکدا تێپەڕین تا گەیشتنە شوێنێک کە بەبێ مەشخەڵی چراکە هیچ شتێک نەدەبینرا.
سەرۆکی زیندان بە چەند پەیژەیەکدا شۆڕبووەوە، لەوێوە ئاماژەی بە شوێنێک لە کۆتایی ڕاڕەوەکە کرد، ئەوسا مەشخەڵەکەی دایە دەست شا. پاشاش بە ئەنقەست یەک دوو جار لەسەر یەک کۆخی و یەک دوو هەنگاو لە شوێنەکە چووەپێشەوە. مەشخەڵەکەی بەرزکردەوە تا ڕوخساری زیندانییەکە ببینێ، هەینێ تارماییەکەی بەردەمی بینی. پیاوێک بە جلێکی لەبەردادڕاو کە بە زنجیرێکی ئەستوور بە دیواری ژوورەکە بەستراوەتەوە. لەبەر تیشکی مەشخەڵەکەدا شاڵە سەوزەکەی وەک تەلیسمێک دەدرەوشایەوە. شا هێشتا چەند هەنگاوێکی دیکەی لێچووە پێشەوە. لەپڕێک بریسکەی چاوی باب دەرکەوت و پاشای ناسییەوە.
پاشا چرپاندی: "مەهدییەکە."
شا هەروەک منداڵێکی سامگرتوو دەستی لە زنجیر و پێوەندەکانی کابرا دا و دیسان چرپاندییەوە: "مەهدی."
بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو باب لێی نزیک کەوتەوە و پڕبەدەم تفێکی لە دەموچاوی پاشا کرد. ئەویش پشتاوپشت گەڕایەوە، بە سەردەستەی کراسەکەی دەموچاوی سڕیەوە و هاواری کرد: "لە داری دەن!"

بۆ ڕۆژی پاشتر باب، مەهدییە ساختەکە، لە دەروازە گەورەکەی تاران ملی بە پەتی قەنارەوە کرا. شاڵە کەسکەکەشی بەسەر شان و ملی هەر دەشەکایەوە.

## ٢٢

# پشیلەکان

قرالّی ڕوس لە کۆشـــکی خۆیدا پێشـــوازی لە مەهـدولیـا کرد و لە دانیشـــتنێکدا ئەوەی پێڕاگەیـانـد، کـاتی خۆی نێردەی ڕوســـی لە هاوینەهەوارەکەی شێخ ئاغاسییدا بەتەمابوون بە شای ڕابگەیەنن.
گفتوگۆ لەگەڵ قرالّدا هاندەرانە بوو. مەهدولیا متمانەی جارانی گەڕاندەوە.
خانمی دایکی شا دوو هەفتە لە شوێنی حەوانەوە لە دەرەوەی مۆسکۆدا مایەوە، لەو نێوەشدا کاتێ بۆ پیاسە ویستبای بچێتە ناو شار، پۆلێک لە ژنە تێرتەمەنەکانی ماڵی پاشایەتیی ڕوسی یاوەرییان دەکرد.
کاتێکیش ویســتی بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، بەشـــی باکووری ڕوسـیا بەفرێکی ئەستوری لێ باری. ڕێگاوبان بە بەفرێکی سپی سپی ئەستوور داپۆشـــرا. زۆر بە خراپی بەســـتبووی. کەس زاتی نەدەکرد خۆی لە ڕێ بدا. مەهدولیا ناچار بوو لە شـــوێنی خۆی بمێنێتەوە تا بەفرە باریوەکە دەتاوێتەوە.

له تارانیش لەمێژ نەبوو زستان هاتبوو. شا له ترس و سام له کۆشکەکەی هەر دەهات و دەچوو. ئەو شەوە شەرمینیش وەدەرنەکەوت. هەرگیز پێشتر شتی وەها ڕووی نەدابوو. ئاخر خۆ ئەو لە ڕێی باخی کۆشکەکە بۆی دەردەچوو، خۆی وندەکرد، بەڵام هەمیشە دەگەڕایەوە هۆڵی مینابەندەکەی و ئیدی لەوێ لەپشت پەنجەرەکەوە لێی وەردەکەوت. لێ کاتێک پشیلەکە هەر وەدەرنەکەوت، شا بە درێژایی شەوەکە خەوی لێنەکەوت. ئەو بەنێو ڕاڕەوەکانی کۆشکدا هەر ڕاوێچکەی دەدا، سەیری هەموو هۆدەکانی دەکرد و بانگی شەرمینی دەکرد. لەوە دەترسا نەبادا لە شوێنێک شتێکیان لێدابێ و کوژرابێ. لە دالان و کونجە تاریکەکان، لەبن تەختەبەند و قەنەفەی کۆندا بەدوایدا دەگەڕا، لێ لە هیچ شوێنێک سۆراغی نەبوو.

بۆ بەیانییەکەی، پاسەوانی بەدوای سەروسۆراغی پشیلەکە ناردنە دەرەوەی کۆشک. لێ ئەوانیش هیچیان بۆ هەڵنەکرا. شا بەمجۆرە ماندوو و هیوابڕ گەڕایەوە سەرجێی خۆی و گوێی بۆ هەر دەنگێک هەڵدەخست کە لە دەرەوە هاتبا. پشیلە تۆڕییەکان لە دەرەوە، لەسەر بانی کۆشک لە هەرا و میاوەمیاوی خۆیاندا بوون. تۆ بڵێی ئەوان شەرمینیان بۆ لای خۆیان کێشکردبێ؟ تۆ بڵێی شەرمین گەرمیی پشیلەیەکی تۆڕی لە جیاتی گەرمیی باوەشی شا لێگرتبێ؟

میاوەمیاوی پشیلەکان شایان شێت و هارکرد. ئەو لە نێو پێخەفەکەی دەرپەڕی و بەرەو دەرەوە چوو. لای حەوزی ئاوی حەوشەی کۆشک بانگی کرد: "شەرمین، ئەرێ لەوێی؟"

پاسەوانەکانیش شایان بینی. سەردەستەی پاسەوانەکان لە شای پرسی ئاخۆ دەتوانێ شتێک بکا. (شا)ش پێی گوت: "دەی برۆ چرایەک بێنە."

پاسەوان فەرمانەکەی بەجێگەیاند.

شا بەخۆی و چرای دەستی لێ وەسەر پەیژەکان بۆ سەر بان کەوت.

پشـــیلەکانیش، ئەوانەی لەســـەربان بوون، کاتێک شــایان بە خۆی چرای دەســـتییەوە بینی، لەو ســـەربان بازیان دایە ســـەر بانی و پاردەیەکی دیکەی کۆشـک. ئەوانە ڕەوە پشـیلەیەک بوون، بە دڵنیاییەوە سـەد دانە دەبوون. شـا هەرگیز پێشـتر ئەو ژمارەیەی بە یەکەوە نەدیبوو. بە ڕۆژ ئەو پشـــیلانە بەنێو کوچە و کۆلانەکاندا بۆ خۆیان دەســـووڕانەوە، بە شـەویش لەیەک خڕ دەبوونەوە. بۆ مایەی سـەرسـوڕمانی، پاشـا چرای دەستی بەرزکردەوە. ئەو پشیلە خەپە توڕییانە کۆشکیان وەک پاوانێکی خۆیان دانابوو، ڕۆژانەش لەســـەر بەرماوی فڕێدراوی حەرەمســـەرا و ناندینەکەی کۆشـک دەژیان. ئەمانە پاشـماوەی ئەو پشـیلانەن کە نەوە دوای نەوە لەسەر بانی کۆشکەکەدا دەژیان.
ئەو بەســـتەزمـانـانە ســنووری خۆیـان دەزانی، هەرگیز لێ وەژوور کۆشکەکە نەدەکەوتن، بەڵام سەربان و پاشخانی حەرەمسەرا و شوێنی فڕێدانی زبڵ و پاشـــماوە، کە کەوتبووە پشـــتی پشـــتەوەی باخەکە، بە مەیدانی پاوانکراوی خۆیان دەزانی. کاتی لە نزیکەوە چاویان بە چاوی پاشـــا کەوت، لەوە تێگەیشـــتن نابێ نزیکی بکەونەوە و لەســـەریشـــیان پێویستە ئاگایان لە جرتوفرتی خۆیان بێ.
شـا بە دەنگی بەرزەوە بانگی کرد: "شـەرمین." ئەوەبوو پشـیلەکانیش بە هەموو لایەکدا هەڵاتن. هەرچی شـــەرمینیش بوو، لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوو.
شا بە گەڕانەوەی بۆ سەر جێ خاڵییەکەی، بەزۆی خۆی بۆ کێش دەکرا. ئینجا لەوێ دەستی بە زەنگەکەیەوە نا و بانگیکرد "تاج!"
دەنگی خێرای تەپەی پێ، هی پەردەدار بوو، غاری دەدا تا کیژەکەی پاشا بانگ بکا.

تاج سـولّتان هەمیشـە بە خۆی قەرەواشـەکەی لە ژووره تایبەتییەکەی خۆی دەژیا، ئەو ژوورەی دەکەوتە ئەوپەڕی حەرەمسـەراکە، کە بە ڕێڕەوێک دەگەیشـتە سـەر باخی کۆشـکەکە. شـا لەگەڵ تاج سـولّتاندا هەسـتی بە ئارامی و خۆشـحاڵی دەکرد. ئەو بەردەوام سـەری کچەکەی دەدا، کاتێ خەریکی دەرسی فرەنسی دەبوو. دەوڵەتمەداری بە ئەزموون مێژوویی وڵاتەکەی فێری کچەکەی دەکرد. لێ پـاشـا هەر مێژووی سەردەمی باوکی و باپیرەی فێری کچەکەی دەکرد.

"هەموو شـتێک لەبەر بکە، وەک کچە شـازادەیەک پێویسـتە هەموو شتەکان بزانی."

ئەو مێژووەی شـا بە کچەکەی دەگوت، وای دەکرد پەیوەسـتی نێوان باوک و کیژ پتەوتر بکا. ئەو پەیوەسـتییەی وای لە کچە دەکرد، خەم لە لەشساخی و خۆشگوزەرانی ئەو بخوا.

تازە تاج سـولّتان ڕۆبەکەی بەسـەر شـاندا دادابوو کە پەردەداری بابنۆکەر هات و پێیگوت دیسان پاشا خەوی لێزڕاوە.

کاتێکیش هات و پاشای بینی، پرسی: "باوکە، خێرە؟"

ئەویش باوەشێکی بە کیژەکەی کرد و پرچە ڕەشە تارییەکەکەی ماچکرد.

"شەرمین ڕۆیشتووە."

کیژەکە بە سەرسامییەوە: "چۆن، ڕۆیشتووە؟"

"هەمو شوێنێکی بەدوادا گەڕام."

کچەش پێیگوتەوە: "زۆری پێنـاچێ دەگەڕێتەوە. تۆ شـەکەتی. هەر بەڕاستی پێویستە بچیتە ناو جێگەی خۆت."

شا وەڵامی دایەوە: "خەوم لێناکەوێ."

"دەی من شتێکت بۆ دەخوێنمەوە" کچە ئەمەی گوت و پاشای خستە ناو جێگەی و لێفەکەی بەسەردا دا.

تاج لەسـەر مێزەکە دەسـتی دایە کتێبێکی فرەنسـی. لەسـەر ڕۆخی پێخەفەکە دانیشـت ئەو لاپەڕەیەی لێک کردەوە کە پێشـتر پاشـا گوێچکەکەی نوشتاندبووەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد.

"ڤیکۆنتێس بۆ ماوەی سـێ سـاڵ بوو پەیوەندییەکی پتەوی بە لۆردێکی دەوڵەمەندی ناودار، بە مارکیز ئاجوپنتۆوە هەبوو..." [47]

بەڵام خۆ مێشـکی شـا لەلایەکی دیکە بوو. ئەو سـەری بەرزکردەوە و گوتی: "ژنانی حەرەمسەرا دەستیان لە ونبوونی شەرمیندا هەیە."

تاجیش بە نەرمی پاڵێکی بە شـاوە ناو خسـتییەوە سـەر جێگاکەی. درێژەی بە خوێندنەوەکە دا: هەر یەکێ لەو پەیوەندییە پاکانە بوو، کە بووە مایەی سـەرنجڕاکێشـانی زۆری ئەو کەسـانەی پەیوەندییان لەگەڵدا هەبوو..."

پاشـا بەدەم گوتنی ئەم قسـەیە: "ئەوان هەموو شـتێک کە بۆ من دڵگیر و خۆشەویستە دەبەن." جارێکی دیکە لەسەر جێگەکەی هەڵسایەوە.

"باوکە، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟" کچەکە وەهای بە باوکی گوت و کتێبەکەی لەسەر جێگەی خۆی دانایەوە.

"من هێشـتـا میراتگری جێگرەوەم نییە. کوڕی یەکێ لەو هەموو ژنانە دەکرێ ببنە جێگەرەوەم."

کچەکەش پەرداخێک ئاوی بۆ باوکی تێکرد و دایە دەستی.

پاشا گوتی: "پێویستم بە ئاو نییە. تاج ، گوێبگرە، تۆ تاکە هیوای منی. تۆ پێویسـتە جێگرەوەیەک بە من ببەخشـی. من دەبێ مشـوری مێردێکی شیاوت بۆ بخۆم."

تاجیش پێی گوتەوە: "ئەرێ ئەوە باسـی چی دەکەی؟ من هێشـتا هەر کیژۆڵەیەکم."

---

[47] ئەم دێرە و دێڕی دواتر بە فرەنسی نووسراوە. وەرگێر.

"دایکیشت هەر کیژۆڵەیەک بوو، هەر چواردەساڵان بوو کاتێ تۆی بوو. باشە تۆ ئێستا چەند ساڵەی؟ نزیکەی چواردە، وایە؟"

تاجیش گوتی: "نا نەخێر، هێشتا نا."

"زۆر نابا دەبێتە سێزدە، ئێ خۆ سێزدەش هەروەک ئەوە وایە چواردە بێت. تۆ دەبێ بە باشی ئاگات لە خواردنەکەت بێ. ئاخر چەند گەورەتر و جوانتر بێت ترسی ئەوەم هەیە ئەوان ژەهرخواردووت بکەن. ئەوان شەرمینیان لێ بردم، دەکرێ تۆش لە دەستم دەربهێنن." کاتێ پاشا لەم قسەیەی بووەوە، ژووری نوستنەکەی جێهێڵا.

"باوکە، ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟"

پاشا گوتی: "بەرەو حەرەمسەرا. هەر کەسێک ئازاری شەرمین بدا، دەبێ بمرێ. دەی تۆش بڕۆوە ژوورەکەت. ئاگات لە خواردنی خۆت بێ. کاتێ دەخەوی دەرکەی هۆدەکەت باش لەسەر خۆت پێوە بدە. هەر کەسێک پەنجەت بۆ درێژ بکا لە سێدارەی دەدەم."

درەنگانی شەو بوو. خواجەباشی، بەرپرسی حەرەمسەرا خەوتبوو. پاشا بەتوندی خۆی بە دەرکەکەدا دا، بە شێوەیەک کابرای بەستەزمان لەخەو ڕاپەڕی. هەر بەتەنیا پاشا وەهای دەکرد. خواجە خرەی لە شمشێرەی دەرکەوە هێنا و کردییەوە. پێدەچوو شا حەوجەی بە ژنێک هەبووبێ.

"پایەبەرز!"

پاشا خۆی لە کابرا نەگەیاند و درێژەی بە ڕۆیشتنی خۆی دا. بۆنێکی قورسی توتن لە حەرەمسەراکەوە دەهات.

شا بە دەنگی بەرزەوە بانگی دەکرد: "شەرمین."

خواجەباشی لە دڵەوە ترسی لێ نیشت. ئەو بیستبووی، پشیلەکەی پاشا ون بووبوو. ئەوەشی دەزانی پاشا ئامادەیە کەسێک بکوژێ ئەگەر هات و شتێک نەکرێ و هێور نەکرێتەوە، لێ خواجە زاتی نەدەکرد دەمی

لێکبکاتەوە و شـــتێک بڵێ، دەترســـا نەوەک ئەو یەکەمین قوربانیی تووڕەییەکەی شا بێ. ئەو لە دوورەوە بە دوای شادا دەڕۆیشت.
شا هەر بانگی دەکرد: "شەرمین، شەرمین!"
پاشا لە تاریکییدا بەسەر کورسییەک و مەسینەکەیدا کەوت. پاشان پێی لە ســـۆندەی ئاو هەڵدا. بە تووڕەییەوە شـــتەکەی بە دیواردا دا تا بە دەنگەدەنگەوە پارچەپارچە بوو. دەنگە دەنگ لە ژوورەکان پەیدابوو. ژنەکان بێدار بوونەوە، دەرکەی هۆدەکانیان لەســـەر خۆیان گاڵە دا، ترسان لەوەی نەبادا پاشای تووڕەوتووش لێیان بە ژووری بکەوێ.
خواجەباشـــی، ئەوەی زۆر بەهەند هەڵگرتبوو کە ژنەکان لە پشـــتی بێسەروشوێنبوونی پشیلەکەوە بن، گەڕایەوە بەڵکو بە دوای پارمەتییەکدا بگەڕێ. ژنەکانیش لە شوێنی خۆیانەوە کڕ و بێدەنگ مانەوە.
شا هەر هاواری دەکرد: "شەرمین، ئەوە لە کوێی؟"
دەردەست میاوەمیاوی پشیلەیەکی ترساو لەبەر پێی پاشا پەیدا بوو. شا چاوی لەســـەر ئەوە بوو ئاخۆ پشـــیلەکە لە کامە ژوور فڕێدرایە دەرەوە بە هەموو هێزێکەوە خۆی بە دەرکەوە دادا.
"باوکە پاشا، بوەستە!"
خواجەباشـــی خێرا تاج ســـوڵتانی ئاگادار کردبووەوە: ئەوەبوو کیژەکە پیلی پاشای گرت و لە حەرەمسەرای هێنایەدەر.

# ٢٣
# پەیامێکی نهێنی

مەهدولیا گەڕابووەوە. ڕۆژێک دوای گەڕانەوەی، لە کۆشـــکەکەی خۆی چاوی بە پاشـــا کەوت. ویســـتی گفتوگۆکەکەیان لە دەرەوەی چاوی وەزیرەوە بێ. ئاخر ڕوســـەکان ســـەرنجی نەرێنییان لەبارەی وەزیرەوە پێدابوو.

"دایکە، ئەرێ گەشتەکەت چۆن بوو؟ چۆن پێشوازییان لێکردی؟"

"شتەکە لە دەرەوەی بازنەی چاوەڕانکردنەوە بوو. وەک خزمێکی خوێنی، زۆر بە گەرمی لە لایەن ژن و دایک و خوشـــک و کیژەکانی قڕاڵ بەخێرهێنرام. قڕاڵ گوتی، ئەوە دەزانم کە ئێوە هیچ دەســـتتـان لە ڕووداوی باڵوێزخانەکەدا نەبووە."

پاشاش گوتی: "دایکە، دڵمان خۆش دەکەی."

"سەردانەکەی مۆسکۆ ئەزموونێکە لەبیر ناکرێ. ئەو ڕێوڕەسمی نوێژ لە کڵێسـاکان و ئەو تەلارە مێژووییە ســەرنجڕاکێشـانە شـاهیدێکی پێداگرن لەســـەر فەنابوونی ئادەمیزاد. هەموو شـــتێکی ئەوێ، هەر لە شـــەقام و پەردەکانەوە تا تیاترۆخانەکان، بە تەواوی لە تاران جیاوازن. یەک دوو

جار لە سـەر شـەقامەکانی مۆسـکۆدا دەبووایە لەبەر خۆم و بۆ حالی خۆمان بگریابوومایە."
"دایکە بۆچی؟"
"کوڕم، لەبەر تۆ. لەوێ لە کۆشکەکەی قڕاڵدا هەستم بەوە کرد، ڕۆڵەکەم، پاشـای ئێران، لە چ کەسـاسـییەکدا دەژی. لەوێ بە تەواوی ئەوەم بۆ دەرکەوت، مێژوو چی بەسەر هێناوین، بەتایبەت بەسەر تۆ. خۆی جاران ئێمە زێڕ و تەلامان لە شـار و کۆشـکەکاندا بەسـەردا ڕژابوو، لەکاتێکدا مۆسکۆ ئەوکات وەک گوندێک وابوو. ئێستاش کوڕەکەم بووەتە پاشـای وڵاتێک، کە هەر کەلاوەی لێ ماوەتەوە."
شا دەستەسڕەکەی خۆی دایە دایکی.
"لێ لەبەردەم قڕاڵدا وەها خۆم نواند، وەک ئەوەی دایکی بەهێزترین پاشای جیهان بم."
پاشاش پێی گوت: "بۆ ئەمە زۆر سوپاسگوزاری تۆین. ئەرێ چیت لەگەڵ ڕوسەکان باسکرد؟"
"بەڵگەنامەکان لای شـێخ ئاغاسـین، ئەو بەیانی دێت و هەموو شـتێکت ڕادەست دەکا. شتەکە لەسەر ئەمەی خوارەوەیە. ڕوسەکان ئامادەن لەو بەشـە داگیرکراوەی وڵات، لە ئازەربایجان بکشـێنەوە، لێ بۆ ئەمە مەرجیان هەن."
شا بە حەوسەڵەوە گوتی: "گوێم لێتە."
"ئەوان دەیانەوێ دەسـتیان بە بەشـە ئێرانییەکەی سـەر دەریای قەزوین ڕابگا، تا بتوانن کەشتیرانی تێدا بکەن."
پـاشـاش وەهـا وەڵامی دایەوە: "ئەمە مەحاڵە. ئێمە خۆشـمان هیچ کەشـتیمان نییە. ئایا دەکرێ ڕێڕەوی ئاوی لای باکوورمان بە تەواوی بخەینە بەردەسـتی ڕوس؟ ئایا پێویسـتە خۆمان بەرکەنار بکەین و هەر سەیری کەشتییە جەنگییەکانی ڕوس بکەین؟ نەخێر نابێ، هەرگیز نابێ."

"کورِم، خۆ ئەگەر ئێمە هیچ کەشــــتیمان نەبێ، کەواتە ئێمە ئەو زێیەمان بۆچی پێویستە؟"

"دایکە!"

"گوێ بگرە. ڕوس ئامادەن بکشــێنەوە، بەڵام، لە بەرانبەردا دەیانەوێ بۆ ماوەی پەنجا ســاڵ دەســەڵاتیان بەســەر دوورگەکانی دەریای قەزوێن و بانی ئەفغانســتاندا هەبێ. خۆ ئێمە لێیان خۆش نابین و نایاندەینێ، بەڵکو بە قەرزیان پێدەدەین."

"دایکە لێم مەگرە، بەڵام سەرلەبەری ئەم شتە قوڕە!"

قوڕ؟ باشــە ئێمە چی لەو بانە بەیار و قاقڕەی ســەرووی ئەفغانســتان بکەین؟ تەنانەت هێسترەکانی مەنگولیاش ڕکیان لێدەبێتەوە. هەروەها ئەو یەک دوو دوورگانەش، باشــە خۆ لەوەتەی زەوی پەیدا بووە، تا ئێســتا تاکە ئێرانییەکیش پێی وەسەر نەناوە؟"

"کەواتە ڕوســەکان ئەوێیان بۆ چییە؟ ئەوان لەســەر خاکی لێی دادەکوتن. باشە شەرم لەخۆت ناکەیتەوە؟"

مەهــدولیــاش بەمجۆرە بەرگری پێ لەخۆی کرد: "بۆچی؟ من هەموو شــتێک دەکەم تا یەکانگیریی وڵاتەکەم بپارێزم. من بەزانم هۆزەکەمان چ قوربــانییەکی داوە تــا خزمەتی ئەم گەلە بکــا. من تەرمی زۆر لە پیــاوە ئازاکانمان بینین، کە لە شــــەڕەکانیاندا ســــەریان تێداچوو، یان بە هۆی شــۆفاری هێزی بێگانەوە کوژران. تۆ وەها ڕەفتار دەنوێنی وەک ئەوەی ناپاکییم لە نیشــــتمان کردبێ. من دەمەوێ تۆ بپارێزم. من شــــەکەت و ماندووم. وەها باشــــترە هەڵبســــتی و بڕۆی. بەیانی پەیامە گرنگەکانی قراڵت پێدەڵێم." کاتێ شاژن لەم قسانە بووەوە، لە شوێنی خۆی هەڵسا.

– "نەخێر. دایکە، دانیشەوە."

- "ئەگەر تۆ هەر وا بکەی و وەک باوکت لە بەرزییەوە قسەم لەگەڵ نەکەی."

پاشا هەڵسا و لە تەنیشت دایکی دانیشت.

- "خۆت دەزانی ڕوس دەیەوێ بگاتە ئۆقیانووسی هیندی؟"

- "دەی لێگەڕێ با ئەوان هەر خەون ببینن. ئێمە خاکی خۆمادیان نادەینێ."

- "قڕاڵ ئەم پێشنیازەی خوارەوەی هەیە: ئەگەر هات و پاشا بیەوێ هەرات لەبن دەستی بریتانییەکان دەربهێنێ، دەکرێ پشت بە ئێمە ببەستێ."

ترووسکاییەک پەڕیە چاوی پاشا.

- "خۆ ئەگەر ئێمە پلانی ئەوان پەسەند بکەین، ئەوا ئەوان لە ناوچە داگیرکراوەکانمان دەکشێنەوە. پاشان قڕاڵ تۆپ و تفەنگمان دەداتێ. خۆ ئەگەر پاشا داوا بکا، ئەوا ئەفسەری ڕوس پشتی جەنگاوەرانی ئێمە دەگرن و بە یەکبەرگیی سەربازیی ئێمە لەپاڵ ئێمەدا دەجەنگن."

- پاشاش پرسی: "هەر بە ڕاستی قڕاڵ پێشنیازێکی وەهای کرد؟"

- "ئەو بە تەنیا و دوو بەدوو ئەمەی بە من گوت و کەس لەگەڵمان نەبوو. تەنانەت شێخ ئاغاسیش لەوێ نەبوو. کوڕم، گوێ بگرە، خۆ ئەگەر ئێمە هەراتە خۆشەویستەمان بگێڕینەوە سەر نیشتیمان، لە مێژوودا وەک پاڵەوان دەردەکەوی."

- شا پێی گوتەوە: "بەڵام خۆ ڕوس جێگەی متمانە نین."

- "کوڕم، باشە چی لە دەست دەدەین؟"

- "وەزیر هەرگیز ئەم شتە پەسەند ناکا."

- "تۆ پاشای وڵاتی نەوەک ئەو. وێڕای ئەمە، قڕاڵ هیچ بە باشی ناوی وەزیری نەهێنا."

- "ئەو چی گوت؟"

- "قڕاڵ ئەو ڕازەی بۆ درکاندم، کە لە ڕاپۆرتی باڵوێزخانەکەی ڕوسیادا هاتبوو، پێویستە حیساب بۆ ئەگەری کودەتایەکی سەربازیی بکەی، کە وەزیر بەتەمایەتی.

پاشا بەسەر کورسییەکەیدا کەوت.

ئینجا مەهدولیا گوتی: "خەمی لێ مەخۆ. ڕوس خاوەنی قسەی خۆیان دەبن، ئەگەر هاتوو تەخت و تاجت مەترسی کەوتەسەر، ئەوان پێیڕادەگەن."

پاشا لە سەر کورسییەکەی هەڵسا، دەستی دایکی گرت و ماچی کرد ئینجا بەجێی هێشت.

لە ڕێی گەڕانەوەی بۆ کۆشکەکەی خۆی، لە دڵی خۆیدا پرسی تۆ بڵێی کەی لەبارەی پێشنیازەکەی قڕاڵ لەگەڵ وەزیردا بدوێ. لەکاتێکدا پاشا ئەگەری دەستبەسەرداگرتنەوەی هەراتی لەبەردەستی خۆیدا دەبینی، کەچی وەزیر تیشکی خستبووەسەر کاروباری ناوەخۆی وڵات.

شا بڕیاڕی دا چاوەڕێی کات و ساتی گونجاو بکا.

## ٢٤

# چاپخانە

کاتێک شا هێشتا وەک شازادەیەکی جێنشین لە تەورێزدا دەژیا، وەزیر پۆلێک لە قوتابییە زیرەکەکانی بۆ خوێندن ناردبوونە ئەوروپا. ئەوان خوێندنەکەیان تەواو کردبوو. وەزیریش بۆ بنیاتنانەوەی وڵات پێویستی پێیان هەبوو.

ئەندازیارەکان ئەوانەی هەموو شتێکیان لەبارەی تەکنیکی نوێوە دەزانی، مشووری ئەوەیان خوارد، تۆڕێکی ڕێگاوبانی نوێ بۆ تاران دروستبکەن. پزیشک و دەرمانسازەکانیش نەخۆشخانەی نوێیان کردنەوە. بە ڕۆژ و شەو خەڵک لە نۆرەی درێژی چاوەڕوانی وەستابوون، بەدوای یارمەتی و چارەسەردا دەگەڕان. ئەوانەی زمانی نوێ فێربووبوون و زاست و زانیاریی نوێیان بەدەستهێنابوو، ئەو مامۆستایانەیان دەرس دەدان و پێگەیاندن کە دواتر لە کاتی دروستکردنی قوتابخانەی نوێدا بوونە مامۆستا.

یەکێ لەو کوڕە گەنجانەی ناردرابوونە دەرەوە، واتایەکی تایبەتی بۆ خودی وەزیر هەبوو. ئەویش کوڕی چێشتلێنەرەکەی ماڵی خۆیان بوو.

ماوەیەکی درێژ بوو، ئەو کاتەی وەزیر یارمەتی منداڵەکانی خۆی دەدا و دەرسودەوری زمانی فرەنسی لەگەڵ دەکردنەوە، ئەوەی بەدیکرد کوڕی چێشتلێنەرەکەیان لەپشت دەرکە دەوەستێ و دوابەدوای ئەوان دەرس و دەورەکە دەکاتەوە. ئیدی وەزیر بانگی کوڕێژگەکەی کرد، کتێبی فێرکردنی فرەنسی لەپێش دانا و پێیگوت: "دەی بیخوێنەوە."
بۆ مایەی سەرسامیی وەزیر، کوڕێژگەکە یەکسەر کتێبەکەی خوێندەوە. وەزیر وەهای بینی کوڕەکە بەهرەیەکی لە ڕادەبەدەری هەیە. ئینجا پەلی کوڕەکەی گرت و خستیە نێو بازنەی خانەوادەکەی و لێیگەڕا لەگەڵ منداڵەکانی خۆی دەرسی تایبەتی بخوێنێ. پاشان کوڕەکەی بۆ تەواوکردنی خوێندن ناردە پاریس و ئێستاش گەڕابووەوە و وەک دەستەڕاستی وەزیر دەستبەکار بووبوو. گەنجەکە ناوی تەقی بوو، بەڵام وەزیر لەو بڕوایەدابوو، ئەم گەنجە لە دوارۆژدا دەستی لە سەرکردایەتیکردنی وڵاتەکەدا دەبێ، بۆیە ناوێکی شەرەفمەندانەی لێنا: ئەمیر، ئەمیریش ناوێکە هاوواتای شازادەیە.

یەکێ لە خەونەکانی وەزیر بۆ وڵات چاپخانە بوو؛ خوازیار بوو ڕۆژنامەیەک لە تاران چاپ بکا.
ئەو بۆ یەکەمین جار لە مۆسکۆ ڕۆژنامەی بینیبوو، ئەوکاتە بوو لەگەڵ باوکی بۆ ئەوێ چووبوو.
وەزیر هۆنراوەی دەنووسی، لەپاڵ ئەمەشدا حەزی لە ڕۆژژمێر بوو، تێیدا تێبینی و سەرنجی لەسەر ڕووداوەکان دەنووسی. هیوای ئەوە بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان هۆنراوەکانی لە دوتوێی کتێبێکدا کۆبکاتەوە و بە چاپی بگەیەنێ. لەگەڵ هۆنراوەدا ئارام دەبووەوە، هەمیشە ئەو هۆنراوانەشی لابوون کە بەسەریاندا دەچووەوە و ڕاستی دەکردنەوە. بەمجۆرە خۆی لە جیهانی دەرەوەدا دادەبڕی. ئەو حەزی لە نامەنووسین بوو، نامە و

پەیامی وەک بەڵگەنامەی سیاسی، وەک بەراوردکاری مێژوویی و لەم جۆرە بابەتە.
ئەو جۆرە پەخشانی نوێی دەنووسی. فارسی، زمانێک بوو قورس و ئاڵۆز، بەڵام وەزیر شێوازێکی ڕوون و ڕەوانی هەبوو. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، ئەو وەک ڕووداونووسێک لای باوکی و زۆر لەو نامانەی بە زمانەکانی ڕوسی، فەرەنسی، ئینگلیزی و هیندی کە بۆ باوکی پاشا دەهاتن و ئەویش دەیخوێندنەوە و دەیکردنە فارسی. بەمجۆرە ئەو ڕاستەوخۆ زانیاریی لەبارەی شێوازی ڕاستەوخۆی نووسینی ئەوروپی پەیداکردبوو.
جارێکیشیان باوکی پاشا پەڕەمووچەیەکی قازی شاهانەی وەک پاداشتێک بۆ نووسینێکی جوان پێشکەشکردبوو.
زۆرینەی ئەو دەقە وروژێنەرانەشی بریتی بوون لەو نامانەی بۆ ژنەکەی نووسیبوون:
*ئازیزەکەم،*
*دوێنێ ئێوارە کاتێ گەڕامەوە، تۆ لەماڵ نەبووی.*
*ماڵەکەمان مێلانەیەکی خاڵی بوو.*
*خاڵی لەو مەلە ئاوازەیەی بۆ هەمیشە فڕی بوو.*
*دەی خۆشەویستەکەم. هەمیشە و هەر کاتێک دەگەڕێمەوە، لە ماڵ بە، دەنا هەر بانگت دەکەم. زوور بە زوور بە دواتدا دەگەڕێم تا دێییتەوە.*

ئەم کورتە نامە سادەیە، ڕوانینێکی نوێبوو لە پەیوەندیی نێوان پیاو و ژندا. شیعری فارسی پڕیەتی لە جاڕنامەی دڵداریی پیاو بۆ ژن، بەڵام هەرگیز هیچ پیاوێک نامەیەکی وەهای بۆ ژنەکەی خۆی نەنووسیبوو.

وەزیر فەرمانی بە ئەمیر دا بەڵکو ڕۆژنامەیەک لەبارەی پەرەسەندنەکانی وڵات و جیهان دەربکا. وەزیر بە شـــانازییەوە یاوەریی پاشـــای کرد بۆ چاپخانەیەکی نوێی تازە دروســتکراو. لەو بەســەرکردنەوەیەشــدا تۆپە خۆشــەویســتەکەی پاشــا وەک شــتێکی دانەبڕاو بە دوای کاروانەکەی ڕاکێشرا.

وەزیر کاروباری ئەو ئەندازیارە گەنجە ئێرانییانەی بە پاشا ڕاگەیاندبوو، ئەوانەی شــەقام و جادەوبانەکانی تاران لەســەر شــێوازی فرەنســی لێ دەدەن. پاشاش بەرلەوەی بگاتە چاپخانەکە، بە فەرمی یەکێ لە گۆڕەپانە نوێیەکان دەکاتەوە.

بەقەد ئەوەی ئەوان لەناوجەرگەی شـــــار نزیک و نزیکتر دەبوونەوە، شــەقام و ڕێگاکان جەنجاڵتر دەبوون، ئاخر خەڵک خوازیار بوو نیگایەک لە پاشــا ببڕن. جلی پاشــایەتی و ئەو شــێوازەی ئەو بە ڕازاوەیی لەســەر پشــتی ئەســپەکەی لەنێوان یاســاوڵەکاندا دەڕۆیشــت، ســەرنجێکی وەهای لای خەڵکەکە دەوروژانــد، وەک ئەوەی لە جیهــانێکی دیکەوە هــاتبێ. کاتێکیش پاشــا گەیشــتە لای گۆڕەپانەکە، بەوە هیدمەگرتی بوو، کە بینی هەموو پیاوە گرنگ و ناودارەکانی شار بە جلی ئاهەنگئامێزەوە لەمبەر و ئەوبەری ڕێگا وەستابوون. ئاخر ئەوە گۆڕانکاری بوو، بەوەی دوای ئەو حەشاماتی ئەو هەموو خەڵکە کەڕە و کوێرە و سواڵکەرانە، تووشی ئەو پیاوە پایەبەرز و پلە بالایانەی وڵات ببێتەوە.

پاشــا لای گۆڕەپانەکە دابەزی تا شــریتەکە ببڕێ. پێشــتریش لەم جۆرە بۆنــانەی ئەزموون نەکردبوو. گۆڕەپــانەکە بە تــاتەبەرد داپۆشـــــرابوو، ناوەڕاستەکەی پڕ لە گوڵدان بوو، ئاویش لە ناوەڕاستەوە بە فوارەوە بۆ سەرەوە فیچقەی دەکرد.

خوانچەیەک[48]گە مقەستێکی لەسەر بوو لەبەردەم پاشادا ڕاگیرا، ئەویش بەشێوەیەکی ناکارامە دەستی گەیاندە مقەسەکە و یەک دوو شەنقاو[49] بەرەو شریتەکە ڕۆیشت. بە ئاماژەیەکی پاشایانە شریتەکەی گرت و بە هێواشی مقەستێکی لێدا و بڕی. ئینجا موزیک و هوتاف و فیکە کردیانە ڕۆژی خۆیان. شا پێشوازیی لە ئەندازیارەکان کرد و گفتوگۆیەکی کورتی لەگەڵ کردن، یەک دوو دراوی لەناو لەپ دانان، ئینجا لەوێوە لەگەڵ وەزیر بەرەو چاپخانەکە ڕۆیشتن. کۆمەڵێک پیاوی گەنجیش لەگەڵیان ڕۆیشتن.

چاپخانەکە لە تەلارێکی نوێ لە پشت مزگەوتەکەدا هەڵکەوتبوو. لە ژوورەوە بۆنێکی سەیر بەر کەپووی ئامادەبووان کەوت. پێشتر وەزیر نەخشەی تەلارەکەی نیشانی پاشا دابوو، هەندێ شتی لەبارەوە تاوتوێ کردبوو، بەڵام خۆ چاپخانەکە لە نزیکەوە شتێکی دیکە بوو.
ئەو لەوێ سەیری ئامێر و ماکینەکانی کردن. نیگای پەڕیە سەر ئەندازیارێکی گەنج کە سەرپەرشتی ئیشەکەی دەکرد. ئەو پێشتر لەبارەی ئەو ئەمیرەی بیستبوو، کە دەستەڕاستی وەزیر بوو. شا هیچی لەبارەی ئەوە نەدەزانی ئاخۆ ئامێرەکان چۆن کاردەکەن، بەڵام ئەو وەها خۆی نواند وەک ئەوەی لە هەموو شتێک بزانێ. ئەو سەیری پیتە بارکراوەکانی نێو کیسەکانی کردن و لای خەرەکی پاڵنەری چاپەکە وەستا. بە وریاییەوە پەنجەی ئاماژەی لەسەر خەرەکەکە دانا، بە جۆرێک سەری پەنجەی لەبەر چەورییەکە ڕەش بوو. ئینجا پەنجەکەی لە هەوادا ڕاگرت، نەیدەزانی چی لێبکا. ئەوسا ئەمیر دەستەسڕێکی پاکی بۆ هێنا. پاشاش پەنجەکەی پێ سڕی و لەسەر ڕۆیشتنەکەی بەردەوام بوو. لای

[48] خوانچە: سینی، مەجمە، ساج، خوان.
[49] شەنقاو: هەنگاو

سندوقی پیتەکان وەستا، وەزیریش ئاماژەیەکی بۆ ئەمیر کرد تا شتەکە بۆ پاشا ڕوون بکاتەوە.
ئەمیریش یەک دوو پیتی داگیراوی لەنێو سندوقی پیتەکان دەرهێنان و لەسەر شوێنە دیارەکەی خۆی بە ڕیز دانیان ئینجا خستییە نێو ئامێری چاپ. پاشان بە کارامەیی پارچە کاغەزێکی بڕی لەسەر کاغەزگری سەر چاپەکەی دانا. پاشا بە تامەزرۆ و حەپەساوییەوە سەیری ئەندازیارەکەی دەکرد و چاوەڕێی ئەنجامەکەی بوو. ئینجا ئەمیر دەسکی ماکینەکەی بادا. دەنگێکی تەواو نامۆ بەر گوێی پاشا کەوت، پاشان کاغەزەکە لە لایەکی ئامێری چاپەکە کەوتەخوار. ئەمیریش کاغەزەکەی و دایە دەستی پاشا. ئەویش بەسەری لێوان ئەو ڕستەیەی خوێندەوە کە لەسەر کاغەزەکە چاپ بووبوو: "پاشا بۆ یەکەمین چاپخانەی پاشایەتی بەخێر بێ."
پاشا بە ئەوقمانەوە سەیری ئەمیری کرد. دوای ئەوە وەزیر یاوەریی پاشای بۆ لای ماکینەی چاپ کرد، لەو شوێنەی هەندێ تێکست چاپکرابوون. داوای لە پاشا کرد بەڵکو دەسکی ئامێرەکە بابدا تا بە شێوەیەکی فەرمی چاپخانەکە بکاتەوە. پاشاش دەستێکی لەسەر دەسکی شمشێر و بە دەستەکەی دیکەی لەسەر دەسکی خولخۆری ئامێرەکە، ئەوەبوو سێ جار لەسەر یەک خەڕەکە خولخۆرەکەی سووڕاند. لەملاوە بارستە کاغەزێک لە ئامێری چاپەکە کەوتە خوار. وەزیر بە هەردوو دەست کاغەزەکانی هەڵگرتنەوە و ڕادەستی پاشای کرد و گوتی: "ڕۆژنامە".
کاتێک پاشا سەیری کرد و پۆرتێتی خۆی لە پشت شێری شاهانە بینیەوە، کە شمشێرێکی بەدەم گرتبوو، ڕۆژێکی درەوشاوەش لە پشتییەوە لە سەر ڕووپەڕی پێشەوەدا بینی، هەندێ وروژا. خەندەیەکی

شاگەشکەبوون کەوتە سەرروخساری. نیگای پاشا کەوتە سەر ئەو دەقەی لە ژێر پۆرترێتەکە نووسرابوو. تەزوویەکی وێ هەڵات.
"سەیرکە، لێرەدا هۆنراوەیەکی ئێمە چاپکراوە!" پاشا بە ڕوویەکی گەشاوەوە ڕۆژنامەکەی دایەوە دەستی ئەمیر، کە لە تەنیشتییەوە وەستا بوو، ئینجا درێژەی بە قسەکەی دا: "دەی بۆمان بخوێنەوە!"
ئەمیریش کەوتە سەر خوێندنەوە.
پاشا وەستاندی و پێیگوت: "گوێمان لێت نییە، بە دەنگ بیخوێنەوە."
ئەمجارەیان بە هەستێکی پڕترەوە ئەمیر کەوتە سەر خوێندنەوەی هۆنراوەکە:

*ئەرێ کێ لێی تێدەگا؟*
*ئەز لە خاکێکی سادەوە کەوتوومەتەوە،*
*لە شەقڵێکدا داڕێژرا، هەر بۆیە شکا*
*تا لە وەرزێکی دیکەدا تێیهەڵبدرێ.*

"نایابە." پاشا وەها هاتە دەنگ: "بەڵام خۆ دەبێ چاومان لەسەر ئەم جۆرە پێتانە ڕابێ. خوێندنەوەی ئەمە لەگەڵ کتێب شتێکی دیکەیە."
ئەو ئاماژەی بۆ وتارێک کرد کە لەبن شیعرەکەیەوە چاپکرابوو و گوتی: "دەی ئەمەشیان بخوێنەوە!"
ئەویشیان وتارێک بوو لەبارەی تێلیگرافەوە بوو، ئەمیر خۆی نووسیبووی. ئینجا بە بە باوەڕبەخۆبوونێکەوە خوێندیەوە: "بەڵێ هەر لە دێرزەمانەوە ئێمە بیرمان لە خێراترین تۆڕی پەیوەندی کردبووەوە. لەسەردەمی خۆیدا، داریوش، پاشای مەزن مشووری تۆڕێکی گەورەی بەرفراونی پەیوەندی خواردبوو، بەهۆیەوە پەیک و نامەبەران بە ڕۆژ و شەو بەبێ وچان و لە هەر چوار کەناری دنیایێ لە جرتوفرتی خۆیاندابوون تا هەواڵەکان خێرا بگەیەننە کۆشک. ئەوان تەنانەت دەنگ

و ســـەدا، ئاماژە و میناشـــیان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی پەیامەکانیان لە ڕووبار و چیاکانەوە تێپەڕێنن و بپەڕێننەوە. کاتێک ئێمەش بەو داهێنانە دێرینانەمان شـــاناز بووین، لێ ئێســـتا وامان لێهاتووە پشـــت بە ڕوس ببەستین بۆ ئەوەی ڕێگەی کەروبارمان[50] بۆ بکەنەوە..."

وەزیر تێڕامانەکەی پاشـــای لە ڕوخســـاردا بینی. ئەمیریش لەســـەر خوێندنەوە دوودڵ بوو، لێ هەر درێژەی پێدا: "تەلەگراف (بروســـکە) پەیامێکە لە ڕێی کێبلەوە دەنێردرێ. بەم شـــێوەیەی خوارەوە کاردەکا. نێرەر پەیامەکەی دەگەیەنێتە دەســـتی نامەبەر، ئەویش لەهەمان کاتدا پەیامەکە دەگەیەنێتە دەستی وەرگرەکەی.."

پاشا بە ئۆقرەلێبڕانەوە لەسەریەک گوتی: "بەردەوام بە، دەی پتر..."

"ئینگلستان پێشتر بۆ گەیاندنی پەیامەکانی پشتی بە کەشتی بەستبوو، ئەمەش چەندین مانگی پێدەچوو تا پەیامەکەی لە لەندەنەوە دەگەیشـــتە شـــوێنەکانی دیکەی ژێر قەڵەمڕەویەکەی، وەڵامی پەیامەکانیش دووبارە چەند مانگێکی پێدەچوو تا دەگەڕایەوە لەندەن، بەڵام ئێستا ئینگلستان کە پەیامی خۆی دەنێرێ..."

پاشا لە بەرتەکدا گوتی: "بەڵێ بەڵێ."

"وەزیر لە ڕۆژنامەکەیدا پێمان دەڵێ، ئەگەر هاتوو بمانەوێ، پێویست ناکا دە ساڵێک لەســـەر تەلەگراف بوەســـتین. خۆ ئەگەر وەزیریش وەها بڵێ، ئێمە دەبێ پەیڕەوی بکەین بەوەی ئێمەش لە مـــاوەیەکی کورتـــدا پەیامەکانمان بە چاونووقاندنێک لە شـــارێکەوە بگەیەنینە شـــارێکی دیکە، بەڵام..."

پاشـــا ڕۆژنامەکەی لە دەســـتی ئەمیر وەرگرتەوە، لوولی دا و بەنێو چاپخانەدا زیاتر قەدەمی لێدا. ئەو کێبڵ، مەرەکبدان، وشـــە دانراوەکانی

[50] کەروبار: کەرو ئێستر بە بارەوە. ڕێگەیەک کەری بەبارەوە لێوە بڕوا.

پشـــکنی و بەســـەرکردنەوە، ئینجا چەند دراوێکی بەســـەر کارمەندەکان دابەشکرد، ئەوسا لێیدا ڕۆیشت.

لە ڕێگادا وەزیر لەبارەی ڕۆژنامەکە بۆ پاشـــای ڕوونکردەوە: "هەڵبەتە ئەم زانیارییەی نێو ڕۆژنامەکە بۆ خاوەنشـــکۆ نییە، بەڵام پێمان وایە پێویستە هاووڵاتییەکانیشمان لە گۆڕانکارییە مەزنەکان ئاگادار بکەینەوە، وتارەکانی نێو ڕۆژنامەکە باســـوخواســـی پەرەســـەندنی وڵاتەکەمان دەهێننەگۆ. بریتـانییەکـان بە فەرمی ئەوەیـان پێ ڕاگەیـاندووین، کە لەبـارەی هەڵســـەنگـاندنی ئەوەدان هێڵی تێلێگراف بە وڵاتەکەی ئێمەدا بەرەو هیندســـتان ڕابکێشـــن. زۆر نابێ کێبڵیان لە بندینی دەریا داناوە، ئەمەش ڕێگـایەکی گران و پڕتێچووە و کـاتێکی یەکجـار زۆریش دەخوازێ. ئێســـتا ئەوان گەیشـــتوونەتە لای ئێمە، چونکە هەرزانترین و کورتترین ڕێگەیە تا کێبلی خۆیان بۆ هیندســـتان بە وڵاتەکەی ئێمەدا ڕابکێشـــن. تا ئێســـتاش لەو بارەیەوە بە فەرمی هیچ قســـەیەکمان لەگەڵ ئـاڵوگۆڕ نەکردوون، لێ چـاوەڕێ دەکەین لە مـاوەیەکی کورتـدا لە دەرکەمان بدەن."

شـــا بە بێدەنگی گوێی لە قســـەی وەزیر گرتبوو، بیریشـــی هەر لای پەیامەکەی قراڵی ڕوس بوو، ئەو پەیامەی لەبارەی پەلاماردانی هەراتەوە بوو. ئەو خوازیاربوو لەو بارەیەوە لەگەڵ وەزیر بدوێ، بەڵام بڕیاری دا هێشتا پێی نەڵێ.

ئینجا پاشا پێی گوت: "دەی لە ڕەوشەکە ئاگادارمان بکەرەوە."

بۆ شـەوەکەی پاشـا بە شـڵەژاوی لە خەو ڕابوو، خەریک بوو دڵی لە نێو قەفەزەی ســینگیدا دەربپەڕێ. شـــەرمینیش خۆی پێوە نووســاندبوو. بە دانیشـتنەوە لەســەر پێخەفەکەی، بیری لە ســەردانەکەی بۆ گۆرەپانەکە و

چاپخانەکە کردەوە. ئێستا پەی بەوە برد، پۆلێک لە پیاوانی گەنج لە هەموو لایەکەوە هەر بە دوای وەزیرەوەن. ئەوانیش ئەو کەسانەن لە دەرەوەی ولات خوێندنی خۆیان تەواوکردبوو. ئەوان بە شێوەیەکی دیکە دەردەکەوتن، ئەوان جیاواز سواری ئەسپ دەبوون جیاواز لە بازرگان و شازادەکان بە ڕێگادا دەڕۆیشتن.

هەمووشیان بە یەکەوە یەک ڕوخساری ولاتیان دەنواند، ئەو ڕوخسارەی پێشتر پاشا نەیبینی بوو.

"لەوانەیە دایکم ڕاست بکا." وەها لەگەڵ پشیلەکەی دوا: "ئەری خۆ تۆ لە سەردانەکەی لای چاپخانە لەگەڵمدا نەبووی. دەنا دەتبینی پیاوە گەنجەکان چەند مجێز بەرزن. هەربینا خۆشیان دەرخست."

# ٢٥



# بڕیارێکی مێژووی

هەر بە تەنیا شا و دایکی و شێخ ئاغاسی بە ناوەڕۆکی ئەو گفتوگۆیانەیان دەزانی کە لە کرملین کرابوو. بۆ ئەوەی ڕێ لە دزەکردنی نهێنییەکە بگرن، سێکۆچکەیەکیان پێکهێنابوو. ئەوان هیچ پەیکێکیان لەنێو خۆیاندا بەکارنەهێنا و هیچ تێبینی و سەرنجێکی نووسراویشیان نەخستبووە ڕوو. شا خۆی بڕیاری دابوو لەمەودوا کاراتر خۆی لە کاروباری سیاسییانەی وڵات هەڵقورتێنێ. لە جاران پتر ئامادەی کۆبوونەوە گرنگەکانی لەشکر دەبوو، کارێکی وەهاشی کرد وەزیر بخاتە دەرەوەی ئەو جۆرە بڕیارداڕشتنانە. بۆ مایەی سەرسامییەکی گەورەی وەزیر، ئەوەبوو پاشا بەشێکی زۆری لەڕایکردنی کار و ئەرکەکانی سەربازیی لە ئەستۆی خۆی گرت، پاکانە و بەڵگەوبەندیش ئەوەشی بۆ هێناوە، گوایە بۆیە وادەکا تا دەستی وەزیر بۆ نەخشەی پێداچوونەوە و چاکسازییەکانی کاروباری وڵات والاتر بکا و کات و دەرفەتی باشتری بۆ مەیسەر ببێ. لەو نێوەشدا پاشا، شێخ ئاغاسی وەک ڕاوێژکارێکی فەرمی ناودێر کرد.

ئیدی دەستبەجێ شێخیش وەک پەیکێکی نێوان پاشا و ڕوس بۆ کاروباری دانوستان لەبارەی لەشکرکێشی بۆ سەر هەرات دەستبەکار بوو. لە کۆتاییدا شا ویستی بەشێک لە دەسەڵاتەکانی وەزیر بداتە شێخ ئاغاسی. ئاغاسیش ڕاوێژی وای بۆ شا دەکرد بەڵکو ڕەعیەت و مسکێنەکان بە چاوی خۆیان پەی بەوە ببەن، کە پاشا خۆی وڵات بەڕێوەدەبا نەوەک وەزیرەکەی خۆی.

هەروەها هەوڵی ئەوەشی دەدا نەبادا پاشا هەست بە هەراسانی بکا. هەر بۆیە بەردەوام نەخشەی بۆ دادەنا و وای لێدەکرد بە کاروباری دەوڵەت شارەکان بەسەربکاتەوە. ئەم گۆرانکارییانەش بە دڵی پاشا بوون، کەیفی بەم کار و چالاکییانە دەهات.

شێخ ئاغاسی ئەوەی دەزانی ئەگەر هاتوو بتوانێ ڕێککەوتنێکی یەکلاکەرەوە لەگەڵ ڕوس ببەستێ و کارێکی وەها بکا پاشا هەرات بگرێتەوە، ئەوا بێ سێ و دوو ئەو دەبووە گەورەوەزیری داهاتوو.

میرزا کەبیر ئەوەی لەبەرچاو ون نەبوو، کە شێخ ئاغاسی بەردەوام لەگەڵ ڕوسەکان کۆدەبووەوە. ئەو زۆر جاران لەبارەی شێخ ئاغاسییەوە هۆشداری دەدایە پاشا بەوەی کەسێکە بە ئاسانی دێتەژێربار و بڕوای بە شتی خورافات هەیە. ئەم جۆرە پیاوانەش دەکرێ وڵات بخەنە دۆخێکی دژوار.

جارێکیان پاشا بەتوندی وەڵامی دایەوە: "وەها باشترە هەریەکە و بەکاری خۆیەوە سەرقاڵ بێ و دەم لە کاروباری ئەوانی دیکەوە وەرنەدا."

دەبوایە وەزیر بە حەوسەڵەوە ئەوەی ببینیایە تا دەهات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فەرماندە و ئەفسەرە متمانەدارەکانی خۆی لە نێو سوپادا ون دەبوون و لە شوێنی خۆیان نەدەمان. خۆ ئەوەش ڕاست بوو پاشا

فەرماندەی گشـــتیی هێزەکان بوو، بەڵام وەزیر لە بڕیارەکانی پاشـــا و نەخاســـمە لە کاروباری ســـوپاوە دەیبینی چۆن پاشـــا کەوتووەتە بن باندۆری دژبەرەکانی. لە بارێکیشدا نەبوو دژی ئەو بڕیارانە بوەستێتەوە. پاشـــاش لاری لەوەدا نەبوو بە زەبروزەنگ وەزیرەکەی خۆی بەرکەنار بکا.

وای لێهات، لە هەر شـوێنێک پاشـا دەرکەوتبا، شـێخ ئاغاسـیشـی لەگەڵدا دەبوو. ئاغاســـی هەر بە ئەنقەســـت لەو کاتانەی وەزیر بۆ دیدارەکانی دەهاتە کۆشک، ئەویش دانیشتنی لای پاشای بەرنەدەدا و نە دەڕۆیشت.

ڕۆژێکیان، نیوەڕۆیەکی درەنگ، دوا لاپەڕەی ئەو بەڵگەنامەیەی مۆرکرد، کە لەســـەر مێزەکەی دانرابوو، بەڵگەنامەکەش هی هاوکاریکردن بوو لەگەڵ قڕاڵ. کاتێکیش پاشـــا مۆرەکەی لە قوتووی مەرەکەبەکە دەدا و مۆرەکەی لەســـەر بەشـــی خوارەوەی کـاغەزەکـانی بەڵگەنـامەکەی دەگیرســـاند، دەیبینی ڕێگەی هەرات بە ڕوویدا کراوەتەوە. ئەو بە مۆری دەســـتی لەنێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، لە ئاوێنەکەدا تەماشـــایەکی خۆی کرد. بەڵێ ئەو خەریکە شـــتێک بکا، باوکی نەیتوانیبوو بەدەســـتی بێنێ.

شەرمین![*] شا وەها بانگی پشیلەکەی کرد، بەڵام بەپیر دەنگییەوە نەهات. لە پەنجەرەوە ســەیری دەروازەکەی کرد، ســەری خۆی هەندێک خوراند و کڵاوەکەشی هەر بەدەستەوە وەبوو، ئاوەها وەستابوو. ئینجا لێبڕاوانە کڵاوەکەی لەســەری نایەوە بەرەو نووســینگەکەی ڕۆیشــت، لەپێشــەوە مۆری ئەنگوســـتیلەکەی لە مەرەکەب هەڵهێنا، ئینجا بە هێزەوە لەژێر ناوەکەی لەسەر کاغەزەکەی گیرساند. پاشان دەستی بۆ زەنگەکە برد و بانگی پەردەدارەکەی کرد بچێ شێخ ئاغاسی بۆ بانگ بکا.

کاتێکیش ئاغاسی گەیشت، پاشا بێ ئەوەی یەک قسەشی لەگەڵ بکا بەڵگەنامەکەی دایەدەستی شێخ، ڕەوانەی کردەوە.
هەنووکە ئەو بڕیارەکەی خۆی دا، ئینجا هەستیکرد لەو بارەیەوە لەگەڵ وەزیر قسە بکا.
جارێکی دیکە بانگی کردەوە: "شەرمین!"
پشیلەکە هات و خۆی نیشان دا.
پاشا بەرەو حەوشەکە ڕۆیشت، بەڵام لە نیوەی ڕێگا، لەسەر پەیژەکان گەڕایەوە دوا. بێ ئاگاداركردنەوە و جاڕدان خۆی بە حەرەمسەردا کرد. کاتێکیش خواجەباشی وای بینی تەڕدەستانە قاپقاپەکانی بەسەرپێ وەکردن و بە دوای پاشادا ڕۆیشت، پاشاش بێ ئاوڕدانەوە درێژەی بە ڕێڕۆیشتنەکەی خۆی دا، لێ ئیستێکی کرد و سەرلەنوێ ڕای خۆی گۆڕی. ئەم جارەیان ڕووی لە خواجەباشی کرد و پێی گوت: "بڕۆ وەزیرم بۆ بانگ بکە!"
خواجەباشی لەوە نەگەیشت ئاخۆ بۆ چی پاشا دەیەوێ وەزیری بێنێتە حەرەمسەرا.
شا لە شوێنی خۆی هاواری بەسەر خواجەدا کرد و شیڕاندی: "باشە بۆچی لە شوێنی خۆت ڕەق وەستاوی؟ دەی بڕۆ وەزیرم بۆ بێنە!"

کاتێ وەزیر بە سواری ئەسپەکەی گەیشتە حەوشەی کۆشک ئەنگۆرە داهاتبوو. لەوێ لغاوی ئەسپەکەی دایە دەست یەکێ لە ئیشکچییەکان و پەردەداری بابنۆکەریش پاشای لە هاتنی وەزیر ئاگادار کردەوە. کاتێکیش ئەو چووە ژوور یەکسەر پاشا وەزیری لەگەڵ خۆی بردە ژووری گفتوگۆ.
پاشا بەدەر لە خووخدەی خۆی بە وەزیری گوت: "فەرموو دانیشە."
بەڵام وەزیر هەر بە پێوە وەستابوو.

ئینجا پاشا دۆستانە لێی دووبارەکردەوە: "دەی، فەرموو دانیشە."
وەزیریش لەسەر سەندەلییەک دانیشت. پاشا چووە لای پەنجەرەکە وەستا و پشتی لە وەزیر بوو، ئەوسا سەرەداوە سەرەکییەکانی لەبارەی ئەو بڕیارەی لەبارەی هەراتەوە دابووی لەگەڵ پرسی کەشتیگەلی ڕوسی و دەریای قەزوینەوە پێڕاگەیاند. کاتێکیش بەتەواوی لە قسەکانی بووەوە، هەستیکرد بارێک لەسەر کۆڵی لاکەوتووە.
وەزیریش بێدەنگ سەری بەسەر سینگیدا شۆڕکردبووەوە و هەر بیری لێدەکردەوە.
پاشا لێی پرسی: "ئەرێ وەزیر بیر لە چی دەکاتەوە؟"
"ئەوەی شا کردوویەتی شتێکە چاک ناکرێتەوە." وەزیر بەدەم ئەم وەڵامە لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵسا.
"چاک ناکرێتەوە؟"
"کردنەوەی دەریای قەزوێن بە ڕووی کەشتیگەلی ڕوسی، خۆبەدەستەوەدانێکی تەواوە. هەرچی لەبارەی هەراتیشەوەیە، پاشا خۆی دەزانێ ئێمە هەرگیز جەنگێکی وەها نابەینەوە. پاشا و ڕاوێژکارەکانی، وڵات دەخەنە بارێکی ترسناک."
پاشاش وەها بەرگریی لەخۆی کرد: "ئاخر ئێمە لەگەڵ ڕوس بڕاندوومانەتەوە، گردەبڕانە سۆزمان داوە."
"کەس ناتوانێ لەگەڵ ڕوس بیبڕێنێتەوە. نەوەکانی پێش خۆمان ئەزموونیان لەوبارەیەوە هەیە."
پاشا بە نادڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە: "ڕۆژگار گۆڕاوە."
وەزیریش بە پێداگرییەوە گوتی: "بۆ ڕوس هەرگیز ڕۆژگار ناگۆڕێ."
"شا هەوڵێکی دیکەی لەگەڵ دایەوە: "لێ ئێمە چ زیانێک دەکەین ئەگەر هات و جەنگی هەراتیش نەبەینەوە؟"

"ئێمە زۆر شت لەدەست دەدەین، بەڵام خۆ دەقاودەق ئێستا پێشبینی ناکرێ."
"پێمخۆش نییە وەزیر بە قسەی بە پێچوپەنا لەگەڵ ئێمە بدوێ. دەی نموونە بهێنەوە. یەک نموونەمان پێ بڵێ." شا ئەمەی بە لێبڕاوییەوە گوت.
"قڕاڵ قومار دەکا، ئەو هیچ نادۆڕێنێ، بەڵام پێویستە پاشا باش ئاگادار بێ، ئاخۆ پێی خۆی لە کوێ داناوە. ئێمە ئەوەندە دەکەوینە قووڵایی زۆنگاوەکە، ناتوانین لێی دەرباز بین."
من داوای نموونەیەکی بەرجەستەم لێکردی، کەچی وەزیر هەر مەتەڵم بۆ هەڵدەدا."
"سەنگینی و دژوارییی کاروبارەکە لە سەرووی نموونە هێنانەوەیە."
وەزیریش وەها وەڵامی دایەوە: "جەنگ لەگەڵ خۆی پشێوی و نائارامی و نادڵنیایی لێدەکەوێتەوە. پێویستە ئێمە لەگەڵ بریتانییەکان بگەینە سازش نەوەک بکەوینە داوی قڕاڵەوە. چاکسازییەکان..."
"چاکسازیی . چاکسازیی، باشە ئەو چاکسازییانە لە کوێن کە ئێمە چیدی دەسەڵاتمان بەسەر نیشتمانەکەماندا نەشکێ. سازش، کامە سازش؟ وەزیر لە هەموو کەسێک باشتر دەزانێ، بریتانییەکان لە سازش تێناگەن. بڕیارەکە دراوە، ئێمە بە زوویی بەسەر هەراتدا دەدەین. بەسیەتی تۆ بایی پێویستت زانی." شا وەهای بە وەزیر گوت و کاتێکیش وشەکانی لەدەم دەردەپەڕین، لێوی دەلەرزی.
وەزیر زاتی کرد دوا هەوڵی خۆی بدا و وەها تێهەڵچووەوە: "تکایە پایەبەرز لێم مەگرە، بەڵام ئەوە ئەرکی منە ڕووبەڕوو ئەمەت پێ بڵێم. ئەمەیان لە بڕیارە هەرە بیرلێنەکراوەکانە تا ئێستا دەرتکردبێ. من دژی ئەو بڕیارەم. تۆ لە لایەن دەستەیەک لە ڕاوێژکارە چاوچنۆک و سەرشێتەکان ڕێنوێنی کراوی. من دە جاران دژی شەڕم. دەی ئەم

بەڵگەنامانە بدڕێنە. تەخت و تاجی خۆت لەسەر سەنگی محەک دامەنێ، وڵات مەخەرە بن باری دژوار!"
لە تافی لاوێتیدا زۆر جاران شا کاتێ شازادەیەکی جێگرەوە بوو، قسەی ئاوەها توندی لە وەزیر وەک مامۆستا و پەروەردەکارێک پێویست بوو ببیستێ، بەڵام خۆ ئێستا پێویستی بەوە نەمابوو. پاشا لە چەکمەجەیەکی مێزەکەی بارستاییەک کاغەزی دەرهێنا لەبەردەم کەپووی وەزیری دانا، حەوجەش نەبوو شـــا چیدی بڵێ. کاغەزەکانیش بەندێکی وەرگێڕاوی دەستوری فرەنسی بوو، دەمێک بوو وەزیر کاری تێدا دەکرد. ئەوەی لە بەندەکەدا هاتبوو، کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکانی پاشا بوو.
ئینجا پاشا هاواری کرد: "دەی بڕۆ ون بە!" پاشان بە توندی دەرکەی لە دوای وەزیرەوە پێوەدایەوە.

# ٢٦

# عیساخان

وەزیر بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە لە کۆشـــک هاتەدەر. بە نێو شـــەقامە تاریکەکاندا بەرەو گردەکانی دەرەوەی شـــار لێیخوڕی و هەر لەگەڵ خۆشـیدا قسـەی دەکرد: "لە تاریکیدا ڕەوە گورگێک بەدوامەوەیە، ئەرێ باشە بۆ ئەوەندە گورگە، ئاخر خۆمن ناتوانم زیاتر لە سێ ئاژەڵی کێوی تێربکەم".

ئەو پێویستی بەوە هەبوو قسە لەگەڵ کەسێک بکا. ئەوە بوو ئەسپەکەی هاژۆت، بە گورگەلۆقە ڕۆیشت و بە دەنگی بەرزیش لەگەڵ خۆی دەدوا. دواجاریش فرمێسک بەسـەر ڕوومەتیدا هاتنەخوار. تۆ بڵێی پێویست بکا وەک وەزیر دەسـتی لەکاربکێشـێتەوە و ئەو ژیانەی ماویەتی لەسـەر زەویوزاری خـانەوادەکەی لە فەراهـان بە خوێنـدنەوە و نووسـین بباتەسـەر؟ هەڵبەتە، نابێ واز بێنێ، ئاخر ئەوکات دەسـتەبژێری گەندەڵ، سیاسـییەکان و هێزە بیانییەکان دێن و گەمە بە کارتەکانی دەسـەڵات و حوکمڕانی وڵات دەکەن.



ئەو ئەوەی بینی وا نەخشـــەکانی یەک بە دوای یەکدا هەرەس دەهێنن. خەونەکەی بە هێڵی ئاســـنین، کە هەر لای خوارەوەی ولات تا ئەوپەڕی ڕۆژهەلات دەڕۆیشـت، کیبڵی تێلێگراف سـەرتاسـەری ولاتی گرتبووەوە. ئەو ویسـتی پرد و نەخۆشـخانە بنیات بنێ، منداڵان بنێرێتە قوتابخانە و ژنـان لە کۆڵ کوێرەوەری بکاتەوە، لێ دیـارە هەموو ئەمانە لەبارێەک دەترازێن و هەرەس دەهێنن.

کەواتە خۆ بۆ هیچ لەســـەر شـــۆڕشـــی فەرەنســـای نەخوێندبووەوە و لێکۆڵینەوەی لەســـەر نەکردبوو، بەڵگەنـامەکـانی لەبـارەی پێکهێنـانی ئەنجوومەنی نیشـتمانی، ئەوەی لەبارەی هەلاتنی لویسـی چواردەهەم و دەســـتوری فرەنســـای خوێندبووەوە و لە مێشـــکی خۆیدا تاوتوێی کردبوون. دیـاربوو ئەو هەموو خۆزگـانە نەکردە بوون، بەلام خۆ ئەو پێشتر ئەنجوومەنێکی ئێرانی بۆ دەسەلاتی قانونداناں دانابوو. ئەوە خۆی بیروبـاوەڕی ئەو بوو تـا دەســـەلاتەکانی قـانونـدانـان و جێبەجێکـار و دادوەری پێویســـت بوو لە یەک جیابکرێنەوە. ئەو لەوە تێگەیشـــتبوو دەکرێ مێژوو دروســـــت بکرێ و خەڵکیش بۆ بەختەوەریی خۆیـان تێبکۆشن.

لەبەردەمی پاشـــاشـــدا هەرگیز نەدەبوو ئەم بابەتانە بێنێتە گۆڕێ. بەڵێ ئەو لە کاتی دەســـتبەتاڵی ئازادانەی خۆیدا بە وەرگێڕانی دەســـتوری فرەنســی بۆ ســەر زمانی فارســییەوە خەریک بوو. وایدەزانی کەس بەو شـــتەی نازانێ، بەلام خۆ نەیارەکانی ئەو کەســـانێک بوون گاڵتەیان پێنەدەکرا.

دیار بوو شـــێخ ئاغاســـی بەندێکی وەرگێڕدراوی دەســـتوری فرەنســـی کەوتبووە دەســـــت. ئەم بەندەش کتومت لەبارەی ســـنووردارکردنی دەســـەلاتەکانی پاشـاوە بوو. ئاغاسـیش چاوەڕێی کاتوسـاتی گونجاوی خۆی کرد، تا نمایشی خۆی لەبەردەم پاشادا پێبکا.

وەزیر ڕکێفی لە ئەســـپەکەی دا و تا تا لای باوکە بەتەمەنەکەی خۆی تاودا. پیرەپیاوەش خۆی لە ژیانی گشــتیی کێشــابووەوە، لە گوندێک لە دەرەوەی تاران لە قەڵایەکدا دەژیا. ناویشی عیساخان بوو. لە ڕۆژگاری خۆیدا سەروەزیری باوکی پاشا بوو. عیساخان حوکمڕانێکی پڕئەزمون بوو، لە زۆر جەنگ و کوشتن و لەناوبردنی سیاسییانەی بەشدار و کارا بوو.

گوندە بچکۆلانەکەی عیســـاخانیش کەوتبووە بەرانبەر شـــاخی توچال. گوندنشـــینەکان زەویوزاری گەورە و زۆریان نەبوو، ئەوان خانووە بچکۆلەکانیان لەبەر بەرزایی و ڕەوەزی چیاکەدا دروستکردبوون. لەبەر ئەوەی گوندەکە زەویی پێویست بە خەڵکەکەی نەبوو، بۆیە خانووەکانیان لە پاڵی یەکدی هەڵنابوو، بەشێوەیەک بانی خانووەکانی خوارەوە دەبووە دەروازەی چوونەژووری خانووەکانی ســەرووی خۆیان. بۆ کەســانی لایدە هەمیشە ئەو شوێنە تایبەت و جیاواز دەهاتە بەرچاو، ئاخر مانگا و مەڕومالات لە بەینی بانەکان دەوەستان.

هەرچی مـاڵباتی وەزیر بوو، زۆر لەمێژ بوو قەڵایەکیان بنیاتنابوو. هەنووکەش باوکی وەزیر، لەوانەشـــە خودی وەزیریش دوا ڕۆژەکانی خۆی لەوێ باتەسەر.

کاتێک نزیک گوندەکە بووەوە، ئەســـپەکەی وەزیر بە ئەســـپایی و بە تاریکایی بەرەو دێیەکە ملی نا. لە شوێنێکی دیاریکراودا لە یەکسەمەکەی دابەزی و بەپێی ڕێگەی قەڵای باوکی گرتەبەر. دەروازەی قەڵاکە وەک هەمیشە لەسەر گازەرای پشت بوو. پیرەژنێک، کە ساڵانێکی دوورودرێژ خزمەتی ماڵەکەی دەکرد، لە دوورڕا وەزیری بینی و ویستی دەمودەست عیساخانی لێ ئاگادار بکاتەوە، بەڵام وەزیر ئاماژەیەکی بۆ کرد، پێویست بەوە ناکا، بەڵکو دەیەوێ کتوپڕ بچێتە لای باوکی.

عیسـاخان لە ژوورەکەی خۆی لەسـەر مافوورێک لە پشـت مێزێک دانیشـتبوو، بە زەڕەبینێک(وردبینێک) سـەری بەسـەر کتێبێکدا گرتبوو. وەزیر لە شوێنی خۆی وەستا و هەر سەیری دەکرد. ئەو پەی بەوە برد کە دەکرێ ئەمە دواساتی بینینی باوکی بێ. شێوازە کوورەکەی دانیشتنی باوکی و سـەر و ریشـە درێژەکەی بەتەواوی چەرموو بووە، بڕوای نەدەکرد ئەو پیاوەی بەردەمی، ئەو پیاوە بێ کە کاتی خۆی لەبەرەی پێشـەوە لە دژی ڕوسـەکاندا جەنگاوە، ئاخر ئەو پیاوە ئەو کەسـە بوو گفتوگۆیەکی دووروودرێژی لەگەڵ قڕاڵدا کرد تـا سـنووری ولاتەکەی لەگەڵ ڕوسـیادا دیاری بکا و بچەسـپێنێ. خۆی هەر هەمان ئەو پیاوەش بوو، ڕۆژێـک لە ڕۆژان دەبووایە ئەو سـووکـایەتی بهەژرێنێ و ئەو ڕێککەوتننامەیە مۆربکا، بە هۆیەوە وازی پێ لە ئوسـتانێکی باکووری ولات، وازی لە یەریڤان و وازی لە بەشـی سـەرووی ئازربایجان بۆ ڕوسەکان بێنێ.
عیسـاخان سـەری بەسـەر کتێبێکدا داگرتبوو، لەکاتێکدا تیشـکی زەردی چراکە لاڕوومەتێکی ئەوی ڕۆشن کردبووەوە.
"ئەرێ ئەوە عیساخان چی دەخوێنێتەوە؟"
پیرەپیاوەکە پشـتی قیتکردەوە، سـەری بەرەو لای دەنگەکە هەڵبری و گوتی: "ئەوە دەنگی وەزیرە." ویسـتی لە شـوێنی خۆی هەڵبسـتێ، لێ وەزیر بەرەولای چوو، هەردوو دەسـتی توند گرتن و مـاچی کرد و لەبەردەمیدا چەمایەوە.
عیساخان گوتی: "چییە وەزیر غەمناکە، دەی قسەم بۆ بکە."
"ولات، ولات و هەر ولات." وەزیر بە ئـاخێکەوە وەهـای گوت، ئینجـا دەموچاوی خۆی خستە ناو لەپە بەرگەگرەکانی باوکی.
"کوڕم وا دەبینم کۆڵێکی قورست لەسەرشان بێ."
"دەترسم ئەوان بمکوژن."

عیســـا خانیش وەڵامی دایەوە: "پیاوەکانی بنەماڵەمان هەرگیز لە مردن نەترساون."
"من لە مردن ناترســـم، بەڵام لەوە دەترســـم ئەوان بێن و بەرلەوەی کارەکەی خۆم تەواو بکەم، بمکوژن."
"تۆ ناتوانی بە تەنیا ڕەوتی مێژوو دیاری بکەی، خەڵکیش لەو ڕەوشـــەدا نین تەواوی کارەکانیان ببەنەسەر، لێ هەر دەبێ بۆی تێبکۆشی."
وەزیریش وەهـای پێگوتەوە: "من ئەوە دەکەم و هەمیشــــەش وەهـام کردووە، بەڵام دەترسم مێژوو ئەوە لەبیر بکا، کەوا خەریکی چیم."
"وشـەکان لای من ئاشـنان." باوک بە خەندەیەکەوە وەڵامی دایەوە: "خەم مەخۆ، مێژوو تۆی بینیوە."
""بەڵام چی دەڵێی ئەگەر هات و لە نیوەی ڕێگادا ئەرکەکەم لەبار ببەن؟"
عیساخانیش وەڵامی دایەوە: "کەواتە ئەمەش ڕەوتی مێژووە."
وەزیر بزەیەکی هاتێ و ئاهێکی هاتەوەبەر.
ئینجا عیســاخان پێیگوتەوە: "هەرگیز ترســم لە مردن نەبووە، باوکیشـم لێی نەترســاوە، باوکی باوکیشــم هەر لێی نەترســاوە. ئەوانە پیاوگەلێک بوون، وەک تۆ خزمەتی وڵاتیان کرد. ئەوان کارەکەی خۆیان لێهاتووانە بردەسەر. ئێستاش نۆرەی تۆیە."
وەزیر دەرکەکەی پێوەدایەوە و لە تەنیشت باوکی دانیشت.
"باوکە،" وەزیر بە چرپەیەکەوە گوتی: "شـا وڵات وێران دەکا و دایکیشـی لەو پۆلکترە. ڕاوێژکارەکانی لەخشـــتەبەرن و پاشــاش دەیەوێ بکەوێتە داوەکە و لەخشــــتە ببرێ. ئەو ڕیشـــی خۆی داوەتە دەســــت ئەو ڕاوێژکارانەی لە پشتەوە خەنجەری لێدەدەن."
"ئەمە شـــتێکی نوێ نییە." عیســـاخان وەها وەڵامی دایەوە: "ئەدی منیش هەمان شتم لەگەڵ باوکی ئەم پاشایە لێنەقەوما؟"

وەزیر جارێکی دیکە هەڵسـا و بەرەو لای دەرکەکە ڕۆیشـت، تا بزانی ئاخۆ کەس لە دەرەوە بەدزییەوە گوێیان لێدەگریٚ.
ئینجا وەزیر کەوتەسـەر قسـە: "باوکە، تۆ لە خزمەتی باوکە لاوازەکەی ئەم پاشـایەدا بووی. باوکیشـت لە خزمەتی باوکە لاوازەکەی باوکی ئەم پاشـایەدا بووە. هەنووکەش ئەز لە خزمەتی ئەو پاشـایەم. ئەوان ناتوانن بەبیٚ ئێمە هەڵبکەن."
عیساخانیش پێی گوتەوە: "دەی کوڕم، دڵت بکەوە."
وەزیر وەها هاتەوە قسـە: "باوکە، ئێمە ئێسـتا لە ڕۆژگاری کارەبا و قیتاردا دەژین. پێوسـتی بە سـەرکردەی نویٚ هەیە. پێم وایە دەبیٚ شـا بەرکەنار بکریٚ و لەو شتەشدا من هەر بەتەنیا نیم."
پیرەمێردەکە سەیری دوڕ[51] چاوی وەزیری کرد.
ئینجا بە حەوسەڵەوە پێیگوت: "ئەم بیرۆکەیە لەسەرت دەرکە. خۆ ئەگەر پاشا بەرکەنار بکەی، ئەوا وڵات توشی تەوژمێکی ئاڵۆزی شەڕی خێڵ و هۆزەکان دەبێتەوە. ئەمەش ئەو شتەیە هێزە دەرەکییەکان بۆی لە بۆسە دان و چاوەڕێی دەکەن. ئەم وڵاتە توونی بابایەکی لەمێژینەی ململانێیەکی شـاراوەیە لەسـەر دەسـەڵات، کاری بەسـەرچوو، تەوژمە دینییە ئاڵۆزوبڵۆزەکان، سـیاسـییە دژوارەکان، شـازادە بەرچاوتەنگەکان تۆڵەخوازەکان، ئاخوندە گەمژەکان و ژنە بەدەسـەڵاتەکان، ئەوانەی لەپشـت پەردەوە سـەرەداوەکان ڕادەکێشـن. کوڕم، ئەوەی دەتەویٚ، پێویستە لەگەڵ پاشادا بیکەی."
"ئاخر پاشـا گەلحۆیە. هەموان دەچرپێننە بنگوێی تا من بکوژیٚ، ئەویش لەم کارە دوودڵی ناکا."
عیساخان بێدەنگ بوو، بیری لێکردەوە.

---

[51] دوڕ: ناو، ناوەڕاست.

ئینجا بە هێورەییەوە گوتی: "کوڕم، ئیرەیی بە مجێزبەرزییەکەت دەبەم. نامەوێ ڕێگەت لێبگرم. لەوانەیە لەسەر هەق بیت، بەڵکو پێویست بکا یەکێک ڕابپەڕێ و بەم شێوازە وڵاتەکە ڕزگار بکا. لێ لەبەر ئەوەی من باوکی تۆم، لەو حاڵەتەدا ئەو ڕاوێژکارە ڕاستودروستە نیم. خۆت کوڕێکی زیرەکی و پێویستت بە ڕاوێژ نییە. لێ یەک شت هەیە دەکرێ ئاشکراوڕوون بێ: هیچ هەنگاوێک بۆ دواوە مەگەڕێوە. هێزی خۆت بەکاربێنە و ئەرکەکەت ڕابپەڕێنە."

وەزیر بە وەڵامەکەی باوکی گرژ بوو. لە نێو چاویدا ژیانویستی بریسکایەوە. لە شوێنی خۆی هەڵسا و دەرکەکەی بە تەواوی کردەوە.

# ٢٧

# هێزی سروشتبڕ

کاتێک داریوشی گەورە بۆ یەکەمین جار بە خۆی و لەشکرە بێژمارەکەی بەرەو ڕۆژئاوا کشا و ویستی ئەسینا بگرێ، پێشتر ڕاوێژکارەکانی سەیری ئەستێرەکانیان کردبوو، لەو بارەیەوە ڕاوێژی خۆیان دابووە پاشا.
لێ گەلۆ، خۆ ئێستا وڵات ئەو ئەستێرەناسە لێهاتووانەی نەماون، هەروەها هەموو قوللە بەرزەکانیش، ئەوانەی مرۆ دەیتوانی پێی لە ئاسمان بڕوانێ، هەموویان لە میانەی شەڕەکاندا لە لایەن دوژمنانەوە تێکوپێک درابوون و خاپوورکرابوون. ئێستا هەر جادوباز پێشبینی پاشەڕۆژی دەکرد و ڕەملی لێدەدا.
شێخ ئاغاسییش دواهەمین پیاوی نێو ئەم نەریتە بوو، ئەو خۆی وەها نمایش دەکرد، گوایە لە باریدا هەیە پەیوەندی لەگەڵ هێزی سروشتبڕدا بگرێ. پاشاش ئەو ئەرکەی بە ملدا هێنابوو تا بەهرەکەی خۆی بۆ ئەوە بەکاربهێنێ و لە پرسی هەراتدا خاترجەمی بکا.

شێخ ئاغاسی بەسەر کێوی توجال کەوت، تا لەوێ لە ئەشکەوتەکەی خۆی بچێتە چلەوخلوەوە. ئەو لە ڕۆژگاری پاشای پێشووشدا، کاتێ ڕاوێژی پێدەکرا، هەر وەهای دەکرد. ئەشکەوتەکەش شوێنەکە بوو، پێشتر جادوباز و فاڵچییەکان دەهاتن و لەوێ بە خۆیان و سیپارە و کتێبی کۆن، گیادەرمانی سەیروسەمەرە، بخوری بۆندار، پەلی وشککراوەی ئاژەڵ، کەللەسەری ئادەمیزاد و مار و خشۆکەکانی دیکەیان خەڵوەتیان دەکێشا.

دەرووی ئەشکەوتەکە کەلێنێکی تەسکی نێوان دوو گاشەبەردی گەورۆنە بوو. شێخ ئاغاسی چەند پارچە نانێکی ڕەق، جانتایەک قەسپی وشککراو و دێمکەیەکی[52] ئاوی لەگەڵ خۆ برد. دەبووایە لە زارکی ئەشکەوتێدا خۆت تی دابا[53] تا بچێتە ژوور، پاشان خۆی کووڕ کردەوە تابتوانێ بچێتە بنەبانی ئەشکەوتەکە، ئەو شوێنەی دەیتوانی بە قیتی لێی ڕابوەستێ. لەوێ مۆمێکی داگیرسان و ئینجا زیاتر بۆ بنەبانی کشا. شوێنێکی شێداری سامناک دەهاتە پێش چاو، لێ نەوەک بۆ شێخ ئاغاسی، ئاخر ئەو فێر بووبوو لەوێ لەبەرخۆیە دەستی بە خوێندنەوەی چەند دەقیکی پیرۆز کرد، بەڵکو دەعبای ژەهردار و دڕوارە لەخۆی دوور بخاتەوە و زاریان لەخۆی ببەستێ: "*یا رب ئەل ڕەبوک و ما رەبوک و ئیننا ڕەبوک و ئەللاهو ڕەبوک و موحەمەدون ڕەبوک و عەلیون ڕەبوک و مەهدیون ڕەبوک.*"

---

[52] دێمکە: لە پێستەی ئاژەڵ دروستکراوە، ئاوی خواردنەوەی تێدا هەڵگیراوە.

[53] تی یان تیدان: واتە خۆلادان بەقەدەر ئەوەی تا ڕێگەی یەکێکی دیکە ببێ بە بەردەمتدا ڕەت بێ.

دیوارەکانی ئەشـــکەوتێ بە هۆی دووکەڵی مۆمەمەکان ڕەش بووبوون؛ گژوگیای وشـــکراو، گیاوگوڵ، جێپێی گورگ، کەللەســـەر، ددانی مار و دەقی پیرۆزیشی پێوە هەڵواسرابوون.
شـــێخ ئاغاســـی دانیشـــت و دوای ئەوەی گورگەخەوێکی بۆ کرد و پشوویەکی بۆ دا، ئینجا تیشکی بیروهۆشی خستە سەر پرسی هەرات. ئەو هەمیشـــە هەر لە هەمان شـــوێندا دادەنیشـــت تا بتوانێ لەگەڵ هێزە ســـروشـــتبڕەکان بکەوێتە هاموشـــۆ. کاتێکیش دایکی پاشـــا خۆی بۆ گەشـــتەکەی ڕوســـیا ئامادەدەکرد، هاتبووە ئێرە هەمان شـــتی کردبوو. ئینجا لەسەر دیواری بەردەمی ئەوەی بینی چۆن مەهدولیا لە کەژاوەکەی خۆیدا لە کۆشکەکەی قراڵی ڕوسیا دەچێتەژوور. بەرلەوەی شاژن بەرەو مۆســـکۆ بەڕێبکەوێ، لێرە لەســـەر دیواری ئەشـــکەوتێ چەند دیمەنێکی ئایندەی بینین.

شێخ ئاغاسی لەپاش سێ ڕۆژ و دوو شـەو هێشتا هیچ نیشـانەیەکی لە هێزی باڵاوە لەبارەی هەراتەوە بۆ نەهات. تەنیا لە ئێوارەدرەنگی ڕۆژی ســـێیەمیدا، خەریکبوو لە ئایندەدا هەم دەنگی خەڵکی هەرات ببیســـتێ و هەم ڕوخســـاریشـــیان ببینێ. پاش ماوەیەک، ئینجا هات، دیمەنێکی شـەڕەکەی لەســـەر دیوارەکە نمایش بوو. ســـەربازی هیندی بینین لەژێر فەرماندەیی ئەفســـەرە بریتانییەکان لە دەروازەی هەراتدا بەڕیز ڕێدەکەن و بەیداخی بریتانیش بەســـەر دەروازەی شـــارەکەدا دەشـــەکێتەوە. فەرماندەیەکی گەورەی بریتانی، فەرمانڕەوای شـــارەکە، ئەوەندە نزیک بووەوە تا ڕاددەیەک شـــێخ ئاغاســـی توانی بیچمێ بیبینێ و لەبیریشـــی نەکا. ئینجا گوێی لە تۆپەکانی ئێرانیش بوو بەسەر دیوارەکانی شارەکەدا دەڕۆیشـــتن و گرم لەولا بەزەویدا دەکەوتن، بەیـداخی بریتـانی بینی دەکەوتنە ســـەر زەوی. ئەوەشـــی بینی، هەر ســـەبازیی هیندی بوو

هەڵدەهات و جەنگاوەرانی ئێرانیش بەسەر پشتی ئەسپەکانیان بەدوایانەوە بوون و ڕاویان دەنان.
لە دیمەنی سێیەمینیشدا شای بە زیندوویی لە دەروازەی شارەکەدا بینی، بە سواری ئەسپەکەی دەچووە ژوور. هەر دەتگوت شتەکە ڕاستییە و ئێستا ڕوودەدا، گوێی لە پرمژنی هەناسەی ئەسپی شا بوو. هێشتا شا هەر لەسەر پشتی ئەسپەکەی بوو کاتێ سەری مرۆڤێکیان فڕێدایە بەردەپێی.
شێخ ئاغاسی دەستبەجێ ئەو کەللەسەرە گەورەیەی فەرماندە بریتانییەکەی ناسییەوە. ئیدی پەیامی باڵا ڕوون و ئاشکرا بوو. ئاغاسی لە کێوەکەدا دابەزی تا بە دڵگەرمییەوە پێشبینییەکانی بخاتە بەردەم پاشا.

## ٢٨

# لەشکرکێشی

کاتی خۆی هەرات ناوی ئاریا بوو. ئاخر یەکەمین شـــاری ئارییاییەکان بوو، ئـاریـایەکـانیش دامەزرێنەری قەڵەمڕەویی ئێران بوون. گریکە کۆنەکان بە شارەکەیان دەگوت ئارتاکۆوانا.[٥٤]
ئەسـکەندەری گەورە لەسـەر ڕێگەی خۆی بەرەو هیندسـتان بەسـەر شـارەکەی دادا و گرتی. لەوێدا بارگەوبنەی خسـت، هەر ئەوێشـی کردە بنکەیەک بۆ ئەوەی زێڕ و زیوی هینـدسـتان تـاڵان بکـا. ئەو نـاوی شـارەکەی ناونا ئەسـکەندەریا ئاریانا. چەند سـەدەیەک دواتر عەرەب قورئانیان بەسـەر خەڵکەکەدا سـەپاند، پاشـانیش جەنگیزخان شـارەکەی خاپوور کرد. دوای ئەویش چەندانی دیکە هاتن و ڕۆیشـتن. ئێسـتاش نۆرەی شـای ئێرانە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە داوای شـارە ئاڵتوونییەکە بکاتەوە.

---

[٥٤] Artacoana

یەک مانگ لە دوای ئەوەی شێخ ئاغاسی لە ئەشکەوتێ دابەزی و هەواڵە خۆشـــەکەی پێراگەیاند، پاشـــا خۆی کۆکردەوە و چووە شـــارە ســـنوورییەکەی مەشـــهەد لە ڕۆژهەڵاتی وڵات، لەوێوە دیداری لەگەڵ ئەفســـەرە ڕوســـەکـان هەبوو. ئەفســـەرەکـانیش نەخشـــەوپلانی لەشکرکێشییەکەیان لەگەڵ هاوتاکانی خۆیان لە ئێرانییەکان تاوتوێ کرد. هەر دەســـتبەجێش بە ســـتراتیژەکەیان ســـەرســـامبوون و پاشـــانیش پەســـەندنامەی پاشـــای وەرگرت. نەخشـــەکە تۆکمە و باش دیار بوو، پاشـاش دەیەویسـت خۆی لە بەرەی پێشـەوە ئامادەبێ. ئەو خۆی دەها دەبینییەوە کتومت وەک چۆن ئاغاســـی لە دیمەنەکەی لە ئەشـــکەوتێدا هاتبووە پێش چاو، ئاوەها لە دەروازەی هەراتەوە بە نمایشێکی گەورەی هێزەوە، بە سواری ئەسپەکەی لە شارەکە بە ژوور بکەوێ.
دەسـتنیشـانکردنی کاتوسـاتی بەسـەردادانەکە زۆر لەبار و گونجاو بوو. ئاخر بریتانییەکان لە شـار و لادێیەکانی هیندسـتاندا تووشـی فشـاری بەرهەڵســـتی و هەرای نـاڕازاییبوون بووبوونەوە. ئەوان وەهـای بۆ چووبون هەر دەبێ کێشـــەکەیان لەگەڵ ئێرانییەکان بە دانوســـتان و چارەسەر بکەن. هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبوون سوپای ئێرانی بە چەکەوە بتوانێ هەڵبکوتێتە سەر هەرات و بیگرێتەوە.
ڕوســەکانیش مشــووری ئەوەیان خوارد بە هیچ شــێوەیەک بریتانییەکان لەســـەر نـاوچە ســـنوورییەکەی ڕۆژهەڵاتـدا گومـان لە جموجۆڵی سەربازییانە نەکەن.
لە هەمان کاتیشـدا ڕوســەکان یەکەیەکی ســەربازییان بەســەر پشــتی کەشـتی و لە دەریای قەزوینەوە ناردە دەشـتە قاقڕکەی پشـت سـنووری ئەفغانستان تا بتوانن هەر کاتێک دەستیان بەسەر هەراتدا گرت کۆمەکی ئێرانییەکان بکەن.

پاشـا حەکایەتخوانەکەی خۆی لەگەڵ خۆی بردبووە سـەر سـنوور. لە شـەوی هێرشـەکەدا بانگی لای خۆی کرد تا داسـتانێکی جەنگیی بۆ بگێڕێتەوە.
پاشـا لە لەنێو مۆڵگە سـەربازییەکەی لەسـەر سنوور لە نێو خێوەتەکەی خۆیدا دەڕازا. ئەو لەسـەر تەختەبەندێک دانیشـت، پشـتی بە چەندین سـەریندا دابووەوە، قلیانەکەی خۆی دەکێشـا و هەرچی شـتی خۆش و بەتامی ئەوکاتیش هەبوو لەبەردەمی دانرابوو. ئینجا بە نۆکەرەکەی گوت برۆ حەکایەتخوانەکەم بۆ بانگ بکە.
حەکایەتخوانەکەش پۆشـاکی پیاوێکی هەراتی لەبەردابوو، مێزەرێکی شـیرڕەنگی لەسـەر نابوو تا سـەرملانی هاتبوو. لە خێوەتەکە هاتە ژوور و کڕنووشـێکی بۆ پاشـا برد وەسـتا تا ڕێگەی درا دەسـت بە حەکایەتخوانی بکا.
پـاشـا کە قلیـانەکەی لەدەم بوو، دووکەڵەکەی هەڵدەکێشـا، لە حەکایەتخوانەکەی پرسی: "ئەرێ چیمان بۆ دەگێڕیتەوە؟"
"ئەگەر پایەبەرز پەسەندی بکا، ئەمشەو لەشکرکێشییەکەی خشایارشا بۆ ئەسـینا دەگێڕمەوە، ئەو سـەربردە ڕاسـتەقینەی بە دەقە نووسـینەکەی هیرۆدۆتس پشتڕاست کراوەتەوە."
پاشاش پێیگوت: "دەی، بیگێڕەوە."
ئیجا حەکایەتخوانەکە مۆمەکانی کوژاندنەوە.
"خشـایار، پاشـای پاشـایان لە ئاپاندا لە کۆشـکێک دەژیا، ئەو کۆشـکەی حەفت هەزار پاسـەوان ئێشـکیان لێدەگرت. لە نـایابترین هەنگی لەشـکرەکەی بوو، "فیداگیان"یشـیان پێدەگوترا. ئەوان تیر و نێزەی درێژیـان پێبوو، تـایبەت بۆ ئەوان دروسـتکرابوون، بە زێڕ و زیو ئاودرابوون. لەدوای ئەوانیش هێشـتا حەفتا هەزار سـوارە هەبوون، بە

"نەمرەکان"ناویان دەرچووبوو. هەروەها لەشکرەکەی ئەو لە دەستەبژێری ناوچە جیاجیاکانی ئێران و هەندێ نەتەوەی دیکەی وەک میدی، باکتری و هیندی و پێدەشتەکانی ساکانی پێکهاتبوو، هەموو ئەوانەی لەگەڵدا بوو.

ئیدی لەشکرێکی یەک ملیۆن و نیوی بەرەو ئەسینا کشا.

شاهەنشاش سواری گالیسکەیەکی زێڕینی کراوە بووبوو، ئەسپی شاهانە ڕایدەکێشا، لەکاتێکدا نۆکەرێک لەپشتەوەی وەستا بوو، سەیوانەیەکی بۆ هەڵدابوو تا لە هەتاو بیپارێزێ.

خشایار بە خۆی و کەژاوەکەی بۆ سەر پشتی کەشتییەکی ناوازە لێیخوڕی، لەوێدا جەنگاوەران بە یەکبەرگی تایبەتەوە لە پێشوازییدا وەستابوون. دەنگی کەڕەنا و تەپڵی شەڕ گوێی مرۆڤی کەڕ دەکرد. وەک قوربانییەکیش، وشترێک لەبەر پێی پاشادا سەربڕا، بۆ ئەوەی کەژاوەکە بەسەر خوێنەکەدا بڕوا. خەڵک لە دڵەوە و بە هەموو هێزی خۆیەوە گۆرانی لە شکۆی پاشادا دەگوت. موغە گەورەکەی زەردەشتییش بە داردەستە زێڕینەکەی یەک دوو جار بە نەرمی بە کەژاوەکەیدا کێشا تا پیرۆزنامەی خۆی بەسەردا ببارێنێ، بە دەستەکەی دیکەشی دووکەڵە پیرۆزەکەی بەرەو خاشایار دەنارد، بەڵکو لە چاوی بەد دووری بخاتەوە. خۆی ئەمە نمایشی هێز و دەسەڵاتێک بوو، هەرگیز زەوی شتێکی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو. گریکەکانیش لەوە گەیشتن، کە زۆری پێناچێ وێنەی ئەو شا مەزنە وەک مۆرێک دەکەوێتە سەر دراوە ئاڵتونییەکەیان.

خشایار، کوڕەکەی داریوش، بە تەنیا یەک دەرسی لە باوکییەوە وەرگرتبوو: "دەست بەسەر جیهاندا بگرە." خۆ ئەگەر بەتەنیا جێپێی لە سەر خاکی ئەسینادا کردبایەوە، ئەوا دەکرا شانازی بەوە بکا تەخت و تاجی هەخامەنشییەکان داوابکا.

ئەم ڕووداوەش چوارسەد و هەشتا ساڵ بەر لە لەدایکبوونی عیسای کوڕی مەریەمەوە قەوما.
لەپاش هەفت ڕۆژان، کەشتییەکان گەیشتنە بەندەری یۆنان، بە نزیکبوونەوە لە وشکانی، خشایار چووە سەربانی کەشتییەکەی تا لە لەشکرەکەی بڕوانێ. بۆ هەرکوێیەک بیڕوانیبا، تا چاو حوکمی دەکرد، هەر کەشتیگەلی ئەو بوو. خۆ ئەو چیدیکە مرۆڤ نەمابووەوە، ئەو خواوەندێک بوو کە خۆی بۆ جیهان ئاشکرا کرد.
کاتێکیش ئاوڕی دایەوە، بۆ یەکەمین جار کەناری ئەورووپای بینی.
کەشتییەکەی پاشا لەنگەری گرت. خشایارشا هەر لە سەربانی کەشتییەکە وەستا بوو سەیری سەربازەکانی دەکرد ئاخۆ چۆن دادەبەزن و بەرەو وشکانی دەڕۆن. خەڵکی خۆجێی ئەوێش بە دەستەوەستانی سەیریان دەکرد.
لەکاتێکدا ئەو خەڵکە بە دەستی لەرزۆکیان دەستی زارۆکەکانیان توند گرتبوو، بە سرتەوە دەیانگوت: "پاشای پاشایان."
پاشا پاشکۆمی چیرۆکەکە و شکستە زەلیلیەکەی خشایاری دەزانی. ئەوەش ڕوون نەبوو، ئاخۆ حەکایەتخوانەکە بۆچی ئەم حەکایەتەی بۆ لێهەڵبژارد، ڕووداوێک ئێرانییەکان دوای چەندین سەدە هەر ئارەقەی شەرمەزای بۆ هەڵدەڕێژن. هێشتا حەکایەتخوانەکە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە نەبووبووەوە، شا دراوێکی بۆ فڕێدا. ئەویش دەستبەجێ لە گێڕانەوەکە وەستا، دراوەکەی هەڵگرتەوە و لە خێوەتەکە چووەدەر.
"هەی گەمژە." ئەم قسەیە لە دەمی پاشا دەرهات و قلیانەکەشی لە لایەک دانا. خۆی وەرگێڕا، لێفەکەی بۆ سەر سەری ڕاکێشا و هەوڵیدا بنوێ. دەبووایە بەیانییەکەی زوو، یەکەمین تیپ لە لەشکرەکەی بەسەر بکاتەوە و هانیان بدا، بەرلەوەی بچنە مەیدانی جەنگ تیژیان بکاتەوە.

ئەو شــەوە خەونێکی ناقۆلا لەخەوی ڕاپســکاند. لە خەونیدا باوکی خۆی بینی. لە خەودا بە چاوی پڕ لە فرمێســکی شــادییەوە باوەشــی پێداکرد. ئاخر ئەوە شــتێکی ناوازە بوو کە پاشــا کۆنەکە لەو کاتەدا بێتە خەونی. بەڵام خۆ ئەوەش هەر چاوەڕوان دەکرا.
ئێرانییەکان چەندین ســـەدەی ڕابردوو بوو، نازی هەراتیان وەک پارچە گەوهەرێکی دێرین هەڵگرتبوو، ئاخر شـــارێکی تایبەت و جیاواز بوو، هەردوو کەلتووری هینـدی و ئێرانی تێـدا کۆبووبووەوە. خەڵکەکەی بە فارســییەکی ڕەوان قســـەیان دەکرد، دابونەریت ئێرانیانە بوو، تەنانەت دەســـەلاتـدارە هینـدیەکـانیش بە فـارســـی دەدوان، بەلام داگیرکەرە بریتانییەکان هەموو شــتێکیان کرد تا شــارەکە بکەنە شــارێکی هیندییانە. خۆی ئەوەش ڕێکەوت نەبوو، کە پاشــا مردوەکە ئەم شــەوە بێتە خەونی کوڕەکەی، ئەمەیان شـــتێکی پێویســـت بوو، ئاماژەیەکی خێر و فەڕیش بوو. پاشان هەر لەو بەیانییەدا، کاتێک سوارگەل پۆل پۆل بە پێش پاشادا بەرەو مەیـدانی جەنـگ دەڕۆیشـــتن، لە نـاخی دڵییەوە هەســـتی بە سەرکەوتنێکی حاشاهەڵنەگرانە کرد.

کاتێکیش پاشا بیستی تەپڵی شەڕ بۆ پەلاماردانی هەرات لێدرا، کڕنووشی برد و هەنیەی خســتە ســەر زەوی و بە گریانەوە دوعای کرد و لە خوا پارایەوە بەڵکو ســـەرکەوتنێکی خێرای پێ ببەخشـــێ. ئەو هێشـــتا لە نوێژەکەی نەبووبووەوە، کە ســەرهەنگێکی ڕوســی فەرمانی بە ســوپای ئێرانی کرد تۆپەکانیان بتەقێنن.
بەم جۆرە هەزاران تیرئەندازیی ئێران بەرەو شـــار ملیان لێنا. هەروەک ڕوســـەکان دایان نابوو، ئاخر ئێرانییەکان زۆر باشــیان لە تیرئەندازی و تەقەکردن بە غاردانەوە بەســەر پشــتی ئەســپەوە دەزانی. ئەم شــێوازی

شــەڕکردنە وەک پەرجوویەک دەهاتە پێشــچاو، بەڵام خۆ مەبەســت لێی هەر ئەوە بوو سەر لە لەشکرە ڕێکوپێکەکەی بریتانی-هیندی بشێوێنێ. بریتانییەکانیش کە حیســابی ئەوەیان کردبوو لە هەموو لایەکەوە پەلامار بدرێن، کەچی چاوەڕێی ئەو ســتراتیژیە جیایەی ئەمڕۆیان نەکردبوو. بە شـــێوەیەک ئەفســـەرەکان نەیاندەزانی چۆن بەرەنگاری ئەو پۆل پۆلە چەکدارە ئێرانییانە ببنەوە و چۆن بەرگری لەخۆیان بکەن.
ئەو ســـەربازە ئەفغانی و هیندییانەی لەســـەر دیواری شـــارەکەشـــدا وەســـتابوون، نەیاندەتوانی لەوە زیاتر بەرگە بگرن. تیپی ســـوارەی هێرشبەریش لەیەک جیابوونەوە و لە مەیدانەکەدا بڵاوبوونەوە تا خۆیان لە لوولەی تۆپی بریتـانییەکـان بپـارێزن و بگەنە دەروازەی شـــار. بەربەســـتەکە شـــکێنرا و لەنێو دیوارەکانی شـــارەکەدا بووە شـــەڕی دەستەویەخە. پێشتر هەرگیز بریتانییەکان ئاوەها شەری دەستەویەخە، شــەڕی دووبەدوو، چاو بەچاو بکەوێت لەگەڵ ســەربازە ئێرانییەکانیان نەکردبوو.
شەڕەکە زۆر ئازاری ئەفغانییەکانی دا، لە قووڵایی دڵیانەوە نەیاندەویست لە دژی برا ئێرانییەکانیان بجەنگن. هەروەها ســـەربازە هیندییەکانیش مجێزی دنەدەرانەیان بۆ شــەڕ نەمابوو، چونکە ئێران وڵاتی دراوســێیان بوو، ئەوانیش نەیاندەویســت بۆ ئینگلیز شــەڕی دراوســێکانیان بکەن. هەرچی ئێرانییەکانیش بوون هەســتیانکرد ســـەرکەوتن نزیکە، ئەمەش ورەی زۆر بەرزکردنەوە. بە شـــێوەیەکی خۆزاییش خۆیان لە شـــەڕی ســـەربازە ئەفغانی و هیندییەکان لادەدا و بە دوای ئەفســـەر و ســـەربازە بریتانییەکان کەوتن بۆ ئەوەی تا دەرەوەی شارەکە ڕاویان بنێن.
یەکێک لە تیرئەندازە نیشـانشـکێنەکان، نیشـانەی لە سـینگی ئەفسـەرێکی بریتانی گرت، ئەوەی لەســەر قەپەنگی بارەگاکەی خۆی وەستابوو، لەپڕ دەنگی تفەنـگ هـات و کـابرای ئینگلیزی لەجێی خۆی ڕاقەنـانـد.

فەرماندەیەکی جەنگاوەری ئێرانی فەرمانی کرد تەرمی کابرا لە سـەر گالیسـکەیەک باربکەن، تا زووە فڕێیبدەنە بەردەم پێی پاشـا. کاتێکیش سـەربازە هیندییەکان ئەم شتەیان بەچاوی خۆیان بینی، هەر بابا بوو بە دەرکەی دیکەی شـارەکەدا بەرەو سـنووری هیندسـتان تێیدەتەقاند و هەڵدەهات.

ئەمجارەیان ئەفسەرە ئەفغانییەکان نەیاندەزانی ئاخۆ لە دژی ئێرانییەکان یان لەپاڵیاندا بجەنگن. ئاخر هەرات ئەو شـارە بوو هەر لە کۆنەوە هەروەک چۆن ئێرانییەکـانی لێدەژیـا ئـاوەهـاش هی خێـڵ و هۆزە ئەفغانییەکان بوو، ئەمەش بۆ چەندین سـەدەی دوورودرێژ هەروا بووە، تێکەڵی و ژن و ژنخوازیشیان لەگەڵ یەکدا هەبوو. هەر بۆیە دانیشتوانی شارەکە مەراقی ئەوەبوون ئاخۆ چۆن لەشکرکێشییەکە کۆتایی دێ.

کاتێکیش لەشـکری بریتانی-هیندی بۆ دەرەوەی شـار ڕاونرا، ئینجا سـەربازە ئەفغانییەکان فەرمانیان لە سـەرکردەکانیانەوە پێدرا جارێ بۆ ماوەیەکی کاتی خۆیان لەشەڕەکە بکشێنەوە و خۆیان بگەیەنە گردەکانی دەوروبەری شارەکە و چاوەڕێ بکەن.

بەم چەشـنە ئێرانییەکان دەسـتیان بەسـەر شـارەکەدا گرتەوە، بەڵام لە دەرەوەی دیوارەکانی شـارەکەدا هێشـتا شـەڕ لەوپەڕی گەرمەی خۆیدا بوو. لەوێدا بریتانییەکان زەبرێکی کوشـندەیان لە سـوپای ئێرانی دا و زیانێکی زۆریان پێگەیاند و هەرچی تۆپی ڕوسـی و فەرەنسـی سـوپای ئێرانی هەبوو، هەموویان تێکشـکاندبوو. سـوپای ئێرانی لەبارییەک ترازا بێژمار کوژراو و برینداری دا.

بریتـانییەکـان هەر زوو کەوتنە خۆ بەڵکو تیرئەنـدازەکـان لە هەرات بەدەربنێن. ئەوان داوایان لە سـەرۆک هۆزە ئەفغانیەکان کرد، لە هەموو لایەکەوە بەسـەر شـارەکە دادەنەوە، لێ ئەوەی مایەی سـەرسـوڕمانی هەمووان بوو سـەرهەنگە بریتانییەکە فەرمانی ئەوەی پێکرا دەسـتبەجێ



سوپاکەی بۆ سەر سنووری هیندستان بکێشێتەوە. ئەفسەرە بریتانییەکان لەم بڕیارە دەهری بوون، لە پەیامی فەرمانەکە نەگەیشتن، بەڵام خۆ لەندەن شتێکی دیکەی لە بن سەردا هەبوو.
یەکێک لە ئەفسەرە بریتانییەکان ئەوەی بینی، کە ڕوسەکان لە پاڵ ئێرانییەکان دەجەنگان. ئەو فەرمانی بە سەربازەکانی کرد تا لەنێو کوژراوەکاندا بە دوای سەربازی ڕوسیدا بگەڕێن. سەربازەکانیش بە خۆیان تەرمی سێ ڕوسی گەڕانەوە. تەرمەکان لە گالیسکەیەک بارکران و ئیدی سوپای بریتانی بەدەستکەوتی جەنگەوە لە هەرات کشانەوە.

هەواڵی سەرکەوتنەکە گەیشتە بەرگوێی پاشا. ئینجا بەدەورەدراوی بە ئەفسەرانی ئێرانی و بە چەشنی خشایارپاشا چووە نێو شارەکە. دانیشتوانە ئێرانییەکانی شارەکە کە ئەمەیان بینی، بۆ پێشوازیی پاشا لە ماڵەکانیان هاتنەدەر. پاشاش لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەستی بۆ ڕەعیەتەکەی ڕادەوەشاند و بیریشی لە خشایارشا و شادمانییەکەی کردەوە کاتێ بۆ یەکەمین جار پێی نایە سەر خاکی ئەورووپا.

# ٢٩

# بێدەنگییەکی کوشندە

هەواڵی دەستبەسەرداگرتنی هەرات گەیشتە تاران. دڵخۆشی گەیشتە ئەوپەڕی ئاستی خۆی. جارچییەکان هەواڵە خۆشەکەیان بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە. بە فەرمانی مەهدولیای دایکی پاشا، شار ڕازێنرایەوە، موزیکی لەشکر بەوپەڕی شادمانی لە کوچە و کۆڵانەکانی شار لێدرا. بازرگان و دوکاندارەکانی بازار مەشخەڵی گەورە گەورەیان هەڵکرد و لە مەیدانی بازاڕیشدا مەنجەڵی گەورە گەورەی زنجیرداریان لەسەر ئاگردان دانان و خواردنیان بەسەر هەژار و نەداراندا دابەش کرد. دەستوپێوەندەکانی دەوری مەهدولیا بەو ئەنجامەی سوپا بەدەستی هێنابوو، هیوا و نزای خۆشبەختییان بۆ شاژن خواست. سەرکەوتنەکەش وەک زللەیەکی توند دەبینرا بە بناگوێی وەزیر کەوتبێ. شکۆی شێخ ئاغاسی بەرز بووەوە، لای هەمووان وەک وەزیری نوێی وڵات لەقەڵەم

دەدرا. هیچ گومانێکیش لەوەدا نەمابووەوە، دوای گەڕانەوەی پاشا هەموو ئەرکەکانی وەزیر بە شێخ ئاغاسی بسپێردرێ.
شێخ ئاغاسی لە وتارێکدا کە بەناوی پاشا ڕێکیخستبوو، لەبەردەم هەموو شازادە سیاسی و کاربەدەست و بازرگانانی تاران بە دوورودرێژی پەسنی هەوڵ و کۆششی پاشای دا. ئەوەی ڕوون کردەوە، چۆن سوارە ئێرانییەکان بە سەرەنێزەی خۆیان دەرگاکانی شارەکەیان کردۆتەوە و چوونەتە نێو شار و دەستیان بەسەردا گرتووە. ئەو ئەوەشی ڕاگەیاند، پاشا جارێ هەر لە هەرات دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی کاروباری بەڕێوەبردنی شارەکە ڕێکدەخاتەوە، هەروەها بە تەواوی چێژ لەو شارە خۆشەویستە وەربگرێ.
بۆ رۆژی پاشتر شێخ ئاغاسی سەردانی مزگەوتی جومعەی تارانی کرد، لەوێ ئایەتوللا بە ئامادەبوونی هەزاران شوێنکەوتوو دوعای بۆ لەشساغی و خۆشبەختیی پاشا کرد.
دە شەو و ڕۆژی ڕەبەق لە هەموو لایەکی وڵات هەر شایی و ئاهەنگ بوو، داروباریش ڕازێنرانەوە و ئاڵاکانیش لەسەر فەرمانگەکانی حکومەت دەشەکانەوە.

شا لە قەڵایەکەی ناوەڕاستی هەراتدا مایەوە، ئەو قەڵایەی بۆ ماوەیەکی کورت بووبووە بارەگای سەرەکیی هێزی بریتانی. ئەو خۆی کاروباری شارەکەی بەڕێوە دەبرد. هەنووکەش کە کاری زۆری لەپێشە و چالاک و پڕ وزە بوو. ئاخر ئەو لە کۆشکەکەی خۆی هەراسان بووبوو، لە هەرات هەستی کرد پاشابوون چ واتایەکی گەورەی هەیە. هەموو ڕۆژێک بۆ ناو شار لێیدەخوڕی، لەوێ مۆڵگەی سەربازیی بەسەر دەکردەوە، لەسەر قوللە بەرزەکان بە دووربین سەیری سنوورەکەی لەگەڵ هیندستاندا دەکرد، ئەو شوێنەی سوپای بریتانی لێ وەستابوو.

تا ئەوکات هەموو شتێک بەگوێرەی نەخشە و پلانەکە دەڕۆیشت، تەنیا گومان لە بەرەی ڕوسەکانەوە هەبوو. شا دەیزانی ڕوس بەرگەی ئەو شتە ناگرن، کە بریتانییەکان یەک دوو تەرمی ئەفسەرەکانی ئەوانیان لەگەڵ خۆیان بردۆتەوە هیندستان. شتێکی سەیر و نامۆش لە ئارادا بوو، ئاخر ڕوسەکان هەر هەفتەیەک دوای سەرکەوتنەکە گەڕابوونەوە وڵاتەکەیان، لەوکاتەوە سۆراغیان نەمابوو، هیچ شتێکیان لێ نەبیسترا. شا هەوڵیدا خۆی بەو بیرۆکەیە ژێر بکاتەوە، بەڵکو ڕوس خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکا تا جارێکی دیکە بێتەوە ناو ئەفغانستان ئەوەی بەر بە دژەهێرشەکەی بریتانیا بگرێ. یاخود لەوانەیە جارێ ویستبێتیان ئەوە ببینین، ئاخۆ چۆن لەندەن کاردانەوەی لە هەمبەر شکستەکەیدا دەبێ.
هەرچۆنێک بێ، هەستەکە مایەی نائاسوودەیی بوو. لەگەڵ ئەوەی لەشکری ئێرانی لە هەراتدا نمایشێکی ناوازە و جیاوازی کردبوو، شا پەی بەوە بردبوو ئەگەر هات و بریتانییەکان بەڕاستی ویستبێتیان ئەوا دەیانتوانی بەر بە هێرشی ئێرانییەکان بگرن و بیانبەزێنن. تۆ بڵێی ئەو کەوتبێتە داوێک، بەڕاددەیەکی وەها پەی بە ناوەڕۆکەکەی نەبردبێ؟

زۆری نەبرد هەواڵێک لە مۆسکۆوە هات؛ هێرش کراوەتە سەر قڕاڵ. لێ قڕاڵ بە سەلامەتی لێی دەرچووبوو. کەچی ڕووداوەکە وای لەشا کرد لەو بارەوە زۆر وریا بێ. لەپڕیش چێژ و خۆشیی سەرکەوتنە خێراییەکەی ڕەوایەوە و شەوانی پڕ لە ترس و مۆتەکە جێگەیان گرتەوە. شا هەستیکی وەهای بۆ هات خەریکە شتێک بقەومێ.
لە کۆتاییدا ڕوسەکان دەرکەوتنەوە. باڵوێزی ڕوسیا لە تاران کارمەندێکی پلە سێی نارده لای دایکی پاشا تا پێی ڕابگەیەنێ تەندروستی قڕاڵ زۆر باشە، هەروەها ڕوس بەو سەرکەوتنەی هەرات شادمانن، قڕاڵیش سڵاوی بۆ پاشا هەیە و مۆسکۆ بۆ ئەگەری هەر کاردانەوەیەکی

سەربازیی ئینگلیز ساز و ئامادەیە. هەروەها باڵوێزەکەی ئەو پەیامەشی بۆ مەهدولیا ناردبوو، ئەگەر هات و بریتانییەکان بەسەر هەرات دابدەنەوە، ئەوا دەستبەجێ ئەوان ئەو لەشکرەی باکووری ئەفغانستانیان جۆش دەدەن.
خۆی ئەمە شێوازێکی نا سەرنجڕاکێشانە بوو بۆ گەیاندنی هەواڵەکە. تۆ دەتتوانی شتەکە وەک سووکایەتییەکیش لێکبدەیتەوە، بەڵام پەیامی ڕوسەکان پاشای هێورکردەوە و پێی قایل بوو. خۆ هەر هیچ نەبێ دەکرا ئەمجارەیان بە ئارامی سەر بنێتەسەر سەرین و پشوو بدا.
لە پاش چەند ڕۆژان، پاشا لە ڕێی هەواڵدزەکانییەوە هەواڵێکی بۆ هات، بە تەواوی پێی دڵخۆش بوو؛ گوایە سەربازە هیندییەکان لەسەر سنووردا دژی بریتانییەکان ڕاپەڕیون و نەیانویستووە دژی ئێرانییەکان بجەنگن.
ئەم هەواڵە بۆ پاشا زۆر گرنگ بوو، بە جۆرێک کاری تێکرد، هەر تەڕدەستانە ویستی پەیامهێنەکە بە تەنیا ببینێ. دەمودەست کابرا هێنرایە قەڵا سەربازگەکە. پیاوە پەیامهێنەکە زیاتر لە هیندی دەچوو لەوەی ئێرانی بێ. کاتێ گەیشت لە دەرکەوە بە هەڵلەرزینەوە وەستا بوو، تا ئەوکاتەی پاشای بە خۆی و تێلایەکەی لە ناوەڕاستی ژوورەکەیدا بینی.
پاشا لێی پرسی: "فارسی بەڵەدی؟"[**]
پیاوەکەش بە شەرمنییەوە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ. بە فارسی قسە دەکەم."
"بەڵام خۆ تۆ هیندییت؟"
کابرا وەها وەڵامیدایەوە: "نەخێر، بەڵێ، ئەز هیندیم، بەڵام ئێرانییشم."
"مایەی پێکەنینە. تۆ فارسی بە شێوەزاری هیندییانە قسەدەکەی."
پیاوەکە لە ڕەچەڵەکی ئێرانی بوو، ئەوانەی هەزار و سێسەد ساڵ پێشتر وەک شوێنکەوتەی زەردەشت بەرەو هیندستان ڕایانکردبوو، ئەوکاتەی

---

[**] نووسەر ئەم ڕستەیەی هەر بە فارسی بەڵام بە پیتی لاتینی نووسیوە: Farsi baladi?

عەرەب بەسەر دەوڵەتی ئێرانیاندا دا. لەوساوە ئەو هیندییە ئێرانییانە بە پارسی لەقەڵەم دەدرێن.

شا بە دانبەخۆداگرتنەوە پێگوت: "ئێمە هەواڵی نارەزایەتیی سەربازە هیندییەکانمان بیست، بەڵام دەمانەوێ جارێکی دیکە لە دەمی تووە بیبیستینەوە. باش گوێمان لێبگرە. خۆ ئەگەر درۆ بکەی، تەنانەت ئەگەر یەک وشەشت ڕاست نەبێ، ئەوا هەڵتدەواسین. تێگەیشتی؟"

پیاوەکەش بە ترسەوە گوتی: "خاوەنشکۆ، ناوێرم لەوە زیاتر بڵێم، دەترسم هەڵەیەک بکەم."

"وا لەخۆت مەکە، نمایش بکەی. ئەوەمان پێ بڵێ ئاخۆ ئەو هەواڵەی بۆت هێناوین لە کوێت بیستووە!"

پیاوەکەش وەڵامیدایەوە: "شتەکەم لە سەربازێکی هیندی بیست، خۆی لە نێو سەربازگەکەدایە."

"ئایا ئەو سەربازە هیندییە شتەکەی ڕاستەوخۆ بە خۆتی گوت؟

"بەڵێ، خاوەنشکۆ."

ئینجا شا پێیگوتەوە: "ئەمە باشە، ڕونە. دەی وشە بە وشە پێمان بڵێرەوە."

سەربازە هیندییەکەش گوتی: "ئێمە لە سەربازگەکە بووین، خەریکبوو خۆمان لە ڕۆن و چڵک پاک دەکردەوە، لەو کاتەدا لەنێو سەربازەکانی ئەوێ لە دژی شەڕ و وەستانەوە لە دژی ئێرانییەکان بووە هەرا. ئەو دەنگۆیە بڵاوبووەوە، ئەو ڕۆنەی ئێمە تفەنگەکانمان پێ چەور دەکرد لە چەوریی مانگاکانەوە دروستکرابوو. هەمووان بەو هەواڵە هێدمەگرتی بوون. پاشان ئەو دەنگۆیەش بڵاوبوویەوە، گوایە ئەو هەتوانەی لەبەر پۆرگ و بزماری مێخەکی، سەرپەنجە و سمتمان پێ چەور دەکرد لە چەوریی بەرازی بریتانییەوە دروست کرابوو."

"زۆر نایابە." شا بە خەندەوە گوتی: "دەی ، بیڵێ، زیاترمان بۆ بگێڕەوە."

سەربازە هیندییەکەش درێژەی بە قسەکەی دا: "بینیم هەمووان چەکەکانی خۆیان دانا و هەڵستان."
شا هاواری کرد: "زۆر نایابە."
"ئینجا خەریکی ئەوە بووین بە خۆڵ چەورییەکە لە دەست و پێمان بکەینەوە. عەریفە بریتانییەکانیش هەوڵیاندا ناچارمان بکەن تفەنگەکانمان هەڵبگرینەوە، بەڵام بە گوێمان نەکردن. لە کۆتاییدا ئێمەیان کێشایەوە بەرەی پشتەوە."
پاشا لێی پرسی: "دوای ئەوە؟"
"پایەبەرز، ئەوە هەموو شتێک بوو."
پاشا لە کابرا نزیک بووەوە، فەرمانی پێکرد دەمی بکاتەوە. پیاوەکەش وایزانی بە باشی گوێی لێنەبوو، بە سەرلیشێواوی لە پاشا نزبووەوە.[٥٦]
پاشا قسەکەی لێ دووبارە کردەوە: "دەی دەمت بە تەواوی بکەوە!"
کابرا بە هەڵلەرزینەوە دەمی خۆی کردەوە. پاشاش یەک دوو دراوی زێڕینی تێکرد و پێی گوت: "ئێستا دەتوانی بڕۆی، بەڵام هەمیشە هەر بە ئێرانی بمێنەوە."
کابرا بەو دراوە ئاڵتوونیانە ناودەمی، لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە و کڕنووشی بۆ برد و پشتاوپشت لە ژوورەکە چووەدەر.
ئیدی شا دەیتوانی لە شوێنی مانەوەی چێژ وەربگرێ. ئامادەبوو شەوەکانی لەگەڵ ژنانی هەراتی بەسەر ببا، ئەوانەی تەنیاییان لەبیر دەبردەوە.
کاتێکیش شا بەوەی زانی، کە هێزی ڕوس لە بانەکانی ئەفغانستان کشاونەتەوە و بە دەریای قەزوینەوە گەڕاونەتەوە وڵاتی خۆیان، ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرا. هێشتا لەو هێدمەگرتن و شڵەژانەی ڕاست نەبووبووەوە، ئەوەشی بەسەردا هات کە ئینگلیز بە پەسەندنامەی سەرۆک هۆزە

[٥٦] لێنزبوونەوە: ورد سەیرکردن، بە چاوی ئەبلەقەوە تەماشاکردن.

ئەفغانییەکان بە هەزاران سـەربازی بریتانی و هیندییان لە ئەفغانستان ڕێکخستوتەوە و لەڕیزەکانی سوپادا سازوتەیاریان کردوونەتەوە.
بەم جۆرە مۆتەکە باڵی بەسەردا کێشا. شا بەبێدەسەڵاتی دەبووایە هەر سەیری بکا چۆن پاشـملە لەبارەی وڵاتەکەی ئەو بڕیار دراوە. دیارە ڕوسـەکـان ئەویـان بە گورگـان خواردی داوە، بە بریتـانییەکـانیـان فرۆشـتووەتەوە. بەڵام تۆ بڵێی لە بەرانبەر چ ئاڵوگۆڕییەک وەهـایـان کردبێ؟ شـا خەریکبوو لە مەراق و نادڵنیاییدا نەخۆش دەکەوت. خەو و خۆراکی لەبەر چاوکەوت، قلیانەکەی تامی هیچی نەدەدا، چیدیکەش ژنە شۆخ و شـەنگەکانی هەرات دڵیان پێنەدەدرایەوە. لەوەش تێکەیشت، کە نابێ جارێ هەرات بەجێبێڵێ.

لەو ماوەیەدا خەڵک لە تاران سـەرقاڵی شـتی دیکە بوون. ئەوانیش ئەو هەواڵە هۆشـدارییانەیان بیسـتبوو، هەمویان لە هەوڵی ئەوەدابوون ئاخۆ چۆن لە خەمی پاشەڕۆژی خۆیاندا بن و مشووری خۆیان بخۆن. هەندێ لە شـازادەکان هەوڵیاندا هەرهیچ نەبێ سـەرەداوی پەیوەندییان لەگەڵ بریتانییەکان ڕابچێنن، ئەوانی دیکەش لەگەڵ ڕوسەکان.
شـێخ ئاغاسـیش گوێی لە ڕێککەوتنی نێوان ئینگلسـتان و ڕوسـیا بوو، هەوڵیدا لەو ئاڵوگۆڕە نوێیەی دەسـەڵاتدا پێگەی خۆی بەهێز بکا. ئەو زانی چۆن دەسـتی بگاتە ئەو بەڵگەنامانەی لە باڵوێزخانەی بریتانییدا بوون، ئەوەیان دەردەخست کە وەزیر لەگەڵ بزووتنەوەی میللی ڕوسیدا لە دانوسـتان و گفتوگۆدا بووە. پێناوەکەش یەکێک لەو خوێندکارانە بوو، کاتی خۆی وەزیر بۆ خوێندن ناردبوویە ڕوسیا.
لە ڕاپۆرتەکەدا ناوی خوێندکارەکە هاتبوو، باسـی ئەوەش کرابوو لە کۆبوونەکە لەگەڵ بزووتنەوەی میللی ڕوسـیدا ئامادە بووە. ڕاپۆرتەکە

هەواڵەکانی پێشـتری پشـتڕاسـتدەکردەوە، ئەو هەواڵانەی دایکی شـا لە ڕێی چاو و شۆفارەکانی دەستی کەوتبوو.

شـێخ ئاغاسـی بەنیاز بوو لەگەڵ گەڕانەوەی پاشـا، ڕاپۆرت و بەڵگەنامەکانی بخاتە بەردەم. بازنەی دەوروبەری مەهدولیا چاوەڕێی زەبری کوشـندە بوون لە وەزیر بدەن، کەچی ئێسـتا پاشـا لە هەرات عاسی بووە. شێخ ئاغاسیش بە دەوری خۆی تیختیخەی مەهدولیای دەدا بەوەی پێیڕاگەیاند: "وەزیر چەند تۆپێکی لە کۆشـکەکەی خۆیدا جێگیر کردوون. هەروەها ئەو ژن و منداڵەکانی خۆیشـی ناردوونەتە لای خەزوورەکەی لە فەراهان. لەوانەیە شـتێک لە ئارادابێ، هێشـتا پێمان نەزانیبێ."

## ٣٠

# کردەی لەپڕی ئینگلستان

لەمێژبوو لەندەن مرخی لە پارێزگا باشوورییەکەی ئێران خۆش کردبوو. خاکوخۆڵی بەشێکی زۆری ئەوێ، کە تا ئەوپەڕی گەرما سووردەبووەوە، ئەو بەشـــە خوارووی وڵات هی لێ ژیان نەبوو، خۆڵەکەی قاوەییەکی ئەوەندە تۆخ بوو وەک ئەوەی لە ڕووندا سـووركرابێتەوە وابوو. پاشـای وڵاتیش هێشـــتا هەر لە هەرات بوو، ئیدی کاتەکەی بۆ بریتانییەکان دووشەش بوو.

هەواڵی پەلاماردانی بۆ ســـەر بەشـــی خوارووی ئێران گەیشـــتە گوێی ئەفسەرانی بریتانی لە هیندستان. هەفتەیەکیش دوای ئەوە ئەوسا شا لە یەکێکەوە هەواڵەکەی پێگەیشت. پەیکەکە بە شەکەتی و لێبڕانەوە بەسەر پێی پاشـادا کەوت و گوتی: "بریتانییەکان بەســەر بەندەری بوشـەهریان داداوە."

شا لە شوێنی خۆی تاسا و هاواری بەسەرداکرد: "ئەوە تۆ دەڵێی چی؟" پیاوەکە نەیوێرا باقی هەواڵەکەی پێبڵێ. تەنیا ئەوەندە نەبێ زەرفێکی بە مۆمی سـووری لە بەرکی دەرهێنا، وەزیر پێیدابوو تا بیگەیەنێتە دەسـتی

شـــا. ئەویش بە دەســـتێکی لەرزۆکەوە زەرفەکەی کردەوە و نامەکەی خوێندەوە. بریتانییەکان هەراتیان بەو شـێوە بەجێهێشـت کە کردیان، تا لەبری ئەو بەدووری شەش هەزار کیلۆمەتر لەشکرکێشی بکەن و بەشی خوارووی وڵات داگیر بکەن.
شـــا بە پەشـــێوحاڵییەوە لە جێگەی خۆی هاواری کرد: "باشـــە، بۆچی ئەوێ؟"

کەشتییە جەنگییەکانی بریتانیا بەنێو کەنداوی فارسییدا هاتن و دەستیان بەســـەر دوورگەی (خارگ)ی ئێرانییدا گرت. مارینزی بریتانی لە ســـەر پشـتی کەشـتییەکانیانەوە بەندەری بوشـــەهریان بۆمباران کرد و خەڵکە خۆجێیەکەشیان ڕاونا. بە سـەدان سـەربازی بەریتانی دەسـتیان بەسـەر مەڵبەندە چۆڵکراوەکەدا گرت، ئاڵای بریتانیاشیان لەسەر هەڵدا.
هەرچەندە وەزیر پێشـــتر لە لایەن نەیارەکانی ســـووکایەتی پێکرابوو، لێ دەنەدرا دەســـــتبەرداری وڵاتەکەی بێ. ئەوە بوو دەســـــتبەجێ بەرەو باشـوور ڕۆیشـت و لە نامەکەیدا نووسـیبووی: "ئینگلسـتان لە شـوێنێکی هەسـتیار ئێمەی گرت، ئێسـتا مانەوەی نیشـتمانمان لە مەترســـی دایە. بوونی پاشا لە تاران داخوازییەکی پێویستە."
دەســـتبەجێ پاشـــا بانگی فەرماندەکانی لەشـــکری کرد و ڕێنمایی نوێی پێدان. ســـەرهەنگێکی لە جێگەی خۆی بۆ ســـەرپەرشـــتی لەوێ دانا و پێیشـــــی ڕاگەیـانـدن دەگەڕێتەوە تـاران. لەگەڵ گەردەی بەیـانی[57] ڕۆژی پاشـتر، کە هێشـتا ڕێگەوبان هەر تاریک بوو، پاشـا شـارەکەی لە دوای خۆی بەجێهێشـت. بەر لە ڕۆیشـتن و لە دەروازەی شـاردا، ئەسـپەکەی خۆی ڕاگرت، یەک مســـت خۆڵەکەی هەڵگرت و وەک خۆشـــەویســـترین یادەوەریی هەرات خستیە پاشکۆی زینی سـەر پشتی ئەسپەکەی. ئینجا

[57] لەگەڵ گەردەی بەیانی: بەیانی سەرلەزوو. کازیوە.

دەرکەدارینەکەی ماچ کرد بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەرەو تاران کەوتەوە ڕێ. هەفتەیەکی پێدەچوو تا دەگەیشتەوە پایەتەخت.
تا ئەوکاتیش بریتانییەکان توانیبوویان بەرگریی بەندەری بوشەهر بشکێنن و جێپێ خۆیان لەوێ قایم بکەن. ئینگلستان دەیەویست شارەبەندەرەکە وەک بنکەیەکی سەربازیی خۆی لە ناوەڕاست-ڕۆژهەڵات و هەروەک بەندەرێکی خۆی لە ڕۆژهەڵات بەکاربهێنێ. پاش ئەوێش، چاویان لەسەر دوو شاری هەرە بەناوبانگی وەک خورەمشەهر و بۆررنجانیش بوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە گومانی ئەوەی لێدەکرا کانەنەوتی گەورە گەورە لێ بن.
ئینگلستان تا پێنج ساڵ پێشتر هەر بە تەنیا سەروکاری لەگەڵ هیندستاندا بوو بە دەگمەنیش خۆی لە ئێران نەدەگەیاند. ئاخر ئەوان ئەوکات دڵنیا نەبوون، لی ئەو زانیارییانەی دواتر بەوان گەیشت، دەریخست لە بندینی خاکەکەدا، لەناوچەی سەر سنوور لەگەڵ عێراقدا یەدەگێکی یەکجار قەبە و زۆر لە نەوتی خاو لە دیوی ئێراندا هەیە. خۆی ئەمەش یەکێک بوو لە ڕازەکانی دەوڵەت، هێشتا نەدرکێنرابوو. بۆ ئەوەی نەخشەکەشیان ڕاستەڕێ بکەن، دەبووایە ڕێککەوتنێک لەگەڵ ڕوسیا مۆربکەن. لەشکرکێشی بۆ سەر هەرات ساتێکی زێڕین بوو تا لەگەڵ ڕوسەکان بکەونە گفتوگۆ.

ڕوسیا دەیان ساڵی دوورودرێژ بوو لەسەر دەریای ڕەش لەگەڵ عوسمانییەکان لە شەڕدا بوو، هەمیشەش بریتانییەکان لایەنی عوسمانییەکانیان دەگرت. ئیدی پێشنیازی بریتانییەکان بەوەی چیدی پشتی عوسمانییەکان نەگرن بە مەرجێک ڕوسەکانیش لە ئەفغانستان بکشێنەوە و پاشای ئێرانیش بۆ بەختی خۆی جێبهێڵن.

قرالّی ڕوســـــیش کە بەهۆی ڕاپەڕین و هەرای نـــاوەخۆ تووشـــی سـەرئێشـەیەکی زۆر بووبوو، تەردەسـتانە بە خسـتنەڕووەکەی ئینگلیز قایل بوو. ئەوەبوو ڕوسیا هێزەکانی خۆی لە بانە قاقڕەکەی ئەفغانستان کێشایەوە و دەستی ئینگلیزی بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکەی والا کرد.

لە بەرانبەردا وەزیر دەســتەوەســتان دانەنیشــت. زانی چۆن لەشـکرێک ڕێکبخا و بینێرێتە خوڕەمشـــەهر تا خەڵکەکەی بپارێزێ. لە تاران ئەو بۆچوونە هەبوو گوایە ئینگلســـتان وەک تۆڵەکردنەوە لە ڕێی کەنداوی فارسییەوە لەشکرکێشی دەکاتە سەر ئێران و دەیگرێ. وەزیریش خۆی وا تەیار و ئامادەکردبوو تا وەک شێرێک لە مەیداندا بجەنگێ.

بریتانییەکان لە شـــەڕەکەیاندا دڵڕەق بوون. وەزیر بەتەنیا بێ ئامرازێکی کاریگەریی بەرگری لە بەرانبەر تۆپەکانی بریتانییەکان وەسـتابوو، بەلام لەو نێوەدا توانی فەرمان و ڕێنمایی خۆی بە شـــێوەیەک دەربکا، کە جەنگاوەرەکانی بتوانن لە کونوکەلەبەری شارەکەدا خۆیان حەشار بدەن، ئیدی کە کاتی خۆی هات لێیان ڕاپەڕن و شـەڕی دەسـتەویەخە، شـەڕی پیاو بەرانبەر پیاو لەگەڵ ئینگلیزدا بکەن. ئەو لێگەڕا بریتانییەکان بێنە نێو شـــارەکە، تا وەک ســـەرکەوتوویەک بێخەم بە کوچە و کۆلانەکاندیدا بگەڕێن. ئینجا لە هەموو کون و قوژبنێکی شـــارەکەوە لێیان وەدەرکەون و دەستی خۆیان لێ بوەشێنن.

نامە و پەیامیشی بۆ هەموولایەک، بۆ سەرۆک هۆز و دەمڕاستانی تیرە و خێڵە ڕەوەندەکانی دەوروبەر ئەوێ دەنارد، داوای ئەوەی لێکردن کە ڕۆژی خۆی هاتووە، نیشـــتمان پێویســـتی پێیان هەیە. "دەی خۆ ئەگەر پەرداخی ئاویشـتان لە دەسـتدابێ، یەکسـەر دایبنێن و ئەسـپەکانتان زین کەن و بە خۆتان و پیاوەکانتان بگەرە خوڕەمشەهر."

سەرەک هۆز و تیرە و خێڵەکانیش قۆڵی مەردانەیان لێ هەڵماڵی و بەدوای جێسمی ئەسپ و شوێنەواری گالیسکەی سەربازە بریتانییەکان کەوتن و خۆیان گەیاندە خورەمشەهر.
دوژمن سەری لێشێوا، ئاخر وەیانزانی سەربازە ئێرانییەکان لە لاڕێوە شارەکەیان جێهێلاوە. ئەوان ئالای خۆیان هەڵدا و لەترسی دژە هێرش خەریکی دامەزراندنی تۆپەکانیان بوون. ئەوە بوو سەربازە ئێرانییەکان لە هەموو لایەکەوە، لە حەشارگەکانیان هاتنەدەر و داگیرکارەکانیان کردنە نیشانی لوولەی تفەنگ و سەرەنێزە و شمشێرەکانیان.
بریتانییەکان بە دوای ئەوەدا گەڕان ئاخۆ کێ تەقەیان لێدەکا، بەڵام خۆ لەبەر دەستترێژ سەری خۆیان پێ هەڵنەدەهات. هیچ چارەیان لەبەردەستدا نەمایەوە، مەگەر لە شارەکە بچنەدەر و چۆڵی بکەن.
وەزیر تێکۆشا ورە بداتە بەر سەربازەکان. هیوای بەوە هەبوو سەرۆک هۆز و تیرەکان لە کاتی خۆی بەپیر دەنگییەوە بێن، هیواکەشی بە ڕاست وەرگەڕا. ئیدی بریتانییەکان کەوتنە نێوان دوو بەرداشەوە، لە لایەکەوە سەرباز و لە لایەکی دیکە هێزی خێڵە پشتیوانەکان. مەیدان، مەیدانی ڕاستەقینەی شەڕ بوو، لەو کاتەش وەزیر پیاوەکانی خۆی بۆ جۆش دەدا، ئەفسەرێکی بریتانی کە ئەوی ناسییەوە، لوولەی دەمانچەکەی تێکرد و سێ جاران لەسەر یەک تەقەی لێکرد. دوو گوللە بەر وەزیر کەوتن. سەربازێک خۆی گەیاندێ و پڕی دایە و خستیە پشت خۆی و بە ئەسپەکەی تێیتەقاند و گەیاندیە هێڵی پشتەوەی مەیدانی شەڕ.
ئینجا سەرۆکی هۆزە خۆجێیەکەی ئەوێ جێگەی وەزیری گرتەوە و فەرمانی پێدان بەدوای بریتانییەکان بکەون، بەم جۆرە تا درەنگانێکی شەو هەر شەڕ بوو، دوژمنیان تا قووڵایی دارستانی دارخورماکان ڕاونا. بۆ بەیانیەکەی و بە هەڵاتنی خۆری ڕۆژێکی نوێ، هیچ سەربازێکی بریتانی یان هیندی لەوێ نەمابوو.



ئینگلسـتان دوابەدوای ئەو ڕووداوە کەشـتی و بەلەمەکانی ناردنە سـەر بەندەر عەباس. بەسەر ئەو بەندەرە باشووریە هەرە گرنگەشیان دادا، لێ لەوێ هیچ سەربازیکی ئێرانی لێ نەبوو. لە ئەنجامدا دوو هەواڵی ناخۆش بە پاشـا گەیشـتن: "وەزیر بەسـەختی بریندارە و ئینگلسـتانیش دەسـتی بەسەر کەنداوی فارسییدا گرت."

## ٣١

# ژنەکە

پێش هەتاوهەڵات، کەژاوەی مەهدولیا بەرەو کۆشکی شا کەوتەڕێ. لەو دواییانەدا ژانی لە چۆکاندا هەبوو، نەیدەتوانی بەپێ بڕوا. دەبووایە لە قاڵدرمە و لە هەنگاونان لە شـــوێنە بەرزەکاندا یەکێک بچێتە بن باڵی. ئەوەبوو شـا بۆ پێشـوازی هات و دەسـتی گرت و یارمەتی دا تا لەگەڵ خۆیدا بیباتە ژوور. هێشـتا هەر لەسـەر پەیژەکان بوو، مەهدولیا ئامێزی لە شـــا وەرێنا و بە هەنســـکەوە گوتی: "ئای لە ڕۆڵەکەم، وای لە کوڕە بەستەزمانەکەم."

پاشاش بە سرتەوە پێگوت: "دایکە ئەدی هیممەت و شکۆت لەکوێیە؟ خۆ پاسەوانەکان سەیرمان دەکەن."

لە ژووری دانیشـتنەکەدا مەهدولیا بە ئاخ هەڵکێشـانەوە خۆی بەسـەر کورسییەک دادا و لێی دانیشت.

بە داخ و حەسـرەتەوە کەوتەوە سـەر قسـە: "ئای کوڕەکەم، خۆزگە من بمردبامایە، بەڵام تۆم لەو دۆخە سەخت و ناخۆشەدا نەدیبایە."
دیاربوو پاشا لەبن کاریگەریی دۆخەکەدا بوو، لای پەنجەرەکە وەستابوو.
"کوڕم، ئەو بێدەنگییەت دەمکوژێ. دەی قسـەم لەگەڵ بکە، دڵی خۆتم بۆ بکەوە."
"بـاشـە دایکە، چی بڵێم. لەشـکرەکەم لە هەرات گیری خواردووە. بەندەرەکانیشـمان لە کەنداوی فارسـییەوە داگیرکراون و منیش هیچ فیشـەکم نەماوە تا تەقەیان پێ بکەم. باشـە هەنووکە چیبکەم؟ تەگبیر؟ متمـانەم بەکەس نەمـاوە. دایکە خۆت دەبینی، چۆن ڕوس ئێمەیـان بە گورگان سـپارد. چ یارییەکی قێزەونیان لەگەڵ کردین. ئاخر خۆ قڕاڵ تۆی لە ماڵەکەی خۆی پێشـوازی لێکردی. ئەو دوو بە دوو لەگەڵ تۆ قسەی کرد پاشانیش لەپشتەوە خەنجەری لێدام."
مەهدولیـاش تۆڵەسـتێنانە هـاتە وەڵام: "بـاوەڕ نـاکەم ئەم کـارە قڕاڵ کردبێتی. ئەدی ئەو لەپاڵ ئێمە لە هەراتدا نەجەنگا. تۆ دەبێ لە شـوێنێکی دیکەدا بە دوای هۆکارەکەدا بگەڕێی. ئەم پیلانە هەر دەبێ لەبن سـەری بازنەی دەوروبەری خۆمانەوە بێ."
"لە لایەن کێوە؟"
"کوڕەکەم، ساویلەکە مەبە، لە وەزیر زیاتر کێ هەیە!"
"دایکە، توخوا واز لەو نەخۆشییە هەناوڕەشییە بهێنە. زۆر جار بیر لەوە دەکەمەوە، ئێمە ناڕەوا دەرهەق وەزیر دەجووڵێینەوە. من نامەم بۆ نارد و پەسـنی ئازایەتییەکەم دا. ئەم پیاوە بەسـەختی بریندار بووە، لەوانەیە بمرێ."
"دەکرێ بریندار بووبێ، بەڵام مردن، ئەوە شتێکی دیکەیە. ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەیە تا خۆڵ بکاتە چاوتەوە! دەی بڕۆ سـەر جادە، گوێت هەڵخە و ببیسـتە، ئینجا دەزانی ئاخۆ دایکت باسـی چی دەکا. لەشـکرەکەت لە

هەرات گیری خواردووە، کەنداویش داگیرکراوە. هەڕەشـــە لەســـەر نیشـتمان هەیە، کەچی خەڵک ســەری زمان و بنی زمانیان هەر وەزیرە. ئەو بۆتە پاڵەوان، هەمووان بە پاشــای ڕاســتەقینە ناویدەبەن. ئایا کەس ئەمەی بە پاشــــا ڕانەگەیاندووە؟ نەخێر هیچ کەس، ئاخر کەس ناوێرێ ڕاستی بڵێ. کوڕم، من لێرەم، بۆ ئەوەی تارماییەکە لەسەر چاوت لاببەم. من دایکی تۆم، تاکە کەسێک کە گەفت لێ ناکا منم، من بەتەنیا و هەر بۆ ئەوە هاتووم تا دڵت بدەمەوە."

قســەکانی مەهدولیا کاریان لە شــا کرد. فرمێســک بەســەر ڕومەتیدا هــاتنەخوار، ئەو ڕووی بەرەو پەنجەرەکە وەرگێڕا تــا ڕوخســــارە خەمبارەکەی خۆی بشـارێتەوە. شـاژنەدایک لەسـەر کورسییەکە تەکانی بەخۆی دا، خۆی گەیاندە شــا، دەســتی گرت و ماچی کرد، ئینجا گوتی: "خۆ ئێمە ئەو وڵاتەمــان لە کلۆرەداری بۆ نەکەوتۆتە خوار. پیــاوە مەزنەکانی خێڵەکەمان، ئەوانەی پێش تۆ بە زەبری شمشێر ئەم وڵاتەیان پێکەوەنا و پاراستیان. خۆی نە بە تۆ دەستی پێکرد و نە بە تۆش کۆتایی پێ دێ. پاشــایان لە ژیانی خۆیدا تووشــی نســکۆش دێن. دەی پشــتت قیتکەوە، سەرت بەرز ڕاگرە و ئارام بگرە."

پاشا بێ ئەوەی ئاوڕ لە دایکی بداتەوە لە هەنسکی گریانی دا.

ئینجا مەهدولیا شای بۆ باوەشی خۆی ڕاکێشا و بەگوێیدا چرپاند: "زۆر باش بیری لێبکەوە. ئێستا نۆرەی تۆیە، ئەو ئەرکەت لەسەر شانە تەخت و تاجەکە ڕزگار بکەی. تۆ دەبێ وەک باپیرانت توندوبەند بی. لێ جارێ هەموو شـــتێک بۆ وەزیر لێبگەڕێ، دەرفەتی ئەوەی بـدەرێ ئەوەی پێیخۆش بێ بیکا. لێگەڕێ با وەک پاڵەوان لە لایەن گەلەوە پێشـــوازی لێبکرێ و چەپڵەی بۆ لێبدرێ. پاشــان پێویســـتە پاشــا بجووڵێ. دواتر دەگەڕێمەوە تا پێت بڵێم چۆن. ئەمەش کارێکی ســـانا نییە، بەڵام ئەگەر

هات و هەمووان دەســـتبەرداری شـــا بوون، خۆ هەر دەبێ یەکێک لە پشتیەوە بوەستێ، ئەو کەسەش منم!"

پاشـــا خۆی ڕاســـت کردەوە، ڕوومەتی مەهدولیای ماچ کرد. ئینجا تا بەردەرکەی کۆشک یاوەری کرد. شەماڵی دەرێ ئەوی هێنایەوە سەرخۆ. بە قووڵی هەناســـەی هەڵمژی، کاتێ هەناســـەی دایەوە گوتی: "دایکە، سوپاس بۆ هاتنت."

سـەردانەکەی مەهدولیا بۆ لای پاشـا، وەک ئەوە وابوو دەسـتی گرتبێ و لە بیری هێنـابێتەدەر. ئیدی جارێکی دیکە هەســـتی بەخۆی کردەوە و دوای چەندین شـەوی بێداری و خەوزڕان، ئەو شـەوە ئارام لێی ڕازا. بۆ بەیانییەکەی پڕ بەدڵ حەزێ لە نانی بەیانی بوو، وەک شـــێتان کەوتە سـەرێ. لەسـەر ناشـتا، هەسـتیکرد شـیعرێکی بۆ دێ. دەسـتبەجێ داوای قەڵەم و کاغەزی کرد.

دەســـتی دایە دەفتەرەکە، لەســـەر چۆکی خۆی داینا، بەر لەوەی لەبیر بچێتەوە هەندێ ســـەرەدێڕی گرنگی نووســـین. خۆی ئەمانە ئەو دێڕانە بوون، کە کاتی خۆی، کاتێ هێشتا هەر لە هەرات بوو، بۆی هاتبوون، لێ لەبەر دۆخە نـاکـاو و شـــڵەژاوەکەی هەینێ لەبیریـان بردبووەوە بیاننووسـێتەوە. هۆنراوەکە لەبارەی گەمەی ژیانەوە بوو، لێ هێشـتا ئەو وشە گونجاوەکانی بۆ نەدۆزیبوونەوە تا کێش و سەروایان بە دروستی بۆ دابنێ. ئیدی ئەو وەهای نووسی:

*کاش میشود که من ازاد بودم*

*چوبی بر دست، پا بار راه بودم*

تۆ بڵێی وەک هەر کەسێکی دیکە ئازاد بوو‌بم

بە تێلاکەی دەستمەوە بێباکانە بەڕێدا دەڕۆیشتم

بە ماندوویی لە سایەی دارێکدا چاوم گەرم کردن

پێڵاوەکانم کردنە سەرین.
من دەڕۆم، دوور دوور، هەر زۆر دوور
ڕۆژێکیش دێ تووشی کچە جوتیارێکی جوان ببم
ئیدی لەگەڵ خۆی بمباتەوە ماڵێ
منیش لای ئەو بمێنمەوە
زەویەکەی بۆ بکێڵم
بۆ ئەو بچمە ڕاوێ
ئاسکێک بەکۆڵ دادەم و بگەڕێمەوە

ئەو وەهـا چووبووە نێو قووڵایی هۆنراوەکەی، هیچ ئـاگـای لەو هەراوزەنایەی ناو کۆشـــکەکە نەبوو. کاتێکیش هەرایەکە لە دەســـت دەرچوو، ناچار وازی لە هۆنراوەکەی هێنا و چووە لای پەنجەرە. لەوێ هەموو ژنانی حەرەمسەرا لە حەوشەکە وەستابوون. سەیری سەربانیان دەکرد و هەر هـاواریـان دەکرد: "وامەکە! نەخێر وامەکە! دەی وەرە خوارێ!"
پاشا کە وای بیست، پەنجەرەکەی کردەوە: "چییە، ئەوە چی قەوماوە؟"
هیچ کـام لە ژنەکـان نەیوێرا شـــتێک بڵێ. خواجەبـاشـــی، گەورەی حەرەمســـەرا هاتە پێشـــەوە و بە دەنگهەڵبڕینەوە گوتی: "یەکێ لە ژنانی حەرەمسەرا لەسەربان وەستاوە."
- "لەوێ چی دەکا؟"
- "دەیەوێ بـاز بـدا، چونکە دایکی ئەویـان فڕێداوەتە دەرەوەی کۆشک."
پاشا پرسی: "ئەو کێ بوو؟"
- "دایکی ئەو ژنەی ئێستا لەسەربانەکە وەستاوە."
- "باشە دایکی ئەو لێرە چی دەکا؟"

- "دەیەوێ کچەکەی لەگەڵ خۆی بباتەوە."
- "ئەدی بۆچی دەقیژێنێ؟"
- "دەترسێ نەبادا کچەکەی لەسەر بانەکە خۆی فرێبداتە خوار."

شا بانگی کرد: "ئەو کیژە کێیە؟ ئێمە دەیناسین؟"

"ئەو یەکێکە لە ژنەکانی ئێوە."

ژنەکانی حەرەمسەرا هەر یەک لای خۆیەوە بانگی دەکرد: "نەکەی، باز نەدەی!"

لێ خۆ ئەو هاوارکردنە درەنگ بوو. ژنە لەسەربانەکە بازی و هەر وەک فەردەئاردێک لە خوارەوە لە تەنیشت دایکە چاوبەگریانەکەی کەوتە سەرزەوی.

ژنەکان لە شوێنی خۆیان لەقیژەیان دا و بە ئەفسوسەوە لە دەرکەوە بەرەو نێو حەوشەکە غاریان دا.

"ئەمە پەڕجووە. ئەو هێشتا ماوە! هێشتا هەناسە دەدا!"

شا بانگی کرد: "ژنەکە بهێننە ئێرە!"

پاشان دوو پاسەوانی چوارشانە ژنەیان لە بەتانییەک وەرپێچا و گەیاندیانە ژووری میناباەندەکە.

ژنەکانیش لە دەرەوە هەوڵیان دا گوێیان لەوە بێ ئاخۆ شا چی بە ژنە دەڵێ.

- "دەی ڕووبەندەکەت لادە و چیدیکەش مەگری."
- "ژنە ڕووبەندەکەی لادا، بەڵام دەسماڵەکەی بەسەر ڕوخساریدا دا و هێشتاش هەر نەرمە هەنسکی دەکردن.
- "دەی پێم نەگوتی، بەسیە فونگە فونگ!"

ژنە دەستێکی لەسەر دەمی خۆی دانا و بێدەنگ بوو.

ئینجا شا پێی گوت: "دەی پەچەکەشت لادە، دەمانەوێ دەموچاوت باشتر ببینین."

ژنە گەنجەکە لەوانە نەبوو، جوانییەکی ناوازەیان هەبێ.
شا بەسەرسوڕمانەوە سەیری کرد و پێیگوت: "تۆش یەکێکی لە ژنەکانی ئێمە؟"
ژنە وەلامیدایەوە: "بەڵێ." چاوەکانیشی لەبەر گریان سوور هەڵگەڕابوون.
"ئەمە شتێکی مەحاڵە، تۆ لەو نموونە ژنانە نیت کە مایەی سەرنجی ئێمە بن."
ئەمجارەیان ژنەکە توندتر گریا.
شا لێی پرسی: "باشە کەی بوو کە دواجار ئێمە تۆمان بینی؟"
ژنە وەلامی دایەوە: "سێ ساڵێک دەبێ."
"لە کوێ؟"
"کاتێک تۆ لە گوند هاتیتە لامان، منیش لەنێو خەڵک وەســـتابووم، تۆ ئاماژەت بە من دا. ئیدی منیان بۆ ئێرە هێنا، ئێســـتاش ئەو هەموو ماوە درێژە چاوەڕێ دەکەم."
"چاوەڕێ دەکەی؟ چاوەڕێی چی؟"
ژنە پێی گوتەوە: "چاوەڕێی ئێوە."
"هی ئێمە؟" کەواتە ئێمە لە کوێین؟ خۆ ئێمە زۆر دێینە حەرەمسەرا."
"ئێوە دوو جاران هاتوونەتە لای من، هەر ئەوەندە و بەس. زۆر جار دایکم هەوڵیداوە من لەگەڵ خۆی بباتەوە، لێ خواجەباشـــی ڕێگەی پێنەدا بێتە ژوور. ئەمڕۆ گوێم لە دەنگی دایکم بوو بانگم دەکا. ئەوەبوو هەڵاتمە سەر بان و بازم دا."
لەو کاتەدا لە دەرکە درا.
پاشاش گوتی: "وەرە ژوور."
خواجەباشـــی هاتە ژوور. ئاگردانی زێڕینی قلیانکەی پاشـــای لەدەســـتدا بوو.
شا پرسی: "ئەمە چییە؟"

"ئەم ژنە ئەم کەڵبە[58] زێڕینەی قەلونەکەی تۆی دزیوە. لەناو جلەکانی خۆیدا شاردبوویەوە. من لە دەرەوەی حەوشەکە، لەسەر شۆستەکە دۆزیومەتەوە." کابرا ئەمەی گوت و شتەکەی دایە دەست پاشا.
ئینجا پاشا خواجەباشی ئیزن دا و شتەکەی لەبەرچاوی ژنەکە دانا و پێی گوت: "باشە بۆچی کەڵبەی قلیانەکەی منت دزیوە؟"
ژنە بێدەنگ بوو.
"ئێمە پرسیمان ئاخۆ بۆچی ئەو شتەت دزیوە؟"
"من...من... من نەم دزییوە، هەر بە تەنیا ویستم شتێکی شا وەک یادگاری لەگەڵ خۆم ببەم. کاتێکیش بەرەو سەربانەکە غارم دا، قلیانەکەی تۆم بینی، بۆیە کەڵبەکەم لێکردەوە. من ویستم بەڵگەیەک لەگەڵ خۆم ببەم. بەڵگەیەک بەوەی من لە کۆشکدا بووم، بەوەی من یەکێک بووم لەوانەی حەرەمسەرا و ژنی پاشا بووم."
دیاربوو ئەم وشانەی ژنە کاری لە پاشا کرد. دەستێکی لەسەر پشتی ژنە دانا بە ئاگردانی زێڕینی قلیانەکەی دەستی بەنێو ژوورەکەدا ڕاوێچکەی دا. لە ساتێکدا ڕووی بە لای ژنە وەرگێڕا و بە نەرمی پێیگوت: "تۆ لەو جۆرە ژنە جوانانەی نیت کە سەرنجمان ڕابکێشن، باشە بۆچی ئەو کات ئاماژەم بۆ کردووی و تۆم هێنایە کۆشک؟ "
ژنەش لێبڕاوانە گوتی: "ئەوکات من جوان بووم. ڕێک من ئەو جۆرە ژنە بووم کە تۆ حەزت لێی بوو، لێ ئەم ساڵانەی ڕابردوو منیان لاواز و ناشیرین کرد."
شا چووە لای ژنەکە وەستا و هەندێک خۆی شۆڕکردەوە دەستی بەسەری ژنەدا هێنا هەندێ یاری بە یاخەی کرد. ژنەش لە ورووژاوییدا لەرزی. ئینجا لە بەرکی چاکەتەکەی سێ دراوی زێڕینی دەرهێنان و

[58] کەڵبە: پشکۆگر، ئەو ئاگردانە بچکۆڵەیەی لەسەرووی بۆڕی قلیان، دایە پشکۆی تێدەکرێ تا توتنەکەی لەسەر بسووتێنرێ.

خستیه کۆشی ژنه و به سرتەشەوە پێیگوت: "ئێستا تۆمان بینی، دەی برۆ، خۆ ئەگەر بتەوێ دەتوانی لەگەڵ دایکت بچیەوە ماڵ، برۆ."
خەندەیەک پەڕییە سەر لێوی ژنە. ئێستا شتێکی لە شۆخییەکەی جارانی بۆ گەڕایەوە.
شا دەرکەکەی کردەوە، ئەو ژنانەی لە پشت دەرگە گوێیان هەڵخست بوو، هەریەک بەلایەکدا تێیانتەقاند. ئەو وەها جووڵایەوە وەک ئەوەی هیچی نەبینێ بێ، ئاسایی بەرەو باخەکە ڕۆیشت هەروەک ئەوەی هەر هیچ نەقەومابێ. تەنانەت بیری بۆ ئەوە چوو، کە بازدانی ژنە لەسەر بانەوە، ئاماژەیەک بووە بۆ ئەو. ئاماژەیەک بەوەی گەلەکەی لێی ڕازی نییە، چونکە خۆی سەروکار و هاموشۆی لەگەڵ ئەواندا نییە، دەبێ سەربەستییان پێ بدا. لێ ئەو هەر زوو بیرۆکەکەی بەلاوە نا. گەل پێویستی بە ئازادی نییە. گەل پێویستی بە ڕابەرێک هەبوو. ڕابەرەکەش شا بوو.

## ٣٢

# وڵات نزا بۆ کەنداوی فارسی دەکا

بریتانییەکان نەیاندەوێرا سەری خۆیان لە دەرەوەی دیوارەکانی شارە بەندەرەکان هەڵبێنن. هەر کاتێک ئەوان لە شار دەهاتنەدەر، دەدرانە بەر دەستڕێژی گوللە.

وەزیر، کە بەسەختی بریندار بووبوو، لە قەڵای سەرۆکی خێڵەکە دانرابوو. حەکیمە خۆجێییەکە توانیبووی گوللەکان لە جەستەی وەزیر دەربهێنێ. دوای یەک مانگ لە چارەسەری هێشتا وەزیر تاقەتی ئەوەی نەبوو لەسەر پێی خۆی بوەستێ. کاتێکیش لەسەر جێی نەخۆشیەکەی هەڵسا، هەوڵیدا دەست بە دیوارە دووردرێژەکانی قەڵاکە بگرێ و بەپێی خۆی هەندێک بڕوا.

پیرەژەکانی هۆزی بەختیاری زۆر باش ئاگایان لە وەزیر بوو، داودەرمانی باشیان بۆ دانابوو، وای لێهات لەوێ هەندێ خۆی بگرێتەوە و هێز و گوڕی بۆ پەیدا ببێتەوە. بۆ مایەی شادمانی هەمووان، سپێدەیەکیان بەخۆی خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکەی و لێیخوڕی. ئینجا بە هێواشی بەنێو مەزراکاندا ئەسپەکەی هاژۆت.

وەزیر ئەو ڕۆژانەی وەک خاڵێکی نوشست ئەزموون کرد. ئەو دەبووایە بیر بکاتەوە، شــتێک بدۆزێتەوە تا بتوانێ بریتانییەکان لە وڵاتەکەی دەربکا. بە یارمەتیی یەک دوو پیاوی دەستڕۆیشتوو توانی لەشکرێکی بچووک لە شــەهیدخوازان[٥٩] شــەڕیێ بخا. ئەو ئەوەی بە جەنگاوەران گوت، کە مێژوو ئەوەی بەســەر دا ســەپاندوون بە خۆیان و خەنجەری بەر پشتیان، بە تفەنەنگە ڕەشکە کۆنەکانیان بەرەنگاری زلهێزترین وڵاتی جیهان ببنەوە و دژی سوپاکەی شەڕ بکەن. ئەو جەختی لەسەر ئەوەش دەکردەوە، کە سەرکەوتن شتێکی مەحاڵە، بەڵام مەبەست لە بەرگرییەکە ئەوەیە زەبر لە داگیرکەران بدرێ و ئازاریان پێبگا. شــەهیدخوازەکانیش بۆ هەموو ئەگەرێک ئامادەبوون.

کاتێکیش وەزیر بایی پێویست چاکبووەوە و لەگەڵ لەشکری شەهیدان بەرەو بەندەرعەباس بەڕێکەوت، تووشــی کۆســپ و تەگەرەی یەکجار زۆر بوو، ئەوەی بریتانییەکان لە دەوروبەری بەندەرەکە دایاننابوو و لەسەر گردەکانیش بۆیان دانیشتبوون لێنەدەگەڕان بستێک بچنە پێشەوە، بەم جۆرە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمن دژوار بوو.

لەوێ جەنگاوەرەکانی خۆی وەها جۆش دەدا: "ئارام بگرن و تا بۆتان هەڵدەکەوێ لەهەر کوێیەک بۆتان هەڵکەوێ لە دوژمن بدەن. چاوەڕێکردن و هەر چاوەڕێکردن تاکە چەکی دەستی ئێوەیە."

بەڵێ، هەر بەڕاســتیش کات خاڵی لاوازی بریتانییەکان بوو. کارخانەکانی ئینگلســتان بۆ ســووتەمەنی بەهەوادا دەچوون، لەکاتێدا بە ملیۆنان لیتر نەوتی خاوی دەســتلێنەدراو لە ژێر خاکی کەنداودا کەوتبوو. ئینگلســتان پەلەی بوو.

---

[٥٩] نووســەر نووسیویەتی لەشکری شــەهیدان، مەبەست لێی ئەو لەشکرەیە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی ئامادەیە شــەهید ببێ و نەگەڕێتەوە، منیش بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە وام پێباشتر بوو دەستەواژەکە بکەمە لەشکری شەهیدخواز.

ڕەوشـە نائارامەکە لە بەردەم بریتانییەکان بەربەسـتێکی ڕاسـتەقینە بوو بەوەی زیاتر لەو ناوچانە نەچنە پێشـــەوە کە دەیانەویســـت بندینی خاکەکەی بپشـکنن. لەشـکری شـەهیدانیش بە ڕۆژ و شـەو بە خۆیان و تفەنگی دەستیانەوە لەسەر تۆقەڵیی دارخورماکان بۆیان لە بۆسەدابوون. یان بێ هەسـتوخوسـت بەخۆیان و خەنجەری دەسـتیانەوە لەنێو قوڕە لیتەدا بە حەشاردراوی بۆیان لەسەر پێ بوون.
بریتانییەکان وەهـایان دەزانی، بەڵام و کەشـــتییەکانیان لە کەنداوی فارســـییدا بێوەی دەبن، لێ زۆر جاران پیاوەکان بە تاریکی لەنێو ئاودا لێیان پەیدا دەبوون و لێ وەسەر بەلەمەکانیان دەکەوتن و زەبری خۆیان لێدەوەشاندن.
چیرۆکی کردەی پـاڵەوانـانەی جەنگـاوەران بە خێرایی بڵاوبوونەوە و بوونە مـایەی ورەبەرزکردنەوە و زاتـدانەبەرخۆی خەڵکی داگیرکراوی بەندەرەکان. تـا دەهـات بـازنەی بەرگری فروان و فراوانتر دەبوو. وای لێهات بریتانییەکان سەرچڵی ئەوە نەکەن بەشەو لە مۆڵگەکانیان بێنەدەر.

بریتانییەکانیش لەوە تێگەیشتن پێویستە سوود لە ئەزموونی خۆیان هی هیندســـتان وەربگرن و بەکاریبهێنن. پێوســـت بوو لەگەڵ ئێرانییەکان بکەونە گفتوگۆ.. هەر کاتێکیش ئاسـایش و ئارامی بەرقەراربوو، ئامادەی کنەوپشکنینی نەوتی خاوو بوون، بۆ ئەوەی بیر لێبدەن و ئەوە مسۆگەر بکەن زێڕی ڕەش بگەیەننە ئینگلسـتان. ئەوەی مایەی سـەرسـامی بوو بریتانییەکان چاوەڕواننەکراوانە لە هەردوو شارە بەندەرەکاندا کشانەوە. ئەوان لە نێو بەلەمە و کەشـــتییە گەورەکـانیـان لە کەنداودا چـاوەڕێی ڕێنمایی لەندەن بوون.
دوعای ئەو ملیۆنان خەڵکەی لە مزگەوتان دوای نوێژ کردیان، گیرۆ بوو. وەزیر سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

له دوای نیوەڕۆیەکی درەنگی لەنـدەنـدا، دیپلۆمـاتەکـانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیا سـەردانی شـوێنی حەوانەوەی نوێنەرانی ئێرانیان له لەندەن کرد. ئەوان لەو ماوەی دواییدا زۆر جار یەکدییان دەدی. نوێنەرانی ئێرانی بە چـا و شـیرنەمەنی پێشـوازییـان له دیپلۆماتەکانی ئینگلیز کرد و لەسـەر مێزێک دانیشـتن ئاخۆ ئینگلسـتان و ئێران کاروبارەکانیان لەگەڵ یەک چۆن ڕایی بکەن.

به ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، بروسـکەیەک بۆ وەزیر لێدرا، بروسـکەکه له کەشـتییەکەی بریتانییەوە نێردرابوو. وەزیریش دەبوایه پێشـوەختە چاوی لەسـەر پیته تایبەتییەکان ڕاهاتبا. بۆیه چاویلکەی بۆ لەچاو کرد و پەیامەکەی خوێندەوە. دەردەستیش پەیامێکی بۆ پاشا نارد:

گەورەیی هەر بۆ خوایه. ئەو خوایەی هێز و توانسـتی بەسـەر هەموو شـتێکدا زاڵه. هەر ئەو زانایه و هیچی لێ شـاراوە نییه، هیچ سـرتەیەکی لی بزر نییه، تەنانەت ئەگەر به کڕی و بێدەنگییش شـت گوترابێ. ئەو هەموو شتێک دەبینێ و هێزی ئەو بەسەر هەموو شتێکەوەیه. هێزی ئەو بەسـەر هەموو ئەوەی لەسـەر زەوییە و ئەوی لە ئاسـمانیشـه باڵکێشـه. هەر ئەو بڕیار دەدا. لەسـەر وەزیرە لەپێشـدا هەواڵی هاتنی ڕۆژگاری شـادمـانی پێڕابگەیەنێ. ئێمه بۆ شـەڕراگرتن لەگەڵ بریتـانییەکـان گەیشتووینەتە ڕێکەوتن. بریتانییەکان ئامادەن لەبارەی هەرات و لەبارەی کانەکانی ژێرەزەوی لەبەشـی باشـووری وڵات لەگەڵ ئێمەدا گفتوگۆ بکەن. هەفتەی دادێ له له بەندەرعەباس گفتوگۆ لەگەڵ نێردەی بریتانییدا دەکەین. هەر کاتێک گەیشـتینە شـتێک، ئەوا دەمودەسـت شـا لە هەواڵ و پێشهاتەکان ئاگادار دەکەینەوە.

دڵسۆزتان. وەزیر

# ٣٣
# ڕۆژژمێرنووس

لەو کاتەی پاشـــا لە هەرات گەڕاوەتەوە، بەشـــی زۆری کاتی خۆی لە قەڵای ســـەربازیی دەرەوەی تاران بەســـەردەبرد. ئەو لەوێ خۆی لە چالاکییە ســـەربازییەکان هەڵنەدەقورتاند، بەڵکو هەبوونەکەی وەهای لێ دەخوێندرایەوە، ئەو ســـەرکردایەتیی هێزی چەکداریی وڵات دەکات. لە ژووری کردەوە جەنگییەکان دادەنیشـــت و هۆنراوەی دەنووســـی، هەروەها ئەو یاداشـــتانەی کە لە هەراتەوە بە بیری مابوون، تۆمار دەکردن. ئەو خۆی وەک خووخدەیەک لە ڕۆژژمێرەکەی خۆیدا شـــتی ڕۆژانەی تۆماردەکرد، بەڵام ئێســـتا مێژووی ڕۆژانەی ڕووداوەکانیشـــی هاتەســـەر و تۆماری دەکردن. بێ مەبەســـتانەش بەدوای گەواهییەکاندا دەگەڕا.

نووســـین هەســـتێکی وەهای بە شـــا دەبەخشـــی وەک ئەوەی بە شـــتێکی هەرە بایەخدارەوە خەریک بێ، بەوەی مێژوو دەنووسێتەوە. پێشوەختانە

ئەو هەستەی بۆ هات کە لە دوای خۆیەوە، نەوەکان لە ڕێی ڕۆژژمێر و یاداشتەکانییەوە پەسنی بدەن و خامەکەشی لە کردەوەکانی باشتر لە بیرەوەری و یادگەدا بمێننەوە. کاتێک دەینووسی، لە هەموو شتێک دادەبڕا، خۆی لەبیر دەکرد و چێژی لێ دەبینی. هەرچەند شێوازی نووسینی جوانتر دەبوو هێشتا هەر ئیرەیی بە بەهرەی نووسینی وەزیر دەبرد. ئاخر دەیزانی ئەمیر کەبیر بە وشەکانی جادووی دەخوڵقاند. لەو نامانەی کە لە وەزیرەوە بۆی دەهاتن، هەندێ جار وا هەستدەکرا لەبری ناوەڕۆک زیاتر بایەخ بە ڕستەسازی دراوە.

هەنووکە زیاتر لە بەترێک شەو[60] ڕابردووە، بەڵێ نیوەی شەوە. شا کە لەم شەوانەی دووایی‌دا خراپ دەنوست، هێشتا هەر لەسەر پێخەفەکەی بێدار بوو، سەری بەسەر ڕۆژژمێرەکەیدا گرتبوو، تێیدا دەینووسی.

پەیکی وەزیر لەسەروبەندی هەمان کاتدا گەیشتە کۆشک. سەردەستەی پاسەوانانیش یەکسەر گەورەنۆکەری ئاگادارکردەوە، بەڵکو پاشا لەخەو هەڵستێنێ. پەردەداریش بە نەرمی لە دەرکەی ژووری خەوی پاشای دا. کاتێک گوێی لە دەنگی دەرکە بوو، قەڵەمەکەی دانا و گوتی: "ئەوە کێیە؟"

کابراش وەڵامیدایەوە: "خاوەن پایە، تەتەرێک لە باشوورەوە هاتووە و پەیامێکی گرنگی بۆ هێناوی."

لەو تاریکییەدا شا بە دوای چاکەتی شەویدا گەڕا: "دەی بابێتە هۆڵەکە، ئێستا ئێمەش دێین."

پەردەداری بابنۆکەر مۆمەکانی هۆڵی مینابەندەکەی هەڵکردن.

"سوپاس بۆ خوا، دیارە ئەوە مایەی خۆشبەختیمە ئەمجارە هەواڵێکی خۆش بە شا ڕادەگەیەنم." بەدەم ئەم قسەیەوە کابرای تەتەر زەرفێکی لەبن جلەکانی دەرهێنا و ڕادەستی پاشای کرد.

---

[60] بەترێک لە شەو ڕابردووە: دەربڕینێکە زیاتر لە بەیت و حەکایەتە کۆنەکاندا هاتووە، واتە بەشێکی زۆر لە شەو تێپەڕیوە.

پاشـــــا یەک دوو هەنگاو بەرەو لای چرای ســـــەر زۆپاکە ڕۆیشـــــت، زەرفەکەی هەڵپچڕی و نـــامەکەی لێککردەوە. لەبەر تیشـــــکی چراکە خەندەیەکی گەورە پەڕیە ســـــەر دەموچاوی، ســـــێبەرەکەشـــــی باشـــــتر سـەلماندی. لە دڵخۆشـییان ویسـتی پاداشـتی پەیکەکە بکا، بەڵام خۆ ئەو هیچ دراوی زێڕینی لە بەرکی چاکەتەکەیدا نەبوون. شـتێکی شـایستەش نەبوو ئەو پیاوەی سەدان کیلۆمەتری بێ پشوودان بەسواری ئەسپەکەی بڕیوە، بە دەسـتی بەتاڵ بگەڕێنێتەوە. جارێکی دیکە لە گیرفانەکانی گەڕا، لێ هیچ دراوی تێدا نەدۆزینەوە. ئینجا قاپقاپە شـــــاهانەییەکەی داکەند و دایەدەســـتی پەیکەکە، ئەو کابرایەش لەبەر شـــەکەتی و ماندووبوون بە ئاستەم خۆی لەسەر لاقەکانی ڕادەگرت: "ئەمەیان بۆ تۆ، فەرموو بیبە!" کـابرای تەتەر کە پـارەی لە حیســـــابی خۆی دانـابوو، نەیـدەزانی چ کاردانەوەیەکی لە بەرانبەر پاشادا هەبێ.
ئیجا پەیکەکە قاپقاپەکانی لێوەرگرتن و ماچی کردن، لەبن هەنگڵی دانان و بە دووردڵیش لە شوێنی خۆی وەستابوو، چاوەڕێی پارەوپوولی دەکرد.
ئینجا پاشا زەنگەکەی لێدا.
شـا گوتی: "پەردەدار، وەرە ئەو پیاوە بەسـتەزمانە لەگەڵ خۆت ببە، ئەو ماندووە، خواردنی بدەرێ و شوێنێکی حەوانەوەی بۆدابین بکە تا پشوو بدا. بەیانیش سێ دراوی زێڕی خۆی لە ئێمە وەردەگرێ."
پەیکەکە ویسـتی دەسـتەکانی پاشـا ماچ بکا، بەڵام شـا دەرفەتی پێنەدا. پەردەدارەکەش چووە بن باڵی پیاوەکە و لە هۆڵەکەی بردەدەر.

پاشـــــا لە کەیفخۆشـــــی پەیامەکە خەوی لێزڕا. جارێکی دیکە نامەکەی وەزیری خوێندەوە. ئەو ڕزگاری بوو، ئیدی پێویســـــت نەبوو چی دی شـــــەرم لە جەنگە دۆڕاوەکەی بکاتەوە. دەســـــتی دایەوە ڕۆژژمێرەکەی،

نووسی: "خوا لەگەڵ ئێمەدایە، هەرگیز خوا دەستبەرداری ئێمە نەبووە. خوا ئێمەی ڕزگار کرد. ئێستا نیوەی شەوە و لە بەختەوەریدا خەوم لێناکەوێ. ئێمە نازانین ئاخۆ ئەو بریتانییە فێڵبازانە لە باشووری وڵاتماندا بە دوای چیدا دەگەڕێن. وەزیر دەڵێ بە دوای کانیی زێڕوزیودا دەگەڕێن. باشە کانی ژێرزەمینی لە شوێنێک هەیە، کە خۆر کردوویەتیە دۆزەخ و هەموو شتێکی سووتاندووە. هەمیشە خوا لای ئێمەی گرتووە، ئەو ڕێنیشاندەرمانە.

ئێمە جەنگەکەمان نەدۆڕاندووە، لەوەش زیاتر لەوێ لە ڕێی گومرگەوە پارەیەکی زۆرمان دەستدەکەوێ.

ئێمە، پاشای ئێران بەو وشانە ئەوە ڕادەگەیەنین کە لاپەڕەیەکی سپی لە مێژووی وڵاتەکەمان هەڵدەدەینەوە."

هەرچەندە لەنیوەی شەویش داین، لێ ئێمە دیسان هەست بە باشیی خۆمان دەکەین، مجێزم لە ناشتایەکی چەور هەیە."

شا ڕۆژژمێرەکەی شاردەوە. پێویستیشی بەوە بوو شادمانییەکەی لەگەڵ کەسێکدا بەش بکا، بەڵام لەگەڵ کێ؟ سەرەتا ویستی بەرەو کۆشکی دایکی بڕوا، بەڵام خۆ ئەو پاشایە، بۆیە دەبێ دان بەخۆدا بگرێ و تا بەیانی بوەستێ. بیری لە ڕاوێژکارەکەی، لە شێخ ئاغاسیش کردەوە، لێ هەر زوو ئەو بیرۆکەشی بەلاوەنا دوای ئەوان تەنیا یەک کەس لە مێشکیدا مابووەوە، ئەو کەسەی هەر وەک ئەو بەو پێشهاتانەی وڵات دڵخۆش دەبێ، ئەویش کیژە هەرە خۆشەویستەکەی، تاج سوڵتان بوو.

چرای ژوورە بچووکەکەی شوێنی حەوانەوەی تاج کوژابووەوە، بەڵام یەک مۆم لەپشت پەنجەرەکەی داگیرسابوو. بە نەرمی لە دەرکەی دا. پیرەژنە خزمەتکارەکە، دەیزانی هەر پاشا بەو درەنگانەی شەو لە دەرگا

دەدا، مۆمێکی هەڵگرت، هەر بۆ دڵنیاییش لە کونی شــمشــێرەی دەرگاوە سەیرێکی دەرەوەی کرد، ئینجا دەرکەی کردەوە.
پاشـــا بە بێدەنگی و لەســـەر پەنجەی پێیەکانی چووە ژووری نوســـتنی کیژەکەی. "تاج، هێشتا هەر نووستوی؟ ئێمە لێرەین، پاشا، باوکت لێرەیە."
کیژۆڵەکەش لەبن لێفەدا وەک ژنێکی گەنج دەهاتە پێشـچاو، لە خەوەکەی خۆی وەرسـووڕاندە سـەر لاتەنیشـتەکەی دیکەوە. بە دەسـتێک لاچکی لێفەکەی زیاتر بۆ سەر شانەکانی ڕاکێشا و کڕ لێیخەوتەوە.
"تاج، دەی هەڵسەوە، ئێمە هەواڵێکی خۆشمان پێیە. پاشا دڵخۆشە، زۆر بەکەیفە."
کیژۆڵەکە چاوی کردنەوە: "شتێک قەوماوە؟"
ئەویش بە ســـرتەوە گوتی: "هەواڵی خۆش. ئینگلســـتان بەندەرەکەیان جێهێشتووە. ئەوان دەیانەوێ سەروسەودامان لەگەڵدا بکەن."
کچەکە باوەشی بە شادا کرد و سەری ماچ کرد.
کچەکە بەدەم ئەم قســـەیەوە: "باوکە، بۆ تۆ زۆر کەیفخۆشـــم." لەســـەر جێگەکەی خۆی قیت بووەوە.
"هەڵمەستە، هەر پاڵکەوە. دەمەوێ وەها قسەت لەگەڵ بکەم." پاشاش بە دەم ئەم قســـەیەوە دانەویە ئاســـتی پێخەفەکەی. "گوێبگرە، لە هەرات من زۆر غەمبـار بووم، چونکە هیچ جێنشـــینێکم نەبوو. خۆ ئەگەر لەوێ کەسێک منی کوشتبا، ئەوا کوڕێک، هیچ کەسێکی خوێنی خۆم نەبوو بە شـــوێن پێی مندا بێ. پێویســـتە ئێمە بە زووترین کات پیاوێک بۆ تۆ بدۆزینەوە."
تاجیش پێیگوتەوە: "بەڵام، بەڵام باوکە، من ئەوەم ناوێ. هیشـــتا زۆر زووە بۆ من."
"قســـەی هیچ." پاشـــا بەمجۆرە وەڵامیدایەوە: "ســـەدان جار پێمان گوتی، دایکت هەر ڕێک لە تەمەنی تۆدا بوو، کاتێ بە تۆوە دووگیان بوو."

"من لەوم پرسی. دایکم ڕێک لەو تەمەنەی ئێستای مندا نەبووە کاتێ مارەت کرد."

پاشا دەستی دایە سەرینێک لەسەر مافوورێک لێی ڕاکشا، ئینجا گوتی: "من لێرە هەندێک ڕادەکشێم، دەمودەست هەستم بە شەکەتی کرد، لەو دوایانەدا خەوم زۆر خراپ بووە."

"باوکە، «من کتێبی ڕوسی و فرەنسی و ئینگلیزی دەخوێنمەوە، لەو وڵاتانەدا کچان لەو تەمەنەدا بە شوو نادرێن."

"ئەو چیرۆکانەی تۆ خوێندنتەوە، چیرۆکی هەڵبەستراون، باوکی ئەو کچانەی تۆ لەکتێبەکاندا بەسەریاندا ڕۆیشتووی، پاشا نەبوون. من پاشام. خۆ ئەگەر من مردم، ئەوا کوڕانی ژنەکانی دیکەم لەسەر تاجەکەم وەک سەگی هار تێکبەردەبن. ئەوان وڵاتەکە وەک مامزێک هەلابەهەلا دەکەن، بیر لەوەی پێمگوتی بکەرەوە."

تاجیش بە پاڕانەوە: "باوکە، لێت تێدەگەم، بەڵام خۆ دەبێ جارێ بوەستی تا هەندێک گەورەتر دەبم."

پاشاش ڕاستەوڕاست سەیری ناو چاوی کرد و بە چرپەوە گوتی: "ئێمە دوژمنمان هەن، متمانەم بەکەس نییە، متمانەم نە بە دایکت، نە بە داپیرەت، نە بە باپیرەت و نەبە وەزیریش، بە کەسیان نییە. تۆ تاقەکەسی کە متمانەی تەواوم پێت هەبێ. گوێت لێمە؟ هەمووان دەیانەوێ من بگلێم، کۆتاییم بێ، ئەو کاتە زۆرەشمان لەبەردەستدا نەماوە."

ئەو سەیرێکی دەرکەی کرد ئاخۆ پیرەژنە قەرەواشەکە لەوێ ماوە. کاتێکیش دڵنیابوو ئەوان هەر خۆیانن، ئینجا پێیگوت: "گوێبگرە، وەزیر دەیەوێ تەختمان بڕووخێنێ. من بەڵگەم هەیە، بەڵگەنامە دەدوێ، ئێمە دەرفەتێکی باشمان پێدا، ئەو لە لایەن گەلەوە خۆشەویستە. بەڵام لە پاشملە خەریکی پیلانی ڕەشە لە دژی ئێمە. ئەو نازانێ ئێمە پێی دەزانین. ئێمە جارێ ڕێگەی دەدەین دانوستان لەگەڵ ئینگلستان و ڕوسیادا بکا،

پاشـــان کە کاتی خۆی هات، بێ هەســتوخوســت وەک دووپشــکێکی ژەهراوی پێیەکی لەسەر سەر دادەنێین و دەیفلیقێنینەوە.'

'باوکە ئەوە تۆ چی دەڵێی، من بڕوا بەو شـــتانە ناکەم. وەزیر پیاوێکی زۆر نایابە. من زۆر کەیفم پێ دێ. چۆن دڵت دێ ئەو بە...'

'من بەڵگەی ســەلمێنەرم لەبەردەســتە. تۆ هێشــتا گەنجی، تۆ دەبێ ئەو شــتانە فێر ببی. لێ زۆر نابات دەبیتە دایکی جێنشــینەکەمان، تۆ دەبێ لەکاتی خۆیدا زەبری خۆت بوەشــێنی، دەنا نۆرەی خۆت دێ. ئەوەی ئێستا پێویستمان پێی هەبێ تەنیا شازادەیەکی جێگرەوەیە.'

تاج بە خەمەوە پرسی: 'باوکە، بە نیازی بمدەیتە کێ؟'

'دەتدەمە پیاوێکی هۆزەکەمان.'

'چۆن پیاوێکی وەها دەبینیتەوە؟'

'مشـــووری دەخۆین. ئێمە خەونمـــان بینیوە، تۆ کوڕێـک بە ئێمە دەبەخشی.'شا دوای ئەم قسەیە لە شوێنی خۆی ڕاکشایەوە.

'باوکە، زگم هێشتا زۆر بچکۆلەیە، دەترسم نەتوانم هیچ کوڕم ببێ.'

شا نەیویست گوێی لەو قسانە بێ. چاوەکانی داخستن و نوست.

بە بێدەنگی قەرەواشـە پیرەکە هاتەژوور. پەتۆیەکی بەسـەر پاشـادا دا و تاجیشی لەگەڵ خۆی بردە ژوورەکەی خۆی تا لەوێ بخەوێ.

# ٣٤

# بڕوانامەکان

وەزیر سـێ لە ڕاوێژکارە لاوەکانی لەگەڵ خۆی بردبوون. ئەمیر یەکێک بوو لەوان. بریتانییەکان داوایان کرد، دانوستانەکان لەسەر پشتی یەکێ لە کەشـتییە جەنگییەکانی ئەواندا بێ، چونکە لەوێ هەموو ئامادەکارییەکانی دانوستانی تێدایە. وەها لێکدەدرایەوە گەشتیگەلە پڕ لە شـکۆکەی ئینگلیز، باندۆری خۆی لەسـە نێردەی ئێرانییەکانەوە دابنێ. وەزیریش لای خۆیەوە ئەو خسـتنەڕووی بریتانییەکانی ڕەتکردەوە، لەبری ئەوە بریتانییەکانی بۆ شـوێنێک بانگهێشـت کرد، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان جێگەی حەوانەوەی کۆرش، داریوش، ئەسـکەندەری گەورە و جەنگیزخان بووە، لە میانەی کاروانی جەنگاوەرانەی خۆیان، لەوێدا ماونەتەوە.

شـوێنەکەش یەکێ لە قەڵا کۆنینەکانی وڵات بوو، لەسـەر گردێکی نزیک دەریا هەڵکەوتبوو. ڕاسـتە ئەم قەڵایە جێ حەوانەوەیەکی خۆش نەبوو،

لێ مرۆ لەناویدا هەســــتی بە شــــكۆی دێرۆک و گیانی دەســــەڵاتدارە دێرینەكان دەكرد. لەســــەر قوللەكانی قەڵاكەشــــدا دیمەنی بەرفراوانی كەنداوی فارسی لێوە دیار بوو.
لەســەر دیواری بەردینی قەڵاكەوە نیشــانەنمای جەنگ و جیهانگیرەكانی ســــەردەمی خۆی لەســــەر هەڵكەنرابوو. لەوێدا تابلۆیەكی دانســــقەی ئەســكەندەری گەورە هەبوو، ئەو كاتەی بەخۆی و ســوپاكەی بەســەر هیندســتانی دادابوو، لەپشــت ســەریشــیەوە هەورێک لە دووكەڵ هەبوو، ئەو دووكەڵەی لە كۆشــــكە ئێرانییەكــانەوە دەهــات، ئەوانەی ئــاگری تێبەردابوون. هەروەها تابلۆیەكی ســەرنجڕاكێشــی دیكەش هەبوو، تێیدا جەنگیزخان دەبینرا، تەماشــای ڕۆژئاوای دەكرد، لەكاتێكدا لە پاشــخانیدا خاكی ڕۆژهەڵاتی دەستبەسەرداگیراو وێنەی كێشرابوو.
خۆی ئەوە شــتێكی ئاســایی بوو، كە هەموو ئەو شــوێنەوارە مێژوویەی دەسەڵاتدارانی ڕابردوو لە لایەن دەسەڵاتداری نوێوە تێكوپێک درابن، لێ ئەوەی لەو قەڵایەدا مــابووەوە، بەهۆی پەڕجوویەكەوە هێڵرابوونەوە و دەســتیان لێنەدرابوو. ئەوان قەڵا و دیمەنی تابلۆكانیان لە شــوێنی خۆی بێ دەستكاری هێڵابوونەوە.
وەزیر ئاگادار بوو لەوەی ڕەوڕەوە ســــەرنجڕاكێشــــەكەی شــۆڕشــــی پیشــــەســــازی لە ڕێی كەنداوی فارســــییەوە هاتۆتە نیشــــتمانەكەی و گەڕانەوەشــــی بۆ نییە. ئەویش دەیەویســـت شــوێنەواری ئەو ڕووداوانە وەک ئەوانی دی لەسەر بەرد جێبهێڵێ.
وەزیر لەگەڵ ســێ ڕاوێژكارەكەی بە ســواری ئەســپ گەیشــتە ســەر كەناراوەكە. ڕەتیان كردەوە جڵەوی ئەســپەكانیان بدەنە دەست عەرفێكی بریتانی. ئەوان هەر بەسەر پشتی ئەسپەكانیانەوە بەسەر گردەكە كەوتن. كاتێكیش گەیشــتە قەڵایەكە، ئەو ئەفســــەرە بریتانییەی بۆ پێشــوازییان هاتبوو، پشــــتگوێیان خســـت. ئەوان هەر بە خۆیان ئەســــپەكانیان بردە

تەویلە و ئالیک و ئاویان بۆ دانان. ئینجا بە پێ ڕۆیشتنە بن ئەو خێوەتە دانراوەکە و لە سەر مێزی دانوستاندن دانیشتن. وەزیر هەستی بە فشاری سەر خۆی کرد.

بۆ خۆدڵنیاکردنەوەش لەنێو کتێبە پیرۆزەکەدا ئەم ئایەتانەی خوێندنەوە؛

*من ناوی تۆ دووبارە دەکەمەوە.*

*تۆ کە هەموو شتێکت ئافەریدە کردووە و جڵەوی هەموو شتێکت لە دەست دایە.*

*تۆ ئەوەی بەخت دیاری دەکەی و ڕێگا نیشان دەدەی.*

*تۆ ئەوەی ئاو بە خوڕ دەبارێنی.*

*تۆی زەوی وا لێدەکەی بتەقێ و بکرێتەوە.*

*تۆ ئەوکەسەی گەنم لەسەر ڕووی خاکدا دەڕوێنی.*

*سەوزە و دارزەیتون، دارخورما و باخی ڕەنگین، میوە و گیا.*

*ئەلف لام میم*

*ئەلف لام میم.*

*ئەلف لام میم.*

*نوێژ بۆ تۆ دەکەم هەر بەتەنیاش هانا بۆ تۆ دەبەم.*

*تۆش بمخەرە سەر ڕێگەی ڕاست.*

*ڕێگەی ئەو کەسانەی کە ڕێنیشاندەریان بووی، نەوەک ئەوانەی گومڕا بوون تۆ خۆشت نەویستن.*

ئەزموونی وەزیر لە ڕۆژە سەرەتاییەکانی دانوستاندندا وەک کەسێک وابوو سووکایەتی پێبکرێ. نێردەی بریتانی وەک کەسانی زاڵ دەجووڵانەوە، ئەمەش زۆر سەخت بوو بە وەزیر بفرۆشرێتەوە. هەموو ڕۆژێک دوای کۆتایی هاتنی دانیشتنەکان دانوسـاندکارە بریتانییەکان دەگەڕانەوە نێو کەشتییەکەیان تا نانی خۆیان بخۆن و پشووبدەن و برازێن و خۆیان بۆ ڕۆژی پاشتر ئامادە بکەن. هەرچی وەزیر و

ڕاویژکارەکانیشی بوون هەر لە قەڵایەکە لە نێو خێوەتێکدا دەمانەوە. دوای سێ هەفتە لە دانوستاندنی سەخت و دژواردا ئەم پێشنیازانەی خوارەوە خرانە سەر مێز:

- بریتانیا کەشتییە جەنگییەکانی خۆی لە کەنداوی فارسی بکێشێتەوە.
- دەکرێ ئینگلستان بەندەرەکانی کەنداوی فارسی بۆ بازرگانیکردن لەگەڵ هیندستاندا بەکاربهێنێ.
- فرەنسییەکان سوپای ئێرانی جێبهێڵن و ئەفسەرە بریتانییەکان بۆ دارشتنەوە و چاکسازیی سوپا جێگەیان بگرنەوە.
- گرێبەست لەگەڵ فرەنسییەکان لەبارەی کانزاکانەوە کۆتایی پێبهێنرێ و بریتانییەکان قەرەبووی فرەنسییەکان لەو بوارەدا بکەنەوە.
- بریتانییەکان لە ماوەی پەنجا ساڵی ئایندەدا بەندەرەکەی باشووریان پێبدرێ بە مافەکانی گومرگیشەوە، بەڵام هێشتا گومرگەکەی لەژێر سەرپەرشتیی ئێرانییەکاندا بمێنێتەوە. ئینگلستان دوای لێدەرکردنی تێچوونی دامودەزگاکانی بەندەرەکە، بڕە پارەیەکی مانگانە بداتە دەوڵەتی ئێران.
- بریتانییەکان ڕێگەیان پێبدرێ لە سەرتاپای پارێزگاکانی باشووری وڵات بەدوای کانی ژێرزەمینیەکاندا بگەڕێن و دامودەزگای پێویستی بۆ دابمەزرێنن.
- ڕێژەی ٧٥٪ی بەرهەمی دەرهاتوو بۆ ئینگلستان و باقی ڕێژەی بیست و پێنجەکەش بۆ ئێران.
- هەرات لەسەر کاغەز هەر بەشێک دەبێ لە ئێران، بەڵام بەڕێوەبردنی شارەکە دەدرێتە دەستی بریتانییەکان.

- ئینگلستان هێڵێکی تێلێگراف بۆ بەکارهێنانی خۆی بۆ هیندستان بەناو وڵاتدا ڕادەکێشی و مۆنۆپۆلییەکەشی بۆ ماوەی پەنجا ساڵ لەبن دەستی خۆیاندا دەبێ.
- ئینگلستان هێڵی ئاسنین لە کەنداوی فارسییەوە تا سەر سنووری هیندستان ڕادەکێشێ و مۆنۆپۆلییەکەشی بۆ پەنجا ساڵ لەبن دەستی خۆیاندا دەبێ.

ڕێککەوتننامەکە، سەرکەوتن نەبوو. وەزیر هەوڵێکی زۆر سەختی دا تا دوو داخوازیی خۆی تێدا جێبکاتەوە، پێشتر بەریتانییەکان بەلایەناوە نابوو.
وەزیر لە شوێنی خۆی هەڵسا. "کەواتە ئێمە نایکەین. خۆ ئەگەر ئێمە بەو ڕێککەوتنە بچینەوە ماڵێ، هەر ژنەکانمان پێمان پێدەکەنن."
داوای کرد ئەم بڕگانەی خوارەوە لە ڕێککەوتننامەی ئاشتییەکەدا جێگیر بکرێن:
- ئینگلستان تۆڕێکی تێلێگراف بۆ ئێران ڕابچینێ، تاران بە تەواوی شارە گەورەکانی وڵاتەوە ببەستێتەوە.
- ئینگلستان هیچ کارمەندێکی هیندی دانەمەزرێنێ، بەڵکو کارمەندی ئێرانی لەو سەدان نووسینگەی تێلێگرافانە دابمەزرێنێ.

سەرۆکی نێردەی بریتانی تووڕە بوو، خۆی پێ نەگیرا تا بەتەوسەوە بە ئەم قسەیە بە نێردەی ئێرانی نەڵێت: "ئاخر لەم وڵاتەدا جارێ هیچ کەس وشەی تێلێگرافی نەبیستووە، چۆن دەتوانن لە نووسینگەکانیدا کاربکەن؟"
وەزیریش وەها وەڵامیدایەوە: "ئەوان خێرا فێر دەبن."
دانوستان بۆ ماوەیەکی کاتی هەڵپەسێردرا و خواستەکانی وەزیر بۆ لەندەن نێردران.

لە پاش هەفتەیەکدا لەندەن پێشنیازەکەی بەم شێوەیە هەموار کردەوە:

- ئینگلســـتان تۆڕی تێلیگراف بۆ ئێران ڕابکێشـــی بە مەرجێک تەواوی مافە گومرگییەکانی بەندەرەکانی کەنداوی فارسی بۆ ماوەی نیو سەدە لەبن دەستی بریتانیادا بێ.

ئەمەش داخوازییەکی نیشـتمانییانەی هەسـتیار بوو، بەڵام وەزیر دوای وتووێژێکی دوورودرێژ لەگەڵ ڕاوێژکـارە لاوەکـانیـدا ڕێککەوت. ئـاخر وڵاتەکە لە بار یدا نەبوو ئەو بەندەرە کۆنانە نۆژەن بکاتەوە. خۆ ئەگەر کەشـــتییە کانی بریتانیا بیانەوێ ئەو بەندەرانە بەکاربهێنن، هەر دەبێ خۆیان مشـــووری ئەوە بخۆن نوێیان بکەنەوە و لەگەڵ کەشـتییەکانیان بیگونجێنن. ســـەرباری ئەوەش کەســـیش نازانێ ئاخۆ ئایندە چی لەبن ســـەردا دەبێ. ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژانیش بریتانییەکان لەوێ بڕۆن، خۆ ناتوانن بەندەرەکان لەگەڵ خۆیان بگوازنەوە ئینگلســـتان. باڵەخانە و دامودەزگاکان لە شوێنی خۆیان بۆ نیشتمان دەمێننەوە.
بریتانیەکان پێیان وابوو ڕێککەوتنەکە لە ئانوســـاتی مۆرکردن دایە، لێ وەزیر دیسان لەسەر مێزی دانوستاندن داوایەکی دیکەی هێنایە پێشەوە:

- ئینگلســتان بەو مەرجە هێڵی ئاسـنین لە کەنداوی فارسـییەوە بۆ سەر سنووری هیندستان ڕابچێنێ، کە لە هەمان کاتیشدا هێڵی ئاسنینی نیشتمانیش بۆ ئێران لێبدا.

دیســـان وەزیر هەمووانی ســـەرســـام کردەوە، تەنانەت ڕاوێژکارەکانی خۆیشـــی، چونکە ئەمە خەونێکی نـاواقیعی و نەکردە بوو، کەس زاتی نەکرد هەر بیریشی لێبکاتەوە.
بریتانییەکانیش هەســـتیان کرد ئەگەر هات و پەســـەندی نەکەن، دەکرێ ڕوسەکان تۆڕی تەلێگراف و هێڵی ئاسنینی ناوخۆ لە ئەستۆ بگرن. دوای

ڕۆژێکی دیکەی پڕ لە وتووێژ و تاوتوێکردنی چڕوخەست، پرسەکەیان بەم بڕگەیەی خوارەوە چارەسەر کرد:

- ئەگەر ئینگلستان هەر کاتێک دەستی بە لێدانی هێڵی ئاسنین لە کەنداوی فارسییەوە تا سەرسنووری هیندستان کرد، ئەوا ڕاکێشانی هێڵی ئاسنینی نیشتمانیش بۆ ئێران بەهەند هەڵبگرێ.

لە کۆتاییدا ڕێککەوتننامەکە مۆرکرا و هەفتەیەکیشی خایاند تا بڕوانامەکان لەگەڵ پەیکێکدا بگەنە تاران. پاشاش بەنابەدڵی کاغەزەکانی واژۆکرد و مۆری خۆی لەسەر دانا.

دوای ئەوەی وەزیر و سەردەستەی نێردەی بریتانی بڕوانامەی ڕێککەوتننامەکەیان لەگەڵ یەک ئاڵوگۆڕ کرد و تەوقەیان لەگەڵ یەک کرد، ئیدی هەموو کەشتیەکانی بریتانیا فیکەی خۆیان لێدا.

ئەمەش هەستوسۆزی وەزیری بزواند، بەڵام ڕکێفی خۆی گرت و لێنەگەڕا فرمێسکی شادمانی لەچاو بێنەخوار. فاک و فیکەی کەشتیەکان گەلیان لە خەوی غەفڵەتی هەزار ساڵە ڕاچڵەکاند. لە هزری وەزیردا پەیامەکان خێرا بە ڕێگەی هێڵی تیلێگرافدا بەسەرتاسەری نیشتمان بڵاودەبوونەوە، قیتارەکانیش لەمسەر بۆ ئەوسەری وڵات لە جرت و فرتدا بوون. ئێستاش لەسەر پشتی ئەسپەکانیانەوە لە قەڵا کۆنەکەدا بینیان چۆن کەشتییە جەنگییەکانی بریتانی کەنداوی فارسی جێدەهێڵن.

ئینجا وەزیر وەهای بە ڕاوێژکارەکانی گوت: "لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژوومان دەنووسرێتەوە."

# ٣٥

# فەخری

هەر لەوکاتەی ئەسکەندەری گەورە بەلەمەکانی دەوڵەتی ئێرانی سووتاند، ئیدی ئەم وڵاتەدا لەباریدا نەما کەشـــتیکەلی خۆی نۆژەن بکاتەوە. هەر بۆیە خەڵکەکە بایەخی کەنداوی فارسـییان نەدەزانی و ڕۆژانە بۆ هەرات و بۆ ئەفغانستان بەخەم بوون.

ئەگەر هاتبا و باســـی ئەفغانســـتانیان هێنابایە گۆڕێ، بە دڵگەرمییەوە لەبارەیەوە دەدوان، ئاخر چەند شـــاعیری گەورە خەڵکی ئەوێ بوون، هەروەها سـەربردەی چەند داسـتانی پاڵەوانێتیش لە نێو کتێبی شـانامەدا لەوێ ڕوویاندابوو. هەر بۆیە هیچ کەس ئەوەی بۆ قووت نەدەدرا ئەوێ ســـەر بە نیشـــتمان نییە. خۆ هیچیش لە مەزنایەتیی ڕۆژگاری بەرێ نەمابووەوە، لێ هێشا لە نێو خەڵکدا هەر مابوو.

لەهەمان کاتیشـــدا زۆر لە کوڕوکاڵی ماڵباتە دەوڵەمەندەکان و گەورە بازرگانان بەرەو ئیســـتانبول باریان کردبوو، لەوێ بە شـــێوەیەکی سـەرسـامانە بووبوونە گەواهیدەر بەسـەر جیهانێکی دیکە. ئاخر شـارەکە وەک پردێکی نێوان ڕۆژئـاوا و ڕۆژهەڵاتی لێهـات. لەوێوە یەکەمین

داهێنانەکانی ڕۆژئاوا، هەروەک تێلێگراف و قیتار و چرای ڕوناکی لە لایەن ڕۆژهەڵاتییەکانەوە بەکاردەهێنرا.
ئەوە نوێیەکە ئەوەیان بینی چۆن باکۆ و بۆمبای گۆڕانکاری زۆر بەرچاویان بەخۆیەوە بینی و کەچی تاران هێشتا هەروەک گوندێکی گەورە ماوەتەوە. هیچ پاشایەک حەرەمسەرای نەمابوو، کەچی حەرەمسەراکەی پاشای ئێران تادەهات گەورەتر دەبوو. بەردەوام ژنی نوێی بۆ زیاد دەکرا.
بیروهزری بزووتنەوەی بەرگریی ڕوسیش وردە وردە گەیشتە شارەکانی وەک تەورێز، ڕەشت، تاران و ئیسفەهان. ڕۆشنبیرە لاوەکانی ئەو شارانە زۆرتر لە جاران لەگەڵ یەک کۆدەبوونەوە و باسیان لە ئایندەی وڵاتەکەیان دەکرد. دەنگی ناڕەزایەتی بەو دەنگانەی لە مۆسکۆ بەرز بووبوونەوە بەراورد دەکران.
لەگەڵ بە پیشەسازیکردنی وڵات جووڵەی بەرگریی ڕوسی بەرفرەوانتر دەبوو، بزووتنەوەی بەرگریی ڕوسی توانییان کرێکارەکانی وڵات لە دژی قڕاڵ جۆشبدەن و بجوڵێنن. لە تاران و ئیسفەهانیشدا هێشتا گرووپەکانی بەرگری، کەسێک نەبوو دژی بوەستنەوە. ئاخر خەڵکەکە نەخوێندەوار بوو، وەهاشیان دەزانی پاشا نوێنەری خودایە لەسەر زەوی. ئەوەیان لە مێشکدا نەبوو لە دژی ئەودا بوەستنەوە.
پاشا هەروەک وەزیر بەدوای گۆڕانکارییەکانی وڵاتە دراوسێکاندا دەڕۆیشت. هەستی بە مەترسی و شیاربوونەوەی گەل دەکرد. ئەوەشی دەزانی هەموو چاوەکان لەسەر وەزیرن.
دوژمنەکانی وەزیر، ئەویان بە ناپاکیکردن لە نیشتمان تاوانباردەکرد. ڕاوێژکارەکانی وەزیریش تێکۆشان خەڵکەکە بێنە سەر ئەو بڕوایە، لە ڕێی ڕێککەوتنامەی ئاشتییەوە وڵات ڕۆڵێکی گەورە لە جیهاندا وازی دەکا.

پاشــا نەیدەزانی بەدوای کێدا بڕوا. تا دەهات لەوە بەئاگادەهاتەوە هێز و دەســەڵاتەکەی چەند لە پاشــەکشــەدایە. زوو زوو ســەردانی لادێکانی دەوروبەری پایتەختی دەکردن تا زیاتر خۆی نیشانی گەل بدا، بەڵام ئەم سەردانانە کاریگەرییەکی کەمیان هەبوو.

لەو نێوەشدا و دوای ڕێککەوتننامەکەی وەزیر لەگەڵ ئینگلستان، لە ڕێی گەڕانەوەی بۆ تاران لە شــارێکەوە بۆ شــارێکی دیکە، وەک کەســێکی ناودار خۆی دەنواند. لە دەروازەی شــارەکانەوە بە هەزاران کەس بە دەهۆڵ و زوڕنا، بە ئاڵا و دەست بۆ هەڵوەشاندن پێشوازییان لێدەکرد و وەک قوربانیی مانگا و وشــتریان لەبەر پێدا ســەردەبڕی. هەر لە خۆوە خەڵک خورما و قەندی بە شــەقامەکاندا دەبەشــیەوە و گەورەبازرگان و دوکـانـدارەکـانیش خێوەتیـان لە گۆڕەپـانی بـازاڕ هەڵـدەدا و خوانیـان دەڕازاندەوە و هەموو ڕێبوارێکیان بۆ خواردن بانگهێشــــت دەکرد. لە ئیسفەهانیش، لەو شارەی وەزیر بۆ یەک دوو ڕۆژ تێیدا مایەوە تا پشوو بدا، دانیشتوانەکان لە دەروازەی شــار بەســەر شــانانەوە تا ناوجەرگەی شار هەڵیان گرت.
دواجاریش گەیشــتەوە تاران، دیاربوو هەموو شــارەکە بۆ پێشــوازیی هەڵســتابوو. منداڵان بەســەر داروردەخت هەڵگەڕابوون، ژنانیش بەســەر بانان کەوتبوون. هەموو ڕێگاکە، هەر لە دەروازی شــارەوە تا گۆڕەپانی بازاڕ ســەدان مافور و ڕایەخ ڕاخرابوون. دەســتەی ســواران یاوەریی وەزیریان کرد تا گەیاندیانە ڕەشــماڵێکی گەورە لەناوجەرگەی بازاڕ، خەڵکەکەش گۆرانییان پێداهەڵدەدا و پەسنیان دەدا.
وەزیر بە هەســتێکی تێکەڵ لە دڵخۆشــی و ترس خۆی دایە دەســت گوڕدەمی[61] حەشــاماتی خەڵکەکە. گەورە بازرگانان باوەشــیان پێدا دەکرد

[61] گوڕدەم: ئاپۆرای خەڵک.

و پیرۆزبایی شەڕەکە و سەرکەوتنەکەیان لێدەکرد، کەچی وەزیر تێبینی ئەوەی کرد، هیچ کەسێک لە دەستوپێوەندەکانی کۆشک لەوێ ئامادە نەبوون.
دوکاندارەکان یارمەتیی وەزیریان دا تا بچێتە سەر کورسییەکی تایبەت بەو بۆنەیە، لەژێر دارێک لەسەر مافوورێکی گرانبەها دانرا بوو، ئیدی لە دەوری خڕبوونەوە. دەستبەجێ چای دەمکرا و کولیچەیان بۆ هێنا و ئەویش بە گەرمی لەگەڵ دوکاندارە پرسنەکان کەوتە گفتوگۆ.
هەر بە خەندەوە پێیگوتن: "ئەوەی ئێمە کردمان بۆ ئێوەی خاوەنکار باشە. خۆتان ئامادە بکەن، دەستە جل و پێڵاوی نوێ بپۆشن. زۆری پێناچی پێویست دەکا بەرەو نووسینگەی تێلێگراف بڕۆن و هەواڵی کاسبیتان بگەیەنن یان بە قیتار لە شوێنێکەوە بۆ شێوێنیکی دیکە بچن."
هەمووان کەیفیان بەو هیوایە هات، کە لەسەر قسەکانی وەزیریان هەڵنا.
"من ئاگادارتان دەکەمەوە، لەمەوپاش چیدی لە ماڵەکانتان چرای پلیتەدرای ڕۆنی گەرچک ناسوتێنن. دەترسم ناچار بن هەموو ئەو ڕۆنەی لە ئەمبارەکاندا داتان کردووە[٦٢]بیرێژن، ئاخر پلانی ئەوەمان دارشتووە کارەبا بهێنین. لەمەوپاش پێویست ناکات لە ماڵەکانمان مۆم دابگیرسێنین، بەڵکو گڵۆپی کارەبایی ماڵەکان ڕووناک دەکاتەوە."
ئەو پێکەنی و هەمووانیش بە دڵخۆشییەوە لەگەڵ ئەو پێکەنین.

لە دواییدا و ئێوارەدرەنگ وەزیر گەیشتەوە لای ماڵی خۆی، تا شەوەکە لەگەڵ ماڵ و منداڵی بباتەسەر. ماڵێکی گەورە لە گوندێکی بچکۆلانەی پەرگەی شار کە ناوی *ولنجک* بوو.

[٦٢] داکردن: ئەمبارکردن، هەڵگرتن.

ماڵەکە شوێنی کارمەندی میری بوو، لە کۆنەوە هەر سەرۆوەزیری وڵات لێیدەژیا. ژنی وەزیر کیژی خانەوادەیەکی ناوداری هۆزەکەی خۆی بوو هی فەراهان، دوو کوڕ و سی کچیشیان هەبوون.

وەزیر بۆ یەکەمین جار لە پاریسەوە دارتێلی تێلیگرافی بینیبوو، لە لەندەنیش بۆ یەکەمین جار قیتار و هێڵی ئاسنینی بینی.

هەمیشە لە وڵاتانی دەرەوەدا ژنان سەرنجیان ڕادەکێشا. ئەوانی لە قاوەخانە، لە شانۆکان و لە بازنەی سیاسییدا بینی، لەو شوێنانەی یاوەریی پیاوان بوون. ئیدی هەستی کرد چۆن ژنانی وڵاتەکەی لە چ ڕەوشێکی نایەکساندان، ڕاستی ئەمەش ئەوەبوو هیچ مافێکیان نەبوو.

لە مۆسکۆ چەند شەوێک لەگەڵ ژنانی ڕوسی سەری بە شوێنی خواردنەوەدا کردبوو، ئەوانیش وەک شازادەیەکی ئێرانی بایەخیان پێدابوو.

ئەو لە ژیانی خۆیدا زۆر ژنی ناسیبوون، بەڵام ئاسوودەیی خۆی هەر لای ژنەکەی، لای فەخری دەبینییەوە. زۆری خۆشدەویست و کاتێکیش بۆ شوێنێک دەچوو، غەریبی دەکرد. هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو کاتێک بۆ ماوەیەکی درێژ لێی دووردەکەوتەوە بۆی دەنووسی. وشەکانی هۆنراوەکەشی زۆر تایبەتمەند بوون:

*هەندێک جار هەستدەکەم بوومەتە پیرەدار*

*باڵندە لە فڕین دوای فڕین لەسەرم دەنیشنەوە*

*لێ من هەر تەنیا تۆم دەویست*

*تۆ بێیت و لەسەرم هەڵنیشیەوە،*

*هەر بۆ منیش بخوێنی.*

دوای ماوەیەکی درێژ، وەزیر گەڕابووەوە ماڵێ. وێڕای پەسندنامەی خەڵک بۆ کردەوەکانی، کەچی هەستی بە خۆی دەکرد خەمبارە. شتێک

هەبوو دەرەقەتی نەدەهات. کاتێک پێینایە حەوشەی ماڵەکەی، هەستیکرد مێژوو خەریکە قووتی بدا. ئەوە بوو لە ئەسپەکەی دابەزی، دەرکەی کردەوە و ئەسپەکەشی بردە تەویلە. لە حەوزی حەوشەی ماڵەوە دەست و چاوی شوشتن، لەکاتێکدا فەخری، ژنەکەی لەپشت پەنجەرەوە تەماشای دەکرد. بە هێواشی بەرەو قەپەنگەکە هات. لە سێبەرەکەیدا ئەوە دەبینرا دەشەلێ.

فەخری دەمودەست ئەوەی بینی، ئیدی بە چرای دەستیەوە هاتەدەر.

بەبێ دەنگی بۆ ماوەیەکی زۆر لە باوەشی گرت.

"فەخری، غەریبیم کردبووی. هەوڵدە لە ماڵ گلم دەیەوە، چیدی لێمەگەرێ بچمەوە دەرێ."

فەخرییش گریا.

ئینجا بە هەنسکەوە چرپاندییە گوێی: "دەی پیاوەکەم، وەرە ژوورێ."

ژنە بیستبووی هەموو دەستوپێوەندەکانی شا ئەویان بە ناپاک لەقەڵەمدابوو، ئەو کەسەی نیشتمانی بە گیانە توورەکان فرۆشتبوو. تا ئێستا بەو شێوەیە لە ژیانی مێردەکەی نەترسابوو. هەستێکی وەهای بۆ پەیدابوو، هەر باوەشپێکردنێکی دەکرێ دوایین باوەش بێ.

ئینجا فەخری خەمبارانە سەیری دەرکەی حەوشەی کرد و بە چرپەوە پێی گوت: "خۆشەویستەکەم فەرمو وەرە ژوورێ."

# ٣٦

# لە کۆشکەکەدا

وەزیر هەر لە گوندی *ویلنجیک* مایەوە تا پاشا بە دوایدا بنێرێ، بەڵام بۆ مایەی دڵتەنگی ئەو هیچ خەبەرێک لە کۆشکەوە نەهات. کاتێکیش چاوەڕوانییەکە زۆری خایاند، بڕیاریدا خۆی دەستپێشخەری بکا و بچێتە کۆشک.

کاتێکیش چوو، پاشا لەوێ نەبوو. تەنانەت کابرای گەورە نۆکەریش، کە هەمیشە تووشی دەهات، لە هەچ کون و کەلەبەرێک دیار نەبوو. بە دوودڵییەوە پاڵی بە دەرکەی کۆشکەوە نا، کەچی بۆ مایەی سەرسامی، هیچ مۆمێک لەسەر تاقەکانی دانەگیرسابوون. ئینجا لە دەرکەی هۆڵی مینابەندەکەی دا و بە لەسەرخۆیی گوتی: "خاوەنشکۆ، منم وەزیر، من لێرەم."

هیچ وەڵامێک نەبوو.

ئەمجارەیان بە دەنگێکی بەرزتر بانگیکرد. "خاوەنشکۆ، ئەرێ ئێوە لێرەن؟" ئەوەی لە مێشکی خۆیدا هەڵسەنگاند ڕاستەوخۆ بێ پرس سەر بە ژوورەکەدا بکا، لێ هەر زوو ئەو بیرۆکەیەی بەلاوەنا و وەهای نەکرد. لە دەرەوە بانگی سەردەستەی پاسەوانانی کرد.

"ئەرێ ئەو خەڵکە بۆ کوێ ڕۆیشتوون؟"
پیاوەکەش پێی گوتەوە: "مەبەستت چییە؟"
"هیچ کەس لێرە نیە، باشە پاشا لە کوێیە؟"
"هەر دەبێ خاوەنشکۆ لە کۆشک بێ."
وەزیر جارێکی دیکە چووەوە ژوور. بە ڕاڕەوە درێژەکەدا ڕۆیشت و بانگی گەورەنۆکەری کرد: "ئاغا موشیر!"
ویستی بچێتە نانخانەکە، بەڵام داخرابوو. پاشان دەرکەی هۆڵی مینابەندەکەی کردەوە. "خاوەنشکۆ، تۆ لێرەی؟ ئەرێ هەموو شتێک باشە؟"
هەر دەبێ وابێ، هەردەبێ پاشا شەوەکەی لە حەرەمسەرا بەسەربردبێ. هەربینا گەڕایەوە. وەزیر چووە سەر کورسییەک دانیشت و لاقی ڕاستەی لەبەر ئازار شێلا.
زۆری نەبرد گوێی لە دەنگەدەنگێک بوو لە پاشخانی کۆشکەکەوە هات، لەبەر غەڵبەغەڵبەکە لە شوێنی خۆی هەڵسا. دەنگەدەنگەکە هی ژنەکانی پاشا بوو، لە حەرەمسەراکەوە دەهات. هەر دەبێ شتێکی گرنگ قەومابێ، ئاخر پەنجەرەکان دەشکان و ژن و منداڵیش قیژە و هاتوهاواریان بوو، لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا هەر لە پشت دەرگا وەستا بوو. تۆ بڵێی لە درزی دەرگاوە تەماشا بکا بزانێ چی هەیە؟ یان وەها باشە بانگ بکا بەڵکو یەکێک بە پیر دەنگییەوە بێ؟ شتەکە لە سەرچڵی خاڵی نەبوو، خۆ ئەگەر شا ئەم شتە بە خۆتێهەڵقورتان لە کاروباری تایبەتی و کەسی لەقەڵەم بدا، لێکەوتەی باشی نابێ. ئەوە بوو لەپشت دەرکەکە وەستا و گوێی هەڵخست. ئەو هەر گوێی لە دەنگی ژن و منداڵ و لە خواجەباشی سەرداری حەرەمسەرا بوو.
وەزیر وەها لە دەنگ و هەرایەکە تێگەیشت، ژنان ویستوویانە لە حەرەمسەراکە بێنەدەر، بەڵام خواجەباشی و قەرەواشەکان لێنەدەگەڕان

و هەوڵیان دەدا هەر لە ژوورەکان بیانهێڵنەوە و دەرنەچن. پشێوییەکە لە دەست دەرچوو. ژنان هەر شتیان بە دەرکەی حەرەمسەراکەدا دەدا و خەریکی ئەوەبوو بیشکێنن. وەزیریش نەیدەتوانی چیدی لە تەماشا بمێنێتەوە. ئینجا دەرکەی نیوە کردەوە و بانگی کرد: "خانمان! ئەوە چی لە گۆڕێدایە؟"

لەبەر پاشاگەردانی هەراوبەزمەکە کەس گوێی لە بانگکردنەکە نەبوو.

"خانمان! ئەوە منم، وەزیرم. ڕێگەم بدەن بەڵکو یارمەتیتان بدەم."

دیسان کەس دەنگی ئەوی نەبیست. تۆ بڵێی ژنەکان لەبەر ئەوە ئەوەندە تووڕە و ئۆقرەیان لەبەر بڕاوە، شا شتێکی لێهاتووە؟ تۆ بڵێی مردبێ؟ تۆ بڵێی خواجەباشی بۆ ئەوە لێناگەڕێ ژنەکان بێنەدەر تا هەواڵێکی وەها سامناک بشارێتەوە و دزە نەکاتە دەرەوە؟

وەزیر نەیدەتوانی لەوە زیاتر دان بەخۆیدا بگرێ، بە دەستەکانی چاوەکانی خۆی داپۆشی و لێ وەنێو حەرەمسەراکە کەوت.

هەر دەڕۆیشت و هاواری دەکرد: "خانمان؟ پاشا لە کوێیە؟ ئەوە چی قەوماوە؟"

ئینجا بێدەنگیی باڵی بەسەردا کێشان. ژنان بە هاتنی لەناکاوی وەزیر سەریان سوڕما. ئاخر هەموویان بێ سەرپۆش بوون، ڕووبەندیان لە خۆیان نەدابوو، بۆیە بە تەواوی پەشۆکان.

خواجەباشی هاواری کرد: "دەی سەرتان داپۆشن!"

قەرەواشەکانی ژنانی حەرەمسەرا غاریان دا و لەچک و ڕووبەند و سەرپۆشیان هێنا و دایانە ژنەکان. کاتێکیش ژنەکان خۆیان داپۆشت، ئینجا وەزیر دەستی لە چاوی کردنەوە جارێکی دیکەش لێی پرسینەوە ئاخۆ چی بووەتە مایەی ئەو هەراوزەنایە.

ژنەکان دەستیان بە گریانێ کرد، هەروەک ئەوەی باوکیان یان کاکیان بینیبێ، کەسێک کە بتوانن دەردەدڵی لا هەڵڕێژن. پاشا و شاژنی دایک و

شـــازادەکان ڕقیان لە وەزیر دەبووەوە، بەڵام لای ژنەکانەوە کەســێکی خۆشــەویســت بوو. ئەوان دەیانزانی ئەو ژنەکەی خۆی خۆش دەوێ و کاتێکیش دەچێتە سەفەر نامەی بۆ دەنووسێ. هەموویان سەرەتای یەکێ لە نامەکانی ئەویان لەبەر بوو، ئەو نامەیەی بەو شێوە دەستی پێدەکرد:

*خۆشەویستەکەم،*

*هەمیشە کاتێک دێمەوە، لە ماڵ بە،*

*دەنا هەر بانگت دەکەم،*

*ژوور بە ژوور بە دواتدا دەکەڕێم تا دێیتەوە.*

ژنێک بە هەنسکەوە گوتی: "هەمووان لێرە نەخۆشن، هەموو کەسێک لەو حەرەمسەرایەدا خەریکە بمرێ."

ژنێکی دیکە هەڵیدایێ: "دەرد، تاعون بەسەر ئەم حەرەمسەرایەدا زاڵە."

وەزیر پرسـی: "ئەوە تۆ دەڵێی چی؟" وەک ئەوەی هێشتا بە باشـی گوێی لە وەڵامی ژنەکان نەبووبێ.

"تاعون لەم حەرەمسەرایەدا بڵاوبۆتەوە."

ئەویش بە بڕوانەکراوی گوتی: "بۆچی وا دەڵێی؟"

یەکێ لە ژنەکان هاواری کرد: "ئەمشــەو ژنێک مرد، ئەو هێشــتا هەر لە نێو پێخەفەکەی خۆی دایە."

ژنێکی دیکە قسەکەی لێ وەرگرتەوە: "دەردێک لەو شارەدا بڵاوبووەتەوە. تەنیا ئێمە نەبێ، دەنا هەمووان دەیزانن."

"ئەم قســەیە وا نییە. من ئێســتا لە شــارەوە هاتووم، هیچ دەردێک لە گوڕێدا نییە. هەر دەبێ ئێوە ترســا بن. ئەمە ترســە زەندەقی بردوون، لەوانەیە ئەو ژنەی نێو حەرەمسەرا بەر هۆکارێکی دیکەوە مردبێ."

"ئاخر زۆر ژنی دیکە نەخۆشـن، پاشـاش لێرە نەماوە. ئەو دایک و کچ و پشیلەکەی لەگەڵ خۆی برد وئێمەشی لێرە بۆ مردن بەجێهێشتووە."

وەزیر هێدمەی[٦٣]گرت. ئەو دووبەدوو لەگەڵ خواجەباشی دوا و تێگەیشت ئاخۆ چی بەسەر کۆشکەکەدا هاتووە. پێدەچوو پزیشکەکەی پاشا لە ژنە مردووەکەی حەرەمسەرا گومانی لە هەبوونی دەردی تاعونی کردبێ. ئەو بە متمانەوە پاشای لە دۆخەکە ئاگادارکردۆتەوە، پاشان شا بڕیاری دا بڕواتە هەوارێکی ئارام و بێ وەی.

وەزیر قسەی لەگەڵ ژنەکان کرد: "خانمان، خەم مەخۆن. مشووری هەموو شتێک دەخۆم." ئینجا ڕووی خۆی لە خواجەباشی کرد و پێیگوت: "دەی بڕۆ ژنە مردووەکە لە حەرەمسەرادا بێنەدەر و هەموو ژنە نەخۆشەکانیش لێرە لە قاوشێکی گەورە، لە دیوەکەی دیکەی کۆشک کۆبکەرەوە. منیش دەمودەست دەچم پزیشک ئاگادار دەکەمەوە." ئینجا ڕووی قسەی کردە ژنەکان: "دەرکەی حەرەمسەرا دەکرێتەوە، ئێوە دەتوانن بۆ وەرگرتنی هەناسەیەکی سازگار بچنەدەر. هەموو شتێک بە پاکی ڕابگرن، گەرماو و هۆدەکانتان پاک بکەنەوە. خۆتان و منداڵەکانیش پاک پاک بشۆن."

ئەم قسە باوکانەیەی وەزیر بە دڵی ژنەکان بوو، هێوری کردنەوە، بەم جۆرە دیسان ئارامیی بۆ حەرەمسەرا گەڕایەوە. دەمودەستیش تەرمی ژنە مردووەکە لەوێ لابرا و پزیشکیش بۆ ژنە نەخۆشەکان بانگ کرا. ژنان هەڵمەتێکی پاککردنەوەی گشتییان ڕاگەیاند و منداڵانیش ئازادانە جرتوفرتی خۆیان بۆ باخی کۆشکەکە دەستپێکردەوە.

وەزیر دیسان لە ڕەفتاری نابەرپرسانەی پاشا نامراد بوو. ئەو بڕوای نەکرد تاعون لە تارانی دابێ، گومانی بۆ ئەوە چوو ژنانی حەرەمسەرا لە ترسان تۆقیون و شتەکەیان لەوەی هەیە گەورەتر زانیوە. ئینجا سواری

[٦٣] هێدمەگرتن: شۆکبوون.

ئەسپەکەی بووە و بەرەو قەزوین، بەرەو ئەو قونەگوندەی لەنێو چیاکان هەڵکەوتبوو ملی لێنا، بەڵکو لەوێ چاوی بە پاشا بکەوێ.
هەوای دەرەوەی شار هێنایەوە سەرخۆی، توورەییەکەی دامرکایەوە و تێگەیشتنێکیشی بۆ دەرچوونی شا بەم جۆرە لە لا پەیدا بوو. خۆی هەردەبێ شتێکی گەورە و دژوار لە ئارادا بووبێ.
ئەو لە دواگردیش ئاوا بوو، بەنێو مەزرادا ئەسپەکەی خۆی تاودا. لە سەر ڕۆخی ڕووبارێک خەڵکی بینی پاڵ کەوتبوون. سەرەتا وایزانی ئەمانە جوتێر و کشتیارەکانی ئەو دەوروبەرەن و لە چیمەنی تەنیشت ڕووبارەکە پشوودەدەن، لێ کاتێ لێیان نزیک کەوتەوە، بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەکرد. خۆ ئەمانە خەڵکی کەترە[٦٤]ی نەخۆشن، خەریکن دەمرن. خەڵک لە ترسی تاعون ئەوانی لە گوندەکە دەرکردبوو.
وەزیر هەراسان بوو. لە هەموو شوێنێک هەر ژن و پیاو بوون وەک کەلاکی ئاژەڵی مردارەوەبوو لەو گۆڕە کەوتبوون. بینی چۆن دایکان منداڵەکانی خۆیان لە کفندا وەردەپێچان، دایبابی بینین بە خۆیان و منداڵەکانیان بەرەو چیاکان هەڵدەهاتن. بێدەسەڵاتانە بە لای تەرمی سێ ژندا ڕەتبوو لاقی نیوەڕوتیان لەنێو ڕووبارەکەدا بوو. کەسانێک گەچیان بەسەر تەرمەکاندا دەکرد تا لە سەگی تۆڕی و هارییان بپارێزن.

کاتێک وەزیر گەیشتە گوند تازە تاریک داهاتبوو. ڕاستەوڕاست بەرەو دەرکەی قەڵاکە ملی لێنا، بەڵام پاسەوانەکان ڕێگەیان پێگرت.
سەردەستەی پاسەوانەکان پێیگوت: "خاوەنشکۆ پێشوازی لە هیچ کەس ناکا."
"دەکرێ بە پاشا بڵێی وەزیر لەبەردەرگا وەستاوە؟"

---

[٦٤] کەترە: کەسیرە، هیلاک، داهێزراو.

کابرای تایین پێیگوتەوە: "تەنانەت پاسەوانەکانیش بۆیان نییە لە حەوشەی قەڵاکە نزیک بکەونەوە."
وەزیر تووڕەیی خۆی خواردەوە، ئینجا پێی گوتەوە: "خۆ دەکرێ لە دەلاقەکەوە بانگ بکەی کەوا من لێرە لە بەردەرگە وەستاوم."
پیاوەکە شێلگیرانە گوتی: "خاوەنشکۆ نایەوێ کەس ببینێ. هەر بە ڕاستی هیچ کەس. ئەو بە دەمی خۆی فەرمانی پێکردووین."
وەزیر خۆی بینی لە پشت دیواری قەڵاکەوە وەستاوە، باشە ئەرێ بە ڕاست چی بکا؟ باشە پاشا چی لە تاعونێک بکا کە هەموو لایەکی داگرتووە؟ خۆ ئەگەر کەسێک شتێکی لەدەست بێت و بیکا هەر وەزیرە. ئەدی بۆچی لێرە وەک سواڵکەرێک لەبەر قاپیی شا بوەستێ تا لێی بپاڕێتەوە بەڵکو قسەی لەگەڵدا بکا؟
بڕیاریدا بگەڕێتەوە و تا پێیدەکرێ لە تاران شتێک بکا ئەم پەتایە بوەستێنێ. بەڵکو داوای یارمەتی لە ڕوس و بریتانییەکان بکا. وا باشە ڕاستەوخۆ بچێتە لای باڵوێزی بریتانی و لە ڕەوشەکە ئاگاداری بکاتەوە. دەکرێ باڵوێزیش داوا لە لەندەن بکا بەڵکو تیمی پزیشکانی خێرخواز لە ڕێی هەراتەوە بەرەو تاران بنێرن. ئەم بیرۆکەیە تاکە فریادڕەس بوو.
وەزیر ویستی بەرە تاران بکەوێتەوە ڕێ، بەڵام دیمەنی ئەو پاشا بێباکەی خۆی لە قەڵایەکی ئارام و بێ وەیدا حەشار داوە تووڕەی کرد. ئاخر خۆ پاشا بەرپرسیارێتی گەلی لەسەر شانە.
ئینجا لە شوێنی خۆیەوە هاواری کرد: "پاشا! وەزیر لێرەیە! وەزیر هاتووە! ئەوە منم وەزیر، لێرەم!"
پاسەوانەکانیش بێهودە ویستیان وەزیر لەوێ دووربخەنەوە.
وەزیر جارێکی دیکە بانگی کردەوە، ئەمجارەیان توندتر: "پاشا، وەزیر لێرەیە، وەزیر! وەزیر!"

ئەوسا فەرماندەی پاسەوانەکان دەستی گەیاندە تفەنگەکەی، لێ نەیوێرا لوولەکەی لە وەزیر بکا. ئەویش دەستی بۆ تفەنگەکەی خۆی برد تەقەی بە هەوادا کرد، لەکاتێکدا هێشتا هەر لەسەریەک بانگی دەکرد: "وەزیر لێرەیە!"

لەبەر دەرگە بووە هەرا و پاشاگەردانی، ئەسپەکان دەیانحیلاند، سەگی ئێشکچی دەوەڕین، پاسەوانەکانیش هەوڵیان دا وەزیر لە دەروازەی قەڵاکەوە دوور بخەنەوە.

لە ژوورەوەش پاشا کرۆبیێدەنگ گوێی لێگرتبوو. گوێی لە دەنگی داردەستی دایکی بوو. مەهدولیا هاتە پشت کوڕەکەی گوتی: "دوودڵ مەبە! بیکوژە. ئەو زۆر بە دەسەڵات بووە."

کەچی لەهەمان کاتدا دەرگای قەڵاکە کرایەوە. تاج سوڵتانی کیژی پاشا بە خۆی و مەشخەڵێک بەدەستەوە هاتەدەر. بە ئارامی ڕووی لە وەزیر کرد: "سەلام وەزیر. ئەرێ من چیم پێدەکرێ بیکەم؟"

وەزیریش وەڵامیدایەوە: "نا ، نەخێر کچەکەم، نەخێر. من شادمانم کە خاتوونی شازادە تەندروستە، ئەوەندە بۆ من بەسە."

"من بیستم تۆ لەبەرەی باشوور بریندار بووی. خەمم لێخواردی، لێ ئێستا خۆشحاڵم جارێکی دیکە دەتبینمەوە. ئێستا چۆنی ئاغای وەزیر؟ زۆر جار بیرم لێ دەکردییەوە."

قسەکەی تاج بۆ وەزیر مایەی سەرسامی بوون. تووڕەییەکەی دامرکاندەوە. لە شوێنی خۆیەوە تەماشایەکی کرد، بینی خاتوون لەبەر تاریکی وەستاوە، لایەکی ڕووی لەبەر تیشکی مەشخەڵەکەی دەستی بە تەنیشت دەرکەکەوە ڕووناکە. وەزیر بینی تاج سوڵتان گەورە بووە و هەروەک شازادە خاتوونێکی ڕاستەقینە دەجووڵێتەوە.

"کیژەکەم، سوپاسی ئەو وشانەت دەکەم، کە هەروەک دڵت گەرمن. من باشترم. تۆ شازادە خاتوونێکی ناوازەی."



تاجیش بە خەندەوە هاتەوە قسە: "سوپاست دەکەم."

وەزیر بە دەم ئەم قسانەی: "فەرموو تۆ بڕۆرەوە ژووری، باش ئاگات لە خۆت بێ." کڵاوەکەی بەرزکردەوە و هەنـدێکی بۆ چەمـایەوە، ئینجـا سـواری ئەسـپەکەی بوویەوە و بە کلکی بارگیریدا دا و بەڕێگەی خۆیدا گەڕایەوە.

# ٣٧

# پەتای ڕەش

تاعون لە تارانی دا، بەڵام ئینگلستان لە کاتی خۆیدا دەستی یارمەتی بۆ وەزیر درێژ کرد. ئەوان پەرستاری هیندییان ناردنە گوندەکانی دەوروبەری تاران تا بەر بە بەڵایەکە بگرن و لەناویبەرن. لەهەمان کاتیشدا پزیشک و داودەرمانی ڕوسیشی فریاکەوت. ڕوسەکان لە شارەکانی لای باکوور بۆ چارەسەرکردن خێوەتیان لای مەیدانی بازاڕەکان هەڵدا.

بە هەزاران کەس لە ناو تاران و دێهاتەکانی دەوروبەریدا مردن. لە حەرەمسەراشدا سێ ژنی دیکە لەبەر نەخۆشییەکە دەرنەچوون. خەڵکەکەش هەموو ڕۆژانی هەینی دەچوونە مزگەوتی گەورە، لە نوێژی هەینی و لە دوای ئیمامەوە دوعایان دەکرد و لە خودا دەپاڕانەوە بەڵکو ئەو بەڵایەیان لە کۆڵ بکاتەوە. دیاربوو دوعای ئەو هەموو خەڵکە گیرۆ بوو، چونکە پێشوەختە زستان هات، سەرمایەکی وەها داهات بەردی شاخەکانیش خۆیان لەبەر نەدەگرت. یەک هەفتە لەسەر یەک بەفر باری، داروبەرد بوو بەشەختە. ڕەوشەکە ئەوەندە نالەبار و تووش بوو مرۆ

نەیدەزانی لە سەرمان ڕەق دەبێتەوە یان بە دەردی تاعونەکە سەری تێدا دەچێ.
بەڵا و سـەرما بە لایەک، ئینجا برسـیەتی و قاتوقڕیشـی هاتەسـەر. ئەزموون ئەوەی نیشـانی خەڵکەکە دا، لەبەر برسـییەتی و قاتوقڕی، تاعونیان لەبیر چووەوە.
لێ لە بەشـی باشـووری وڵاتدا تێبینی ئەوە نەکرا بەڵای تاعون لێیدابێ. بریتانییەکان لە کەنداوی فارسـییدا خەریکی دروسـتکردنی بەندەرەکان بوون و لە شـاری مەسـجید سـولەیماندا بەردی بناغەی یەکەمین دامودەزگای نەوتیان لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا دانا.

پاشـا هەموو ئەو ماوەیە هەر لە قەڵاکە مایەوە و فەرمانەکانی بە پەیکدا دەناردنە تاران. بەڵام بەر لەوەی بەفرە ئەستوورەکە بباری و پەیوەندیی ئەو بە دنیای دەرەوە ئەستەم بکا، گەڕایەوە کۆشکەکەی خۆی لە تاران. خۆشـی بەدوورگرت لەوەی سـەری حەرەمسـەرادا بدا، ئەوەشـی لێ قەدەغەکردن باس لە مەرگەساتی ئەوانە بکەن، کە بە دەردەکە سـەریان نایەوە.
لە یەکێ لە شـەوە ساردەکانی زسـتان، ئەو شـەوانەی کوچە و کۆڵان چۆڵ چۆڵ بوون، خەڵک دەرکە و پەنجەرەی ماڵەوەیان باش گالەدا، درزی پەنجەرەکانیان بە پەتۆ باش گرتبوو، لەو کاتەدا شـا بەدوای وەزیریدا نارد. لەپاش ئەو ئێوارەیەی وەزیر بە سـواری ئەسـپ لێدا چووبووە قەڵاکە و پاشـاش فەرمانی دابوو قاپییەکەی لێنەکەنەوە، هیچ پەیوەندییەکی دووبەدوویی لەگەڵ شادا نەکردبوو. هەر لە ڕێی تەتەرەوە پەیامەکانیان بۆ یەکدی دەنارد. دیاربوو پاشا ویستبووی وەزیر سـەرما بچێژێ بۆیە بەو شەوە ویستوویەتی ببینێ.

فەخری، ژنەکەی وەزیر لەگەڵ گەیشتنی پەیامەکە پێیگوت: "هەستێکی خراپم هەیە، باشتر وایە بەتەنیا نەچی."

"خەمی مەخۆ، زۆر نابا دێمەوە."

فەخری پێیگوتەوە: "گوێم لێبگرە، بەهانەیەک بدۆزەوە، بڵێ بەیانی دێم و سەری پاشا دەدەم."

"ئەمە نابێ. شا بە دوایدا ناردووم و پێویستی بە منە، دەنا بەو درەنگانی شەوە بەدوایدا نەدەناردم."

فەخری بە گریانەوە: "خوایە، بە هانامانەوە وەرە."

"*وەزیرکوشەن*" لە مێژووی ئێراندا چەمکێکی ناسراوبوو، هاوواتاکەشی "بمرێ وەزیر! بوو.

کوشتن و لەناوبردنی وەزیری لێهاتوو شتێک نەبوو لە بازنەی دەرباری پاشایەتی بەدەر بێ. هەموو وەزیرێک دەیزانی ئەو ئەگەرە لە ئارادایە، کاتێکی چاوەڕواننەکراو هەیە تا پاشا بیکوژێ. نموونەش کەم نین؛ کوشتنی پاشا بە دەستی شازادە، پاشا کوڕ و براکانی خۆی سارد کردبێتەوە. سەربردەی (حەسەنک)[٦٥] گەورەوەزیر نموونەیەکە هەمووان دەیانزانی. حەسەنک کەسێکی خۆشەویست و دەستڕۆیشتوو بوو. لە ڕۆژێکی شوومدا سوڵتان بانگیکرد. حەسەنکیش دەیزانی لە دەرباری سوڵتانەوە بێزراوە، لێ هەرگیز گومانی بۆ ئەوە نەچوو سوڵتان بیەوێ بیکوژێ. ئیدی هەر پێی نایە کۆشک، دەرکەی لەسەر داخرا و

[٦٥] مەبەست حەسن کوڕی محەمەد میکایلی، ناسراو بە حسنک، دوایین وەزیری سوڵتان محەمەد غەزنەوی بوو، بە بڕیاری مەسعود غەزنەوی و بە فتوای خەلیفەی بەغداد گوایە کەسێکی قرمتی یان ئیسماعلییە لە ساڵی ٤١٠ی کۆچیدا لەدار درا. وەرگێڕ

ئابلوقه درا. بەیهەقی[٦٦] تۆمارنووسی سەدەکانی ناوەڕاست، دیمەنی کوشتنی حەسەنکی لە کتێبەکەی خۆی بەم شێوەیە تۆمارکردووە:
ڕۆژێک حەسەنکی گەورەوەزیریان لەسەر پشتی ئەسپێکی بەستەزمان بۆ بەر پەتی سێدارە هێنا. ئەو هەرگیز سواری ئەسپێکی وەها بچکۆلە نەبووبوو. کابرای جەللاد ویستی چاوەکانی بە پارچە پەڕۆکێک ببەستێ، لێ حەسەنک ڕەتیکردەوە چاوی ببەسترێ.
سوڵتان بانگیکرد "بەردبارانی کەن!"
لێ گەلێ، کەس بەردێکی تێنەگرت.
ئەمجارە سوڵتان بانگیکرد: "لەداریدەن!"
جەللادەکە حەسەنکی لەدار دا. حەفت ساڵ حەسەنک هەر بە دارەوە کراوەبوو. خۆرەتاوی ئێرانی تەرمەکەی سووتاند و بای ڕۆژهەڵاتیش خۆڵەمێشەکەی پەخش کرد.

نموونەیەکی دیاری دیکەش هەبوو، ئەویش کوشتنی گەورەوەزیر میرزا تەقی خان بوو. بەیانییەک سەر لەزوو، میرزا دەچێتە گەرمای شار خۆی بشوا. دوای خۆشوشتن دەچێتە سەر کورسیی سەرتاش دادەنیشێ. دەلاکەکەش تیغەکەی زۆر بە باشی بۆ دەسوێ، مووی گەردنی بۆ دەتراشێ، پاشان لە ڕاستی دەماری خوێنهێنەردا دەستی توند دادەگرێ و دەمارەکەی دەبڕێ. ئەو ئەم کارەی بە فەرمانی پاشا کرد.
فەخری ئەو چیرۆکانەی دەزانین، بۆیە دەترسا چارەنووسی مێردەکەشی بەهەمان مەرەد بڕوا.
وەزیر بە ژنەکەی خۆی گوتەوە: "مەگرییێ." ماچی کرد و ئینجا سواری ئەسپەکەی بوو بەرەو کۆشک لێیخوڕی.

---

[٦٦] مەبەست ابو الفضل بەیهەقییە (٩٩٥-١٠٧٧)زاییینی، مێژوونووسی دەرباری غەزنەوییەکان بووە. وەرگێڕ

کاتێ گەیشـتە بەردەرکەی کۆشـک، بینی پاسـەوانەکان هی جاران نین. ئاخر ئەم سـەردەستەی پاسـەوانانی نەبینیوە، پێشـتر یەکێکی دیکە بوو. خۆی وەک عورفێکی لێهـاتبوو، هەر کـاتێ وەزیر لە مەیـدانەکە وەدەرکەوتبا، فیکەیەک لێدەدرا، ئینجا سـەرۆکی پاسـەوانەکان دەهاتەدەر و بەرێزەوە ئیکلامی بۆ وەزیر دەکێشـا. ئەم جارەیـان دونیـایەکی کشـومات، هیچ شـتێک لەم شـتانە ڕووی نەدا، سـەردەسـتەی پاسەوانەکانیش لە شوێنی خۆی نەجوولا.

ئەو هێشـتا هەر لەسـەر پشـتی ئەسـپەکەی بوو، خرەی دەرگا هات و کرایەوە. گومانی بۆ ئەوە چوو، لەدوای ئەوەوە دەرکەیان داخسـتبێتەوە. چلۆپۆپی دارەکان لەبن بەستەڵەکدا سـەریان شۆڕ بووبوونەوە. لوولەی دووکەڵی سـەربانی کۆشـک دووکەڵی لێهەڵدەسـتا و مەشـخەڵەکانی لای حەوزی ئاوی حەوشـەکەش هەڵکرابوون. سـایەی پاشـا لە ژووری کاری خۆی لەسـەر پەردەکەوە دیار بوو، وەک ئەوە وابوو لە پشـت پەردەوە سیخوڕی بەسەر وەزیرەوە بکا.

وەزیر لە ئەسـپەکەی دابەزی و لغاوەکەی دایە دەسـتی یەکێک لە نۆکەرەکان، کە ئەو نەیدەناسی. کابرا کەسێکی چوارشانەی تێکسـمڕاو بوو، پێنەدەچوو هیچ کارامەییەکی مەیتەری بە ڕوخسارەوە دیاربێ.

وەزیر بە ئەسـپایی بەسـەر پەیژە بەسـتووەکاندا بازی دا چووە نێو کۆشـک. ڕاڕەوەکان تاریک بوون، بەڵام چرایەک بچووک لە دەرکەی هۆڵی مینابەندەکە هەڵکرابوو.

کەشـوهەواکە مایەی گەف و هەڕەشـە بوو. دەنگێک لە هەناوی خۆیەوە پێیگوت، واباشـە بەرلەوەی کـارلەکـار بترازێ بگەڕێیتەوە، بەڵام خۆ نەیدەتوانی بۆ دواوە بگەڕێتەوە، ئاخر شـا ئەوی بینی بوو، کەواتە چاوەڕێی دەکا. خۆڕسـکانە ئاوڕێکی لەدوای خۆی دایەوە، دەرکەکەی

کردەوە ویستی بچێتە دەرەوە. لێ ئەو پیاوەی سەری ڕیشمەی ئەسپەکەی لێوەرگرت لەسەر پەیژەوە وەستابوو.
ئینجا بە نەرمی بە وەزیری گوت: "پایەبەرز چاوەڕێت دەکا." ئەمەی گوت و دەرکەکەی پێوەدایەوە.
وەزیر گەڕایەوە هۆڵی مینابەندەکە، بە نەرمی لە دەرکەی دا و بانگی کرد: "ئاغا موشیر!"
لە تاریکییەوە دەنگێک هات: "فەرموو وەرە ژوور، ئاغای پەردەدار لێرە نییە."
لە هۆڵی مینابەندەکەدا هەموو پەردەکان دادرابوونەوە، بەڵام ژووری چلچلراکە ڕووناک بوو. وەزیر بەسەر مافورە گەورۆنە کەسکەکەی هۆڵەکەدا ڕۆیشت، چووە سەر کورسییە ڕەنگ هەنارییەکە دانیشت و لاقەکانی خۆی شێلا، دیسان ئازاری دەدایەوە.
هەموو جارێک، کە ئەو لەو هۆڵەدا چاوەڕێی هاتنی پاشای دەکرد، بە سەرسامییەوە سەرنجی لە تانوپۆی مافوورە ڕاخراوەکەی بەرپێی دەدا. ئاخر یەکێک بوو لە مافووره هەرە نازدارەکان تائێستا چنرابێ. داوی باریکی تەلایی و هەزاران داوی وردیلەی دیکە تانوپۆییەکەی وەها بە گوڵ و گوڵوک نەخشێنرابوو، هەر خواخوات بوو لێی ڕابمێنی.
کەس نەیدەزانی ئاخۆ کەی ئەو مافوورە شاهانەیە چنراوە، لێ مرۆ لەو بڕوایەدا بوو هی کۆشکە ئێرانییە دێرینەکان بێ، ئەوانەی سێزدە سەدە پێشتر بە دەستی موسڵمانان ئاگریان تێبەردرا، ئەوکاتەی دەوڵەتی ئێرانی ڕوخا. ئیدی شوێنکەوتووانی محەمەد هەموو کۆشکەکانیان تاڵانکردن و ئاگریان تێبەردان، لێ یەکێک لە نۆکەرەکان توانیبووی ئەم مافووره دەرباز بکا.
ئەم خەیاڵڕۆیشتنە وای لە وەزیر کرد باشتر بێتەوە سەر خۆی.

"چییە دەڵێی وەزیر ترســاوە، من تۆم وەها نەناســیوە. تۆ شــەکەت و ماندووی، دەی هەفتەیەک برۆ فەراهان و پشــوو بدە." ئەو ئەم قســەیەی بەخۆی گوتەوە.
لە پشـــت دەرکە بچکۆلەکەش، کە هەمیشـــە هەر کـابرای پەردەدار بەکاریدەهێنا، گوێی لە تەپەی پێ بوو.
بانگی کرد: "ئاغا موشیر!"
هیچ وەڵامێک نەبوو. بەرەو لای دەرکە بچکۆلەکە ڕۆیشت بزانێ چ باسە، کەچی ئەو دەرکەیەی هەمیشە لەسەر گازەرای پشت بوو، گاڵە درابوو. گوێی لێبوو یەکێک هەنگاوی هەڵدەهێنا. "ئاغا موشیر، ئەوە تۆی لەوێ؟" کاتێک بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشانەوە، ترسێک پەڕییە دڵی. ئەو پەردە درێژانەی هەمیشە پاشا لەوێوە سەریدەرێناو پەیدا دەبوو، جووڵایەوە. وەزیر چاوەڕێی کرد پاشا بێ، بەڵام خۆ ئەو نەبوو، بەڵکو شەرمین بوو، سەری لە بن پەردە دەرهێنا.
وەزیر ئاهێکی پێداهاتەوە بانگی کرد: "شەرمین. وەرە، دەی وەرە ئێرە!"
لێ پشیلەکە لەجێی خۆی نەبزووت. وەک ئەوەی بۆنی شتێکی ناخۆشی کردبێ. تاوێک لە وەزیر ڕاما، ئینجا ســەری بردەوە پشــت بەردە و ون بوو. شـــەرمین ئەوەی بۆ وەزیر ڕوونکردەوە، دۆخی ئێســـتای هۆڵی مینابەندەکە ئاســـایی نەبوو، دەنا هەر یەکســـەر بۆی دەهات و خۆی لە لاقەکانی هەڵدەسووی.
وەزیر دوودڵ بوو. بەڵکو ڕاستەوخۆ لە شا وێبکەوێ: "خاوەنشکۆ، من لێرەم، چاوەڕێی ئێوەم.
بۆ لای پەردەکە ڕۆیشت.
سەرلەنوێ بانگی کردەوە: "خاوەن پایە! تۆ لەوێی؟"
پێدەچوو پاشـــا هەر لە تەلارەکە نەمابێ، وەزیریش ســـەرچیخ چووبوو بەوەی سـایەی پشـت پەردەی بە هی پاشـا زانیبێ. بەدەسـت لەپشـتەوە

گریدان بەنێو هۆڵەکەدا هەر ڕاوێچکەی دەدان. هەستیکرد کەوتۆتە داوێ، هەر لە سـەرەتاوە جەسـتەی ئاگاداری کردبووەوە، بەڵام خۆ ئەو ئاماژەکانی بەهەند هەڵنەگرتن.
ئێ باشـە، دەبووایە چی بکردبایە؟ نەیدەتوانی خۆی بشـارێتەوە، نەیـدەتوانی لە مـاڵ بمێنێتەوە یـان نەیـدەتوانی هەڵبێ. ئەو دەبوایە گوێڕایەڵی پاشا بێ، هەر بۆیە بەدەم بانگکردنەوە هاتبووە کۆشک.

هەمیشە دوژمنەکانی حیسابی تایبەتیان بۆ دەکرد و زەفەریان پێنەدەبرد، ئەو بیریشـی لەوە نەکردبووەوە لە نێو هۆڵی مینـابەنـدەکە تەڵەی بۆ دابنێنەوە.
ئەو بوێری دایەوەبەر خۆی. کێ ناڵێ شـا لێی تووڕەیە و بیەوێ بەم شـێوەیە بیشـکێنێ بەوەی ماوەیەکی زیاتر لە پێویسـت چاوەڕێی بکا؟ سـەرباری ئەو هەموو شـتانەش، شـا چی لێدەکا؟ کاتێک باوکی ئەو پاشایە داوای لێکرد ببێتە سەروەزیری کوڕەکەی، ئەویش یەک مەرجێکی شاهانەی لێ داواکرد: "ئەگەر شازادەی جێنشین بە قورئان سوێند بخوا هەرگیز نەمکوژێ."
شـازادەی جێنشـینیش بە پێکەنینەوە گوتی: "من سـوێند بە قورئانێ دەخۆم، هەرگیز دەستم بە خوێنی تۆ سوور نەبێ." ئەوسا پاشای باوک دەستی وەزیری خستە نێو دەستی کوڕە جێنشینەکەی و گوتی: "ئێستا من بە ئاسـوودەیی سـەردەنێمەوە." کاتێک وەزیر لە مێشـکی خۆیدا ئەو وشانەی پاشای بەبیرهاتنەوە، هێدمە گرتی. ئەرێ، شا سوێندی نەخوارد بەوەی هەرگیز وەزیر نەکوژێ، بەڵکو بەوەی دەسـتی بەخوێنی ئەو سـوور نەبێ. خۆ دەکرێ کاروباری کوشـتنەکەی ئەو بە یەکێکی دیکە بسپێرێ.

مەشخەڵە چرای لای حەوزەکە کوژێنرانەوە و ئەو ناوە بە جارێک تاریک بوو. دەرگـاکەش داخرابوو، هیچ پاسـەوانێکیش دیـار نەبوو. وەزیر سـەرچیخ نەچوو بوو، خۆی دەبووایە بگەیاندبایە شـوێنێکی ئارام و بێوەی. خێرا بۆ لای دەرکە ڕۆیشـت و کردیەوە، لەوێ تووشـی پاسەوانێکی چوارشانە بوو، وەک دیوار لە ڕاڕەوەکە وەستابوو.

وەزیر بە کابرای پاسەوانی گوت: "پێموایە ئێستا پاشا سەری زۆر قاڵە، لەوانەشە پتری پێبچێ. دەچم دەستنوێژ هەڵدەگرم.

"تۆ ناتوانی لێرە بڕۆی، خاوەنشکۆ چاوەڕێت دەکا."

"شتەکە زۆر ناخایەنێ."

پاسەوانەکە پێیگوتەوە: "نەکەی بڕۆی."

وەزیریش بە تەوسەوە پێی گوتەوە: "وا تێبگەم لێرە دەستبەسەرم؟"

کابرا بەتوندی پاڵێکی بە وەزیرەوە نا و کردییەوە ژوور و دەرکەکەی لەسەر داخست.

وەزیر لە دڵی خۆیدا بەخۆی گوتەوە: "نەکەی بترسی، حەوسەڵەی خۆت لەدەست نەدەی."

ماوەیەک هەروا لە ناوەڕاستی هۆڵەکە وەستا، ئینجا بەرەو لای شێرەی ئاوی پاشا ڕۆیشت، کە لەسەر مێزێک لە گۆشەیەکی هۆڵەکە دانرابوو. بە ئەسپاییەوە دەستنوێژی هەڵگرت. ڕووی لە کەعبە کرد و نوێژەکەی خۆی دابەسـت. ئەمەش تاکە ڕەفتار بوو تا هەندێ ئاسـوودەیی پێببەخشێ. نوێژەکەی خۆی دابەست و لەجاران پتر درێژەی پێدا، کەچی پاشا هەر دەرنەکەوت.

تۆ بڵێی شا لە کوێ چاوەڕێ بکا؟ خۆ ئەگەر ویستبێتی سووکایەتی بە وەزیر بکا، کردی و سەرکەوتووش بوو. خۆ ئەگەر نەخشەیەکی دیکەی هەبووبێ، باشە بۆ هیچ ناقەومێ؟

لەپڕ ئەوەی بە مێشکدا هات، ئێستا شەوی هەینییە و لە ڕۆژانی هەینیشدا حەرامە کەس بکوژرێ. مانگ ڕێک لەسەر کۆشکەکە هەڵاتبوو، کاتەکەش سەروبەندی نیوەی شەو بوو. ئیدی کەوتە سەر ویرد خوێندنەوە: *"ئەشهەدو ئەن لا ئیلاهە ئیللا ئەڵڵا، وە ئەشهەدو ئەننە محەمەدەن ڕەسولوڵلا.* گەواهی دەدەم تەنیا یەک خودا هەیە ئەویش ئەڵڵایە، هەروەها گەواهی دەدەم محەمەد نێردراوی ئەوە."

مرۆ ئەو کاتە ئەم وشانە دەڵێتەوە، کاتێک تەواو دڵنیابێ مردن لێی نزیک بۆتەوە. دووریش نەبوو شا لە شوێنێک بەدزییەوە چاوی لەسەر ئەو بێ، چۆن وەزیر، پاڵەوانەکە، ئەو پیاوەی ویستوویەتی ئەو لەسەر تەخت لابەرێ. گیرۆدەی دۆخێک بووە، دەربازبوونی ئەستەمە.

وەزیر بە دانبەخۆداگرتنەوە لەنێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. ئێستا بۆ مردن ئامادەیە، هەندێک هێور بووبووەوە. جارێکی دیکە لە مافوورەکەوە ڕاما، هەر بەڕاستیش جوانترین مافوور بوو بە دەستی ژنە ئێرانییەکان چنرابێ. پێدەچوو زۆر وەزیری دیکەش پێش مەرگی خۆیان، بەسەر مافوورەکەدا ڕۆیشتبن.

مانگ لەسەر ئاسمانی کۆشکەکە ئاوا ببوو.

لەبەر خۆیەوە بە بردەبردێکەوە گوتی: "کاتی هاتووە."

دەرگا کرایەوە. سێ پیاوی تێکسمڕاوی چوارشانەی لێ وەژوور کەوتن. پەتۆی گەورەی ڕەش و کندریان پێبوو.

وەزیر بە توندی هاواری کرد: "لا ئیلاهە ئیللا للا..."

دوو لە پیاوەکان غاریان دایێ و لە پشتەوە گرتیان و دەستیان لە پشتەوە توند بەستنەوە.

"لا ئیلاهە ئیللا للا" وەزیر وەها هاواری کرد، لێ نەیتوانی ڕستەکە تەواو بکا، سێیەمینەکەیان پارچە پەڕۆیەکی توند لە زاری پەستی.

وەزیر بە چنگەڕنێ خەریکبوو خۆی لە دەســـتیـان ڕاپســـکێنێ، لێ بەرزەفتیـان کرد و بە هەرســـێکیـان لە زەویـان دا، ئینجـا بە چەنـد جووڵەیەکی خێرا لە پەتو ڕەشــەکەیان وەرپێچا. ئەویش تێکۆشــا بەڵکو دەست و پێی خۆی بجووڵێنێ و خۆی بکاتەوە، لێ هەرزوو پیاوەکان بە کندر توند بەســتیانەوە و وەک فەردەیەک لەســەر زەوی هەڵیان گرت و بردیانەدەر.

کاتێکیش ئارامی بۆ ژوورەکە گەڕایەوە. پشــیلەکە ســەری دەرهێنایەوە. بەسەر مافوورەکەدا ڕۆیشت و لێرە و لەوێ هەر بۆنی دەکرد.

پەردەکە لادرا و شــا بەدەرکەوتەوە. هێشــتا هەر شــەو بوو، مەشــخەڵ لەسەر حەوزەکە هەڵکرانەوە و پاسەوانەکانیش بێباکانە لەبەردەم دەرگا وەستانەوە وەک ئەوەی هیچ شتێک نەقەومابێ.

# ٣٨

# بێدەنگی

دوای کوشـــتنی وەزیر، ئەمیری دەســـتەڕاســـتی، یارمەتی ژن و ماڵ و منداڵی دا تا لە تاران هەڵبێن. هەموو دۆســـــت و برادەرانی وەزیریش ڕایانکرد. ئەمیر خۆشی خۆی لەبەر چاوان شاردەوە.
لە کۆشـــک بووە شـــایی و لۆغان. نەیارەکانی وەزیر پیرۆزباییان لەیەک دەکرد بێ ئەوەی نـاوی کوژراوەکەش بهێنن. مەهــدولیـا کە چیـدی نەیدەتوانی بە پێی خۆی بڕوا، هەموو ڕۆژەکەی لە پێشوازیی مێوانەکانیدا بوو. زلهێزە دەرەکییەکانیش بە بێدەنگی چاودێریی بارودۆخی گۆڕانی دەسەڵاتیان لە وڵاتدا دەکرد.

لە هیچ شـوێنێکیش بە فەرمی مردنی وەزیر ڕانەگەیەنرا. پرسـەکە هەروا لەنێوان مردن و نەمردن بە کراوەیی هێڵرایەوە. خەڵکی ئـاســـاییش شتەکەیان ئەوەندە بەهەند هەڵنەگرت.
دوای ئەوەی وەزیر بۆ مـاوەیەکی دوورودرێژ دیـار نەمـا و هـیچ ســەروسۆراخێکی پەیدا نەبوو، خەڵکەکە لە خۆیان دەپرسـی تۆ بڵێی بۆ کوێ چووبێ. وەها مەزندە دەکرا لە لایەن پاشـــاوە لادرابێ، ئیدی بە



خۆی و ماڵباتەکەی چووبنەوە گوندەکەیان و خۆیان لە ژیانی گشـــتیی کێشابێتەوە.
چیرۆکێک لەوناوە بڵاوبووەوە، گوایە وەزیر لە کاتی دانوسـتاندن لەگەڵ ئینگلیزدا ناپاکیی لە وڵات کردووە، بۆیە پاشـــا ســـزای داوە. کەســـانێک هەبوون دەیانگوت، گوایە وەزیر هەموو دەســـەڵاتەکانی بۆ خۆی قۆرخ کردبوو، ئامادەش نەبوو لەگەڵ کەسی دیکەی بەش بکا. هەر بۆیە وایکرد هەموو ئەوانی دیکە لێ بتەکنەوە.
هەنووکەش ئەو بەندوباوە بە کراوەیی بە خەڵک دەگوترا، گوایە وەزیر ئەجێندایەکی دووســـەرەی هەبووە. شـــێخ ئاغاســـی ڕایگەیاند، پاشـــا بەڵگەنـــامەی ئەوتۆی کەوتوونەتە دەســـــت، کە لەگەڵ ئینگلیزەکـــان دانیشـــتووە و گفتی ئەوەی لێ وەرگرتوون، ئەگەر هات و پاشـــای ڕووخاند، ئەوا پشتی بگرن.
نەیارەکانی وەزیر دەیانەویست هەموو کەسێک بهێننە سەر ئەو بڕوایە، گوایە هەر وەزیر بووە کاتی خۆی ئەفغانســـتانی داوەتە بریتانییەکان. ئەوان ئەویان وەک ناپاکێک وێنا دەکرد و پەسنی شایان لەسەر بڕیارە ئازایانەکەی دەدا.
کاتێکیش ورووژاوییەکە دامرکایەوە و بەندوباو کەم بوونەوە، پاشـــا ئاهەنگێکی ساز دا. هەموو شازادە و پیاوە دەستڕۆیشتووەکانی بازاڕ و یەک دوو ئایەتوڵلاشی بانگهێشت کردن.
ســـەبارەت بە وەزیر هیچ قســـەیەک نەکرا. هۆڵەکە هەر جمەی دەهات هەموویـان بۆ ئـاهەنگەکە بـانگکرابوون. لە هـاتنەژوورەوەدا میوانەکـان ســـەری خۆیان دادەنەواند، بەم جۆرە دڵســـۆزیی خۆیان بۆ پاشـــا دەردەبڕی.
جاران پاشـــا کەســـێکی کەم دوو بوو، لێ ئێســـتا پێویســـت بوو چەند قسەیەک بۆ میوانەکان بکا: "خوا ویستی لەسەر ئەوە بوو، ئێوە جارێکی

دیکه بەو شێوەیە لێرە ببینمەوە. ئەم قسەیەی هەر مایەی سەرسوڕمانی خۆیشی بوو، ئاخر کتومت نەیدەزانی مەبەستی چی بوو. لەبەرئەوەی ئەو قسانەی کرد و بێ ئەوەی بشخوازێ فرمێسکی لە چاودا بارین، ئیدی خەڵکەکەش وروژان. هیچ کەسیش پرسیاری نەکرد.

ئەو بە بەردەم مێوانەکانی ڕابورد، مێوانەکانیش بە دوو ڕیز لە بەرانبەر یەک وەستابوون. بە شێوەیەکی ڕێزپەڕانە لەگەڵ بازرگان و دوکاندارەکانی بازاڕ قسەی کرد بە دەستەواژەی تویکڵدارەوە پێیراگەیاندن، گۆڕانکاری بەڕێوەیە و لە بەرژەوەندیی بازاڕیش دایە.

لای ئایەتوڵلاکان ئیستیکی کرد و ئەو دەرفەتەی پێدان چەند ویردێک بخوێنن و لە چاوی بەد بەدوور بن. یەکێکیان بویری ئەوەی تێدابوو قورئانەکەی گیرفانی دەربهێنێ. بەسەر لێوانەوە کورتە سورەتێکی خوێندەوە ئینجا بە هێواشی فووی بەسەر دەموچاوی پاشادا کرد بەڵکو باشتر بپارێزرێ.

بە کورتە ئاماژەیەکی پاشا، سێ نۆکەر پەیدابوون، هەریەکەیان سینییەکی پڕ لە دراوی زێڕینی لەسەر بوو. ئەمەش خۆی خوو بوو لە ئاهەنگەکانی سەری ساڵدا ئەم دراوانە وەک دیاری بەسەر مێواناندا دابەش بکا، ئیدی ئەو بەم ئاماژەیەوە مەبەستی بوو بڵێ ئەم ڕۆژەش وەک ئەوە وایە بەهارێکی نوێ دەستی پێکردبێ.

ئاهەنگەکە پێنج سکەی زێڕی تێچوو بوو، ئەو زێڕانەی لە گەنجینەی ژێرزەمینەکەوە دەرهێنابوو. شێخ ئاغاسایش دراوی نوێی لە سکە دابوون.

زۆرینەی مێوانەکان لە چینی سەرەوەی ناو کۆمەڵگە بوون، ئەوان پێکەنین و بە شاوە سەرسام بوون و دەستیان ماچ کرد و هیوای خۆشبەختییان بۆ خواست.

هەر هەموو شـــازادەكانيش بە جلى ســـەربازيى نوێوە هاتبوون، بە هەموويان دەورەى پاشـايان دا و ئەوەيان بۆ دەرخسـت، گوايە ئامادەن گيانيان لە پێناوى نيشتماندا بەخت بكەن.
شـا بە بێدەنگى گوێى لە هەمووان بوو، خەندەى بۆ كردن. ئاخر دەيزانى ئەوان هـاوئـاخوڕى[67] بريتـانى و ڕوســـەكـان بوون. لە ڕۆژژمێرەكەى ئەوەى تۆمـار كرد: "ئەمـانە تـاقمێكى نـاپـاكن. خۆ ئەگەر دەرفەتيـان بۆ بڕەخســێ، دەستيان دەچێتە خوێنى منيش. ئەوان خواخوايانە كچەكەم و شـــەرمينيش پارچە پارچە بكەن. پێويســـتە ئەوان وا لێبكەين بەر لەوەى بكەونە پيلانگێڕان، بۆ خۆمانيان كێش بكەين."

مێوانەكان چايان لە ئيســـتكانى ئاودامانزێڕ بۆ هات. پاشـــاش كوپێك قاوەى خواردەوە، ئەوە يەكەمين جار بوو ڕاشكاوانە لەنێش خەڵكدا قاوە بخواتەوە. خەڵك ئەم شـــتەى بە ئاماژەى دەســـتپێكى ســـەردەمێكى نوێ بينى. بە تـاســـەيەكى زۆرەوە كوپە قـاوەكەى خۆى لەســـەر خوانچە زێڕينەكە دانايەوە. ئينجا خواحافيزى لە مێوانەكان كرد و بە ڕێى پشـت پەردەكە كشايەوە ژوورە تايبەتييەكەى خۆى.

دواى ئەو، شـــێخ ئاغاســـى ڕۆڵى خانەخوێى بينى. خزمەتكارەكان بە خۆيـان و دەفرى گەورەى پڕ لە شـــيرينەمەنى هـاتنەژوور. مێوانەكـان ئەوەيان بۆ شـێخ ئاغاســى باســكرد چۆن ئەو بەو ئاوەز و حيكمەتەى هەيەتى و لەم ڕۆژە سەخت و تەنگانەيەدا لە پشتى شا وەستاوە. پێشتر هەرگيز پاشـايان وەها دڵخۆش و بەختەوەر نەبينيبوو. شـێخ ئاغاســى گوتى بۆ ماوەيەكى درێژ لەبەر هەرات دڵى شـكابوو، بەڵام ئێســتا ئەو

---

[67] ئاخوڕ: ئەو شـــوێنەى لە تەويلە ئاليكى بۆ ئاژەڵان دادەنرێ. هاوئاخوڕ واتە لەهەمان سەرچاوەى خۆراكەوە سوودمەندن. وەرگێڕ

قۆناغە ڕەشە تێپەڕیوە، سەرلەنوێ کاروباری دەسەڵات و بەڕێوەبردنی وڵات کەوتۆتەوە بن جڵەوی پیرۆزانەی پاشـــاوە. وێڕای ئەوەش، پێی ڕاگەیاندن، شا داوای لێکردووە ئەرکەکانی وەزیر ڕابپەڕێنێ. "زۆر کاری ناڕەوا، بەتایبەتی لە نێو سوپادا هەن. بۆ مایەی خۆشبەختیی پاشا ئەو حیکمەتەی هەیە دەستنیشانیان بکا و ڕاستیان بکاتەوە. هەر بەڕاستیش ئەم خاڵەیان، خاڵی بەهێزی من نییە."

شێخ ئاغاسی بە چاوی فرمێسکتێزاوەوە سوێندی بە خوا خوارد بەهرە و هێزوگوڕی خۆی بخاتە خزمەتی پاشاوە.

لەســەرەتاوە، پاشــا هەوڵیدا مردنی وەزیر لە ئینگلســتان و ڕوســیا بشارێتەوە. باڵوێزی بریتانیا و لە ڕێی چاوی سووسەکارانییەوە و هەر لەهەمان ڕۆژی کوشتنەکەی وەزیردا بە ڕووداوەکەی زانی و لەندەنیشی لێ ئاگادارکردەوە. باڵوێز ڕووداوەکەی بە ڕووداوێکی خەمبارانە و شـــتێکی تەواو چاوەڕواننەکراو دانا. وەزیر پیاوێکی مجێزبەرز بوو، دوژمنی زۆری بۆ خۆی پەیدا کردبوون. ڕاوێژکارە گەنجەکانیشی گیران یان خۆیان شـــاردبووەوە و چاکخوازەکانیش زەبرێکی کوشـــندەیان بەرکەوت.

ئینگلســتان لەبارەی گۆڕینی دەســەڵاتەوە غەمبار نەبوو. ئاخر ئێســتا لەندەن دەتوانێ ڕاستەوخۆ سەروسەودا لەگەڵ شادا بکا.

لە دوای چل ڕۆژ لە کوشـــتنی وەزیر، ئایەتوڵڵاکەی تاران و لە کاتی دوانی ڕۆژی هەینیدا، کورتەهەواڵێکی لەبارەی خانەوادەی پاشـایەتییەوە ڕاگەیاند: "ئێمەی پاشـای ئێران شـێخ ئاغاسـیمان بە وەزیری نوێی وڵات دانا. خوا دەست بەباڵیەوە بگرێ."

پاشا لە هەواڵەکەیدا بە وشەیەکیش باسی مەرگی وەزیری نەکردبوو، هەروەها ئایەتوڵلا لەو بارەیەوە کڕ و بێدەنگ بوو. شێخ ئاغاسی سەبارەت بە تەقوابیەکەی پەسن درا. ئایەتوڵلاش سەرنجێکی وەهای دا، گوایە خوداش بەو بژاردەیە دڵخۆشە.

لەسەر شەقامیش هێشتا هەر چیرۆک و بەندوباو لەبارەی وەزیرەوە دەگوتران.

- "وەزیر هەڵاتووە."
- "ئەو لای باڵوێزخانەی بریتانی لێی پاڵداوەتەوە."
- "وەزیر ویستوویەتی تەختی پاشا سەراوبن بکا و تاجەکە بخاتە سەر سەری خۆی."

ئەو خۆی لەنێو هۆزەکەیدا شاردۆتەوە.

- "ماڵەکەی چۆڵ بووە و ئابڵووقە دراوە. ژن و منداڵەکانیشی هەڵاتوون."
- "وەزیر گیراوە، هەیتەکان بەسەر ماڵیان داداوە و پشکنیویانە و فایلەکانیشیان بردوون."
- "زۆری پێناچێ وەزیر لە مەیدانی گەورەی شارەوە بەدارەوە هەڵدەواسرێ."

چیرۆکەکان گەیشتنە حەرەمسەرا. یەکێک لەوان ئەمەی خوارەوەی وەک ڕاستیی ڕووداوەکە زانرا: "ئاخر وەزیر هاتە نێو کۆشک شەوەکەی هەموو پاسەوانەکان گۆڕدران. ئەوان لە هۆڵی میناب‌ەندەکەدا خنکاندیان. پاشان بەو تاریکییە سوکوئاسان لە گۆڕستانی عەبدولداود چاڵێکیان بۆ هەڵکەند و ناشتیان."

کەس نەیدەزانی دەراوی ئەو هەواڵە کێیە. ئاخر شتەکە لەیەکدانی سێ ڕاستیی بوو، لە لایەن سێ شاهیدی جیاوازەوە گێڕدرابووەوە.



شـــاهیدەکانیش یەک لەدوای یەک، گۆڕهەڵکەن، پاککەرەوە و مەیتەرەکە بوون. چونکە ویژدانی ئەوان بووە بەلا بۆیـان، بۆیە ئەوەی بینیبوویـان گێڕایانەوە.

شـــەویکیان گۆڕهەڵکەنەکە کە لەپاڵ ژنەکەی درێژ بووبوو، پێی گوت: "دەمەوێ شـــتێکت پێبڵێم، بەلام هەر بەینی خۆمان بێ، نابێ کەس پێی بزانێ. ئـایـا دەزانی شـــەوێکیـان دەبوواپە بچم گۆڕێک هەڵبکەنم. هەر هێندەم زانی کاتێک گالیسکەیەک بە دوو سـوارەوە تەرمێکیان لە پەتۆی ڕەشـەوە و لوولدابوو. منیش دەسـتم دایە چرا و چوومە نێو گۆڕەکە بۆ باراســتن و بەرەوقیبلەکردنی ســەری مردوو. ویســتم پەتۆی ســەر تەرمەکە لابەرم، بەلام یەکێ لە پیاوەکان چراکەی لە دەســـت دەرهێنام یەخەمی گرت و لە نێو چاڵەکە دەریهێنام. ئینجا خۆڵیان بەسـەر تەرمەکە داکرد و گۆڕەکەیان پڕکردەوە. کاتێکیش لە ئیشـــەکە بوونەوە، ڕۆناکی داهات. لە زەردەی بەیاندا بینیم گالیســـکەکە لە کۆشـــکەوە هاتبوو. مردووەکەش هەر هی ئەوێ بوو."
ژنەش لە لای خۆیەوە چیرۆکی مێردە گۆڕهەڵکەنەکەی بۆ خزمەتکارێکی کۆنی حەمــام گێڕایەوە، ئیـدی چیرۆکەکە لە حەمــامەوە گەیشـــتە حەرەمسەرا.

دوای مـردنـی وەزیـر بە هەفتەیەک، ئەو خزمەتکـارەی کۆشـــکی خــاوێنــدەکردەوە، کلاوێکی قووچی دڕاوی لە هۆلی مینـابەنـدەکەدا دیتبووەوە. کلاوەکە لە پەنجەرەکە، لەپشـت پەردەکە لە سـەر ناوکەوەکە کەوتبوو. بە نەخشـــە ئـاودامـانی کلاوەکە زانی هی وەزیر بووە. کـاتێ هەڵیگرتەوە دەســـتەکانی دەلەرزین، لێ نەیوێرا ئەوەی بینی لای کەس بگێڕێتەوە. ئینجـا کلاوەکەی لەژێر جلەکـانی شـــاردەوە بە ترســـەوە

هێنایەوە ماڵی. لە ماڵی دەستێکی پێداهێنا و لەنێو پەڕۆیەکی ڕەش و لە ژێر زەمینە تاریکەکەدا شاردییەوە. سێ هەفتەی ڕەبەق قولماتی لە زار نەهاتەدەر، بەڵام ئەو هەموو ماوەیە لە ناخییەوە شتێک پاڵی پێوەدەنا تا بۆ کەسێکی باس بکا. شەوێکیان خەوی لێ نەدەکەوت، بۆیە چووە لای دایکە پیرەکەی، سەری خستە کۆشی و بە گریانەوە گوتی: "من کڵاوێکم لە ماڵێیە. کڵاوە دڕاوەکەی وەزیرم لە هۆڵی مینابەندەکە دۆزیوەتەوە. لەپشت پەردە لەسەر زەوی کەوتبوو، بەڵام نەخشەکەی دەدرەوشایەوە." هەرچەندە چیرۆکەکەی تەنها بۆ دایکی گێڕابووەوە، لێ هەر چۆنێک بێ شتەکە بەر گوێی ژنەکانی شا کەوتەوە.

ژنەکان هێشتا پێویستیان بە ڕاستییەکی دیکە هەبوو تا کرۆکی بابەتەکەیان بۆ دەربکەوێ.

مەیتەری کۆشک نەیدەتوانی لەوە زیاتر دەمی دابخا و هیچ نەڵێ. شەوێکیان متمانەی بە کچەکەی کرد و بۆی گێڕایەوە: "ئەسپەکەی وەزیر ماوەیەکی زۆرە لە تەویلەکە ڕاگیراوە. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ، وەزیر ئەو شەوە بە سواری ئەسپەکەی خۆی هاتە کۆشک، بەڵام بە هەمان ئەسپ لێی نەچووە دەرێ. ناوێرم باسی ئەو یەکسمە لای کەس بکەم، من لە تەویلەکەدا بەستوومەتەوە. ئەسپەکەش حەجمانی نەماوە، هێشتاش هەر ناتوانم بیهێنمەدەر. تۆ نابێ ئەم ڕازە لای کەس بدرکێنی."

ئەم هەواڵەش گەیشتەوە حەرەمسەرا.

ئیدی ژنانی پاشا هەر سێ ڕاستییەکانیان لەپاڵ یەک ڕیزکرد: "وەزیر لە هۆڵی مینابەندەکەدا کوژراوە."

بۆ شەوی پاشتر ژنانی شا ڕەشیان پۆشی و لەسەر قەپەنگی حەرەمسەرا لەگەڵ لەیەک کۆبوونەوە. قلیانی خۆیان دەکێشا و چایان

دەخواردەوە. لەبەردەمیشیان وەک نیشانەی پرسە، سینی پڕ لە خورمای ڕەش داندرابوو. نیگایان خەمبارانە بوو، بەڵام کەسیان نەگریا و کەسیشیان لەبارەی وەزیرەوە نەدوا. بێدەنگییەک وەک بەردی کەڕە باڵکێش بوو.

## ٣٩

# مەلیچک

پێدەچوو وڵات بێ جووڵە بێ، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست بوو. ناکۆکەکان گوتیـان بە مردنی وەزیر و گیرانی لایەنگرەکـانی وڵاتی لە بەدبەختی پاراســت، لێ ئەوان هیچ بیرۆکەیەکیان لەبارەی ئەوە نەبوو ئاخۆ مردنی وەزیر دەرووی چ بەڵایەکی بەســەردا کردوونەتەوە. پێلێکی بەرگریی بە هێواشی بەسەرتاسەری وڵاتدا بڵاودەبووەوە.

هاوزەمانی ئەو ڕووداوانەش، شەرمین دیار نەما. پاشا هەموو شوێنێکی بەدوا گەڕا، لێ وەک ئەوەی ئاسمان هەڵیکێشـابێ یان زەوی قوتی دابێ، نەدۆزرایەوە. ئەو گومانی لە ژنەکانی هەبوو، پشـــیلەکەیان دزی بێ تا تۆڵەی مردنی وەزیری پێ بکەنەوە. هەر بۆیە داوای لە بەرپرســـی حەرەمسـەرا کرد هەموو ژوورەکان، یەک لەدوای یەک بپشـکنێ. لێ هیچ سۆراغێک لە شەرمینەوە نەبوو.

کێ نالێ شــەرمین خۆی کۆشــکەکەی جێنەهێشــتووە؟ تۆ بڵێی چیدی هەســـتی بە ئارامی نەکردبێ؟ تۆ بڵێی لە ژنەکانی حەرەم یان لە خودی پاشا نەترسابێ؟ لەوانەشە شەرمین ڕەگەڵ پشیلە بەرەڵاکان کەوتبێ؟
شـا هەستی کرد چیدی پشیلەکەی ناگەڕێتەوە. ئەمەش ئازاری دا، بەڵام خۆ هیچیشی پێنەدەکرا.

چەند مانگێک بەســەر کوشــتنی وەزیردا تێپەڕی. زۆر جاران شــا بیری لێدەکردەوە، بەڵام خۆی بە هۆنراوەکانی خەریک کردبوو، تا مێشــکی خۆی ســاف بکاتەوە و پێی ژێر بپێتەوە. ئەوەشــی بۆ نەچووەســەر، دوا هۆنراوەشی هەر لەبارەی وەزیرەوە بوو:
*کوتکێک هەڵگرە، دیوارەکە بشکێنە*
*لەم زیندانە ڕاکە*
*هەڵێ و خۆت بدەرە دەستی هەتاو*
*وەک ئەوانەی ڕۆیشتن*
*ئەوانی هەرگیز نەگەڕانەوە.*
ویڕای هەموو شتێک، داخ و کەسەر بۆ ڕزگار بوون لە وەزیر تا دەهات زیاتر و زیاتر دەبوو. بۆ کەس نەبوو پرســە بۆ ونبوونی دابنێ، لێ پاشـا بە بێدەنگی پرســەی بۆ دانا. دڵی خۆشــی بەوە دایەوە، گوایە پاشــاکانی پێش خۆشــی کردەوەی هاوشــێوەیان کردووە. خۆ پێویســت بوو یەکێک یەکێتیی وڵاتەکە بپـارێزێ. هەنووکە وەزیر نەمـاوە، ئیـدی خۆی دەبێ کاروباری وڵات بگرێتەدەست، دەسەڵاتەکەی نمایش بکا.
داوای لە شێخ ئاغاسی کرد گەشتێکی بۆ شاری سوڵتانئاباد بۆ ڕێکبخا. ڕێگەی ســـوڵتانئابادیش بە شـــارە پیرۆزەکەی قومدا تێدەپەڕی، ئەو شـــارەی مەزارگەی مەعســـومەی پیرۆز، نەوەی پێغەمبەری لێیە. گومبەزەکەی ئەو یەکێکە لە شوێنە دینییە هەرە گرنگەکانی وڵات.

شێخ ئاغاسیش ڕاوێژی بە شا دا یەک دوو ڕۆژ لە قوم بمێنێتەوە و سەردانی مەزارە پیرۆزەکەش بکا. بەم جۆرە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ گەورە ئاخوندەکانی وڵات پتەو دەکا.
گەشتەکەش دوو هەفتەی دەخایاند، لەو ماوەیەدا پاشا و ژنەکانی لە ماڵی بازرگانە دەوڵەمەندەکانی شار دەمانەوە.
قوم شارێکی پیرۆزی گەرم بوو، لە لێواری بیابانەکە هەڵکەوتووە. بە شێوەیەکی تایبەت لە ئاخوند و خزمەکانیان پێکهاتبوو. ئەوەی ڕاستی بێ ئایەتوڵلا گرنگەکان لە قوم دەژیان. پێگەی ئایەتوڵلاش گەورەتر بوو لە ئاخوند و ئەوانەی پێشنوێژیان دەکرد. هەر کەسێک بگاتە ئەم پایە دینییە دەبووایە تەمەنێکی زۆری تێپەڕاندبا. ئایەتوڵلاکان دەستڕۆیشتوو بوون، ئەوان هەزاران لایەنگریان هەبوو. بە شێوەیەکی سادە لەنێو خەڵکدا دەژیان. خەڵکەکەش گوێیان لێدەگرتن. ئەوان لە ژیانێکی سادە دەژیان. مزگەوتیش مەکۆی دەسەڵاتەکەیان بوو. لە ڕێی سەدان ئیمامی پێشنوێژخوێنەوە کە بەسەرتاسەری وڵات بڵاوبووبوونەوە، دەیانزانی چی لەنێو خەڵکەکەدا دەگوزەرێ. پاشاش لای خۆیەوە ڕقی لەو شارە دەبووەوە، بەڵام مایەی لێتێگەیشتن بوو، لەگەڵ ئایەتوڵلاکاندا ڕەفتاری باش بێ.
پاشا لە قوم کاتەکەی خۆی لە قەڵایەکی پەڕگەی شارەکە، لە شوێنێکی ناوازە لەنێوان دارخورما پیرەکاندا بەسەر دەبرد، بە ڕۆژ زۆر گەرم بوو لێ بە شەو هەوایەکی فێنک و خۆشی هەبوو. شا حەزی لێنەبوو سەردانی گومبەزە پیرۆزەکە بکا، بەڵام پێویست بوو نیشانی ئایەتوڵلاکان بدا، ئەو ئەوکەسەیە، بە توندی جڵەوی وڵاتەکەی لەدەستە.

بە یاوەریی دەستەیەک لە ناودارانی شار، نەخاسمە ئاخوندەکان، سەری لە گومبەزە پیرۆزەکەی مەعسومەی دا و وەک باو بوو شیشەی قەفەزە زێرینەکەی ماچ کرد.
بەدوای ئەویشدا سەری لە مەدرەسە دا، ئەو مەدرەسەیەی ئیمامەکانی پێدەگەیاند، پاشان گەڕایەوە قەڵاکە تا چیدی کەسە پیرۆز و مێزەربەسەر و ڕیشدارەکان نەبینێ.
بۆ سپێدەی ڕۆژی پاشتر درێژەی بە گەشتەکەی بۆ سولتانئاباد دا. دەڤەری فەراهانیش کە لە سەد دووسەد گوندێک پێکهاتبوو، شوێنێکی زۆر گرنگ بوو. ئاخر ئەوێ زێدی وەزیر بوو. بۆ ماوەیە چەندین سەدە ڕەچەڵەکیماڵباتی وەزیری تێدا نیشتەجێ بووبوو. دانیشتوانی ئەم دەڤەرە شانازییان بە خانەوادەکانیان بەتایبەتیش بە خانەوادەی وەزیری کوژراوەوە دەکرد.
کاتێک شا بۆ ڕۆژی پاشتر و لەسەروبەندی گەیشتنە ناو شارەکە، هەموو ئەو پیاوانەی لەسەر ڕێگەی خۆی بینین، لە وەزیر دەچوون. لەوانەیە لەمەدا سەرچیغ چووبێ، بەڵام ئەو پیاوانە هەمان کڵاوی وەزیریان لەسەر بوو، هەمان شێوەی ڕدێنی قەڵەمکراویشیان هەبوو. فرمێسک لە چاوی پاشا هاتنەخوار.
شا ویستی بچێتە بازارە کۆنەکەی شار. پێشتر وەزیر حەزی لە پێڵاو بوو، بەتایبەتی پێڵاوە چەرم ئەستوورەکان، هەر جارێک بە گەشت و کاروان دەرچووبا، بە جووتێک پێڵاوی نوێوە دەگەڕایەوە. پاشاش بە تەوسەوە پەلاری خۆی تێگرتبوو: "دەبینم کاتی ئەوەت هەبووە جووتێک چەکمە بۆ خۆت بکڕی."
وەزیر وەڵامیدایەوە: "ئەوەی من کڕیم هەرگیز ناگاتە ئەو خۆشییەی کاتی خۆی باوکم بۆ یەکەمین جار جووتێک چەکمەی لە بازاڕی سولتانئاباد بۆ کڕیم."

هەمووان بەو سەردانەی پاشا سەرسام بوون. دوکاندارەکان نەیاندەزانی چن هەڵسوکەوت بکەن، چونکە ڕۆڵی شایان لە بێ سەروشوێنکردنی وەزیر بیستبوو.
سەردەستەی پاسەوانەکان هاواری کرد: "*جاوید شاها* بژی پاشا!"
پاسەوانەکانیش بە دوایدا گوتیانەوە: "*جاوید شاها* بژی پاشا!
پاشا لای بەهارات و دەرمانفرۆشەکان وەستا و بۆنی گیاکانی کرد، لای مافوورفرۆشێکیش بە ئاماژەکردنێکەوە پرسی: ""ئەم مافوورە لە کوێ چنراوە؟"
بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکات، لەسەر ڕێڕۆیشتنەکەی خۆی بەردەوام بوو، بەلای چەند دوکانی زێڕ و تەڵافرۆشدا ڕەت بوو و ئینجا لێ وەژوور دوکانی پێڵاوفرۆشێک کەوت. دەستی بۆ پێڵاوێکی قاوەیی کاڵ برد، بۆنی پێستەکەی کرد و پاشان لە شوێنی خۆی دانایەوە. دوای دەستلێدان و پشکنینی چەند جووت چەکمەیەکی دیکە، لە دوکانەکە چووەدەر و پاشان لە لاڕێوە بازاڕەکەی جێهێشت. پاسەوانەکانیش بۆ ساتێک لەبەرچاویان ون نەدەبوو.

شا ویستی سەری کارخانە گەورەکەی مافوورچنین بدا، ئەوەی لە پشتەوەی بازاڕەکە هەڵکەوتبوو. پلانێکی گەورەی وەزیر ئەوەبوو، هانی فرۆشتنی مافووری ئێرانی بدا بۆ دەرەوەی وڵات. هەر بۆیە پرۆژەی دروستکردنی کارگەی مافوورچنین لە شارەکان دابمەزرێنێ. وەک نموونەیەکی پرۆژەکەش، کارخانەکەی سوڵتانئابادی دامەزراندبوو.
بۆ مایەی سەرسامی و خۆشحاڵیی مافوورچنان، پاشا بە یاوەریی دەستەی پاسەوانەکانی سەردانی کارخانەکەیان بکا. پاشا بەجۆش و وروژاو بوو. ئەو ئێستا خۆی لە نێو یەکێ لە خەونەکانی وەزیردا بینیەوە. ئاخر ئەم جۆرە کارخانانە لە ئێرانێ نەناسراو بوون.

دەروازەیەکی نوێ سەریدەکێشا بۆ حەوشەی باخێکی نەریتانەی پڕ لە گۆم و ئەستێلک، هەرچی دەوروبەریشی بوو شوێنی کاری کرێکاران بوو، سەرقاڵی ڕستن و چنینی مافوورەکانیان بوون.

شا لەبەردەم یەکێ لەو شوێنانەی کارکردن وەستا. بە چاوێکی تەواو کراوە لێی ڕوانی. لە بن هەیوانی کارخانەکەدا سەدان کیژ و ژنی گەنج لەپاڵ یەک دانیشتبوون، بەسەرپەرشتیی وەستایان خەریکی مافوورچنین بوون. تا ئەو کات، مافورەکان هەر لە گوندەکان و ژنان لە ماڵەکانی خۆیاندا دەیانچنین، ئاخر بە بیری کەسدا نەهاتبووە ئەو هەموو کچ و ژنانە لە شوێنێک کۆبکاتەوە و کاری مافوورچنینیان پێبکا. پاشا مەیلی لێبوو دەستی بۆ بەرکی بباتەوە و دراوی زێڕینیان بۆ فڕێ بدا، بەڵام سەرنجی دا ئەم خووەی بۆ ئێرە دەست نادا.

ژنانی کارمەند نەیاندەزانی ئەو پیاوە پاشایە، بەڵام پەیدابوونی کەسێکی لایەدە شتێکی ئاسایی نەبوو. ئیدی هەردەبێ پیاوێکی گرنگ بێ و لێکەوتەشی بەدواوە بێ. لەپڕێکدا ناوەکەی چرپێنرا. ئیدی بێدەنگیی باڵی بەسەردا کێشان، ژنان نەیانوێرا سەریش بەرز بکەنەوە تا تەماشای بکەن. ئەوان لە شوێنی خۆیان مانەوە، هەر سەیری مافووری بەردەمی خۆیانیان دەکرد. شا بەلای مافوورە تەواونەکراوەکاندا ڕۆیشت و نیگایەکی لە ژنەکان بڕی. هەستیکرد دەماری ملی گرژ بوون، چاوەکانی زوورانەوە. لەپڕ وەسووڕا و لەوێ هاتەدەر.

بۆ ڕۆژی پاشتر، بڕیاریدا لەگەڵ پاسەوانەکانی بۆ ڕاوی کەڵەکێوی بچێتە چیا. کێوەکانی فەراهان ژینگەی کەڵەکێوییە بەهێزەکان بوو، بە ئاسانییش ڕاونەدەکران. ئەوان هەمان ڕەنگی تاوێرەبەردەکانیان هەبوو، هەر کاتێک دەنگێکی نامۆ شیان ببیستبا خۆیان لەپەنا بەردەکاندا حەشار دەدا.

دوای ئەوەی نیوەی ڕۆژەکە بەسەر کێوی مەزداراندا هەڵگەڕان، تووشی هیچ نێرییە کێوییەک نەبوون. پێدەچوو ڕاوکردنی چەند کەوێک دوو قازی کێوی قنیاتیان بشکێنێ. شا بەخۆی نیشانئەنگێوێکی باش بوو. ئەو تەقەی لە یەک دوو کەو کرد و خستنیە خوار، ئەمە وایکرد مرخ لە هەڵکشانی زیاتر خۆش بکا تا دەگاتە سەر دوندی کێوەکە. دوای ڕاوکردنی حەوت کەو و نۆ قازی کێوی، کرمی دڵی دامرکا و گەڕایەوە تا چێژ لە کەبابی گۆشتی تازەڕاوکراو وەرگرێ.

لە گەڕانەوەیاندا چاویان بە کەڵەکێوییەکی تەنیا و دابڕاو کەوت. پاشا ئاماژەی بۆ پاسەوانەکانی کرد لە شوێنی خۆیان بچەقن و هیچ نەجووڵێن. بە دووربینەکەی چاوی لەسەر ئاژەڵەکە نەتروکاند. ئینجا بە ئەسپایی دەستی بۆ تفەنگێکی سوارکراو برد. لەکاتێکدا نێرییەکە بە گوێی قولاغەوە بە ئاراستەی ڕاوچییەکەی دەڕوانی، پاشا پلی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی گیر کرد. نێرییەکە سڵەمییەوە، تەنانەت هاوسەنگی خۆیشی لەدەست دا، وەک ئەوەی پێکرا بێ. لێ ئاژەڵەکە تەردەستانە خۆی ڕاستکردەوە وەرسووڕا و بە بازی گەورەوە هەڵات. پاشا دوو فیشەکی دیکەشی گرتە کەڵەکە، ئینجا درێژەی بە لێگەڕانەکە دا. ئاژەڵەکە ئاراستەی خۆی گۆڕی و بەرەو دارستانەکە تێتەقاند، لەبەر حوکمی چاوان ونبوو.

شا بە گورگەلۆقە خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی نێرییەکە ئاودیو بووبوو، ڕاوکەرەکانی دیکە هێشتا گوێیان لە دوا تەقە بوو. شا بە سواری یەکسمەکەی پێینەدەکرا زیاتر بڕوا، لەسەر پشتی ئەسپەکەی دابەزی لغاوبەدەستەوە بەنێو دارەکاندا غاری دەدا. نێرییەکە لەپێش شاوە بە مەودایەکی کەم وەستا و ئاوڕێکی لە شا دایەوە ئاخۆ هەر بەدواوەیەتی یان نا. پاشا بە ئۆقرەلەبەرهەڵگیران دیسان تەقەی لێکردەوە، دیسان نەیپێکا. خۆ نەشدەکرا لە بەرانبەر نێرییەکەدا ببەزێ. خۆی هەڵدایەوە

سەر پشتی ئەسپەکەی و بەرەو ئەو تاوێرە بەردە تاویدا، کە وای دەزانی نێرییەکەی لە پشـــتە. بە ئارەقە و هەناســـەبڕکێوە گەیشـــتە قەدپاڵی شاخەکە، کەچی شوێنەواری نێرییەکە نەما.
شـــا بڕوای بە شــتە خورافییەکان هەبوو، دڵنیابوو لەوەی لەخۆڕا نەبوو کەڵەکە هاتبووە ســـەر ڕێی. ئاخر ئەو پێنج جار تەقەی لێکرد، ئەمەش زۆر بە دەگمەن دەقەوما. لە حەکایەتە کۆنەکانی ئێرانییدا، مامز و ئاسک و کەڵەکێوی ڕێنوێنی پاشـــاکان بوونە بۆ ســـەرچڵییەکی ڕازدار، ئەم نێریەش ئامانجێکی باڵای هەبووە.
لەبەر ئەوەی ئارەقەی کردبوو، دەیەویست لە جووڵە نەکەوێ. تێنوێتییشی هاتەسەر، لەدوورەوە گوندێکی هاتە بەر حوکمی چاوان. کاتێکیش بەرەو دارەکان لێیخوڕی، لەپشـــت دەوەنە دارەکاندا گوێی لە گریانی منداڵێک بوو. وەســـتا تا ســـەیرێکی بکا. منداڵێکی بچکۆلەی پیس و دڕۆنی تەمەن حەوت ساڵە، بە پێی پەتی لەنێو دەوەنەدارێکدا وەستابوو.
"تۆ کێی؟ بۆ دەگری؟"
منداڵەکە بە جلە شـــڕەکەی باش نەدەهاتە پێشـــچاو. چاوەکانی بە شـــێوازێکی ســـەیر زۆر لەیەک نزیک بوون، گوێچکەکانیشـــی لە باری ئاســـایی گەورەتر دیار بوون، بە هەردوو دەســـتیشـــی مەلێکی توند بە سینگییەوە گرتبوو.
شـــا خەندەیەکی بۆکرد و لە ئەســـپەکەی دابەزی. منداڵەکەش لە گریان وەستا و بەو چاوە عەنتیکانەی تەماشای پاشای کرد.
"لێرە چی دەکەی؟ لە ماڵەکەی ئەوێ دەژی؟" پاشـــا بەدەم ئەم پرســـیارە ئاماژەی بە کۆلێتێکی قوڕینی ســـادەوســـاکاری کرد هەندێک لە خۆی دوورتر کرد.
منداڵەکە هیچ وەڵامی نەدایەوە.
"ئەدی ناوت چییە؟"

دیسان منداڵەکە بێ وەڵام بوو. تۆ بڵێی لە زمانی پاشا نەگەیشتبێ، یان کەڕە بوو؟

"تۆ باڵندەیەکی جوانیشت هەیە، ئەرێ ناوی چییە؟"

منداڵەکە هاتە وەڵام: "مەلیچک."

"ئەوە چیت گوت؟"

جارێکی دیکەش گوتیەوە: "مەلیچک."

پاشا بە دەنگ پێکەنی، چونکە منداڵەکە وشەی پاساری "مەلیچ" بچووک کردۆتەوە و کردویەتییە "مەلیچک".

"پەکوو، چەند گرنگە، ئەوە تۆ وشەیەکی خۆشی نوێت داهێناوە، لەمەوپاش دەبێ لە هۆنراوەکانماندا بەکاریبهێنین. مەلیچک ، جوانە، زۆر باشە بۆ تۆ."

پاشا کلۆ شەکرێکی لە بەرکی شلوارەکەی دەرهێنا و خستیە دەمی منداڵەکە. بە جوینی کلۆشەکرەکە، تامی شیرنایەتی کرد و دەستی پاشای گرت. ئەم دەستگرتنە پاشای وروژاند، هەستێکی متمانەبەخشی پێدا و بە نەرمی دەستی بەسەر سەریدا هێنا. منداڵەکەش سەری بە لاقەکانی پاشاوە نووساند، وەک هەمیشە شەرمینیش دەیکرد.

شا پێی گوت: "تۆ منداڵێکی خۆشەویستی، ها بینا تاریکی داهات، تۆ دەبێ بگەڕێیتەوە ماڵێ و ئێمەش بە ڕێگەی خۆماندا بڕۆین."

کاتێک پاشا گەڕایەوە لای ئەسپەکەی، منداڵەکەش بەدوایدا هات. "نەخێر ، مەلیچک. وامەکە، بگەڕێوە، بڕۆ ماڵی خۆت."

بەڵام منداڵەکە گوتی: "مەلیچک، مەلیچک، مەلیچک!"

شا بە خەنەدوە سەیری کرد. "ئێمە تۆمان پێ جوانە، دەی وەرە با بتبەمەوە ماڵێ." بەدەم ئەم قسەیەوە پەلی کوڕەکەی گرت و بەرزی کردەوە و لە پشت خۆی لەسەر زینی ئەسپەکەی سوار کرد.

لەو کاتەدا دەنگی کچێک هات و بانگی کرد: "دەی براکەم بدەرەوە!"

تەڕاشەکە جوولایەوە و کیژۆڵەیەک بەخۆی دوو چاوی ڕەشی گەورەوە و پرچێکی ئاڵۆزوبڵۆزەوە دەرکەوت. پاشـــا هەنگاوێک بۆ لای ڕۆیشـــت، بەڵام کچەکە وەرسووڕا و ڕایکرد.

"هۆ کیژۆڵە! وەرە، براکەت بەرەوە!"

فیسـتانە کەسـکە سـوورگوڵییە درێژەکەی، بە پێخواسـی لەنێو گیاوگوڵ، ترس لە چاوەکانی و دەنگە نەترسـەکەی سـەرنجی پاشـایان بۆ خۆی ڕاکێشـا. لای کۆڵیتە قوڕینەکەدا کوڕیژگەکەی دابەزاند و پێیگوت: "دەی برۆ ژووری و بە خوشـکەکەت بڵێ بادیە[٦٨]ئاوێکمان بۆ بێنێ." بەڵام کوڕیژگەکە لەجێی خۆی چەقی، هیچ خۆی لە گوورە نەبرد.

پاشـا لێبڕاوانە سـواری ئەسـپەکەی بووەوە. تا ئەوکاتیش دەسـتەی نێچیروانە یاوەرەکانی شـوێنپێیان هەڵگرتبوو گەیشـتنە لای. منداڵەکە جارێکی دی، دایەوە پرمەی گریانێ. پیرەپیاوێک لەماڵەکە هاتەدەر. لەبەر ئەوەی سـوارەکانی لە دوورڕا بینیبوون، مەزندەی کردبوو پیاوێکی گرنگیان لەگەڵدابێ. خاکەڕاییانە بۆ پاشـا نوشـتایەوە و پەلی منداڵەکەی گرت و لەوێ لایبرد.

کیژۆڵەکەش بادیە ئاوێکی بۆ پاشـا هێنا. ئاوەکەی لێوەرگرت و بە گومانەوە تەماشـای بادییەکەی کرد. "ئەوە چییە، ئەو ئاوە بۆ ئەوەندە پیسە؟"

"ئەوە پیسی نییە، چەوەندەری شەکرم تێدا شکاندووە."

"بۆچی چەوەندەرەکەت لێ نەپارزنیوە؟[٦٩]"

"ئاخر تۆ ئارەقەت کردووە و ئاوەکەش سـاردە، زۆریش تینووی، خۆ ئەگەر بادیە ئاوەکە بەیەک قوم بخۆیتەوە، نەخۆش دەکەوی. پێویستە بە هێواشی بیخۆیتەوە."

---

[٦٨] بادی: دەفری مسین بۆ ئاوخواردنەوە بەکاردێ.

[٦٩] پارزنین: پالاوتن

شا ئاوه شـیرینه‌که‌ی خوارده‌وه، چاویشـی هه‌ر له‌سـه‌ر کیژۆڵه‌که بوو.
پاشان دراوێکی زێڕینی خسته ناو بادیه‌که و زرنگه‌ی هات
"ئێمه ده‌ڕۆین!" وه‌های گوت و ئاوزینگی له ئه‌سـپه‌که‌ی دا و وه‌جووڵه
که‌وت. کوڕیژگه‌که له کۆڵێته‌که هـاته‌ده‌ر و به قیژه‌وهـاواره‌وه به‌دوای
که‌وت. شـا وه‌سـتا، منداڵه‌که‌ش توند خۆی به چه‌کمه‌یه‌وه نووسـاند.
که‌مێـک بیری کرده‌وه، خۆ ئه‌و له‌و فه‌راهـانه، له ده‌ڤه‌ری وه‌زیر.
که‌ڵه‌کێوییه‌ک ئه‌وی گه‌یاندۆته ئێره، لای ئه‌و کۆڵێته قوڕینه. ئه‌مه هه‌موو
واتای خۆی هه‌بوو. ئه‌و ئاماژه‌ی بۆ یه‌کێ له پاسـه‌وانه‌کانی ته‌نیشـت
خۆی کرد تـا لێی نزیـک ببێته‌وه. "ئێمه ئه‌و کوڕیژگه له‌گه‌ڵ خۆمـان
ده‌به‌ین. هه‌روه‌ها کیژۆڵه‌که‌ش."
پاسـه‌وانه‌که گه‌ڕایه‌وه لای کۆڵێته‌که، لێ چووه ژوور، قسـه‌ی له‌گه‌ڵ
جوتیاره‌که کرد، کیسـه‌یه‌ک دراوی له مسـت نا و مۆڵه‌تی لێوه‌رگرت و
کیژ و کوڕه‌که له‌گه‌ڵ خۆیان ببه‌نه کۆشـک. کابرای جوتیاریش به نه‌رمی
ژنه‌که‌ی خۆی دواند، ئه‌ویش به سـه‌رسـامییه‌وه سـه‌یری پاشـای کرد و
سـه‌ری بۆ دانه‌واند. دایباب چوونه لای کیژه‌که‌یان، قسـه‌یان له‌گه‌ڵ کرد،
نێوچاوانیان ڕاموسـی. هێسـتریان له ته‌ویله ده‌رهێنا، کیژ و کوڕیژگه‌یان
لێ سوارکرد و له‌گه‌ڵ شادا ڕۆیشتن.
له‌پاش پێنج ڕۆژان، که گه‌ڕانه‌وه کۆشـک، پاشـا کیژه‌که‌ی نـارده
حه‌ره‌مسـه‌را. ناوی له کوڕه‌که نا مه‌لیچک. فه‌رمانی به په‌رده‌دار کرد
کوڕیژگه‌که باش باش بشۆن.
ئیدی کوڕه‌که جێگه‌ی به‌تاڵی شه‌رمینی گرته‌وه و ناویشی بووه مه‌لیچک.

## ٤٠

# تێلێگراف

مەلیچک بووە خۆشەویستی شا. خوشکەکەی چاوی لە کوڕیژگەکە بوو، ژوورێکی تایبەت بەخۆیان لای خزمەتکارەکان پێدرا. بۆ مەلیچک هەبوو لە کاتی نانخواردنی پاشا بمێنیتەوە و لەسەر زەوی دابنیشێ، ڕێک لەو شوێنەی جاران شەرمینی لێ هەڵدەتروشکا. ژنەکان سەرەتا زگیان بە مەلیچک دەسووتا و لەگەڵی میهرەبان بوون، کەچی ساڵ بەساڵ لەگەڵ گەورەبوونی منداڵەکە، هەراسانتر و بێزراوتر دەبوو، ئاخر لەمنداڵەکانی دیکەی دەدا و ژنەکانیشی بێزار دەکردن. کەسیش نەیدەوێرا پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە. مەلیچک لە لایەن شاوە ڕێگەی هەموو شتێکی پێدرابوو، ئاخر ئەو دڵی بە کوڕیژگەکە دەکرایەوە.

مەلیچک زۆر باشی دەخوارد، خواردنی زۆر نایابیشی دەخوارد، بۆیە هەر زوو هەڵیدا[٧٠] قەڵەو بوو، کێشیشی قورس بوو. ئەو منداڵە نەما، کاتی خۆی لەتاو کەمخۆراکییەوە دەینالاند. خزمەتکارەکانیش لەسەر

---

[٧٠] زوو هەڵیدا: زوو گەورە بوو.

ڕێی نەدەوەســـتان. هەر کاتێکیش بە شـــێوەیەکی چاوەڕواننەکرا و لەبەردەم ژنانی حەرەمسەرادا قیت ببایەوە، هەر زوو کڵۆ شەکرێکیان لە دەمی دەپەستا. کوڕیژگەکە کتومت هاوشـێوەی پاشـا جلی لەبەردەکرد، هەمان چاکەت، هەمان پێڵاو و هەمان کڵاویش. شـەوانیش هەر لای شـا دەمایەوە تا ئەوکاتەی خەوی دەهات.

هەر زووش چیرۆک لەبـارەی مەلیچـک بەســـەرتـاســـەری وڵاتـدا بڵاوبوونەوە. تۆ نەتدەزانی کامەیان ڕاسـتە و کامەشـیان هەڵبەسـتراوە. دەگوترا مەلیچک بۆ دایک و باوکی دەگریا، غەریبی کردبوون، ئیدی پاشا سواری سەر پشتی خۆی دەکرد، هەروەک چۆن گوێدرێژ لەسەر دەست و قاچی دەڕوا، وەهای دەکرد و لە هۆڵی مینابەندەکەدا دەسووڕایەوە.

هیچ کەسـێک پاشـای بە بێ کڵاوە قووچەکەی نەبینیبوو، لێ دەگوترا بۆ مەلیچک هەبوو کڵاوەکەی پاشـــا دابگرێ و یاری پێبکا. هەمیشـــەش منداڵەکە پیس و پۆخل و بۆگەن بوو. ئەو لە ئاوێ دەترسـا و لێنەدەگەڕا بیشۆن.

پاشا بەخۆی لەنێو تەشتێکی گەورەدا دەیشوشت. بە مقەس سەری بۆ چاک دەکرد، چونکە مەلیچک لێندەگەڕا تەنانەت خوشکەکەشی دەست بۆ پرچی بەرێ.

خەڵک دەیگوت پاشـا لێنەدەگەڕا مەلیچک فێرە خوێندنەوە و وێنەکێشـان بێ. ئاخر ئەمە پێویسـت نەبوو، چونکە ئەو کوڕیژگەکەی وەک ئاژەڵێکی ماڵی و دەستەمۆ دەبینی. تاکە شت پاشا فێری کردبێ شەترەنج بوو، بۆ ئەوەی پێگای[71] خۆی بدۆزێتەوە تا یاری لەگەڵ بکا و خۆشی لێببینێ.

ئەو یارییشی لەگەڵ شێخ ئاغاسی دەکرد. هەر زوو پاشا ئەوەی پێخۆش بوو، کە گاڵتەی بە ئاغاسی دەکرد. هەر جارێک شـێخ ئاغاسـی لە پاشـا

---

[71] پێگا: هاوکار، هاوهەر شـتێکی دیکە.. کاتی خۆی جووت بە دوو گا کراوە، بە هەریەک لەو دوو گاجووتە گوتراوە پێگا.

هاتبایه ژوور، مەلیچک خێرا بۆ لای دەڕۆیشـــت خۆی بە دامەنییەوە دەکرد، لە بەرکەکانی بەدوای شیرینی و نوقڵدا دەگەڕا. دەستی بۆ شاڵی پشـتدێنی دەبرد و دەیکردەوە، ئاخر ئاغاسـی شـاڵەکەی وەک قایشـی پشـتێن بەکاردەهێنا، ئیدی مەلیچک شـاڵەکەی لە کەمەری دەکردەوە و لەنێو ژوورەکەدا یاری پێدەکرد. ئەو پیاوە بەستەزمانەش تا شاڵەکەشی وەربگرێتەوە، دەبووایە بەهێواشـــی بەدوایـدا غـاربـدا، دەنـا لەپڕ دوولینگەکەی دەهاتە خوار. پاشـاش بەدیاریەوە لە قاقای پێکەنینی دەدا. ئەم خۆشییە و پێکەنینە هیندەی دیکە تیختیخەی مەلیچکی دەدا.

شـا خۆشـی بە چارەی شـێخ ئاغاسـی دەهات، بە دەرکردنی وەزیر و دیارنەمانی لە گۆڕەپانەکە، ئەو مەودایە خوڵقا پاشـا هەسـت بە بوونی پاشایەتی خۆی بکا. بە بەراورد لەگەڵ گەورەوەزیری پێشوودا، هەمیشە هەسـتی بە کێماسـی دەکرد. قسـەکانی دایکی هەر لە مێشـکیدا دەزرینگایەوە: "لەبەردەم وەزیردا هەر دەڵێی کارمەندێکی بەرئەمری."
لێ هەنوکە لەگەڵ شـێخ ئاغاسـییدا، ڕۆڵەکان تەواو پێچەوانە بوونەتەوە. ئێستا ئاغاسـی کارمەندە بەرئەمرەکەیە. ئەمەش هەستێکی زۆر خۆشـی دەدایە شا بەوەی خۆی هەموو شتێکە. هەر خۆی بڕیاردەرە.
هێشتا یەک کۆسپ لەبەردەم پاشـادا مابوو، تا تاکەسواری مەیدان بێ. ئەویش دایکی بوو. پاشا لە بەرانبەریدا بێدەسەڵات بوو. ئاخر خۆ ناکرێ دایکت بنێرییەوە ماڵێ، ناشـتوانێ لێی بدەی و دەریبکەی، ئەوەش هەر ناکرێ بیکوژی و لەناویبەری.
هەرچی لەبارەی دایکییەوە بوو، دەبووایە جارێ ئارام بگرێ.

ئینگلسـتان لەگەڵ شـێخ ئاغاسـی دەرفەتی گەورەتری لەبەردەسـتدا بوو، لێ لەهەمان کاتدا زەحمەتیش هەبوو. ئەو پێگایەکی بە متمانە نەبوو.

لەندەن بۆ ئەوەی ڕەوتی پەرەسەندن و پێشهاتەکانی باشتر بخاتە بن ڕکێفی خۆیەوە، باڵوێزەکەی خۆی لە تاران گۆڕی و سێر مالکوم، سیاسەتوانە بەهرەمەندەکەی لەجێگە دانا. ئەو کابرایە بە مێژووی ئێران سەرسام بوو، تا ڕاددەیەکی باشیش فارسی دەزانی. ئەوەی دەزانی گەنجینەی وڵات بەتاڵ بووە و تێچوونەکانی کاروباری خودی پاشاش زۆر بەرز و قورس بوون.

مالکوم لە دیدارە فەرمییەکەیدا سەرنجی پاشای بۆ خۆی ڕاکێشا. لە دیدارێکیدا ساچمەزەنێکی ڕاوی پێشکەشی شا کرد، پاشاش بە دەوری خۆی بانگهێشتی باڵوێزیکر بەڵکو گەشتێکی ڕاووشکار بەیەکەوە بکەن.

هەردووکیشیان لەبارەی زمانەوە هەستیار بوون و حەزیان لە شیعر بوو. لە یەکێ لەو سەردانانەی، کە بۆ چاخواردنەوە چووبووە کۆشک، پاشا متمانەی بە باڵوێز کرد و هۆنراوەیەکی خۆی بۆ خوێندەوە:

*ئای لە دڵم، چەند مایەی بەبەزەییت*
*تۆ دەبێ سزای چاویش بکریتە ئەستۆ*
*ئاخر چاوم خۆشەویستی نەدەبینی*
*سا چۆن بێتاوانی خۆی دەسەلمێنێ؟*

مالکۆمیش سەرنجەکەی خۆی پێگوت: "ئەم شیعرە لە ئاستێکی بەرزی شاهانەیە."

یەکێک لەو کاروبارە یەکەمانەی مالکوم بۆ پاشای ڕێکخست، دەرهێنانی ڕایەڵەی تێلێگرافی نێوخۆیی بوو لە لیستی پرۆژەکان. لەندەن هەر لە بەراییەوە دژی نەخشەکە بوو، مالکۆمیش مشووری ئەوەی خوارد مانگانە دەرماڵەیەک بۆ بەلاوەنانی ئەم کارە بداتە پاشا.

مالکوم بۆ ئەوەی لە هەر ئاماژەیەک بۆ بەرتیلپێدان دوورکەوێتەوە، وشەی دەرماڵەی لادا و کردییە باج. بەم جۆرە لەسەر ئینگلستان پێویست بوو مانگانە بڕێک پارە بە ناوی باجی تێلێگراف بداتە پاشا.

پاشــاش پێی شــاگەشــکە بوو، ئاخر هەر لەو گۆڕە و بن بەرانبەر برە پارەیەکی دەهاتە چنگ، وەک ئەوە دیار بوو، خوا لەســەر کارەباشــەکانی پاداشتی کردبێ.

ســـێر مـالکوم پەی بەوە برد، بەبێ هـاوکـاری دەســـتەبژێر، نـاتوانێ پارێزگاری لە پێگەی خۆی بکا. بۆیە شـــازادە دەســـتڕۆیشـــتووەکانی بانگهێشـتی باڵوێزخانە کردن و داوای دڵسـۆزیی لێکردن. بۆ هەر یەکێک لەوانیش کارێکی لە پڕۆژەی ڕایەڵەی تێلیگرافی نیشتمانی لەسـەر کاغەز پێدان و لە بەرانبەریشدا مانگانە مووچەیەکی بۆ بڕینەوە.
بەم جۆرە ئینگلسـتان ویسـتی خێراتر بۆ جێبەجێکردنی ئەو کاروبارانەی کاتی خۆی لەگەڵ وەزیردا نەخشـە و پلانیان بۆ کێشـابوو، بێتەدەسـت. چەند هەزار پیاوێکیان لە لادێکاندا خسـتنە گەڕ تا دارەکان ببڕنەوە و بە ســـەدان گەنجی تـارانیش فێرکران چۆن ســـتوون و کێبلی تیلێگراف ببەســتن. وەســتای تەلارســازی هەموو وڵاتیشـیان بانگکردن و خڕیان کردنەوە بۆ ئەوەی بە دەیان نووســـینگەی تێلێگراف لەســـەر رێگای گەیشتن بە هیندستان دروست بکەن.

پاشـا هیواخواز بوو بە هەڵپەسـاردنی هێڵی نیشـتمانی تێلێگراف، کارێکی وەهـا بکـا ڕەعیەتەکەی دووردەخـاتەوە لەو زانیـارییـانەی لەبـارەی دوا پێشـــکەوتنەکان ڕوویانداوە. خۆی ئەمە بیرکردنەوەیەکی ســـادە بوو. بازرگانەکان ئەوانەی گەشـتی دەرەوەی وڵاتیان دەکرد، بە چیرۆکی زۆر ســـەرنجڕاکێش لەبـارەی بەرهەم، کـارخـانە، شـــار، گۆرەپـان، پرد و ڕۆژنامەکان دەگەڕانەوە.

لەو شوێنەی پاشای لێهاتبوو، لە هەموو لایەک سەری زمان و بنزمانی خەڵک هەر ئەو باسوخواسانە بوون. تەنانەت لە بازنەی دەورەی دەرباری پاشایەتییشدا بووبووە گرنگترین بابەتی قسەوباس.
شازادەکان لە گفتوگۆکانیاندا چەمک و زاراوەی نوێی ئینگلیزی و فرەنسییان دەردەبڕی تا خۆیانی پێ بابدەن کە ئاستیان چەند باڵایە. هەمووان هەوڵیان دەدا ئەوە نیشان بدەن، شتێکی نوێی بینیوە یان بیستوویەتی.
پاشان لە ڕێگەی سەردانێکی بۆ ئیسفەهان، تووشی پیاوانی ئێرانی بوو بە بەرگی کاری شینەوە خەریکی ڕاچاندنی کێبڵ و دەزگای تێلێگراف بوون. لە دەروازەی ئیسفەهاندا هەیتە و یاساوڵی بە یەکبەرگییەکی نەناسراوە بینین. پێی سەیر بووە ئەو هەموو هەیتە و یاساوڵانەی هەبوو، کە نەیزانیبوو. کاتێکیش لێپێچییەوە، بۆی دەرکەوت ئەوانە هەیتە و یاساوڵی شارەکە نین، بەڵکو پاسەوانی نووسینگە و دامودەزگای هێڵی تێلێگرافن.
بە پرسنیی خۆی سەردانی کارخانەیەکی کرد، کێبڵ و دەزگای تێلێگرافییان قایم دەکرد. دیاربوو وڵات بە بەرچاوی ئەوەوە دەگۆڕا. ئەمە هەراسانی کرد، ئاخر بیری کەوتەوە کاتی خۆی وەزیری کوژراو پێیگوتبوو، هەقە سەردانێکی ئینگلستان یان فەرەنگستان بکا بەڵکو بە چاوی خۆی و لەنزیکەوە پەرەسەندنە پیشەزسازییەکانی ئەوێ ببینێ. لێ ئەو هەمیشە ئەو بیرۆکەیەی ڕەتدەکردەوە. ئاخر چۆن دەتوانێ بە دڵێکی ئاسوودەوە سەفەر بکا، لەکاتێکدا چارەنووسی هەرات بە داوێکی باریکەوە بەندە و لەسەنگی مەحەک دایە، هەروەها ئەدی چی بکا ئەگەر خەڵکەکەی خۆی لێی هەڵبگەڕێنەوە و جڵەوی دەسەڵات بگرنەدەست؟
لە کاتی سەردانەکەی بۆ گوندەکانی دەوروبەری ئیسفەهان، بینی چۆن گوندنشینان لای ستونی تێلێگرافەوە وەستان و سەرگەرمی باسوخواسن

لەگەڵ یەکدی. ئاخر چۆن دەبێ چەند دانەیەک لە ستوون و کێبلەوە بەم جۆرە خەڵکی بوروژێنن؟

- "خۆی ئەمە پەڕجووە، ئەوان قسەکانت دەخەنە نێو کێبلەکە و لە چاوتروکانێکدا دەینێرنە دیوەکەی دیکەی دونیا."
- "چ وشەگەلێک دەنێرن؟"
- "پێموابێ وشەی ئینگلیزی یان ڕوسی."
- "ئەدی وشەی فارسی؟"
- "نەخێر، پێموابێ ناتوانرێ بنێردرێن."
- "خۆی ئەمە فەرمانی پاشای ئینگلستانییە. ئەو شتێک دەڵێ، ئیدی ئەوان لە ڕێی ئەم کێبلانەوە ڕەوانەی سەرتاسەری دونیایێی دەکەن."
- "ئەرێ دەکرێ پاشاکەی ئێمەش ئەو کێبڵانە بەکاربهێنێ؟"
- "پێموانییە بتوانێ."
- "بۆچی نا؟"
- "ئاخر ئەمانە بۆ ئێمە دانەنراون، ئەمانە کێبڵی بریتانیین. پاشا تەنیا زەویەکی بەکرێداوە، تا ئەوان ستونەکانی خۆیان تێدا بچەقێنن."

جوتیارەکان بە ئاوەزمەندیی شا سەرسام بوون، ئەویش وەهای خۆنیشان دا، گوایە بە مەبەست خۆی بە ڕێگەی تێلێگرافدا هاتووە تا کاروباری ڕاچاندن و دانانەکەی بپشکنێ.

شێخ ئاغاسیش هەمان ڕوانینی شاژنی دایکی سەبارەت بە هێڵی تێلێگرافەوە هەبوو.

شاژن گوتی: "بریتانییەکان زیاتر لە دووهەزار کیلۆمەتر کێبڵیان بەنێو خاکی ئێمەدا بردووە. هەزاران داریشیان لەبنەوە بڕیوەتەوە تا دارتێل و ستوونەکانی تێلێگراف بچەقێنن. تۆ بڵێی ئەوان ئەو هەموو شتە بۆ ئێمە بکەن؟ نەخێر، ئەوان بەسەر پشتی ئێمەدا خێراتر دەگەنە هیندستان. ئەدی باشە بۆچی ڕێگەمان پێداون؟ هەر ئەوکاتەش پرسیارەکەم کرد و

ئێستاش تا ئەو کاتەی وەڵامەکە وەردەگرمەوە هەر هەمان پرسیار دەکەمەوە."

"دایکە لەبیرت چووە، بریتانییەکان باشووری وڵاتیان داگیرکردووە. ئێمە دەبێ دانوستان بکەین. هاوکاریکردنمان لەبارەی پڕۆژەی تێلێگراف دەبێ وەک هێمایەکی گۆڕانی ڕۆژگار ببینرێ." پاشا وەها وەڵامیدایەوە و کۆتایی بە دەمەتەقێیەکە هێنا.

ئەو خێراییەی وڵاتەکەی پێ کێبلڕێژ کرا، لە خەیاڵدا نەبوو. بریتانییەکان چرای گازییان هێنابوو تا کرێکارەکان بتوانن لە شەویشدا کاربکەن. کاتێک خەڵک بۆ بەیانییەکەی لەخەو هەڵدەستان، دەیانبینی کرێکارەکان سەدان دارتێلی دیکەیان داچەقاندووە.

کاتێکیش بارەگای سەرەکی تەلەگراف لە تاران تەواو بوو، سێر مالکۆن بە فەرمی داوای لە پاشا کرد شوێنەکە بکاتەوە. پاشاش بەم بانگهێشتکردنە زۆر شاگەشکە بوو. شا بە خۆی و یاوەرەکانی و تۆپەکەی هاتە سەر بۆنەکە. وەک پێشوازیلێکردنیش دەستەیەک لە سەربازە موزیکژەنە هیندییەکان پارچە موزیکێکی خۆشی سەرکەوتنیان بۆ لێدا.

سێر مالکۆم پاشای بەخێرهێنا، چوکلاتێک، کە لە کاغەزێکی ڕەنگتەڵایی وەرپێچرابوو، لە بەرکی درهێنا و دایە مەلیچک.

ڕاڕەوی بارەگاکە بەقەد مافوری ئێرانییەکان بە ئاڵای بریتانیشەوە ڕازابووەوە. لەژێر نیگای تاسەمەند و مەراقی مێوانە گرنگەکان، سێر مالکۆم دوانێکی بە زمانی فارسی دا، تێیدا پەسنی پاشای دا بۆ ئەو هاوکارییە ناوازەی ئەو دۆستایەتییە گەرمەی لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتیی بریتانییەوە هەیەتی. لەسەر سینییەکی زێڕین مقەسەکەی هەڵگرت و دایە

دەستی پاشا تا شریتەکەی پێببڕێ. پاشاش سەرێکی بەنێو باڵەخانەکەدا کرد و ئامێری تێلێگرافەکەی بەسەرکردەوە.
بەدەم چێژوەرگرتن لە خواردنەوەی پیاڵەیەک لە چای ئینگلیزی لە باخچەی پشتەوەی بارەگاکە، سێر مالکۆم بە قسەیەک پاشای سەرسام کرد.
"بەبۆنەی ئەو ڕووداوە مێژووییەوە ئینگلستان بایەخێکی تەواو بە منداڵەکانی شا دەدا، بەتایبەتیش بە مەلیچک، بەڵام دەکرێ منداڵەکانی دیکەی خاوەنشکۆش لێی سوودمەند بن."
پاشاش گوتی: "ئێمە بەو شتە خۆشحاڵین."
مالکۆم درێژەی بە قسەکەی دا و گوتی: "ئەم دیارییە هێمای بەرەو پێشووەچوونە. ئەمە ئامێرێکە تازە لە پارکەکانی لەندەن دامەزرێنراوە. شتەکە بۆ منداڵان دروستکراوە، بەڵام مرۆ تێبینی ئەوەی کردووە، لە لەندەن چەند منداڵان، ئەوەندەش دایکان بەکاریدەهێنن."
بەم سەرنجە مالکۆم ئەوەی نیشان دا، دیارییەکە بۆ ژنانی حەرەمسەراشە.
"من بۆ ئەو ئامێرە هیچ وشەیەکی فارسییم بۆ نەدۆزراوەتەوە، بەڵام بە ئینگلیزی لای ئێمە پێیدەڵێن سلاید Slide یان سلیپ Slip.[٧٢]
پاشا بەدەم وەڵامدانەوە: "با بزانین چۆن دەبێ." چاوی گێڕا تا بزانێ ئاخۆ ئامێرەکە لەوێ دانراوە یان نا.
"دیارییەکە دەگەیەنرێتە کۆشک."

بۆ هەفتەی دواتر، دوو گالیسکەی بارکرا و بە تەختە و لەوحە ئاسنی درێژ گەیەنرانە کۆشک. ئەندازیارێکی ئینگلیز و پێنج تەکنیکاری هیندی لەگەڵ بوون تا دڵنیابن لەوەی ئاسن و تەختەکان لەکاتی گواستنەوە

[٧٢] مەبەست خشخشۆکە. وەرگێڕ.

دانانیدا زیانیان پێنەگا. کەسیش نەیدەزانی ئەو تەختە ڕەنگدەرەوانە بەکەڵکی چی دێن، هەریەکە لە ئاستی خۆیەوە شتێکی دەگوت، وەک ئەوەی مەتەڵێک هەڵبێنێ: "لەوانەیە ئەو پارچانە بۆ دەزگای تێلێگراف بن."
"وا دیارە پاشا تێلێگرافی تایبەتی بە خۆی دەبێ."
"ئەم شتانە فریان بەسەر تێلێگرافەوە نییە، پێموایە دەرگا دارینەکەی کۆشک لێدەکرێتەوە، ئیدی ئەم ئاسنانەی لەجێگەدا دەنێن."
"خۆ ئەگەر ئەو هەموو پارچە ئاسنانەیان بەو زەحمەتییە بە وڵاتدا گێڕابێ تا گەیاندبێتیانە و ئێرە، هەردەبێ شتێکی گرنگ بێ."

پاشا بڕیاری دابوو دیارییەکە لە حەرەمسەرا دابنێن، چونکە ئەگەر ژنانی لەندەن خۆشی لێببینن، دەکرێ ژنانی حەرەمسەراش پێیان خۆش بێ. دەمودەستیش ناوێکی فارسی بۆ ئامێرەکە داهێنا، ناوەکەش تاڕاددەیەکی زۆر وەرگێڕانی دەقاودەقی وشەی "سلاید Slide": سورسورە بوو. ئەو داهێنانی وشەکەی بە دەستکەوتێک زانی، وشەیەک بەتەواوی واتای چالاکییەکەی دەردەبڕێ: "سورسورە: تۆ دەخلیسکێی و تا کۆتاییەکەی لەگەڵی دەڕۆی."
ئەو ڕۆژە هەموو ژنانی حەرەمسەرا بۆ مەزاری عەبدولداود نێردران. بۆ ئێوارە درەنگ گەڕانەوە، شا ویستی بە سورسورە (خشخشۆک، لەیلوک) غەفڵەتگیریان بکا.

ئەندازیارە بریتانییەکە و یاریدەرە هیندیەکان هەموو ڕۆژەکە خەریکی دانانی بوون و کارەکەشیان بەجێگەیاند. ئەوان ڕێرەوێکی دووردرێژی خشخشۆکیان بە هۆی دینگەی ئاسنینەوە بە دیوارەکانەوە چەسپاند تا وەک خانوویەک لە شوێنی خۆی جێگیر بوەستێ. کاتێکیش هەموو شت ئامادەکرا، بریتانییەکە بۆ سەلماندنی کارەکە لێ وەسەر پلیکانەکە کەوت

و له سەرەوەڕا لەخشخشۆکەکە نیشت و تا خوارەوە ڕانەوەستا. پاشان هەر پێنج تەکنیکارە هیندییەکانیش هەمان شتیان کرد.
دیارییەکە لە شوێنی خۆی دامەزرێنرا و سازوتەیار بوو، پاشاش بەم دیارییە تایبەت و جیاوازییەی بریتانییەکان بێ سنوور کەیفخۆش بوو. سێ دراوی زێڕینی دانە ئەندازیارە بریتانییەکە سەر و دراویشی دایە تەکنیکارە هیندییەکان. ئێستا ئەو بەتەنیا لە دیار ئەو خشخشۆکە زەبەلاحە وەستاوە. شا فەرمانی کرد چەند دۆشەکێک لە خوارووی خشخشۆکەکە دابنێن. ئینجا دەستێکی لەسەر کەلەکە دانا و سەیرێکی خشخشۆکەکەی کرد، ئێستا ساز و ئامادەیە. بە ئەسپایی بەسەر پەیژەکان خۆی گەیاندە سەرووی خشخشۆکەکە، دانیشت، ئینجا بە جوانی بۆ خوارووی خوارەوە خشا.
کاتێک بە نەرمی لەخوارەوە کەوتە سەر دۆشەکەکان گوتی: "نایابە!"
بە ئۆقرەلەبەربڕاوییەوە چاوەڕێی هاتنەوەی ژنەکانی کرد. شا بە خۆ و مەشخەڵی دەستییەوە لە پێشوازییاندا بوو، ئەوانیش لەخۆیان پرسی ئەرێ بۆچی هەموو چراکانی حەرەمسەراکە کوژێنراونەتەوە.
ئینجا پاشا بە شانازییەوە ڕایگەیاند: "خانمان، سورسورە بۆ چاوەڕێتان دەکا. دەی بەدوامدا وەرن!"
ئەو لە پێشەوە ڕۆیشت و دەرکەی حەرەمسەرای کردەوە.
"خانمان، بە دوای ئێوەدا!"
ژنان لە حەرەمسەرا چوونەژوور. لەبەر تیشکی چرا و لە سێبەری ڕەنگدانەوەی دینگە و تەختەی خشخشۆکەکەدا، ژنان شتێکی زل و زەبەلاحی ئەفسووناوییان لە ناوەڕاستی حەرەمسەرادا بینی. چرای زیاتر هێنران، ئینجا مەلیچک لە سەرووی خشخشۆکەکە بەدەرکەوت، بۆمایەی سەرسامی لەبەر چاوی هەمووان بە قیژەقیژەوە لەسەرەوە تا خوار

خۆی خشـــــاند و بە کەیف و زەوقەوە لە خوارەوە کەوتە ســـەر دۆشەکەکان. پاشان شا ژنەکانی لەوێ بەجێهێشت و خۆی هاتەدەر. لەپشتەوە گوێی لە هەراوزەنا و قرتەی پێکەنین ژنەکانی بوو. دوو دڵۆپ فرمێسکی گەورەی خۆشی کەوتنە سەر رووومەتی. "ئیدی لەوانەیە ئێستا وا پێویسـت بکا سـەردانی ئینگلسـتان بکەم." ئەمە قسـەی پاشـا بوو بە مەلیچکی گوت، کە بە زەحمەت لەکۆڵ خشخشۆکەکەیان کردبووەوە.

## ٤١

# هێنان و ناردن

هەنووکە کێبڵی تێلێگراف بەســــەر هەزاران دارتێل و ســـتوونەوە بەنێو وڵاتــدا ڕەت دەبوو. بە شـــێوەیەکی نـازدارانەش لەگەڵ دیمەنی ســروشــتەکەی دەهاتەوە. ڕوســەکان لە کاتی جەنگەکەی هەرات لەگەڵ بریتانییەکان ڕێککەوتبوون، پاشـاشـیان خسـتبووە پشـت بەردی کەڕە، چاوەڕێی ئەوەیان لە ئینگلیز نەدەکرد ئەو نەخشەیەی بۆ ئێرانیان دانابوو جێبەجێی بکەن.

ئەو جەنگە بێدەنگەی نێوان ڕوسیا و ئینگلستان لە لایەن بریتاییەکانەوە بردرایەوە. خۆ ئەگەر ڕێگەی ئاســـنیش لە کەنداوی فـارســـییەوە بۆ هیندستان لێبدرێ، ئەوا هەر دەبووایە ڕوسەکان لە دوورەوە تەماشاچی بن. هەربۆیە هەموو شـــتێکیان دەکرد تا کۆســـپ بخەنە بەردەم لێدانی ڕێگەی ئاســنینی بریتانی. ئەوەیان بە شــا ڕاگەیاند، گوایە بە پێچەوانەی بریتانییەکانەوە ئامادەن هێڵی ئاسنینی نیشتمانی بۆ ئێران لێبدەن.

به هۆی بەردەوامی شەڕوشۆڕ، هیچ پاشخانێک بۆ بازرگانی و زانست نەمابووەوە. بەتایبەتیش لەو سەد ساڵەی رابردووەوە، شتێکی وەها بایەخدار هاوردە نەکرابوو، بەهەمان شێوەش هیچی وەها نەنێردرابوە دەرەوە، لێ لەو کاتەی گۆڕانکارییە مەزنەکانی ڕۆژئاوا ڕوویاندا، کەشتییەکانیان بە پڕی دەهاتن و بازاڕی ئێرانیان پڕ لە کاڵای بریتانی کرد.

بازاڕی شارەکانی باکووری وڵاتیش هێشتا هەر سەروسەودایان لەگەڵ بازرگانە ڕوسەکان بوو. لەوێ هەر بەرهەمی نوێ، کە لە مۆسکۆ و سەنت پترسبورگەوە دەهات، دەفرۆشرا.

لەبەر ئەوەی ئینگلیز دەسەڵاتیان بەسەر بەشی خوارووی وڵاتدا دەشکا، ئیدی ڕوسەکانیش لە بەشی باکوور و ڕۆژهەڵاتەوە لێیان داکوتا. ئەوان بەنیازبوون بەندەرەکان بۆ کەشتییە ڕوسیەکان نۆژەن بکەنەوە. باڵوێزی ڕوسیا لەبارەی گومرگەکانی باکووری وڵات، کە بەهۆیەوە پارەیەکی زۆریان دەست دەکەوت، پێشنیازێکی خستە بەردەم پاشا.

بە شێوەیەکی بنەمایی پاشا نەیدەویست هیچ شتێکی لەگەڵ ڕوسەکاندا هەبێ. ئەو هێشتا هەر لەبەر ئازاری ئەزموونی شەڕی هەرات دەیناڵاند. لێ هیچ بژاردەی بۆ نەمابووەوە. وێڕای ئەمەش نەیدەتوانی لەبەر تەماعی برە پارەی قەبە خۆی بگرێ.

ڕاوێژکارەکانی پێیانگوت هەق نییە چیدی باڵوێزی ڕوسیا پشتگوێ بخا، ئاخر ئەوان دەیانزانی، قڕاڵ لەنێو وڵاتەکەی خۆی لەژێر فشاردایە، بۆیە لەگەڵ ئێران ئامادەی سازشکردنە.

ئیدی پاشاش ڕێگەی دا باڵوێزی ڕوسی بێتە دیداری.

چیرۆکی خشخشۆکەکە گەیشتبووە مۆسکۆ و باڵوێزی ڕوسیاش دەیەویست لە لایەن خۆیەوە بە دیارییەکی ناوازە پاشا سەرسام بکا.

پاشـــــا خۆی وەها نیشـــــانی باڵوێز دا، بەرامبەریان بێباکە، بۆئەوەی ســـــەرنجی ئەوەیان لا بوروژێنی، هێشـــــتا ناپاکییەکەی هەراتی لەبیر نەچووە.

ڕوســــیش هەروەک بریتانیا یەکێ لە دیپلۆماتە بە ئەزموونەکانی خۆیان ناردە تاران. ناوی باڵوێزە نوێیەکە دیمیتری چۆڤۆلفســــکی بوو. ئەو کتێبێکی لەبارەی مێژووی پەیوەندییەکانی ڕوسی-ئێرانی بڵاوکردبووەوە. لەپاش ئەوەی پاشــا و باڵوێزەکە چایان خواردەوە و هەندێ قســەی ڕێز و مێوانداریییان لەگەڵ یەکدی ئالوگۆڕ کرد، چۆڤۆلفســکی بە پرســیارێک پاشـــــای غافڵگیرکرد: "من چەند پۆرترێتی مـاڵباتی قڕاڵم لەگەڵ خۆم هێناون، ئاخۆ خاوەنشکۆ نایەوێ بیانبینێ؟"

شـا بۆ دیتنیان هەدادانی نەما، بەڵام هەر بەکورتی سـەرێکی ڕەزامەندی بۆ لەقـانـد. دیمتری چۆڤۆلۆڤســــکیش دەســـــتی بۆ جـانتـاکەی برد و ئەلبوومێکی ئاوادامانزێڕی لێدەرهێنا و پۆرترێتێکی ناوازی قڕاڵی نیشـان دا.

"کەشخەیە". ئەمە تاکە وشە بوو کە بۆ پاشا هات و بە باڵوێزی گوت. لێکچوونە پۆرترێتەکە بە کەســی ماخۆی ڕاســتەقینەکەی خۆی بە قووڵی پاشای هەژاند و باندۆری خۆی لەسەر دانا. ئەمەیان هەر بەتەواوی لەو پۆرترێتانە جیاوازبوو، کە تا ئێستا بە قەڵەمدار کێشرابوون، ئەوانەی ئەو دیتبوونی. لە لاپەڕەی دووەمی ئەلبوومەکە چـاوی بە ژنێکی کەژەی جوانی شانومل ڕووت کەوت. بێ دوودڵی ژنی قڕاڵ بوو. شا دەستی بە دەمییەوە گرت و نەرمەکۆکەیەکی کرد و هەندێ بێ باکانە لاپەڕەکانی ئەلبوومەکەی هەڵدانەوە.

"ئەگەر پۆرترێتەکان بەدڵی خاوەنشـــکۆ بێ، دەکرێ وێنەگرێکی ڕوســـی ڕابسپێرم بێتە ئێرە و پۆرترێتی پاشـا لەنێو کۆشـکدا بگرێ و بە نەمری بیهێڵێتەوە، ئەمەشم وەک دیارییەکی قڕاڵ لێوەرەبگرن."

پاشا دەستبەجێ وەڵامی نەدایەوە، ئەو ئەلبومی وێنەکانی لە لایەک دانا و یەک دوو پرسیاری پەیوەندییەکانی ڕوس بە بەندەرەکانی باکوورەوە لە باڵوێز کرد. لە ڕوخسارییەوە دەخوێندرایەوە حەزی لێ نییە گوێ لە ڕوونکردنەوەی پڕ لە وردەکاری بگرێ.
کاتێکیش چۆڤۆلفسکی ویستی کاغەزێکی لوولدراو بکاتەوە، وێنەیەکی باڵەخانەی گومرگەکەی نیشان بدا، پاشا چیدی حەوسەڵەی نەما و پێیگوت: "دەکرێ بۆ ئەمە دیدارێک لەگەڵ وەزیرەکەمان ڕێکبخەن."

یەک دوو مانگ دواتر، وێنەکێشێکی ڕوسی بە گالیسکەیەکی تایبەت گەیشتە تاران. لە کۆشک دابەزی. کاتێکیش مەیتەرەکە ویستی ئەسپەکەی لە گالیسکەکە بکاتەوە، ڕاشکاوانە بە مەیتەرەکەی گوت: پێویستی بە یارمەتی ئەو نییە. کابرا کەسێکی سەیربوو بەخۆی و ڕیشی تاشراو و سمێڵێکی کشتنەکراو. پاشان دەستی لەپشتەوەی گرێدان و بەرەو لای حەوزەکە ملی لێنا و بە پیاسە بۆ لای باخەکە ڕۆیشت.
پاشا لەپشت پەنجەرەوە سەرنجی دابوو. کابرا وەهای خۆ دەنواند وەک ئەوەی لە کۆشکەکە ژیابێ.
وێنەکێشەکە بایی ئەوەندەی دەزانی پێویست نەکا ئەو پرسیار لە پاشا بکا، بەڵکو پاشا بەخۆی پرسیار لەو بکا. کاتێکیش وادەی خۆی هات، هیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدا.
پاشا بە هێواشی لێی چوەژوور. کاتێک وێنەکێشەکە ئاوڕیدایەوە و بینی، شەپقەکەی بەرزکردەوە و کەمێک بۆی دانەویەوە و گوتی: "خاوەنشکۆ!"

بۆ ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق پاشا لەهەموو سوچێکی کۆشکەکەوە وێنەی گیرا، تەنانەت مەلیچک و تاج سوڵتانی کیژە نازەنینەکەی، کە زۆری پێنەچوو مێردی دەکرد. هەروەها وێنەکێشەکە وێنەیەکی پاشای

لەگەڵ ژنەکانیشیدا گرت، تۆمارەکە دیمەنەکەی بۆ هەتاهەتایە پاراست، ژنەکانیش هەموویان لەچک و بورقایان پۆشیبوو.

کابرای ڕوس پەی بەوە برد، خەریکە بەشێک لە مێژووی ئێران تۆماردەکا و دەسەلمێنێ. هەر بۆیە بە ئەسپایی بە دوای شوێن و دیمەنی ناوازە و بێوێنە دەگەڕا تا بە کامێراکەی بیانگرێ.

بەهۆی هێزی قەناعەتپێهەنەرانەی بالآی ئەو، بێ کێشە توانی بچێتە حەرەمسەرا. ئەمەش یەکەمجار بوو کەسێکی غەوارە پێی بنێتە ئەوێ. شتەکە وەها کەوتەوە تەنانەت ئەوە بە مێشکی پاشاشدا نەهات ڕێگەی لێبگرێ. کاتێکیش ئەو زنجیرەیەک وێنەی ژنەکانی کێشا، زانی وێنەکانی گەواهیدەری بێوێنەن بۆ واقیعێکی نادیار. ئامێرەکەی دەستی ڕۆژگاری قفڵ دا.

بۆ دوو دیمەن کابرای وێنەکێش کاتێکی زۆر و کارامەییەکی زۆری پێویست بوو. یەکێکیان، وێنەی دەستەیەک لە ژنە ڕووپۆشەکان، ئەوانەی بە بازنەیەک لەسەر زەوی دانیشتبوون قلیانیان دەکێشا، هی دیکەشیان پۆرترێتێکی پاشا بوو لەسەر کورسی، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان کورش، پاشای پاشایان لەسەری دانیشتبوو.

زۆر دوای ئەوەی وێنەگرەکە ئەوێی بەجێهێشتبوو، لە مۆسکۆوە کتێبێکی وێنەدار گەیشتە باڵویزخانەی ڕوسی لە تاران و ئەوانیش دەبووایە بیگەیەننە دەستی پاشا. دیمتری چۆڤۆلۆڤسکی بە دڵێکی پڕ لە هیواوە ئەلبوم و گرێبەستەکانی گومرگی ڕوسی-ئێرانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بە سواری ئەسپەکە بەرەو کۆشک ڕۆیشت.

پاشا پەڕەکانی گرێبەستەکەی هەڵدانەوە، بە وریاییەوە چەند برگەیەکی تاوتوێکردن و یەک دوو پرسیاریشی لەبارەوە کردن. ئینجا کاغەزەکانی لە لایەک دانا و گوتی: "ئێمە لەگەڵ کەسانی پەیوەندیدار لەبارەی

نەخشــەکانی ئێوە قسـەمان کردووە. بە شـێوەیەکی گشـتی پێشـنیازێکی تۆکمەمان هەیە. لە ماوەیەکی کەمدا وەزیرەکەمان پەیوەندیتان پێوە دەکا. ئێمە بە پەیوەندیی نوێی نێوان هەردوو وڵات دڵخۆشین."

دوای ئەم قســـانە، دیمتری چۆڤۆلۆڤســـکی ئەلبومەکەی لەنێو جانتاکەی دەرهێنا و دایە دەستی پاشا، ئەویش بە پەرۆشەوە پەڕەکانی هەڵدایەوە. بە وشکییەوە ئەو تێبینییەی دەربڕی: "ئێمە لێی ڕازین."

ئینجا زەنگەکەی لێدا و بانگی مەلیچکی کرد و وێنەکەی خۆی نیشان دا. شا پێی گوت: "مەلیچک، ئەوە تۆی."

دیمیتری چۆڤۆلۆڤســـکی دەرفەتەکەی قۆســـتەوە تا دیارییەک بداتە کوڕێژگەکە: "ئەگەر خاوەنشـــکۆ ڕێگە بدا، دیارییەکی بچکۆلەشـــم بۆ مەلیچک هێناوە." دیارییەکەش دەمانچەیەکی یاریی منداڵان بوو.

شا دەمانچە ساختەکەی لێوەرگرت، پشکنی، لوولەکەی لە مۆمێکی سەر مۆمـدانێـک کرد و تەقەی لێوە هێنـا. دەمـانچەکە دەنگێکی گەورەی لێوەهات، مەلیچک لەبەری سڵەمییەوە. پاشاش پێکەنی.

ئینجا دیمیتری سەری بۆ پاشا دانەواند.

# ٤٢

# بەرگری

کێشکە و پاسارییەکان بە شڵەژاوییەوە دوای تەوابوونی کاری تێلێگراف لەسەر دارتێل و کێبلی تیلێگرافەکە نیشتنەوە و وەک ئەوەی پێشتر هەرگیز لە شوێنێکی وەها نەنیشتبنەوە. لە چریکە و خوێندنیان وەها دیاربوون کەیفیان سازە. لەپاڵ کێشکە و پاساری، منداڵانیش دڵیان پێخۆش بوو. گوێیان بە دارتێلێکەوە دەنا و بە بەردێک لێیاندەدا و زرینگەیان لێوەدەهێنا، گوایە بەم شێوە لەگەڵ یەک پەیوەندییان دەگرت، یارییەکەیان یارییەکی ئەفسووناویی بوو، هەرگیز لێی تێرنەدەبوون.

دیاربوو ئەو کار و چالاکییەی دوابەدوای تێلێگرافەوە هات، هێز و هیوای بەخشیبێتە هەمووان. مەلیچک کە ڕقی لە جووڵە و ڕۆیشتن دەبووەوە، هەنووکە بەخۆی و یاریی دەمانچەکەی هەر لە جرتوفرتدا بوو، نیشانەی لە نۆکەر و قەرەواش و ئاشپەز و پشیلەکان دەگرت و هەر یەکێک تووشی هاتبا تەقەی لێدەکرد. کەسیش نەیدەوێرا ڕێگەی پێبگرێ.

تەنانەت شـێخ ئاغاسـییش کاتێک دەچووە لای پاشـا پێویسـت بوو دان بەخۆیدا بگرێ.
جارێکیان ئەو کورێژگە خەپەیە سـێرەی دەمانچەکەی لە تاج سـوڵتانیش گرت. هەستیشی کرد ناتوانێ کارێکی وەها بکا، لێ تاج سوڵتان لێنەگەڕا ئەم کارەی چەند بارە بکاتەوە.
کەسێکی دیکەش هەبوو، دەبووایە مەلیچک لێی دوورکەوتبایەوە. ئەویش ئەفسـەرێکی گەنج بوو، لەم دواییانەدا زوو زوو پاشـا بانگی دەکرد و لەگەڵی دادەنیشـت. ئەفسـەرەکە سـەر بە هەمان هۆزی پاشـا بوو، هەر هەمان نازناوی خانەوادەشـی هەبوو. ئەم ئەفسـەرە لە شـەڕی هەراتدا ئازایەتییەکی زۆری نواندبوو، ئەمەش هەر لە بیری پاشـادا بوو. ئەو پاداشـتی ئەفسـەرە ئازاکانی کرد و نازناوی عەینولدەولەی دابوونێ، دەقاودەق واتای چاوی دەوڵەتی دەگەیاند. پێدەچوو ئەم عەینولدەولەیەش بۆ تاج سوڵتان شیاوترین پیاو بێ.

پاشـا هێشـتا بەتەمەندا نەچوو بوو، بەڵام فشـاری ئاوەزمەند و ڕیشـسـپییانی هۆزەکەی خۆی بۆ دیاریکردنی جێنشـینێک لەسـەر بوو. ئەوان پێیانوابوو نابێ بەختی سـەرۆکایەتیی هۆز و وڵاتەکە بۆ ڕێکەوت و چارەنووس جێبهێڵێ. ئەو دەبووایە لە ماوەیەکی کورتدا ناوێکی بۆ ئەگەری دەستنیشانکردنی جێنشینێک پێبووایە.
پاشا بە لەبەرچاوگرتنی ڕەوشی ڕێژەییانەی سەقامگیریی وڵات، بڕیاری دا ئەم پرسە چارەنووسسازە خێرا یەکلابکاتەوە. شا نیازەکەی خۆی بۆ ڕیشسپییەکان ئاشکرا کرد و پرسوڕای سەبارەت بە ئەفسەرە گەنجەکە لێکردن. ئەوانیش هەر یەکسـەر پەسـەندیان کرد و دەسـتخۆشـییان سەبارەت بەو بژاردەیە لێکرد.

ئەندازیارە بریتانییەکان لە جموجۆڵی خۆیان نەکەوتن. ئەوان بە هیوا و گەشـــبینییەوە لە نموونەی خـاکی هەڵکۆڵراویـان کۆڵیەوە و هەوڵیـانـدا ئەنجامەکەی لە چاوی دنیای دەرەوە بشارنەوە. لێ کەموکوڕی ئەوان بۆ کار و چالاکی لە پارێزگاکانی باشـــوور و بەتایبەتیش ڕاچاندنی کێبڵی تێلێگراف، کە بەســـــەر مزگەوت، ماڵ ، حەمام و ڕوبار و داروبەرد و بەرزاییەکان دەڕۆیشت، خەڵکی بەئاگا هێنایەوە.

پاشا خەمی ئەوەی بوو خەڵکەکەی بکەونە بن باندۆری دەرەکی. لەپشت ســـەری ئەوەوە هێشـــتا بنەماڵە دەوڵەمەندەکان و بازرگانە گەورەکانی بازار کوڕەکانیان بۆ مۆســـکۆ، لەندەن، پاریس، بۆمبای و ئیستـــتەنبول دەنارد.

دەســـتەیەک لە پیاوە بەهرەمەندەکانی ئێرانی هەســـتیان کرد ئەرکێکی نیشـــتمانییە بگەڕێنەوە وڵات و ڕابەرایەتیی هاوڵاتییەکانی خۆیان بکەن. کەســە هەرە گرنگەکەی ئەم دەســتەیە پیاوێک بوو بە ناوی جەمال خان ئەســتارئابادی، کە بە جەمال خان ناسـرا. لەو کاتەی بۆ یەکەمین جار لە لەندەن قیتار کەوتە گەڕ، ئەو لەوێ بوو. ئەو لە بێرمینگهام ســـەردانی چەندین کارگەی ئاســـن و پۆڵای کردبوو، هاموشـــۆی قاوەخانەکانی کردبوو، لەگەڵ کرێکاراندا قاوەی خواردبووە و بازاڕی قســـەی گەرم کردبوو و لە کۆبوونەوەکانیشیان بەشدار بووبوو.

جەمال خان بووبووە برادەری وەزیریش، هێشتا لەژیاندا مابوو، نامەیان بۆ یەکدی دەنارد و ئاگایان لەیەک بوو. جارێکیان لە سەنت پەترسبورگ و جارێکی دیکەش لە باکۆ یەکدیان بینیبوو. خۆی هەر ئەو جەمال خانە بوو دانەیەکی لە دەستوری فەرەنسی بۆ وەزیر ناردبوو.

مردنی وەزیر ئـازاری جەمـال خـانی دا، بەڵام خۆ ئەوە بۆ ئەو مـایەی ســەرسـامی نەبوو. ئەوکاتەی ئەوان لە باکۆ یەکدیان بینی، ئەو وەزیری

لە ئەگەرێکی وەها ئاگادارکردبووەوە. هەردووکیان هەستیان بەوەکردبوو، وڵات پێویستی بە قوربانیدان هەیە بۆ ئەوەی هەنگاوێک بچێتە پێشەوە. جەمال خان دەیزانی وەزیر چۆن کوژراوە و لەکوێش خراوەتە ژێر گڵ.

خەڵکی ئاسایی جەمال خانیان نەدەناسی، بەڵام ئەو لەنێو رۆشنبیران لە وڵاتانی رۆژهەڵات وەک سیاسییەکی بیرمەند رێزلێگیراو بوو. وتارەکانی لەبارەی بەئاگاهاتنەوەی گەلانی وڵاتە موسوڵمانەکان لە دەرەوەدا بە شێوەیەکی تاسەمەند دەخوێندرانەوە.

ئەو یەک دو ساڵانیش لە میسر ژیا، پاشان چووە تورکیا تا لە ئێران نزیک ببێتەوە. ئیستەنبول خاڵی وەرچەرخانی هزری نوێ بوو، شوێنێک بوو رۆژهەڵات و رۆژئاوای بەیەکەوە گرێ دەدا. جەمال خان لەوێ هەستی دەکرد نامۆ نییە، لێ رووداوەکانی ئەم دواییانە داخوازبوون بگەرێتەوە وڵات.

باوکی جەمال خان ئایەتوڵلایەکی بەناوودەنگی تاران بوو، هەر بۆیە کورەکەی پەیوەندیی باشی لەگەڵ رەوت و بزووتنەوە ئیسلامییەکان هەبوو. زۆری پێنەچوو پێگەیەکی رێزلێگیراوی لە مزگەوتی ناوبازاڕ وەک وتاربێژ پێدرا. هەموو رۆژانی هەینی، کاتێک ئیمام پشنوێژی بۆ دەکردن، ئەویش قسەی بۆ نوێژکەرانی مزگەوتێ دەکرد، گوێگرەکانیشی بەزۆری لە بازرگان و دوکاندارانی ناو بازاڕ پێکهاتبوون.

ئەو قسەکەرێکی بەهرەمەند و لەبلەبان بوو، لەبەر ئەوەی باسی بابەتگەلی دیکەشی دەکرد، نەوەک هەروەک ئاخوندەکانی دیکە هەر بە تەنیا یەک شتی سواو بجوێتەوە، بۆیە خەڵکی بەتاسەوە لە دەوری خڕدەبوونەوە. چیرۆکی لەبارەی بازرگانیی جیهانی دەگێڕایەوە، کە چۆن بازرگانانی جیهانی رۆژئاوا بە یارمەتی تێلێگرافەوە بە ملیۆنان پارەیان

بۆ دەگەڕێتەوە و قازانج دەکەن، چونکە پێویســـتی نەدەکرد بەخۆیان ســـەفەرە دووورودرێژەکانیان بکەن، بەڵکو کارەکەیان بە کورتە پەیامێکی تێلێگراف مەیســەر دەبوو. ئەم قسـەوباسـانە تا دەهات بازنەی گوێگرانی بەفرەوانتر دەکرد. ئەو چاوی خەڵکەکەی کردەوە و تا دەهاتیش زیاتر لەبارەی گەندەڵیی شازادەکان و سیستمە شکستخواردووەکەی خۆیان بوێر و بوێرانەتر دەدوا. بە ماوەیەکی کەم لە تاران بووە ناوێکی ناسراو. قســەکانی ئەو لەســـەر زاروزمانان دەگوازرایەوە بۆ یەکدی و لە هەموو وڵاتەوە بانگهێشت دەکرا تا قسەیان بۆ بکا و وتاری خۆی بدا.

شەوێکیان دوای نوێژ لە مزگەوتی هەینی تاراندا، لە یەکێ لە وتارەکانیدا دابەزییە سـەر ئینگلسـتان: "خەڵکینە، بەسـیەتی سـووکایەتی. ئەگەر ئێمە ڕایەڵەی تێلێگرافی نیشـــتمـانی خۆمـان نەبێ، بـا بریتـانییەکـانیش تێلێگرافەکەیان لەم وڵاتەدا لابەرن و بیگوازنەوە."

ئەمە پەیامێکی نائاســـایی بوو. تا ئەوکاتە خەڵک وەها باســـی تێلێگرافی دەکرد وەک ئەوەی شـــتێک بێ لە دەرەوەی ئەوان بێ و بۆ ئەوان نەبێ. ئێســـتـاش جەمـال خـان بە کراوەیی نیگەرانییەکـانی خۆی لەبـارەی دارتێلەکانی بریتانی لەسەر خاکی نیشتمان دەردەبڕێ.

خەڵکەکەش قسـەکانی ئەویان پشـتراسـت دەکردەوە: "ئەو ڕاسـت دەکا، بـاشـــە ئەگەر ئەو دارتێلانە بۆ ئێمە نەبن، چیمـان داوە لەو هەموو دارتێلانەی تێلێگراف؟"

- "خۆ ئەگەر ئێمە نەتوانین کێبلی ئەو تێلێگرافە بەکاربهێنین، باشـە چ پێوست دەکا، بەم شێوەیە بەسەر خانوبەرەی ئێمەدا بڕوا."

لەو مزگەوتانەی جەمال خان قســـەکانی خۆی تێدا دەکردن و بازنەی وتووێژەکانی تێدادەبەست، خەڵکەکە لەسەر ڕیزی پێشەوە بۆ ئەوەی بە باشـی گوێی لێبگرێ، قەڕاپەسـتێنەیان بوو. دوای قسـە و وتارەکانی ئەو

لەنێو مزگەوتێدا خەڵکیش بەدوای ئەودا قسەی خۆیان دەکرد: "ئەوی ئەو دەیڵێ ڕاســـتە. ئـاخر خەڵکێکی زۆر لەو وڵاتە نەخۆشـــن، کەچی نە داودەرمان و نە پزیشک، هیچمان نییە."

- "هەرگیز بیرم لێنەکردبووەوە، بەڵام ئێسـتا هەقە بپرسـین، ئەرێ بۆچی ئەوەندە خەڵک هەن بێ کاروکەسابەت؟"

- "خۆ ئەگەر پیشـــەســـازیی نوێ بێتەناومان، ئەوا هەموو شـتێک باشتر دەبێ."

- "ئەو ڕاست دەکا، ئێمە هەموومان شایستەی ژیانێکی باشترین."

پیاوەکانی دەوروبەری شـا لە جەمال خان بەدگومان بوون، هۆشـداریان لەبارەی مەبەستە شاراوە و تەمومژەکانی داین. پاشاش هێشتا شتەکەی وەها نەدەبینی سەری خۆی پێوە بێشێنێ. ئێستاش کە پەیوەندیی باشی لەگەڵ هەریەک لە بریتانیا و ڕوســـیا پەیداکردووە، ئەوا لە جاران زیاتر دەســـتی لە تەخت و تاجەکەی گیرکردوە. هەڵبەتە چاو و شـــۆڤاری بە دوای ئەو قسـەکەرە نوێیەدا ناردن بزانن چی دەڵێ و ئاگاداری بکەنەوە، داوای لە ســـەرۆکی پاســـەوانانی شـاریش کرد چاودێری بکا. شـــتێکی دیکەش بووە مایەی ســـــەرنجڕاکێشـــانی پاشـــا. خۆئامادەکردن بۆ زەماوەندی کیژە خۆشـــەویســـتەکەی خۆی، شـــووکردنی تاج ســـوڵتان بەتەواوی هەموو وەخت و کاروچالاکی ئەوی بۆ خۆی بردبوو.
تاج ســـوڵتان لە فروغی دایکی هەواڵی دەســـتنیشـانکردنی ئەفســـەرێک لە لایەن شـــاوە بیســـت تا ببێتە دەزگیرانی و هەروەها نیازی باوکی بۆ ئەوەی زەمـاوەندەکەیـان بەزووترین کـات ڕێکبخەن. کـاتێکیش پـاشـــا کچەکەی بانگی لای خۆی کرد، تا لەبارەی مێردی ئایندەی قســـە بکا، ئیدی بە گریانەوە کەوتە ســـەر دەســـت و پێی باوکی و گوتی: "بەڵام باوکە، خۆ ئەو پیاوە چەند ژنی دیکەی هەن."

دەستبەجێ پاشا وەڵامی دایەوە: "منیش هەمە. ئێمەش ژنی زۆرمان هەن.
- "من لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە بیستوومە، ئەو پیاوێکی باش نییە. ئەو کەسێکی ترش مۆن و تووڕەیە، دەست لە ژنەکانی خۆی بەرزدەکاتەوە."
- "ئەو لە تۆ نادا، ئەگەر کارێکی وەهاشی کرد، بە پەتی قەنارەی هەڵدەواسم"
کچە بە پاڕانەوە: "باوکە من ئەوم خۆشناوێ."
پاشاش هاتەوە وەڵام: "تۆ زیاد لەبەرەی خۆی پێت ڕاکێشا. دەبێ واز لە بۆڵەبۆڵ بێنی. چییە دەڵێی ئەو کتێبە فرەنسییانە چاوی تۆیان لەبارەی ژنومێردایەتی کردۆتەوە. کچەکەم، شتەکە هەر تایبەت نییە بە تۆ، بەڵکو پرسەکە بە هۆزەکەمانەوە پەیوەستە. تۆ ئەم کارە لەپێناو نیشتماندا دەکەی. ئاگاداربە، شتێکی وەها نەکەی تووڕەمان بکەی."

دوای ئەو سەرکۆنەکردنەی شا، دەستەیەک لە ژنە بەتەمەن و بە ئەزموونەکانی هۆزەکەی پاشا سەری تاج سوڵتانیان دا تا وەهای لێبکەن بۆ ئەرکەکەی سازوئامادە بێ. ئەوان توانییان وەهای لێبکەن بچێتە لای باوکی و داوای لێبوردنی لێبکا.
پاشاش سەری ماچ کرد و بە دڵخۆشییەوە پێیگوت: "ئێستا کاتی *ئاشپەزونێکی* گەورەیە."
شا خۆی وشەی ئاشپەزونی داهێنابوو. واتاکەشی ئەوەبوو: بە هەموان سوپێکی چەوری ئێرانییانە لێبنێین.
شا حەزی لە سووپ بوو. ئەو هەمیشە بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕا تا *ئاشپەزون* ڕێک بخا. کاتێ شا جاری دەدا *ئاشپەزونی* دەدا، ژنانی حەرەمسەردا کەیفیان دەهات. ئەوان ئەمەیان بە ئاماژەیەکی کەیفسازی و میزاجخۆشی دەزانی و کەشێکی ئاهەنگئامێزی وەهای دەخوڵقاند،

سێبەرەکەی بۆ چەندین هەفتە بەسەر حەرەمسەراوە دەمایەوە. ئیدی ململانێ و شەڕەدەنووک و دەمەقاڵێ لابەلای نێوخۆیان بەلاوە دەنا، هەموویان دەست لەناودەست تا خواستەکەی شا بەدیبێنن.
بە شێوەیەکی ئاسایی ئەوان شێویان بۆ شا و منداڵەکانی لێدەنا، بەرماوەکەشیان دەدایە نۆکەر و پاسەوانەکانی کۆشک، لێ ئەمجارەیان پاشا ویستی بە شێوەیەکی زۆر گورتر و بەرفراوانتر بێ. ئەو ویستی سووپەکە بەسەر هەژارانی شاردا دابەش بکا، وەک بەلاگێڕییەکی شووکردنی کچەکەی بەڵکو لە گیانی بەدی بپارێزێ.

بۆ ڕۆژی ئاشپەزونەکە، پاشا بەیانییەکەی زوو لەخەو هەڵسا و لە حەرەمسەرا ئامادە بوو. هەر ڕاستەوخۆ لە دەرکەی کۆشک چادرێکی گەورە هەڵدرا، هەژارەکانی شار، هەر یەکەیان ئامانێک و مەنجەڵێکیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لەسەر شوێنگرتن قەراپەستانێیان بوو. لە پاشخانی حەرەمسەرادا بیست مەنجەڵی قفلداری گەورۆنە گەورۆنە بە دوو ڕیز لەسەر ئاگر دانرابوون. بۆنوبەرامەی سووپەکە دەمار دەڕۆیشت. هەمووان سەرقاڵی پاککرنەوەی سەوزە، پارچەپارچەکردنی گۆشت و ئامادەکردنی دەرمان و بەهارات بوون.
لە کاتی سازکردنی ئاشپەزوندا، ژنان پێدەکەنین، سەمایان دەکرد و گۆرانییان دەگوت و بە یەکتریان ڕادەبوارد. ئەو بایەخپێدانەی پاشا زیاتر دەیهەژاندن و دڵی خۆشدەکردن. ئەو بە بەژن و بالا و خشڵ و خۆرازاندوەیانی هەڵدەدا و دڵداریی لەگەڵ دەکردن.
تاج سوڵتانیش جلی ئاهەنگی پۆشین، بە شێوەیەکی تایبەتیش خۆی بە منداڵەکان سەرقاڵ کرد. هەرچەندە ژنەکان هەر هەموویان ئیرەیان پێدەبرد، لێ دەیانزانی لە دڵەوە بەختەوەر نەبوو.

پاشـــا تا دڵی کچەکەی خۆش بکا و زەوقی بکاتەوە، دەســـتەیەک لە ژنە موزیکژەن و گۆرانیبیژانیشـــی بانگهێشـــت کردبوو. کاتێکیش ئەوان بە موزیکەوە لە کۆشک هاتنەژوور، تاج سـوڵتان گەشـایەوە، پاشـا ئاماژەی بە موزیکژەنەکان کرد بوەســـتن. ئینجا ڕووی کردە ژنەکان و گوتی: "خانمان، هەر شـتێک پێویسـت بوو بیکەن، جلی جوان جوان لەبەربکەن. چونکە کەمێکی دیکە ئاهەنگێکی زۆر گەورەمان دەبێ."

بە ئاماژەی ئەو، موزیکژەنەکان دەســـتیاندایەوە ئامێرەکانی خۆیان. پاشـــاش کیژەکەی خۆی ماچ کرد و دەســـتی گرت و بەیەکەوە چوونە ســـەر مەنجەڵەکان تا هەر یەک هەندێ ســـەوزەی تێبکەن و پیرۆزبایی شاهانەیان لێ بخوێنن.

پاشان پاشا چووە سەر کورسی پشوودانەکەی دانیشت و پیاڵەیەک چا و قلیانیان بۆ هێنا. دوو کڵۆ شـەکری خسـتنە دەم، قومێکی لە چایەکە دا و قلیانەکەشی لەسەر کێشا.

لەو قاپە ســـووپەی بۆیان هێنا، یەک دوو کەچکی تێوەردان و تامی کرد. سەرنجێکی دایە ژنەکان بەوەی سوپەکە تامی خۆشە.

دوای خواردنەوەی چایەکەی، لەبەر قلیانەکە کەمێک ســـەری گێژ بوو، لەبەر تینی هەتاویش بۆرژا، ئیدی قاچەکانی لێ ڕاکێشـــان و ســـەری بەســـەر بالیفدا کرد وویســـتی چاوی گەرم بکا. لی هێشـــتا خەوی لێنەکەوتبوو، لەپڕ لە تەقەی تفەنگێک بە شڵەژاوی بەئاگا هاتەوە. ئەمەش کاری مەلیچک بوو نەیهێشت پشوو بدا.

پاشا بە پێکەنینەوە بانگی کرد: "هەی چەتوونی بچکۆلە!"

بەوەی شـا لەوێ بوو، مەلیچک وێرای زیاتر شـووڵ لێهەڵبکێشـی. چەند لاسـاری و شـێتایەتی زیاتر دەبوو، ئەوەندە شـا دڵی پێ خۆشـتر دەبوو. ئیدی ســـێرەی لە ژنان گرت. ئەوانیش بە قیژەوە هەڵدەهاتن، لەکاتێکدا

ئەوان شرینییان بۆ فڕێدەدا تا خۆیان لە شەڕی لابدەن، ئیدی شا لە بەر پێکەنینی دەکەوتە سەرپشت و ئاوی لەچاو دەهات.

بۆ دوای نیوەڕۆیەکەی، کاتێک پاشــا و ژنەکانی و منداڵەکان تێروپڕیان خوارد، ئینجا ژنەکان کشــانەوە نێو حەرەمســەرا. ئینجا دەســتەیەک لە پاسەوانان ئەوەی لە سوپەکە مابووەوە بۆ خەڵکەکەیان برد.
لەســەر بانی کۆشــکەکە پاشــا بینی حەشــاماتەکە چۆن بۆ خواردنەکە تێکقژقژاون، چۆن خۆیان بۆ پێشــەوە ڕاپێش دەکەن. پاســەوانەکانیش بێهوودە هەوڵیــان دەدا بیــانگەڕێننەوە دواوە و ڕیزیــان بکەن. لەو جەنجاڵییەدا یەکێ لە پیاوەکان پاڵی بە یەکێ لە پاســەوانەکانەوە نا و بە پاســەوانێکی دیکە کەوت، کە مەنجەڵی ســووپەکەی لەدەســت بوو. کابرا هاوسەنگی خۆی لەدەست دا، مەنجەڵەکەی لەدەست کەوت و سوپەکەش ڕژا.
ڕەوشــەکە لەدەســت دەرچوو، پاســەوانەکان بە دار و تێلای دەســتیان وەرگەڕانە خەڵکەکە لێدە ئەمما لێدە، خەڵکەکەش بە قاپ و قاچاخی دەســتیان لە ســەری پاســەوانەکانیان دایەوە. مەنجەڵە گەورەکانی پڕ لە ســووپ بە گۆڕی وەربوون و لە پشــتەوەی چادرەکەشــەوە مەشــخەڵی ئاگر بەرزبووەوە. سەردەستەی پاسەوانەکان لەو پاشاگەردانییەدا تەقەی بەهەوادا کرد. هەر بــابــا بوو لە ڕاســــتی خۆیەوە هەڵــدەهــات و پاسەوانەکانیش ڕاویان دەنان تا ئەو کاتەی ئارامی بۆ ئەوێ گەڕایەوە.
پاشــاش لە شــوێنی خۆی بێ جووڵە ســەیری ســووپە بەتامەکەی دەکرد، کە لەسەر زەوی جۆگەلەی بەستبوو.

# ٤٣

# جەمال خان

پشێوییەکەی ئاشپەزونەکە پاشای نیگەران کرد. بە دڵنیاییەوە هەر دەبێ دوێنێ جەمال خان و هاوبیرەکانی خۆیان بە شێوەی هەژار و دەرۆزەکەر شکڵگۆڕکردبێ و خۆیان خستبێتە نێو ئەو حەشاماتە و هەراکەیان نابێتەوە. ئەوان ئەو پشێوییەیان پەیداکرد، ئاخر ئەوان یەکەمین کەس بوون بە ڕووی هەیتە و یاساوڵەکاندا هەڵشاخان و شەڕیان کرد.

لە ڕاپۆرتێکدا ئەوە بە ڕوونی خرابووە ڕوو، گوایە جەمال خان بەرپرسیاری ڕژاندنی مەنجەڵەکانی سوپ بووە، ئاخر ئەو لە کاتی ڕاپەڕینەکەی گەلی ڕوسیا، لەوێ بووە و شارەزایە. هەروەها هەر ئەویش بوو، ئاگری لە چادرەکە بەردا و سووتاندی.

بۆ بەدواداچوونی ئەوەی ئاخۆ لە شارەکانی دیکەش ئەو هەرا و پشێویە ڕوویداوە، پاشا فەرمانی بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و بەرفراوان کرد.

هێشتا وڵات خاوەنی دەزگایەکی ڕێکخراوی ئاسایشپارێز نەبوو، تا دەستبەجێ بتوانێ نەیار و گومانلێکراوەکان ڕاو بنێن و سەرکوتیان بکا. دەبووایە بەرپرسی ئاسایشی شارەکان هەموو ئەو کەسانەی چووبوونە

دەرەوەی وڵات بانگ بکەن، بیانپشـــکنن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن و چاودێرییان بکەن، ئینجا ڕاپۆرتی خۆیان بدەنەوە. پاشـــا ئەم کارەی پێ شتێکی دژوار بوو.

لە دوای دوو مانگ، کاتێک پاشـــا دۆســـیەکەی خرایە بەردەم، چاوەڕێی ئەوەی نەکرد تا بە تەواوی لێی بکۆڵرێتەوە. ســـەرۆکی ئاســـایشـــپارێزی هەر شـــارێک ئەوەی بە شـــێوەیەکی ســـەرنجڕاکێشـــانە تێبینی کردبوو، کە دەستەیەک لە گەنجانی شارەکە بە بەردەوامی لەگەڵ یەک کۆدەبنەوە تا ڕەوشی وڵات هەڵبسەنگێنن و باسی لێوەبکەن. لە هەموو ڕاپۆرتەکانیش ئەوە دەرکەوتبوو، لەهەر دەستەیەک لەو دەستانەی شارەکان، یەک یان دوو کەسی تێدایە، کە لە دەرەوەی وڵات ژیابن و پاشان گەڕاونەتەوە.
پاشـــا ســـەرەتا لە کاتی بەرپابوونی هەراوزەنای ئاشـــپەزوندا، کە بەهۆی هەژار و نەدار و دەرۆزەکەران قەومـــابوو بە ڕێکەوتی دەزانی، لێ هەنووکە ئەو ڕاپۆرتانەی دەخوێندنەوە، پەی بەوە برد ئەمەیان بایەکی پێشوەختەی گەردەلوولی ناڕازیبوونە. بەدەستەسرەکەی ئارەقەی ســـەر نێوچاوانی سڕی، هەڵوەدای هەوایەکی فێنک و سازگار بوو. ئاخر ئەو لە وڵاتەکەی خۆی پشـــێوی و هەرای وەک ئەوەی لە ڕوســـــیا ڕوویدا، نەدەویســـــت. ئەو هەمیشـــە لەوە دەترســـا، ئەو کەســـانەی بۆ خوێندن چووبوونە دەرەوە، لە دەسەڵاتەکەی هەڵبگەڕێنەوە. ڕووداوەکەی سووپ لە کاتی ئاشـــپەزوونەکە و ناواخنی ئەو هەموو ڕاپۆرتانە، ترســـەکەی پشتڕاستکردەوە.
ئەو جارێکی دی دەســـتیدایەوە ئەو ڕاپۆرتانەی پێشـــتر لەبارەی دوان و قســـەکانی جەمال خان بۆی بەرزکرابوونەوە، بەڵام ئەو ئەوکات بەهۆی ســـەرقاڵی بە شـــووکردنی کچکەی فەرامۆشـــی کردبوون. لە یەکێ لە دۆســـیەکاندا، ڕســـتەیەک لەبارەی جەمال خانەوە نووســـرابوو، بووە

مایەی هۆشداری: "ئەو ئەو کەسە یاخییەیە هەر لە بۆمبایەوە تا میسر، پەیوەندی لەگەڵ ڕابەرانی هەموو نەیارەکانی هیندستان لە موسڵمان و هیندییەکانەوە هەیە و نامە و نامەکاری لەنێواندا هەیە."
شا دەمودەست بانگی سەرۆکی هێزی ئاسایشپارێزی تارانی کرد. بە ئاستەم توانی دەمارگرژییەکەی خۆی جڵەو بکا، لێ سەرەتا ئەو یەک دوو پرسیاری گشتیی لە پیاوەکە لەبارەی شارەکەی لێکرد. وەردە وردە سەری قسەی هێنایە سەر ڕووداوەکە.
"ئێمە ڕاپۆرتەکەی ئێوەمان خوێندەوە، ئێستا باش گوێ لەو پرسیارانەم بگرە و وەڵامی بێ پێچوپەنام بدەرەوە. ئایا تۆ لەوە خاترجەمی جەمال خان ڕۆژی گۆرینێ[٧٢] لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا بوو؟"
کابراش بە زمان تێکئاڵاوی گوتی: "بەڵێ، خاوەنشکۆ، لە ڕاستییدا، لە ڕاپۆرتەکەدا، بەڵێ، بەڵێ، بە دڵنیاییەوە."
"کەواتە نەخێر." شا ئەمجارە توندتر پێیگوتەوە: "پرسیاری دووەم. ئایا دڵنیای لەوەی، ئەو کەسەی مەنجەڵە گەورەکەی ڕژاند دەرۆزەکەر نەبوو، بەڵکو پیاوێک بوو ماوەیەک لە مزگەوتێ ژیابوو؟"
"ئەوەی ڕاستی بێ، چاوەکانمان، لە ڕاپۆرتەکەدا هەموو شتێکم ..."
پیاوەکە هەوڵیدا بە دەنگێکی پچڕپچڕەوە ڕوونی بکاتەوە.
پاشا پێیگوتەوە: "دیسان، نەخێر."
کابرا سپی هەڵگەڕا و چاوەڕێی پرسیاری سێیەم بوو.
شا هاواری بەسەرداکرد: "بڕۆ ئەو جەمال خانە بگرە! بۆمی بێنە ئێرە و وای لێبکە لێرە بکەوێتە سەر دەست و پێم. پاشان دەزانین ئاخۆ ئەم ڕاپۆرتانە ڕاستن یان نا."

---

[٧٢] ڕۆژی گۆرینێ: ڕۆژی قەومانەکە، ڕۆژی مەبەست.

جەمال خان دوای گەڕانەوەی لە دەرەوەی وڵات، لە ماڵی باوانی لە تاران دەژیا. ئەو لە مزگەوتان قسەوباسەکانی خۆی دەکرد، وەک ئەوەی تاکە چالاکیی ئەو بێ. ژێربەژێریش تۆڕێکی پەیوەندی لەگەڵ سەرتاپای چالاکوانەکانی وڵات ڕاچاندبوو. ئەم کردەیەشی زۆر بە هێواشی بەڕێوەدەچوو، چونکە بەدەست چوونە شارەکان گیری خواردبوو. ئەم کارەشی تا بتوانی کەسانی لێهاتوو بۆ مەبەستەکەی کۆبکاتەوە و ڕێکیان بخا زیاتر لە ساڵێکی دەخایاند.

وردەوردە لە شارە گەورەکاندا مەکۆی وەها پەیدابوون تێیدا ڕەوشی سیاسیی ناوەخۆ و گۆڕانکارییەکانی وڵاتە دراوسێکانی وەک ڕوسیا و هیندستانیان تێدا دەهێنایە گۆڕێ.

دوای فەرمانی گرتنی جەمال خان، دەستەیەک لە هەیئەتەکانی پاشا بە نیوەی شەو بەسەر ماڵی باوانی جەمال خانیان دادا، لێ ئەویان لەوێ نەدۆزیەوە.

سەرۆکی هێزی ئاسایشپارێزی شا پیاوەکانی خۆی لە شارە گەورەکان ئاگادارکردەوە و زانیاری لەبارەی جەمال خان پێدان، بۆ ئەوەی هەر کەسێک بەو ڕوخسار و خاسییەتانەی بەردەست کەوت، بیگرن. بەڵام لەو وێناکردنە تەمومژاوییانەی درابوو کتومت پیاوەکەی پێ نەدەناسرایەوە، لەوەش پۆلکتر[٧٤] ئەیاندەزانی لە کوێ بەدوایدا بگەڕێن تا بیگرن و ڕاپێچی بکەن.

هاوڕێکانی جەمال خان وتار و شوێنی وتاردانیان بۆ ئامادە دەکرد. ئیدی لەپڕ و بەبێ ڕاگەیاندن لە نوێژی هەینیی مزگەوتێک پەیدا دەبوو.

---

[٧٤] پۆلکتر: بەدتر، خراپتر.

کاتێکیش سەروسەکوتی یاساولەکانیش پەیدا دەبوو، لەنێو گوڕدەمەکەدا[75] خۆی دەشاردوە، تێ بزر دەبوو، نەدەکەوتەبەر.
لەو شوێنەی جەمال خان بۆ یەکەمین جار وتاری خۆی دا، باسی پێشکەوتنی وڵاتەکانی ڕۆژئاوا لە کاروباری ڕۆژانەی ژیانیان بۆ خەڵکەکە کرد. ئەو بە ڕوونی ئەوەی نیشان دا نیشتمان چەند لە دواوەیە. ئەو خەڵکەی بۆ یەکەمین جار جەمال خانیان دەبینی و گوێیان لێدەگرت، کەسانێکی تاسەمەند و پەرۆش بوون، نەشیاندەزانی چۆن لەگەڵ قسەکانی ئەودا بجووڵێنەوە و چی بکەن. ئەو وای لێکردن بیر لە پێغەمبەرەکانی سەردەمی بەرێ بکەنەوە، سەردەمی خۆ ئاشکراکردن و بانگەوازی خۆیان، سەردەمی چوونە نێوخەڵک و ئاگادارکردنەوەی خەڵک. شتێکی سەیریش نەبوو ئامادەبووان بەشێک لە قسە و وتارەکانی لەبەربکرێن. جەمال خان بە تەنیا بەو جموجۆڵە هەڵنەستابوو، ئەو لەگەڵ شەش کەسی باوەڕپێکراو بەسەر چالاکییەکانی ڕادەگەیشت.
یەکێک لە هاوڕێکانی فەتحعەلی ئاخوندزادە بوو. ئەویش لە لەندەن ژیابوو، لە زمانی ئینگلیزیش قاڵ بووبووەوە. یەکەمین نووسینیشی کتێبێک بوو لەبارەی ڕێزمانی فارسییەوە، هەروەها ئەو بە دنەدانی گیانی وەزیری پێشوو، بانگەوازی ئەوەی دەکرد، دەبێ هەموو منداڵانی وڵات ئەو دەرفەتەیان پێبدرێ فێری نووسین و خوێندنەوە ببن.
یوسف مستەشار عەبدولیش چەند ساڵێک لە باڵوێزخانەی ئێران لە پاریس ئیشی کردبوو، لێ لەبەر ئەوەی ڕەخنەی لە گەندەڵیی دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەی خۆی گرتبوو، لەسەر کارەکەی لادرابوو، ئینجا پاریسی جێهیشت و چووە ئیستەنبول، لەوێوە ڕۆژنامەیەکی بە زمانی

[75] گوڕدەم: ئاپۆرا و حەشاماتی خەڵک، کە بەیەک جار بۆ شوێنێک بڕۆن یان لە شوێنێک خڕببنەوە.

فارســـی دەردەکرد، ڕۆژنامەیەک بە شـــێوەیەکی قاچاغ ئاودیوی وڵات دەکرایەوە.
زەینولعابدین مەراغەیی ســـێیەمین پیاوی دەســـتەی هاوڕێیان بوو، ئەو هونەرمەنـدێک بوو، لە بۆمبـای و دوای ئەوەش لە ڕۆمـا ژیـابوو، بە قووڵییش چووبووە نێو هونەرەکەی. مەراغەیی زمـانی ئیتـاڵی دەزانی، وتاری لە ڕۆژنامە ئیتالییەکان دەنووســی. ئەویش گەڕابووەوە نیشـتمان تا هاوڵاتییەکانی لە خەوی غەفڵەت بێدار بکاتەوە.
چوارەمینیان حاجی عەبدولڕەحمان تاڵیبۆف بوو. پیاوێک خەڵکی تەورێز، هەمیشـــە لە دیوەکەی دیکەی ســـنووری ڕوســـیا ژیابوو، لە ســـەنت پەترســـبورگیش خوێندبووی. تـالیبۆف پەیوەنـدییەکی بـاشـــی لەگەڵ ڕابەرانی ناڕازیی مۆسکۆ هەبوو.
میرزا ڕەزا کرمانی پێنجەمین کەسیان بوو، کەسایەتییەکی سەرنجڕاکیش. ئەو ڕۆڵەی ئایەتوڵلای شـاری کرمان بوو. باوکی ئەوی ناردبووە عێراق بۆ ئیمـامەتی بخوێنێ. لە عێراقەوە پەیوەنـدی بە دەســـتەیەک لە میسرییەکان پەیداکردبوو، ئەوانەی بەگژ دەسەڵاتی کۆلۆنیالیی بریتانییدا چووبوونەوە. ئینجا لە عێراقەوە دەچێتە میســـر، لەوێ چاوی بە جەمال خان دەکەوێ. ئەوان پەیوەندییان بە یەکەوە هەبوو، لە تارانیش یەکدییان گرتەوە. میرزا ڕەزا مێزەرەکەی بە سیدارەیەک گۆڕیبووەوە، ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا لە لایەن ڕۆشنبیرانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا لەسەر دەنرا.
دواهەمین کەســـی دەســـتەکە ئەمیر بوو، چەند ســـاڵێک دواتر بووە سەرۆوەزیری وڵات. هەمووان ئەمیریان وەک لاوێکی ڕۆشـنبیر دەناسـی، کە وەک دەســـتەڕاســـتی وەزیری کوژراو کاری دەکرد. ئەمیر دوای کوژرانی وەزیر، ژن و دوو کیژۆڵەکەی لەنێو گالیسکەیەک شاردبوونیەوە و لە تاران دەربازی کردبوون. پاشان بۆ ماوەیەک خۆی بێسەروشوێن

کرد. ڕیش و سمێڵەکەی ئەویان ئاشکرا کرد. وەک وەستایەک گەڕایەوە تاران، لەوێ چاوی بە جەمال خان کەوت و بەیەکەوە کاریان کرد.
ئەو دوو پیاوە بەردەوام بەتەنیا سەفەریان دەکرد، وەک ئەوەی شتاقیان[76] ئەوی دیکەیان نەناسیبێ. ئەوان لە شوێنی جیاجیا کۆدەبوونەوە، بە نهێنییش کۆمیتەیەکیان لە دژی ڕژێم پێکهێنابوو.

لەپاش شەش مانگ کە بەسەر ڕووداوی سوپەکەدا تێپەڕی بوو، جەمال خان دوانێکی چارەنووسسازانەی لەسەر مەزاری پیرۆزی عەبدولداوددا دا. خۆی ئەمە دوانێکی جیاواز و لە شوێن و ڕۆژێکی ناوازەشدا بوو.
لەسەر گڵکۆی عەبدولداوددا بە هەزاران کەس بە بۆنەی ڕۆژی لەدایکبوونی ئیمام مەهدیی فریادڕەس کۆبووبوونەوە. بەندوباو وەها بڵاوبووبووەوە، جەمال خان لەو ڕۆژەدا وتارێکی گرنگی دەدا. بێگومان ئەویش باشترین شوێن بوو تا لەبەردەم گوڕدەمێکی زۆر لە خەڵکی دەربکەوێ، چونکە چوونە نێو مەزارەکە لە یاساڵەکانی ئاسایش قەدەغە بوو. لەنێو چوار دیوارەکانی مەزارەکەدا بەگوێرەی نەریت هەموو کەسێک پارێزرا وو. تەنانەت پارێزراوییەکە تاوانبارانیشی دەگرتەوە.
هیچ شوێنێک لەنێو حەوشەی مەزارەکەدا نەمابووەوە نەگیرابێ. گرووپی شەش کەسییەکە سەکۆیەکییان لە مەزارگەی عەبدولداود بۆ جەمال خان ڕێکخست. ئەو کەسانەی بەندوباوی دوانەکەی جەمال خانیان گوێ لێبووبوو، تێکۆشان چەندی بکرێ لە سەکۆکە نزیک بکەونەوە. ئاپۆرای خەڵکەکە بە ئۆقرەلێبڕاوییەوە چاوەڕێی هاتنی جەمال خانیان دەکرد. ئەوەبوو لەپڕ جموجۆڵێک پەیدا بوو. جەمال خان بە شاڵێکی کەسکەوە لەسەر سەکۆکە پەیدا بوو.

[76] شتاقیان: هیچ کامیان

ئەو شاڵە كەسكەش تەنیا لە لایەن ئەو كەسانە دەبەسترا كە خۆیان بە نەوەی محەمەد پێغەمبەر دەزانی. یەكەمین جاریش بوو، جەمال خان بە شاڵێكی سەوزەوە لەنێو خەڵكیدا دەربكەوێ. كاتێكیش خەڵكەكە شاڵە كەسكەكەیان بینی، هاواریان كرد: "*سەلو عەلا محەمەد وە عەلا ئالی محەمەد*. سڵاو لە محەمەد وماڵباتی محەمەد."

تا دەهات جۆش و خرۆش پتر دەبوو، هیچ شوێنێك لەنێو حەوشەی مەزارەكەدا نەمابووەوە نەگیرابێ. "خەڵكینە!" بەم جۆرە جەمال خان لەو ئامێرەی دەنگی پەخش دەكرد هاتە قسە: "ئێمە هەموومان بۆ ئەوە هاتووینەتە ئێرە تا ڕۆژی لەدایكبوونی ئیمام مەهدیی فریادڕەس یادبكەینەوە. پێتان دەڵێم هەرگیز ڕزگاركەرەكە نایەت تا جیهان لە كوێرەوەری دەرباز بكا، بەڵام ئەی بڕواداران، ئێمە سووكایەتی بەو دەكەین ئەگەر خۆمان هیچ نەكەین، ئەگەر ئێمە لە خەوی غەفڵەتدا بین و خۆمان لاواز نیشان بدەین و هەر چاوەڕێی فریادڕەسەكە بكەین بێت و ڕزگامان بكا.

هۆ خەڵكینە! ئێمە خاوەن مافین. پیاوان مافیان هەن، ژنان هەیانە و منداڵانیش مافیان هەیە. دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتە مافەكانیان لێ زەوت كردووین، ئەوان وەك مەڕوماڵات لەگەڵ خەڵكەكە دەجووڵێنەوە.

هۆ خەڵكینە! من پەیوەندییم لەگەڵ دەستە و كۆمەڵە بەرگرییەكانی وڵاتانی دەرودراوسێدا هەیە. ئینگلستان لە بەشی خواروی وڵاتەكەماندا بە ڕۆژ و شەو بەدوای نەوتماندا دەگەڕێ. دیارە بڕێكی لەبننەهاتوو نەوت لە پارێزگای باشووری وڵاتدا هەیە. ئەمەش ڕاستییە بریتانییەكان دەیانەوێ ئەو شتەمان لێ بشارنەوە.

هۆ خەڵكینە، لەوانەیە ئێوە نەیزانن، بەڵام نەوتی ژێرزەوی بەقەد زێڕی تەواوعەیار بەنرخە. نەوتەكە سووتەمەنییە بۆ چەرخی دەزگا و مەكینەی كارخانەكانیان .

ئینگلستان، پاشا و شازادەکانی کڕیون. ئەو کەسانەی لە شاوە نزیکن، هەر بەرکی خۆیان پڕ دەکەن. ئەوان بوونەتە دەوڵەمەندی ناقۆلا، لەکاتێکدا بە هەزاران پیر و پەککەوتە لەم وڵاتەدا هەن توانای ئەوەیان نییە جووتە پێڵاوێک بۆ منداڵەکانیان بکڕن."

لەبەرئەوەی ئەو لەسەر سەکۆیەکی گەورە بە پێوە وتاری دەدا، ئیدی جەمال خان دەیتوانی ئەوە ببینێ چۆن دەستەیەک لە چەکدار لە دەرەوەی مەزارەکە خەریکن لە دەورەی یەکدی خڕدەبنەوە. ئەو زانی ئەوان بۆ ئەو هاتوون و دەرکەشیان لێگرتوون نەتوانێ لەبەردەستیان دەربچێ. لێ ئەوەشی دەزانی، ئەوان ناوێرن لە مەزەراکە بێنە ژوور.
"خەڵکینە! ئێوە مافی خۆتانە گەرماو و نەخۆشخانەتان هەبێ. خۆ هەمووان ناتوانن لەسەر زەوی و لەسەرماڵیاتەکانیان بژین، ئێوە مافی کارکردنتان هەیە، لێ تەنیا ئەوەندە هەیە ئێمە لە وڵاتدا کارخانەمان نییە. سەیریکی دەوروبەری خۆتان بکەن، لێرە لەو مەزارەدا، بە سەدان دەرۆزەکەر، کەسانی نابینا، منداڵی کەمئەندام و پیرەمێردی نەخۆش هەن. ئێمە پێمان وایە ئەمە لەگەڵ ژیاندایە، بەڵام با من شتێکتان پێڕابگەیەنم، پێویست نییە ئەو حاڵەتەدا وەهابێ، کە هەیە. ئەو کەسانەی ئاماژەم بۆ کردن دەکرێ چاک ببنەوە. ئەوانیش هەروەک شازادەکان، هەروەک خەڵکی دەوڵەمەند، دەکرێ خاوەنی تەندروستی باش بن. هۆ خەڵکینە! دەستڕۆیشتووانی ئەم وڵاتە بیر لە ئێوە ناکەنەوە. ئەوان هەر بیر لە خۆیان دەکەنەوە. گەلی هاووڵاتیان! بە ئاگا وەرنەوە!"
ئەو لە شوێنی خۆی بینی، یەکێ لە پاسەوانەکان بە خۆی و تفەنگەکەی دەستییەوە بەسەر دیوارەکەدا هەڵگەڕا و خۆی لە پەنا چوارچێوەی دەرکەکەدا پەنا دا. ئەو کۆتایی بەم قسانە و کۆتایی بە دوانەکەی خۆی هێنا:

"خەڵکینە، من دەبێ پەلە بکەم. هێشـــتا شـــتی گرنگی دیکە ماوە پێتان ڕابگەیەنم. داوا تان لێدەکەم ســـەرنجی ئەو گۆڕە نەناســـراوە بدەن."
لەکاتێکدا دەدوا بە پەنجە ئاماژەی بۆ شوێنێکی تەنیشت سەکۆکەی کرد.
"لەوێ وەزیر میرزا کەبیر نێژراوە، ئەو کەســەی لە لایەن شــاوە کوژرا. ئێمە کێلمان بۆ دروستکردووە و بەم زووانەش دەمانەوێ..."
ئەو نەیتوانی قســـەکەی تەواو بکا، چونکە تەقە کرا و گوللەیەک بەر دینگەی ســـەکۆیەکەی کەوت. ئیدی پاســـەوانەکان بەســـەر مەزارەکەیان دادا.

دوو جاری دیکە تەقە کرایەوە، خەڵکەکە ڕای کرد و پەرت بوون. جەمال خان هەوڵیدا بە پشــت ســـەکۆکە هەڵبێ و خۆی دەرباز بکا، بەڵام ســێ هەیتەی لەسەر ڕێگە وەستان. یەکێکیان مەترەقەیەکی لە شانی دا، لەبەر زەبرەکە ســـاتمەی برد و کەوتە ســـەر زەوی. ئیدی پیاوەکان هەر بە شاڵەکەی خۆی دەستیان لە پشتەوە شەتەک دا. لە کۆتاییدا کشانەوە و پاڵیان بە خەڵکەوە نا بەرەو دەروازەی مەزارگەکە ڕۆیشتن. خەڵکەکەش، کە هاتنەناوەی هەیتەکانیان بۆ نێو مەزارەکە پێ هەرس نەکرا، دەســتیان کردەوە و پەلامــاریــان دانەوە. پێنج لە هــاوڕێکــانی جەمــال خــان هەراوزەنــایــان بە دەرفەت زانی بە قوتران[77] وەرگەڕانە هەیتەکــان، بە شێوەیەک توانرا جەمال خان لەبەردەستیان قوتار بێ و بەنێو گوڕدەمی خەڵکدا ون بێ. دەستەیەک لە چەکدارانی پاشا بە خۆیان و تفەنگەکانیان هــاتنە نێو مەزارەکە و تەقەیــان لە هەمووان دەکرد. ژنــان لە قیژە و هاواریان دا، منداڵان گریان، بە تەمەنەکانیش کەوتنە بن دەســـت و پێ، بەڵام هێشـــتا پیاوە بەهێزە ســـەردانکەرەکانی مەزارگە بە ژیانی خۆیان بەرگرییان کرد، پڕیان دایە چەکدارەکان و چەکەکانیان لێ ســـتاندن و فڕێیان دانە دەرەوەی مەزارەکە.

---

[77] قوترە: تێڵا، مەترەق.

خەڵکەکە زۆر لە هاتنەناوەی چەکدارەکان بۆ نێو حەرەمی مەزارەکە و تەقەکردن تێیدا دەهری بوون. ئاخر بەو لاساریەیان نەریتیکیان شکاند و ڕێز و شکۆی مەزاری عەبدولداودیان شکاند. ئیدی لە گەرووی هەزاران کەس هاوار دەکرا: "ئەڵڵاهو ئەکبەر!"

دوای ماوەیەک ئارامی بۆ مەزارگەکە گەڕایەوە. خەڵکەکە بە بازنە لە دەوری گۆڕەکەی وەزیری کوژراودا وەستان، یەکێک چەند ئایەتێکی لە قورئان خوێندنەوە. هاوڕێکانی جەمال خانیش بە شکۆوە کێلەکەی وەزیریان دامەزراند، ئەم چەند وشەیەی لەسەر هەڵکەنرابوو: "لێرە میرزا کەبیر، وەزیرە لێهاتووەکە نێژراوە."

# ٤٤

# ڕابەر

دوای ڕووداوی ســــەر مەزارگەکە، هەیتەی تایبەت بە جلی مەدەنییەوە ئـامـادەی هەموو کۆبوونەوە گومـانلێکراوەکـان دەبوون و چـاودێرییـان دەخســـتەســـەر، بۆ ئەوەی وتاربێژ و قســـەکەر نەتوانن بە ئارەزووی خۆیان قســـە بۆ خەڵکی ئامادەبوو بکەن. بەڵام لەو ڕۆژە بە دواوە تا ماوەیەکی دوورودرێژ تووشی هیچ ڕووداویکی لەو جۆرە نەبوونەوە.

بەرهەڵســـتکارانیش بۆ ماوەیەک بێدەنگییان لێکرد، پێدەچوو جارێ هیچ جموجۆڵێکی وەها نەکەن پێیەوە دیار بێ. دیاربوو ئەوەیان دەزانی پاشـا بە مســـتێکی ئاســـنین لەگەڵیان دەجووڵێتەوە ئەگەر هات و جارێکی دیکە پشێوییان نایەوە.

جەمال خان و هاوڕێکانی لەوە تێگەیشـــتبوون ناتوانن بروســـکەئاســـا ئاپۆرای خەڵک بجووڵێنن و دەستبکەنەوە. هەڵمەتێک کە بۆ توندوتیژی و زەبروزەنگ ســـەربکێشـــێ، خەڵکەکەی ترســـاندبوو، هەر بۆیە خۆیان لە بیرۆکەی ئەو دەســـتەیە بە دوور دەگرت. ئـاخر جەمـال خـان گوتی؛

منداڵەکانیان مافی ئەوەیان هەیە ببنە خاوەنی جووتێک پێڵاو، کەچی خەڵکەکە نەیدەزانی ئەم قسەیە چ پەیوەندییەکی بە پاشاوە هەیە.
ئەو باسی کانی بێبنی نەوتی ژێرزەمینی کردبوو، خەڵکەکەش نەیاندەزانی ئەم شتە چ بایەخێکی بۆ ئەوان هەیە.
ئەو باسی پێوستیی کردنەوەی قوتابخانە بۆ منداڵەکانی ئەوانی کردبوو، بەڵام ئاپۆرای خەڵکەکە هێشتا بایەخی بەرچاوی خوێندن و نووسینی بۆ منداڵەکانی نەدەزانی.
هیچ بابەتێکی وەها نەبوو ڕاستەوخۆ سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشێ و بەهۆیەوە بیانجووڵێنێ. ئاخر خەڵکەکە پاشایان بە سێبەری یەزدان لەسەر زەوی دانابوو.
جەمال خان و هاوڕێکانی نەیاندەتوانی تەکتیکەکانی بزووتنەوەی بەرگریی لە مۆسکۆ و وڵاتەکانی دیکە لەسەر وڵاتەکەی خۆیان بگونجێنن و پەیڕەوی بکەن، ئەوان دەبووایە ستراتیژی تایبەت بە خۆیان دابنێن، ڕێکارێک لەگەڵ دابونەریتە باوەکەی ئێران بگونجێ. وێڕای ئەوەش دەبووایە واز لە سەرکێشیی ترسناکانەی گەشتەکانیان بۆ شارەکان بهێنن، بەپلەی یەکەم تاران بکەنە چەقی بازنەی چالاکییەکانیان.
لە کۆبوونەوەی دواتری نێو خۆیان، میرزا ڕەزا کرمانی پێشنیازێکی کرد. پێشتریش خووخدەی ئەو کەمدووی و بێدەنگی بوو، بۆیە کاتێک نۆرەی قسەکردنی هات، هەمووان بە تاسەوە گوێیان لێگرت.
"من زۆر دڵنیا نیم، پێموابێ لە چارەسەرییەک بۆ ئەم ڕەوشە نزیک بوومەتەوە."
جەمال خان پێیگوت: "دەی، پێمان بڵێ."
"بە لێکدانەوەی من، ئێمە هەرگیز ناتوانین قەناعەت بە گوردەمی خەڵک بهێنین، ئاخر ئێمە ئەو کەسە دیار و ئامادەبۆکراوانە نین تا وڵات بەڕێوە

ببەین. ئەوان ئێمە ناناســـن، بەدوای ئێمە ناکەون، ئەوان ڕابەری خۆیان دەوێ، یەکێک لە زاناکانی خۆیان، کەسێکیان دەوێ ڕابەرێکی میللی بێ."
"لێ خۆ هەرئەوەیە کێشەکە، ئەو کەسە دیار نییە."
میرزا ڕەزا وەڵامی دایەوە: "بایی پێویست لەو کەسانە هەن."
تالیبۆڤ قسەکەی پێبڕی: "کەواتە، ئەو کێیە؟"
میرزا ڕەزا وەڵامی دایەوە: "ئایەتوڵلاکان! سەیرکەن، لە ڕوسیادا ڕابەرانی ڕەوتی بەرگری، هێزوتینی خۆیـان لە کرێکـارانەوە وەردەگرن، ئەوان پشــتیان بە دەســتی کاری کارخانەکان بەســتووە، بەڵام ئێمە لێرە هیچ کارخانەمان نین، لەوەش هەر گەڕێ چینی کرێکارمان هەبێ. ئەوەی ئێمە هەمـانە دوکـانـدارەکـانی بـازاڕ و ژمـارەیەکی لەبنەهـاتووی خەڵکی نەخوێندەواری بێ کاروکاســبییە. ئەمانەش گوێ لە ئایەتوڵلاکان دەگرن. ئەوەی ئێمە پێویستمان هەبێ ئایەتوڵلایەکی دەستڕۆیشتووە."
هەموویان بەو ڕوونکردنەوەیە ئەوق مان و چاویان لێ زەق بوو.
"لێ تۆ لەبیرت چووە، کە ئـایەتوڵلاکـان ڕێکوڕەوان هێزی گەورەی نەریتپارێزی وڵاتن." مســتەشــار عەبدول وەها هاتەجواب و درێژەی بە قســـەکەی خۆی دا: "ئەوان هیچ لەبارەی جیهانەوە نازانن. ئەوان حەز و مەیلیشــیان بە لای تەکنیکدا ناڕوا، ئەوان لەو دونیا پانوپۆڕەدا هەر ســێ شار دەناسن: مەککە کە ماڵی خوای لێیە، مەدینە کە محەمەد پێغەمبەری لێ نێژراوە، نەجەف عەلی تێدا کوژرا و لەگەڵ کەربەلا، کە لەســـەر خاکەکەی ســـەری حوســـێنیان بڕی. ئەوەی ئێمە پێویســـتمان پێیەتی زانســـتە، گۆڕانکـارییە. ئێمە دەبێ ئـاگـامـان لەوە بێ وڵات نەخەینە بەردەستی ئەو جۆرە هێزانە."
ئەمیر نیزام گوتی: "ئەمەش وایە. ئایەتوڵلاکان لەبارەی پرسی نەوتی خاو و تێلێگرافەوە هەســـتیار نین، هەر گوێشـــیان لێ نییە. ئەوان بە ماڵی

پاشـــایەتییەوە گرێدراون، لەو بڕوایەشـــدان هەژاری، دەرۆزەکردن و نەخۆشی لەگەڵ ژیان دایە و خودا دایناون."

میرزا ڕەزا وەڵامی دایەوە: خۆ نـابێ بەیەک چـاو ســـەیری هەموو ئایەتوڵڵاکان بکەین. ئاخوندی دەستڕۆیشتووی وەها هەیە هەروەک ئێمە لە وڵات دەڕوانێ و لەبن باری کوێرەوەرییدا دەناڵێنێ."

جەمال خان بە پرسنییەوە قسەی کرد: "دەی، کێیە؟"

"من بیرم بۆ ئایەتوڵڵای شاری شیراز دەچێ. حاجی شێخ عەلی ئەکبەر موجتەهیدی شیرازی، باشتر هەر بەناوی میرزا شیرازی ناسراوە. ئەو هەرگیز گیانی خۆی نەفرۆشتووەتە دەسەڵات."

"تەمەنی چەندە؟"

"پێموابێ هەشتا، هەشتا و پێنج ساڵ دەبێ، لەوانەشە هەشتا و حەفتیش بێ."

ئاخوندزادەشت هەڵیدایێ: "هەشتا و حەفت؟! کەواتە خەریکە دوارۆژەکانی خۆی دەژمێرێ، پێدەچێ نەتوانێ لەســـەر قاچەکانی خۆیشـــی بڕوا. ئەو ناتوانێ یارمەتی ئێمە بدا، ئێمە ســـەرکردەیەکی لاوی بە گوڕوتینمان پێویستە."

میرزا ڕەزا پێشـــنیازەکەی خۆی وەها ڕوونکردەوە: "خۆ حەوجە نییە ئاخوندی ڕابەر وەک مامز بڕوا، هەر پێویســـت ناکا لەســـەر جێگەکەی خۆشـــی هەڵبســـتێ. خۆ ئەگەر بیەوێ هەر بە یەک دوو وشـــە دەتوانێ تەخت و تاجی شا بلەرزێنێ و قوتقوتۆکێی بگرێ. لەبەر ئەوەی بەتەمەنە، کەواتە هێز و دەسەڵاتێکی زۆری هەیە، من باش دەیناسم."

تالیبۆف پرسی: "چەند باش دەیناسی؟"

"ئەو کۆنەدۆســـتێکی باوکی کۆچکردوومە، بۆ ماوەیەکیش لە مزگەوتی هەینی لە شـــیراز دەرســـم لای خوێندووە. ئەگەر بتانەوێ دەتوانم پێتانی بناسێنم و قسەی لەگەڵ دەکەین."

"بەلام چی پێ بلێین؟ چی لێ داوا بکەین؟"

ئەمیر نیزامیش گوتی: "ئێمە دەبێ شتێکی هەستیاری لەگەڵ باس بکەین تا بتوانین قەناعەت بە کەسێکی وەک ئەو بکەین. بیرم لێکردۆتەوە. خۆ ناکرێ باسی وڵاتەکەمان، باسی گەل و تێلێگرافی لەگەڵ بکەین، بەڵکو باسی دینی لەگەڵ بکەین. ئێمە پێویستە ئەو بهێنینە سەر ئەو بڕوایە، کە ئیسلام لە مەترسیدایە."

هەمووان لە شوێنی خۆیان گەڕانەوە دوا و بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان. میرزا ڕەزاش چای بۆ تێکردن.

ئەم پێشنیازە خاڵی وەرچەرخانی ڕەوتی بیروهزری ئەوان بوو. تۆ بڵێی ئایەتوڵلایەکی بەساڵاچووی وەک ئەو چی بە خەڵکەکە بڵێ تا لە دژی ڕژێمی گەندەڵی شا هەڵبگەڕێنەوە؟ ئەدی چۆن ئەوان بتوانن قەناعەت بەو بێنن بەوەی ئیسلام لەبن باری مەترسیدایە؟ هەر بە ڕاستییش ئەمە پێشنیازێکی نایاب بوو میرزا ڕەزا کردی، بەلام پێویست بوو ئەوان لە بیرۆکەکە قووڵ ببنەوە.

ئینجا جەمال خان هاتەوە قسە: "لێرەوە دەوەستین. هەفتەی داهاتوو زیاتر تاوتوێی دەکەین."

لە پاش هەفتەیەک کە کۆبوونەوە، هێشتا کەسیان ڕێوشوێنێکی گونجاوی چۆنیەتی جێبەجێکردنی بیرۆکەکەیان لانەبوو. تا یەکێک لەوان لە دووتوێی قسەکانیدا ئەوەی بەسەر زاردا هات، گوایە باس لەوە دەکرێ ژنانی ئێرانی بە شێوەیەکی بەردەوام لای ئەندازیارە بریتانییەکان دەبینرێن و لایان دەمێننەوە.

تالیبۆڤ هەڵیدایێ و گوتی: "ئەمە شتێکی گونجاوە با زەقی بکەینەوە."

ئاخوندزادەش گوتی: "ئەمە بە دەردمان ناخوا، خۆ ناکرێ باسی قەحپەکانی تاران بێنینە گۆڕێ."

زەینولعابدینیش هاتە قسە و گوتی: "دەتوانین لەگەڵ ئایەتوڵڵاکە باسی هەژموونی زاڵی بریتانییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا بکەین."
جەمال خانیش وەڵامی دانەوە: "پێویستە بابەتێکی ڕوون و ڕاشکاو هەبێ، دەنا خەڵکەکە بە دوای ناکەوێ. هەژموونی زاڵی بریتانییەکان بۆ ئەوان هیچ لە پرسەکە ناگۆڕێ."
ئەو ئێوارەیەش گفتوگۆکانیان بە ئامانجێکی یەکلاکەرەوە نەگەیشت، لێ لە میانی وتووێژی ئایندەیاندا ئەمیر نیزام و تالیبۆڤ پلانێکیان خستەبەر باس، ئەگەر بێت و باش دەستیان پێوەگرتبا، دەبووە بومەلەزە.[78]
سەرەتا تاڵیبۆڤ هاتە قسە. تالیبۆڤ ئەو پیاوە بوو لە مۆسکۆ خوێندبووی و ڕوسی وەک بولبول دەزانی. زۆر جاران ببووە پێناوی نێوان بازرگانە ئێرانی و خاوەنکار و بەرهەمە ڕوسییەکان پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ باڵوێزخانەی ڕوسیا لە تاران هەبوو.
"پار شا هەموو مافەکانی بازرگانی بە هێنان و ناردنی بەرهەمەکانی توتنی بە بریتانییەکان فرۆشتووە. لەسەر بنەمای داهاتی ساڵانە بڕێکی کەم دەدرێتە پاشا، بەڵام بریتانییەکان لەسایەی ئەم مافەوە پارەیەکی یەکجار زۆر قازانج دەکەن. هەڵسوڕێنەری کاروباری توتنی وڵاتی ئێمە ئێستا پیاوێکی ئینگلیزە."
ئاخوندزادەش گوتی: "ئەمە بە شێوەیەکی گشتی ناسراوە، دەتەوێ چی بڵێی؟"
ئەمیر هاتە قسە: "با بۆتان ڕوون بکەمەوە. ئەم کابرا بریتانییە هەموو پشکنەرە ئێرانییەکانی بۆ توتن لەسەر کار لاداون، کارەکەی ئەوانی داوەتە پشکنەرە هیندییەکان. نرخی توتنی دابەزاندووە و لە بەرانبەردا نرخی بەرهەمی توتنی بریتانی بەرزکردۆتەوە. کارمەندە بریتانی و هیندییەکانیش لەگەڵ جوتیارانی توتنی ئێرانی زۆر بە خراپی

---

[78] بومەلەزرە: زەمینلەرزە، زلزال.



دەجووڵێنەوە و بارێکی هەراسـان لە نێوان توتنفرۆشانی بازاڕ و کۆمپانیای بریتانی پەیدابووە."
هەموان گوێیان گرتبوو، لێ کەس لە مەبەستی ئاخێوەرەکە نەگەیشت، ئاخۆ بۆ کوێ سەردەکێشێ.
ئەمیر نیزام لەکاتی قسەکردندا چاوی دەبریسکانەوە: "ئێوە نابێ ئەوەتان لە بیر بچێ، توتن لە وڵاتەکەمان بەقەد نان بەنرخە. نزیکەی هەموو پیاوەکانی وڵاتەکەمان کیسەیەکی پڕ لە توتنیان پێیە، هەموو ژنان قلیان دەکێشن."
جەمال خان پێی گوت: "دەی لەسەر قسەت بەردەوام بە."
تالیبۆڤیش هەڵیدایێ: "بەرپرسە بریتانییەکەی کۆمپانیای توتن کەسێکی قۆشمەیە. ئەو قەڵەوە و بە دوای هەواوهەوەسی خۆیەوەیەتی و حەزی لە ژیانی خۆشە. من دووبەدوو بینیومە، لەم دواییانەدا شتێکی زۆر سەیروسەمەرەی کردووە، ڕەفتارێک بە شێوەیەکی ناوازە دەکرێ بەکەڵکمان بێ."
مەراغەیی لێی پرسی: "ئایا شتەکە پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە؟"
ئەمیر نیزام هاتەوە قسە: "نەخێر، ئەمە نییە، ئەو ئەوەندە مێباز نییە، ئەو نەوسنە، زۆر حەزی لە خواردن و جگەرەکێشان و خواردنەوەیە، هەر بۆیە خۆشمەشرەبە."
"ئایا لە شوێنی گشتییەوە مەی خواردۆتەوە؟"
تالیبۆڤ وەڵامی دایەوە: "نەخێر، ئەمەش نا."
"دەی، کەواتە پێمان بڵێ."
تالیبۆڤ بە خەندەوە زەرفێکی لەنێو جانتاکەی دەرهێنا و گوتی: "لە کۆتاییدا خودا بە هانامانەوە هات. لەوانەیە ئەم بەڵگانە بەقەد زێڕ گرانبەها بن."

تالیبۆڤ وێنەیەکی ڕەشوسپی دەرهێنا، ئیمامێکی تووکن لەسەر مافوورێکی ئێرانی دانیشتووە، خەریکی کێشانی قلیانە و بە پێکەنینەوە دووکەڵەکەی بە با دەکا.
میرزا ڕەزا گوتی: "ئیمامێکی قلیانکێش، ئای لەم لاسارییە؟"
ئەمیر نیزام گوتی: "ئەو ئیمام نییە."
"وا مەڵێ!"
"ئەو بریتانییە، خۆی وەک ئیمامێک نمایش دەکا، بە ڕیشێک و عەبایەک و مێزەرێک. بەڵێ هەر بەڕاستی، ئەم ئینگلیزە سەرۆکی کۆمپانیای نیشتمانیی توتنە." تالیبۆڤ درێژەی بە قسەکەی دا: "ئەو هەر بۆ گاڵتەوگەپ مێزەرێک و ڕیشێکی ساختەی لەخۆ ناوە. سەیرکەن، ئەو بە پێڵاوەش بەسەر دوگردی[79] نوێژان کەوتووە. ئەمەش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە بۆ سووکایەتیکردن بە هێمای دینی و نیشتمانی."
"باشە ئێوە ئەو وێنەیەتان چۆن دەستکەوت؟"
ئەمیر نیزامیش وەها وەڵامی دایەوە: "ناتوانم زیاتر لەو بارەیەوە قسە بکەم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم تالیبۆڤ لە ڕێی پەیوەندییەکانییەوە دەستی کەوتووە."
ئەوسا جەمال خان گوتی: "ئەم وێنەیە داردەستێکی بەهێزە، لەوانەیە ڕێڕەوی جووڵەی ئێمە دیاری بکا."

---

[79] دوگرد: بەرماڵی نوێژ.

# ٤٥

# میرزای شیرازی

کات، ئێوارە درەنگانێک بوو، سەروبەندی ئەوە بوو دونیا تاریک و بولێڵ بێ. لە دەرەوە هێشـــتا گەرما بوو. شـــا لە ژوورەکەی خۆی لەســـەر مافوورێکی جوان لە پشـت مێزێکی نەوی لەبەر چرایەک، کە لە شـێوەی گوڵی مێلاقە دابوو دانیشتبوو، شتێکی لە ڕۆژژمێرەکەیدا دەنووسی.

لە مەودایەکی گونجاودا نۆکەرێک لە لای دەســـتەچەپی وەســـتابوو، بە باوەشێنێک لە پەڕی تاوس، هێدی هێدی باوەشێنەی لێدەکرد بە شنەبای باوەشێنەکە دەموچاوی فێنک دەکردەوە. لەبەردەمیشی ژیاننامەنووسێکی لاو دانیشـتبوو، هەموو نووسـینەکەی پاشـای دێڕ لە دوای دێڕ وشـک دەکردەوە.

لە دەستەڕاستیشی نۆکەرێکی دیکە بەخۆی شەربەیەکی پڕ لە شەربەتی ئاڵوباڵو وەسـتا بوو، چاوەڕێی ئاماژەی شـای دەکرد، تا پەرداخەکەی بۆ پڕ بکاتەوە.

"هەندێ جار لەبیرمان دەچێ ئاخۆ هەندێ ڕووداو تۆمار بکەین یان نا. ڕووداویش ئەوەنـدە زۆرن و بەو جەنجـاڵییەش بەو هەموو شـــتێک

ڕاناگەین. خۆشم نازانم ئاخۆ چیم لەبارەی شووکردنەکەی تاج یاداشت کردووە. هەروەک ئەوە دیارە ماوەیەکی زۆری درێژی بەسەردا تێپەڕی بێ. لێ دیسان هەندێکی لەسەر دەنووسمەوە. ئاخر بەدەر لە شووکردنەکە هەواڵی خۆشیش هەیە.

تاج سوڵتانەکەی ئێمە هەر یەک دوو مانگە مێردی کردووە، ئاهەنگێکمان لە قەڵایەکی پەڕگەی تارانەوە بۆ گێڕا. هەموو ڕێشسپیانی هۆزەکەمان ئامادە بوون. تاج خەمبار دیار بوو، ئێمە ئەم شتەمان بە ڕوخساریەوە بینی. لێ ئەو هێشتا گەنجە و کیژۆڵەکانیش خەونی بەدینەهاتووی خۆیانیان هەیە.

جارێکی دیکە تاج پێیگوتم ئەو عەینولدەولەی ناوێت، بەڵام خۆ ئەگەر ئەو منداڵێکی لێ بوو، دۆخەکە دەگۆڕێ. زۆر جاران ئەو شتەم لەگەڵدا هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام بێ سوود بوو. ئەمجارەیان بە توندی قسەم لەگەڵ کرد. پێمگوت دەبێ واز لە پرتەوبۆڵەی خۆی بێنێ و شتەکەش پەیوەندیی بەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە ئێمەوە، بە هەمووانەوە هەیە. ئینجا گوێڕایەڵ بوو. من ئەوەشم پێگوت، ئێمەش حەزمان لێنەبوو ببینە پاشا، کەچی ئێستا هەوین.

بۆ خۆشبەختی هەموو شتێک باش هات. ئاهەنگەکە شتێک بوو لەبیر ناکرێ. هەروەها خانوویێکی جوانیشمان بۆ دابین کرد، بەڵکو تێیدا بەختەوەر بێ.

قومێکی لە شەربەتەکە دا، لەگژ هزران ڕاچوو، ئینجا دەستی دایەوە خامە و درێژەی بە نووسینەکەی دا. "بە مێردکردنی تاج بارێکی قورس لەسەر شانم لاکەوت. ئێستاش دەتوانین سەرنج و ئاگاهیمان بخەینە سەر کاروبارە گرنگەکان.

هەندێک جار لەوە تێناگەین ئاخۆ چی باشە بیکەین و چی باشیش نییە تا نەیکەین. خۆ ئەگەر لەگەڵ بریتانییەکان بکەوینە گفتوگۆ، ڕوسەکان

هەست دەکەن بەسەریاندا بازدراوە. ئەگەر لەگەڵ ڕوسەکانیش دابنیشن، ئەوا بریتانییەکان ئێمە فەرامۆش دەکەن.
دوێنێ کابرا ڕیشـدارە ڕوسـییەکەمان لابوو، ناوەکەیم بیرناکەوێتەوە. قیافە و ڕوخسـاری هەندێ قۆشـمە دیار بوو. بۆ کارمەندێک ڕیشـێکی وەهای لێدەهات، بەڵکو وەها پێویسـت بکا ئێمەش داوا لە کارمەندانی خۆمان بکەین ڕیشیان بهێڵنەوە.
ڕوس پرۆژە پێشـنیازێکیان بۆ هێناوین بەوەی ئەوان هێڵی ئاسـنینی وڵاتەکەمان لێبدەن، هەڵبەتە ئەوان ئەم کارە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەکەن، چونکە ئێمە هیچ هێڵی ئاسنینمان پێویست نییە. ئەسپ و گالیسکە و داشقەکانمان بە کاری پێویستی خۆیان هەڵدەستن. باشە بۆچی بەسەر هێڵی ئاسـنیندا هاتوچۆ بکەین؟ وەزیرەکەشـمان، شـێخ ئاغاسـی لەگەڵ ئێمەدا هاوڕایە، ئاخر ئەم جۆرە گۆڕانکارییانە لە بەرژەوەندیی وڵاتدا نین. لێ هەندێکی دیکە ئاگاداریـان کردووینەتەوە، خۆ ئەگەر هـات و لەگەڵ ڕەوتی ڕۆژگاردا نەڕۆین، لە بەرانبەر وڵاتە دراوسـێکانمان وەک هیندسـتان و تورکیادا لاواز دەبین. هەربۆیە ئەم ڕۆژانە زۆر پیاسـە دەکەم، تا بە دەم پیاسەوە باشتر بیربکەمەوە. خوا بمانخاتە سەر ڕێگەی ڕاسـت، ڕێگەی ئەوانەی داڵـدەی داون، نەوەک ڕێـگەی ئەوانەی سـەرگەردانی کردوون. ئێمە چـاوەڕێی بەرچـاوڕوونییەک لە خواوە دەکەین.
ئێسـتاش وەرزی ئاڵوباڵووە داهاتووە، هەموو ئاڵوباڵووەکان خڕو خەپە و سـوورن، هەروەک یاقوت بە چڵی دارەکانەوە هەڵواسـراون. کاتێک لەبارەی ئەوانەوە دەنووسم، دەمم پڕ لە ئاو دەبێ. ئەمساڵ ساڵی مشکە. مشکیش پیسە، دەعبایەکی متمانەپێنەکراوە و گڵاوی لەگەڵ خۆیدا دێنێ، هەر بۆیە دەبێ وریا بین. سایەی خوا بە سەرمانەوە بێ. بۆ خۆشبەختی

هەموو شـــتێکمان لەژێر کۆنترۆڵ دایە. هیچ شـــتێکی وەها ڕووینەداوە سەخڵەتمان بکا.
لەوەش پتر، هەواڵێکی گرنگ هەیە، لێ ئێمە دوودڵین ئاخۆ تۆماری بکەین یان نا. ڕۆژە خۆشەکان ئەوانەی پەیوەندییان بە تاج سوڵتانی کیژمانەوە هەیە، لە ڕێی قەرەواشـــەکەیەوە پێمان دەگا. ئەو شـــتێکی بە گوێدا چرپاندین، هەواڵێکی شـاهانە. لێ ئێمە جارێ هیچی لەبارەوە نانووسـین نەوەک بەدبەختی بەدواوە بێ، بۆیە بە حەوسەڵەوە چاوەڕێ دەکەین.
لێرە گەرمایە، جارێ دەست لە نووسین هەڵدەگرین، با بەر لە خواردنی خۆرنشین هەندێک چاو گەرم بکەم.
بە ئاماژەیەک نۆکەرەکانی ڕەوانە کرد و لە شـــوێنی خۆی خۆی درێژ کرد، ئینجا گەورەنۆکەر هات و پەتۆیەکی تەنکی بەسەر قاچەکانیدا دا.
کەمێک پاشـــتر مەلیچک بە خۆی و دەمانچە ســـاختەکەی هات و خۆی هەڵدایە ســـــەر پشـــتی، هەموو گیانی هەر وردەکێک بوو، ئاخر تازە لە ناندین تێروپڕی خواردبوو، وردتکەکێک و ئاردیشـــی بەســـەر خۆیدا وەرکردبوو. ئاشـــپەزەکە لە مەلیچک دەترســـــا. هەر کاتێک دەچووە ئاشـــپەزخانەکە و لوولەی دەمانچەکەی لە کابرای بەســـتەزمان دەکرد، ئیدی یەکســـەر قاپێکی پڕ لە خواردنی خۆش و چەور و شـیرینی لەپێش دادەنا. ئەمەش تاکە ڕێگە بوو تا وای لێبکا لە جێگەی خۆی دابنیشـــێ و چەتوونی نەکا.
پاشا لێی پرسی: " ڕۆژی ئەمڕۆ لە کوێ بووی؟"
مەلیچک شـــتێکی گوت هی ئەوە نەبوو کەس لێی تێبگا، دەمانچەکەی لە لایەک دانا، بە دەستی و پێ خۆی خزاندە بن پەتۆکەی پاشا، لە تەنیشتی درێژ بوو، چاوەکانی نووقاندن. پاشاش دەستێکی بە سەر و شانیدا هێنا و بە باوێشـکەوە پێیگوت: "مەلیچک بۆگەن بووی، پێویسـتە هەندێک جار

خۆت بشۆی، چیدی لە ئاوێ مەترسە. خۆ مندالْ نەماوی، خەریکە ببیتە پیاو."

بێباکانە هەندێکی پالْ بە مەلیچکەوە نا. دەستی بەر چاکەتەکەی مەلیچک کەوت. هەستیکرد دەستی بەر پارچەکاغەزێک کەوت. دیسان دەستی لێدایەوە، بەلْێ هەر دەبێ پارچە کاغەزێکی قەدکراو بێ.

ئینجا پرسی: "ئەوە چیت لە بەرکدایە؟" دەستی بۆ بەرکی برد و پارچە کاغەزە قەدکراوەکەی لێدەرهێنا و بە توندی گوتی: "ئەوە چییە؟ ئەمەت لە کوێ بوو؟"

پاشا پارچە کاغەزە قەدکراوەکەی لێککردەوە، چاوێکی لە لەتە کاغەزەکە کرد و تووڕە بوو: "کێ ئەمەی پێداوی؟ کێ ئەم شتەی خستۆتە گیرفانت؟"

مەلیچک، کە بەرگەی هیچ کەسێکی نەدەگرت دەنگی لەسەر بەرزبکاتەوە، بە چاوی پڕ لە ترسەوە سەیری پاشای کرد. شا پالْی بە مەلیچکەوە نا، کوڕیژگەکە فرمێسکی لەچاو هاتنە خوار و خۆی خزاندە پشت پەردە. شا لە تووڕەییان دەلەرزی، کەسێک بوێریی ئەوەی هەبووە کاغەزەکە لە بەرکی چاکەتەکەی مەلیچک دابنێ. کاغەزەکەش بانگەوازێک بوو بۆ گەل تا دژی پاشا و بریتانییەکان ڕاپەڕێ.

پاشا هەلْسا و پەنجەرەی کردەوە تا بانگی سەردەستەی پاسەوانەکان بکا، لێ بیری کردەوە، ئەم کارە سوودی نابێ. زۆر کەس لە کۆشکەکەدا دەژین، ڕۆژانەش هێندەی دیکە دێن و دەچن، کەس نازانێ ئاخۆ کێ ئەم بانگەوازەی بە قاچاغ هێناوەتە نێو کۆشک و لە بەرکی چاکەتەکەی مەلیچکی ئاخنیوە. ئەو دەبێ دان بەخۆیدا بگرێ و وەها ڕەفتار بنوێنێ وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێ.

لە دەرەوە تاریک بوو، شنەبایەکی فێنکیشی لێدەهات.

ئەو بانگی پەردەدارەکەی کرد، تێیگەیاند خواردنی ئێوارەی لە دەرەوە، لای حەوزی ئاوەکە بۆ دابنێن. هەر لەگۆترەش چووە لای ئەو تۆپەی، کە لە ناوەڕاستی حەوشەکە دانرابوو، ئەم لاو ئەولای پشکنی. پیاسەیەکی بۆ لای دەروازە کرد ڕاشکاوانەش خۆی نیشانی پاسەوانەکان دا. پاشان لە کەلێنی تەویلەکە تەماشایەکی ئەسپەکانی کرد و گەڕایەوە لای حەوزەکە، دەستوچاوی شوشتن، کڵاوەکەی لەسەر کردەوە و بە پەنجەکانی پرچی خۆی داهێنا.

مێز و تەختەبەندی ئامادەکرا، خوانەکەی لەسەر دانرا، خواردن ساز و ئامادە. لێ ئەو مجێزی خواردنی نەبوو. ئەو لە هەر قاپێکی خواردن سەر و یەک دوو کەوچکی لێدان و ئینجا خوانەکەی بەلاوە نا. نۆکەرەکان هەڵیانگرتەوە. ئینجا قلیانیان بۆ هێنا و چادانە چایەکی دەمکراو و دەفرێکی پڕ لە شیرینەمەنیشیان لە تەنیشت دانا.

مەلیچکیش بە ئەسپاییەوە زاتی کرد بێتە سەر تەختەبەندەکە، ئەویش کڵۆشەکرێکی داێ. بە کڵۆشەکرەکەی دەمییەوە خۆی لە شا هەڵسووی و سەری بە کۆشی کرد.

ئاسمان ساماڵ بوو، شەوێکی ڕوون بوو، مانگ بە دەرەوە بوو، بۆق لە باخەکەدا دەیانقیڕاند و شەمشەمەکوێرەش خشەیان دەهات.

شا بەدەم گوتنی: "شەوێکی جوانە" میزاجی کرایەوە و مژێکی لە قلیانەکە دا.

گەمەی لەگەڵ مەلیچک کرد و دووکەڵی قلیانەکەی بە ڕوودا پف کرد. ئەم ڕەفتارەی وای لێکرد هێوربێتەوە.

پشیلەکان لەو ناوە کردیانە هەراوزەنا. شا بیری لە شەرمین کردەوە. سەری بەرزکردەوە، بینی دەستەیەک کاغەز بە بانەکەوە وەرپێچراون. پاڵێکی بە مەلیچکەوە نا و لای خۆی هەڵیستاند و ناردیە سەربان و پێیگوت: "برۆ ئەوانەم بۆ بێنە."

سەردەستەی پاسەوانەکان نەیدەزانی کێ بگرێ، بە خۆی و یەک دوو پاسەوان غاریاندایە سەربان و کەس لەوێ نەبوو.

هەر هەمان شەو لەبەر هەمان مانگەشەودا جەمال خان و میرزا ڕەزا چوونە شاری شیراز تا چاویان بە ئایەتوڵلا شیرازیی بەساڵاچوو بکەوێ.
شیراز هەزار کیلۆمەتر لای باشووری تارانەوە هەڵکەوتبوو. بریتانییەکان بە بڕی پارەی قەبەوە ئایەتوڵلاکانیان بۆ خۆیان کێشکردبوو، لێ ئایەتوڵلا شیرازی بەو تەمەنە زۆرەیەوە خۆی تێکەڵی سیاسەت نەدەکرد. هەر بۆیە بریتانییەکان ئەویان لە مێشکی خۆیان دەرهێنابوو.
شیراز لە ڕۆژگاری پێشووی خۆیدا پایتەختی وڵات بوو، پاشا کۆنەکانی ئێران لەوێ کۆشک و مزگەوتی سەرنجڕاکێشیان لێ دروستکردبوو. بازاڕی ئەم شارە هەمیشە باندۆری بەسەر بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتەکەوە هەبوو.
ئایەتوڵلا شیرازی وەک ئاخوندێکی سەربەخۆ دەبینرا، بۆیە لە سەرتاسەری وڵاتەوە ڕێزی زۆری لێدەگیرا.
جەمال خان و میرزا ڕەزا وەک بازرگان خۆیان گۆڕیبوو، ڕەگەڵ کاروانی شیراز کەوتبوون، شەوی یەکەمیشیان هەر لە کاروانسەرا بەسەربرد. دوای پشوودانێکی تەواو، ئێوارەی ڕۆژی پاشتر سەروەختی خۆرنشین بەرەو مزگەوتی گەورەی شار کشان، کە هەموو ئێوارانی ڕۆژی سێشەممە ، ئایەتوڵلا خۆی پێشنوێژی بۆ دەکردن.
جەنجاڵیی نوێژی ڕۆژی سێشەممان بە بەراورد لەگەڵ نوێژی ڕۆژی هەینی کەمتر بوو، هاموشۆکەرانیش لەو ڕۆژەدا زیاتر لە پیاوە بەتەمەنەکان بوون. ئایەتوڵلا بەتەمەنەکە بەکاوەخۆ نوێژەکەی دەکرد،

پیرەمێردەکانیش ئەوەیان بە شـــەرەف و شـــانازی دەزانی لەدوای ئایەتوڵلاکە نوێژی خۆیان بکەن.
لە دەرکەی مزگەوتی چـاوەڕێی ئـایەتوڵلا دەکرا. ئەو بە ســـواری گوێدرێژێکەوە گەیشـــت، دەســـتەیەک لە ئیمامە گەنجەکان یاوەرییان دەکرد. ئەو ئاخوندە لاوازە بچکۆلەیە بە خۆی و ڕیشـە چەرمووەکەیەوە لە کەرەکە دابەزی و بە یارمەتی داردەســـتەکەی چەند هەنگاوێکی نا. کـاتێکیش گەیشـــتە نـاو مزگەوتی، پیـاوە پیرەکـانی لێ خڕبوونەوە و هاواریان کرد: "سەڵەوات!"
جەمال خان و میرزا ڕەزاش خۆیانیان لێ نزیک کردەوە و لەسەر زەوی دانیشتن.
ئایەتوڵا پێشـــتر دوای نوێژکردن هەڵدەســـتا و دەچووە ســـەر مینبەر و قســـەی بۆ ئـامـادەبووان دەکرد، لێ هەنووکە هێزوتینی ئەوەی تێدا نەمابوو. دوای تەواوبونی نوێژەکە نوێنەرانی بازاڕ و هەندێ کارمەندانی شار هاتنە لای دانیشتن و هەر لایەکیان شتێکیان هەبوو لەگەڵیدا باسیان لێوە کرد.
ئینجا دەســـتبەجێ میرزا ڕەزا بۆ پێشـــەوە خۆی ڕەپێش دا و دەســـتی ئایەتوڵلای ماچ کرد و پێیگوت: "من میرزا ڕەزام، شـوێنکەوتوویەکی تۆم و کوڕی ئایەتوڵلای کۆچکردوو کرمانیم."
شیرازی خەندەیەکی بۆ کرد و گوتی: "خودا لێی خۆش بێ. تۆ بە باوکت دەچی، کتومت سێویک کرابێتە دوو لەت. باوکت ئاخوندێکی مەزن بوو."
"زۆر سوپاست دەکەم. من لەگەڵ هاوڕێکەم بەتایبەت لە تارانەوە بۆ لای ئێوە هـاتووین، تـا لەبـارەی شـــتێکی گرنگەوە قســـەت لەگەڵ بکەین. بابەتەکەش بەقەد ئەوەی بۆ وڵات گرنگە، ئەوەندەش بۆ ئیســـلام گرنگە. ئەگەر ڕێگەمان پێبدەن، دەمانەوێ وتووێژێکی پڕ لە بڕوا و متمانە لەگەڵ ئێوەدا بکەین."

ئـايەتوڵڵاش پێی گوتەوە: "خۆ ئەگەر كـاروبـارەكە ئەوەنـدە گرنـگ بێ، كەواتە بەیانی دوای نیوەڕۆیەكی درەنگ، سەر لەئێوارە وەرنە ماڵێ."

بۆ ڕۆژی پاشـــتر جەمال خان و میرزا ڕەزا چوونە ماڵەكەی. لە ماڵێكی ئێرانییـانەی خـاكیدا دەژیـا، حەوزێكی ئـاو لە نێو حەوشـــەكەیدا، پیرە داربییەكی تێدابوو، سێبەری لە تەختەبەندی حەوانەوە كردبوو.
خزمەتكارەكەی ماڵی یاوەریی مێوانەكانی بۆ كتێبخانەكەی كرد، لەوێ ئایەتوڵڵا لەســـەر مافوورێك دانیشـــتبوو چاوەڕێی دەكردن. ئەوانیش پێڵاوەكانیـان داكەند و چوون لای ئەو لەســـەر مـافووری نـاوكەوەكە دانیشـتن. خزمەتكارەكە هەریەكە و ئیسـتكانێك چای لەپێش دانان، ئینجا ئەوانی بەجێهێشت.
بۆنوبەرامەی چایەكە و شـیرینیی كلۆشـەكرەكە شـكۆی هەندێ ترسـی دانیشـــتنەكەی شـــكاند. شـــیرازی دەســـتی بۆ كلۆشـــەكرێك برد و تیلەچاوێكیشی لە جەمال خان كرد، كە لە نزیكییەوە دانیشتبوو.
میرزا ڕەزا ســـەری قســـەی داهێنا، بە كورتی جەمال خانی بە ئایەتوڵا ناســـاند و باســـی ئەوەی بۆ كرد لە چەندین وڵاتدا ژیاوە و لە لایەن ڕۆشنبیرانی هیندستان و ڕۆژهەڵاتی ناویندا كەسێكی ناسراوە.
ئینجا جەمال خان هاتە دەنگ: "جەنابی ئایەتوڵڵا، لەوانەیە تۆ ئەوە بزانی هاوڵاتیانی وڵاتەكانی دیكە لە بارودۆخێكی باشـــتر لە وڵاتەكەی خۆمان دەژین، لێرە هەمووان لە بن بارێكی قورسی ژیاندا پشتیان كووڕ بۆتەوە. خواش پەســـەندی ناكا موســـڵمانان بەم شـــێوە بێویژدانانە كوێرەوەریی ژیـان بچێژن. ئێمە دەمـانەوێ ئەمڕۆ لەگەڵ ئێوە لەبـارەی ئیســـلام و لەبارەی بازرگانییەوە بدوێین.
هێزە دەرەكییەكان، لەنێویاندا بریتانیای گەورە دەســـتیان لە بینەقاقای وڵاتەكەمـان و بیروبـاوەڕەكەمـان گیركردووە. بـازرگـانەكـانمـان یەك

بەدوای یەکدا نابووت دەبن. تەنانەت ئەو قوماشەی ژنانی ولات بۆ پیچە و لەچک و ڕووبەندیش بەکاریدەهێنن، هەر هەموویان لە ئینگلستانەوە هاوردە دەکرێن.

ئایەتوڵلا گوێی گرتبوو، لێ لە مەبەستەکەیان تێنەدەگەیشت.

جەمال خان هاتە سەر ئەو خاڵەی بە وردی باسی کانە نەوتییەکان و ئەو هەبوونە زۆرە و هەژموونی بریتانییەکان لە باشووری ولاتی بۆ بکا، لێ سەنگرایەوە،[80] ترسا لەوەی ئەو ئاخوندە بەسالاچووە پێی هەرس نەکرێ و تەقەی سەری بێ و خەوی لەبەر لێبکەوێ. بۆیە هاتە سەر باسی تێلێگراف، ئاخر کێبڵەکان بەسەر ماڵی ئایەتوڵلا بۆ نووسینگەی تێلێگرافی ناوجەرگەی شاردا دەچوون.

"جەنابی ئایەتوڵلا، لەوانەیە ئەوە بزانیت، کە بریتانییەکان کێبڵیان بەسەر ماڵ و مزگەوتەکانماندا ڕاکێشاوە تا ئاسانتر دەنگیان بە هیندستانی ولاتی دراوسێمان ڕابگا. ئێستا لە هیندستان خۆپیشاندانی گەورە لە دژی بریتانییەکان دەکرێ."

ئایەتوڵلا هەندێ پشتی خۆی ڕاستکردەوە و سەیری پەنجەرەی کرد. کێبڵی تێلێگراف لەوێ بەسەر دیواری ماڵەکەیدا ڕۆیشتبوو.

ئەو کلۆشەکرێکی خستە ناو دەم و فرێکی لە چایەکەی دا.

"بریتانییەکان خەریکن ولاتەکەمان تالان دەکەن، ئینگلستان دەستی بەسەر بازاڕی شیرازیشدا گرتووە. پێویست ناکا بشڵەژێی، بریتانییەکان ئەوەندە ڕووقایمن تەنانەت هاتوونەتە نێو ماڵی ئایەتوڵلاش."

ئایەتوڵلا بە هەراسانییەوە ئیستکانە چایەکەی دانایەوە و بە سەنگینییەوە تەماشایەکی جەمال خانی کرد.

"ئەم کلۆشەکرە بۆندارانە لەلای خۆمانەوە ئامادە و پاکنەکراونەتەوە، بەڵکو لە کارخانەکانی شیفیلدی ئینگلیزییەوە ئامادە کراون.

---

[80] سەنگرانەوە: وەستان، ڕاوەستان.

ئینگلستان تەنیا و پاشا و خزم و دەستەیەک لە سیاسییە دەربارەکانی ئەویان لەبەرچاو گرتووە پارەی داونەتێ. لەولاشەوە سەرتاپای گەل لەبن باری هەژاری و نەخۆشیدا دەناڵێنێ. پرسیار ئەوەیە ئاخۆ کێ لەو ڕەوشە شپرزەیە ڕێمان نیشان دەدا؟"
ئایەتوڵڵا هێشتا هەر بەبێدەنگی لێی دەڕوانین، ئینجا گوتی: "باشە من چیم پێدەکرێ؟"
جەمال خان بە سەرلەقاندنێک ئاماژەیەکی بە میرزا ڕەزا کرد.
میرزا ڕەزاش گوتی: "گەل وەک مێگەلەڕانێکی سەرگەردان وایە، شوانێکی پێویستە، شوانێک بە گۆپاڵێکەوە کۆیان بکاتەوە و ڕاستەڕێیان بکا."
جەمال خان هەڵیدایێ: "دەقاودەق وایە. ئێمە پێویستمان بە ڕابەرێکی بەهێز هەیە."
میرزا ڕەزا سەری قسەی لێوەرگرتەوە: "ئێمە بیرمان لە ئێوە کردۆتەوە، ئایەتوڵڵا ئێمە پێویستمان بە تۆ هەیە."
ئایەتوڵڵا بە حەپەساوییەوە سەیری هەردوو پیاوەکەی کرد. ئەو هەموو شتێکی لەو پیاوە چاوەڕێ دەکرد تەنیا پرسی کێبڵی تێلێگراف و کلۆشەکرەکان نەبێ.
ئەو پێویستی بە هەوایەکی تەڕوتازی هەبوو. دەستی دایە گۆچانەکەی و لە هۆدەکەی چووەدەر. نۆکەرەکە یاوەری کرد. لای حەوزەکەوە ئایەتوڵڵا بە پاڵپشتیی نۆکەرەکەی پێی ڕاستەی خستە نێو ئاوەکەوە. پاشان چووە بەرسێبەری داربییەکە و لەسەر تەختەبەندەکە دانیشت. دوای ئەوەی قلیانیان بۆ هێنا، داوای کرد مێوانەکانیشی بێنەدەر لای ئەو دانیشن.

جەمال خان و میرزا ڕەزا لای ئەو، لەسەر تەختەبەندەکە دانیشتن.
ئایەتوڵڵا بە سادەییەوە پێیگوتن: "نازانم ئێوە چی لە من چاوەڕێ دەکەن، خۆ من ناکرێ دژی دارتێلەکانی تێلێگراف وکەللەشەکرەکان بوەستمەوە."

جەمال خانیش پێی گوت: "دەنگی خۆت بەرزکەوە."
"من پیرەمێردێکم و پێی ڕاستەم لەسەر لێوی قەبرە. چیدی لە جیهان ناگەم."
میرزا ڕەزا پێیگوت: "ئێمە شتێکمان بۆ هێناوی دەکرێ وەکو چەکێک بەکاریبهێنی."
ئایەتوڵڵا تەماشایەکی دەموچاوی هەردوو پیاوەکەی کرد وەک ئەوەی تازە بیانناسێ.
ئینجا جەمال خان هەڵیدایێ: "بریتانییەکان ڕکێفی مافی ناردن و هێنانی هەموو بەرهەمە گرنگەکانی نیشتمانیان بەدەستەوەیە. هەر بۆ نموونە توتن. چیدی ئێمە دەسەڵاتمان بەسەر توتنەکەماندا ناشکێ، کە ڕۆژانە هەزاران هاولاتیانی ئێمە بەکاریدەهێنن. بازرگانانی توتن و جوتیارەکان کەرتی توتن دەبێ ڕەنجی زۆر بدەن و لە ئەنجامیشدا هیچیان بۆ نامێنێتەوە و پارەشیان نایەتەدەست. ئەو توتنەی ئێستا ئایەتوڵلا کردوویەتیە نێو قلیانەکەی، بەرهەمێکی بریتانییە. لەم وڵاتە هەر کەسێک توتن بکڕێ، ئەوا بەشێک لە پارەکەی ڕاستەوراست دەچێتە قاسەی کۆمپانیای بریتانی بۆ توتن. جەنابی ئایەتوڵلا! ئێمە پێویستمان بە ڕابەرێکی بەهێز هەیە تا هاوار بکا: دەفن بن[81] بە خۆتان و توتنی بریتانیشتانەوە."
ئایەتوڵلا دەستی لە قلیانەکەی بەردا. وەک ئەوە وابوو دەستی لە شتێکی پیس دابێ، بە شێوەیەکی خۆزاییش دەستی لەو بەڕەیەی لەسەر دانیشتبوو هەڵسوو وەک ئەوەی پاکیان بکاتەوە. ئینجا بە دەنگێکی نەرمەوە گوتی: "ئەم کاروبارانە ئاڵۆزن. توانای ئێمە هەر ئەوەیە بانگەوازێک بکەین، بەڵام دواتر هیچ لە شتەکان ناگۆڕێ. لەو دونیایەدا

[81] دەفنبوون: بە تووڕەییەوە دەی بڕۆن، نەمێنن، جۆرە توکێکیشە.

تەنیا ئەو گۆچانەم توند بە دەستەوەیە و ناشتوانم هیچی پێ لەگەڵ ئینگلیزدا بکەم."
دوابەدوای ئەوە جەمال خان پرسی: "جەنابی ئایەتوڵلا دەکرێ شتێکت نیشان بدەم؟"
ئایەتوڵلا پیرەکە بە گومانەوە تەماشای ئەو دوو پیاوە لێبڕاوەی کرد، کە ڕیتمی ڕۆژانەیان تێکدابوو.
شێرازی وێنەکەی لە دوورەوە بەبەرچاو ڕاگرت، بەڵام هیچ شتێکی نامۆی تێدا نەبینی. خۆی هەر وێنەیەکی ئاسایی ئاخوندێکی قەڵەو بوو بە شێوەیەکی قۆشمە قلیانی دەکێشا.
"جوامێران، چاوەکانم وەک پێشان نەماون، من ئیمامێک دەبینم ، وایە؟"
جەمال خان گوتی: "بەڵێ وایە، تۆ باش دەبینی، بەڵام ئەو پیاوەی ناو وێنەکە ئاخوند نییە، ئەو کابرایەکی بریتانییە، مێژەرێکی لەسەر ناوە، عەبایەکی ئاخوندانەی لەبەرکردووە، ڕدێنێکی ساختەشی بەرداوەتەوە. ئەو کەسە بریتانییە سەرۆکی کۆمپانیای توتنە."
ڕوخساری ئایەتوڵلا پیرەکە بەیەک جار گۆڕا. ویستی دەست بۆ کڵۆشەکرێک ببا، لێ دەستی خۆی کشاندەوە، دەستی بۆ ئیستکانە چایەکە برد و بە تاڵی فرێکی لێدا.

# ٤٦

# نامەکە

هەموو دوای نیوەڕوانی ڕۆژانی دووشـــەممە پاشـــا و شـــێخ ئاغاســـی کاروبارە گرنگەکانی ولاتیان تاوتوێ دەکرد. ئەم جارەیان ئاغاسی دوای بەلایەکداخســـتنی دۆســـییەکان و مۆرکردنی بەڵگەنامەکان، نامەیەکی لە جانتاکەی هێنایەدەر.

- "ئەم نامەیە لە کێوە هاتووە؟"
- "لە ئایەتوڵلا میرزای شیرازی."
- "میرزای شیرازی کێیە؟"

شێخ ئاغاسییش وەلامی دایەوە: "ئایەتوڵلای شیرازە."

- "ئەو چی لە ئێمە دەوێ؟"

"ئەو نامەیەکیشـی بۆ من نووسـیوە، نامەیەکی پڕ لە وشـەی ڕەق و زبر. هەر بۆیە دوودڵ بووم بیخەمە بەردەستت یان نا، لێ بیرم کردەوە گوتم وا باشە خاوەنشکۆ لێی ئاگادار بێ."

پاشا نامەکەی دایەوە ئاغاسی و پێیگوت: "بۆم بخوێنەوە."
شـێخ ئاغاسـی بە ئەسـپاییەوە گوتی: "دەکرێ پاشـا لە خوێندنەوەی بمبووری، چونکە پێموایە ناوەڕۆکەکەی زەقە و بێڕێزی تێدایە ."
پاشـا قسـەکەی خۆی لێ دووبارەکردەوە: "دەی بیخوێنەوە!" پشـتی وە کورسییەکە دا.
وەزیریش زەرفەکەی وەرگرت و مۆرە مۆمییەکەی لێکردەوە.

*بیسمیلاهە رەحمانە رەحیم،*
*بە ناوی خودای بەخشندەی دلۆڤان.*
*بۆ پاشای وڵات.*
*یەک دوو پرسـی نیشـتمانییمان لە نامەیەکی دووردوودرێژدا بۆ وەزیر باس کردووە، پوختەکەی لێرەدا باسکراوە.*
*پاشـا چارەنووسـی هاوڵاتییەکانی خۆی داوەتە دەسـتی بریتانییەکان. ئەمەش بۆ موسـڵمانان مایەی شـەرمەزارییە، کە غەوارەی دەرەوە بەم شێوە بە قوولی ڕۆچووبنە ژیانیان و جڵەویان کردبێ. لەپێناو ڕێزگرتنی ئیسلام و بەرژەوەندیی نیشتمان، ئێمە ئەو ئەرکە دەخەینە سەرشانی پاشـا، بەوەی کاروباری توتن لە دەسـتی بریتانییەکان دەربهێنێ و بیگەڕێنێتەوە دەستی هاوڵاتییانەکانی خۆی.*
*لە چاوەڕوانیی وەڵام، خوات لەگەڵ بێ.*
*وەلسەلام*
*میرزای شیرازی*

ئـایەتوڵڵا بەم کورتەنـامە نـاوەڕۆک تونـد و فەرمـانبەرداریيە، کە هۆشـدارییەکی وادەداری تێدابوو، پاشـا دەهری بوو، بەڵام دانی بەخۆدا گرت و گوتی: "بە لێکدانەوەی من ئەو پیاوە پیرە و منداڵیشـە. ئاخر هیچ

هۆیەک لە ئارادا نییە تا بە نووســراو وەڵامی بدەینەوە. من تەتەرێکی بۆ دەنێرم قسەی توندی پێبڵێ."
"من داوا لە خاوەنشـــکۆ دەکەم جارێ ئارام بگرێ، ئاخر ئەم ئاخوندە دەسترۆیشتووە. ئێمە سـەرەتا دەبێ لێ وێبکەوین بۆچی و بەیەک جار لە کەللەی داوە تا دەســـت بۆ خامە بەرێ و ئەم نامەیەت بۆ بنووســێ. ئەمە نیشـانەیەکە بەوەی سـکاڵا و نارەزایەتی لەنێو توتنفرۆشـانی بازار گەیشـتۆتە رادەیەک، لەدەسـت دەرچوە. پێویسـتە بەرلەوەی بجووڵێین زانیاریی زیاتری لەبارەوە بزانین."
پاشا راوێژەکەی وەزیری بەهەند وەرنەگرت.
"بازرگان و دوکاندارانی توتنفرۆشـــی دەبێ بێن و بەســـەر پێڵاوماندا بکەون و مـاچی بکەن. ئێمە مشـــوری ئەوەمـان بۆ خواردن تووتن بە ئامادەکراوی بێتە بەردەستیان. لەوە پتر چییان دەوێ؟ ئێمە کارئاسانیمان بۆ کردوون. ئاخوند لەم شتانە تێناگەن، پێویستە ئەوان ئەوە بزانن نابێ لووتی خۆیان لەم جۆرە کاروبارانە بژەنن. پێویســـتە ئەم ئایەتوڵڵایەش سنووری خۆی بزانێ."
ئینجا نامەکەی دراند و ئەمەشـــی بۆ زیاد کرد: "ئێمە دەبێ دەرســـێکی بدەینێ! ئەگەر وەها نەکەین، ئایەتوڵڵاکانی دیکەشـمان لێ قیت دەبنەوە و داوای نوێمان لێ دەکەن!"

ئیدی تەتەری پاشا لە پاش دوو رۆژ کاروان، هێشتا تەپوتۆزی رێگاکەی لەسـەر دەموچاو و سـەر شـانەکانی بوو کاتێ گەیشـتە بەردەرکەی ماڵی ئایەتوڵڵا. خزمەتکارەکە فەرمووی لێکرد و بردییە ژوور، سەرەتا ویستی چـاو و نـانی بـداتێ، بەڵام تەتەرەکە رەتیکردەوە پشـــوو بدا و گوتی پێشوەخت دەبێ ئەو ئەرکەکەی خۆی بەدیبێنێ.

شیرازی لە ناوکەوی[82] ژووری کتێبخانەکەی خۆی، لەپشت مێزی نووسینە نەویەکەی دانیشتبوو. کابرای تەتەر سڵاوی لێکرد، هەندێ سەری بۆ دانەواند و پێڵاوەکانیشی داکەندن.

قەدوقیافەی ئایەتوڵڵا بۆ بابای تەتەر مایەی سەرسامی بوو. ئاخر ئەو چاوەڕێ بوو کەسێکی چوارشانەی بەهێز ببینێ تا بتوانێ بە وتەکانی دابڕسێتە دەسەڵاتی پاشا، لێ کاتێ ئەو پیاوە بەساڵاچووەی لەسەر مافوورێکی کاڵبووەوەی خۆماڵی بینی، کابرا قورسایی ئەو پەیامەی هێنابووی، لە دەست دا.

ئەو یەک دوو ڕۆژ بوو بێوچان بە نێو وڵاتدا ڕێگای تەیکردبوو تا بگاتە شوێن و کابرای مەبەست.

کاتێ چووە ژوور، ئایەتوڵڵا ئاماژەی بۆ کرد لەسەر زەوی دابنیشێ.

تەتەرەکەش لای مێزەکەی ئەو چۆکی بەزەوی دادان و گوتی: "من پەیامی پاشام بۆ ئێوە هێناوە."

ئایەتوڵڵاش دەستی درێژ کرد و گوتی: "دەکرێ بمدەیتێ."

تەتەرەکە دوودڵ بوو: "تکایە لێم مەگرە، بەڵام من هیچ کاغەزێکم بۆ تۆ نەهێناوە، من دەبێ پەیامەکەت بچرپێنمە گوێ."

دەمودەست ئایەتوڵڵا تێگەیشت، شتەکە پەیوەندی بە پێڕاگەیاندنێکی نەخوازارەوە هەیە.

"پێویست ناکا بچرپێنیە گوێم، دەی پەیامەکەم پێ بڵێ."

کابرای تەتەر بە دڕدۆنگییەوە سەیری دەرکەی کرد. گومانی هەبوو لەوەی خزمەتکارەکە لەبەر دەرکە وەستا بێ.

ئایەتوڵڵاش هێوری کردەوە: "ئاسوودە بە، کەس گوێی لێ نییە."

"پاشا ئەم پەیامەی خوارەوەی بۆ ناردووی: **خۆت لە کاروباری پاشایەتی هەڵمەقورتێنە، دەنا دێم و هەردوو چاوت دەردێنم**"

---

[82] ناوکەو: پانتایی ژوور، پێچەوانەی بنمیچ،

تەتەرەکە بە سەری بەخۆداشۆڕبووەوە چاوەڕێی کاردانەوەی ئایەتوڵلای دەکرد.
شیرازی بە ئارامییەوە لێیپرسی: "هەر ئەمە بوو؟"
"بەڵێ هەر ئەمە بوو."
"سوپاست دەکەم، ئەرکت کێشا و ماندوو بووی تا پەیامەکەم پێ بگەیەنی. برۆ نان و ئاوی خۆت بخۆ و بخۆوە و پشووی تەواو بدە."

ماوەیەک تێپەڕی، کەچی بۆ پاشا ئەوە ڕوون نەبوو ئاخۆ هەڕەشەکەی لە ئایەتوڵلا کاری خۆی کردووە یان نا. ئەو بە بێدەنگی لای خۆی وەهای دانابوو پەیامەکەی بە باشی گەیشتووە و چیدی ئایەتوڵلا نابێتە مایەی سەرئێشە.
لەو نێوەشدا فەرمانی بە گرتنی هەموو ئەوانەدا، کە گومان ئەوەیان لێدەکرا دەستیان لە پشێوی و ئاژاوە تاراندا هەبێ. بەرەبەرە ئەو قەناعەتەی بۆ پاشا دروست دەبوو بەوەی دەنگی ناڕەزایی لە ڕەگوڕیشەوە دەرهێناوە.

ئەو ماوەیەش جەمال خان و میرزا ڕەزا کرمانی و ئەمیر نیزام هەر لە شیراز مانەوە، تا لەوێوە کاروباری بەرهەڵستی و بەرگریی ڕێکبخەن. پاشا لەوە باشتری نەدەویست جڵەوەکە توند بگرێ و بێخەم بێ، تا ئەوکاتەی نامەی لە توتنفرۆشانی شیرازەوە پێگەیشت، کە بە دەستەجەمعی ڕەتیاندەکردەوە سەروسەودا لەگەڵ کۆمپانیای توتنی بریتانییدا بکەن و گوێشیان بەو داوایانە نەدا تا ئەو برە پارەیەی لەسەریان ماوەتەوە بیدەنەوە و حیسابەکەی خۆیان پاک لەپاک ڕابگرن. ئینجا سەرۆکی هێزی ئاسایشپارێزی شیراز ڕاستەوخۆ فەرمانی لە

پاشاوە بۆ هات، ئەو دوکاندارە توتنفرۆشانەی پارەی توتنەکەیان نەداوە بگرن.

شـــا ناڕەزایەتیی دوکاندارە توتنفرۆشـــەکانی بەهەند هەڵنەگرت. هەرچی بریتانییەکان بوون پرســـی دوکاندارە توتنفرۆشـــەکانیان بە هەند وەرگرتبوو، حیسابی خۆیان بۆ دەکرد. ئەوان لەوە دەترسان نەبادا ئەو پشـــێوییەی شـــیراز بۆ بازاڕی شـــارەکانی دیکەش بتەنێتەوە و ئینجا بازرگانی قەند و چا و ڕســـتن و چنین و بەرهەمەکانی دیکەی بریتانیا بکەوێتە بەر مەترسی. هەر بۆیە باڵوێزی بریتانیا دەمودەست لە دەرکەی شای دا و ڕاوێژی ئەوەی دایێ بەڵکو ڕێککەوتنێک لەگەڵ دوکاندارەکانی شیرازدا ساز بدا. داوی چەند ڕۆژێک مۆڵەتی کرد و لەو نێوەشدا پرسی بە دایکی کرد.

شێخ ئاغاسی لەبەر پاشخانە دینداریيەکەی خۆی هەمیشە شیاوی ئەوە نەبوو ڕاوێژی ڕاست و دروســت بداتە پاشـــا. نەخاســـمە هەنووکە، کە بەرهەڵســـتییەکی دینی بەرۆکی گرتوون، ئیدی ئەو کەوتبووە دەریایەکی قووڵی دڕدۆنگییەوە. زۆر جارانیش بەدوای بیر و تێڕامـانی مەهدولیـا دەکەوت.

لەو ماوەیەشـــدا پاشـــا بەردەوام ڕاوێژی بە عەینولدەولەی زاوای دەکرد. بەم شـــێوەیە، ئەو وردەوردە مێردی تاج ســـوڵتانی کیژی ڕاکێشـــایە نێو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵات، لێ لەو دۆخەدا ئەو پێویســـتی بە کەســـێکی خاوەن ئەزموون و لێبڕاو هەبوو.

مەهدولیای دایکی شـــێلگیر و یەکلاکەرەوە بوو: "ڕاوێژەکەی باڵوێزی بریتانی لای خۆت دانێ و فشاری زیاتر بخەرە سەر بازرگانەکان."

بەم جۆرە چەکدار بەنێو بازاردا وەربوون و بەســـەر دوکاندارەکانیاندا دا و قاســـەی توتنفرۆشـــەکانیان بەتاڵکردن و بۆ ئەوەی قەرزی کۆمپانیای بریتـانی پێبـدەنەوە. یەکێ لە بـازرگـانە دیـارەکـانی شـــــار هەوڵیـدا بە

نوێنەرایەتیی ئەوانی دیکەش ڕێگە لە پاسـاوڵەکان بگرێ، لێ هەر لەوێ حەسیرمەیدانیان کرد، ئەوەندەیان لێدا تا لەشوێنی خۆی ڕاقەنا و قۆڵ و سەروگوێلاکیان شکاند.
ئینجا دوکاندارەکان، ئەوانەی سـووکایەتییان پێکرا، هانایان بردە بەر ئایەتوڵلا بەسالاچووەکە. ئەویش قسەی بۆ کردن و ورەی بەرزکردنەوە و دەسـتی دایە گۆچانەکەی خۆی. کاتێ ئایەتوڵلا کەوتەڕێ، هەموو دوکاندارەکانی بازار بەدوایدا چوونە ماڵی بازرگانە بریندارەکە. دوای سەردانەکە، بە گۆپاڵەکەی خۆی ئاماژەی بە دوکاندارەکان کرد و هێوری کردنەوە و ئەوسا پێی گوتن: "بازاڕی شیراز لە ناڕەزایەتیی ئەم کارەدا، دوکانەکانی خۆی دادەخا!"
دوکاندارەکانیش هیچ سێودوویان لێنەکرد و بازاڕ داخرا.

لە نیوەی شەودا ئەمیر نیزام بەسەر باناندا خۆی گەیاندە بازاڕ و پارچە خامێکی گەورەی هێنا، کردیە لافیتەیەک و بەسـەر دەروازەی بازاڕی دادا. بۆ بەیانییەکەی حەشـاماتی خەڵک لە نووسـینی سـەر لافیتەکەیان ڕوانی و ئاماژەیان بۆ دەکرد. لەبەرئەوەی بەشـی هەرە زۆری خەڵکەکە نەخوێندەوار بوون، لە یەکدییان دەپرسـی ئاخۆ چی لێنووسـراوە. کاتێکیش گوێیان لە دەقی نووسـینەکە بوو بۆیان خوێندرایەوە، شـتەکە وەها دەهاتە بەرگوێ وەک ئەوەی پەیامێکی نهێنی بێ.
"بازاڕی شـیراز لەمەوپاش هیچ توتنێک بە بریتانییەکان نافرۆشـێ. دوکاندارەکانی شیراز داوای ڕایەڵەیەکی کاری نیشتمانی بۆ پێشخستنی بازرگانییەکە دەکەن."
کەس نەیدەزانی ئاخۆ کێ ئەو لافیتەی بەسـەر دەروازەی بازاڕەکەدا داوە. ئاخر هێشـتا لای زۆر لە دوکاندارەکان ئەوە ڕوون نەبوو، بیریان لێنەدەکردەوە کە بازار تێلێگرافەکە بۆ کاروباری کاسـبییەکەی خۆی

بەکاربهێنێ. بەم جۆرە نارەزایەتیەکە ئاراستەیەکی تەواو جیاوازی وەرگرت.

سەرۆکی هێزی ئاسایشپارێزی شارەکە لافیتەکەی لێکردەوە. هەروەها فەرمانیشی دەرکرد دوکاندارەکان دوکانەکانی خۆیان بکەنەوە، ئەگەر وەها نەکەن ئەوا یاساوڵەکانی چیدی بەرپرس نین لە پاراستنی ئاسایشی دوکانەکانیان. لێ کەس گوێی بە بانگەوازەکەی ئەو نەدا. بۆ شەوەکەی دەیان باندی دز و جەردەی لە زیندان دەرهێنا و بە بازاڕی وەنان تا دوکانەکان تالان بکەن. ئەوان دەرگاکانیان شکاندن، هەر شتێکیان پێهەڵدەگیرا لە گەڵ خۆیاندا برد و باقی شتەکانی دیکەشیان شکاندن و بەگوڕێیان وە، کرد.

بۆ ڕۆژی پاشتر دوکاندارەکان لە ماڵی ئایەتوللا کۆبوونەوە، تا گوێ لە قسەی بڕیاردەرانەی ئەو بگرن. شیرازی تەتەرێکی نارده بازاڕی تاران تا ئەوانیش هاوئاهەنگ بن دەرگای دوکانەکانیان دابخەن. دوکاندارەکانی تارانیش وەهایان کرد، ئینجا پاشا بازاڕی تارانیشی بە هەمان مەرەدی شیرا، برد و دز و جەردەی بۆ ناردن تا تاڵانیان بکەن.

ئەوەی ئینگلستان لێی دەترسا، قەوما. خەڵکی سادەش چوونە پاڵ ناڕازییەکانی بازاڕ. دەستبەجێش هەموو ئایەتوڵلاکانی شارە گەورەکان دانا یەکیان لە وێنەی بەرپرسە بریتانییەکە بەخۆی و مێزەر و عەبای ئاخوندانە پێگەیشت. ئەوانیش لەسەر ئەوە کۆک بوون: "ئیسلام لە مەترسی دایە."

دروشمێکی هاوبەش پەیدابوو: "ئینگلیز لە توتنەکەمان دوورکەوە!"

پاشا ڕەتیکردەوە مل بەو داواکارییە بدا بە دنەدانی دایکی زەبروزەنگی زیاتری بەکارهێنا.

وێڕای ئەم کاردانەوەیە لە لایەن کۆشکەوە، هێشتا خەڵکەکە لەسەر هەڵوێستەکەی خۆیان ڕقئەستوورتر دەبوون. بۆ یەکەمین جاربوو لە

مێژوودا خەڵکەکە ئەو دەرفەتەیـان بۆ هەڵبکەوێ دژی دەسـەلات بوەسـتنەوە. دوکاندارەکان لە دەوری ماڵی ئایەتوڵڵا گردبوونەوە. ئەوان توانییان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دوکانەکانیان دابخەن، دەنا دۆخەکە بە پێچەوانەی بەرژەوەندیی ئەوان وەردەگەڕا.
پاشـا هەدادانی نەما. فەرمانی دەرکرد، دوکاندارەکان بەزۆر لە ماڵی ئایەتوڵڵا دەربکەن و خودی ئایەتوڵڵا بەسـالاچووەکەش بۆ شـوێنێکی نهێنی ببەن.

یاسـاوڵە ئاسـایشـپارێزەکان هێزوگوڕی دوکاندارەکانیان بۆ بەرگری لەبەرچاو نەگرتبوو، بە هەندیان نەدەزانین. ئیدی یاسـاوڵەکان لە ترسـی ژیانی خۆیان دەسـتیان بۆ تفەنگەکانیان برد و تەقەیان کرد. کوژرا و بریندار پەیدابوون. خەڵکەکە وروژا، لە حەوشەوە پەلاماری یاساوڵەکانیان دا. لە گۆترە تەقە کرا. دانیشتوانی گەڕەکەکە و دەوروبەری بەئاگاهاتنەوە، بە لێشـاو لە ماڵەکانیان هاتنەدەر و بەرەو ماڵی ئایەتوڵڵا شـیرازی هاتن. بە سـەدان کەس ڕژانە کوچە و کۆڵان و لێ وەسـەر بانان کەوتن، بەم جۆرە یاساوڵەکان لەهەموو لایەکەوە ئابلۆقە درا و گیران.
بە یاوەریی جەمال خان و ئەمیر نیزام شیرازی لە کتێبخانەکەی هاتەدەر. ئەمیر نیزام مێزی خوێنـدنەوەی بۆ ئـایەتوڵڵا دانـا. ئـایەتوڵڵا بەسـالاچووەکەش بە پاڵپشـتیی جەمال خان تەکانێکی بە خۆی دا و بە زەحمەت بەسـەر مێزەکە کەوت. گۆپاڵەکەی بەرز کردەوە، ئیدی بێدەنگی باڵی بەسـەر ئامادەبوواندا کێشـا. "من فتوایەک دەدەم، لەمڕۆ بەدواوە توتن حەرامە، هیچ کەس لەو وڵاتە نابێ توتن بکێشـێ. هەر کەسـێکیش ملکەچ نەبێ جاڕی شەڕ دژی خودا دەدا."
هەمیشـە فەتوا وەک ڕاوێژێکی قـانونی وەرگیراوە. کـاتێکیش قـازیی ئیسـلامی لە دۆزێکی بەردەمی هیچ دەقێکی لەلا نەبێ، بۆ بەرچاوڕوونی

داوا لە ئایەتوڵڵا دەکا. هەمیشـــەش ئەمە پەیوەندی بە موســـڵمانان و شـــێوازی ژیانیانەوە هەبووە. هەروەک چۆن خواردنی گۆشـــتی بەراز، خواردنەوەی مەی و مێردکردنی ژنانی موســـڵمان بە غەیرە موســـڵمان، بەڵام ئەمە بۆ یەکەمین جار بوو فتوایەک بە مەرامێکی ســـیاســـییەوە بارگاوی بکرێ.

ئەم فتوایە سـەنگین و هەسـتیار بوو، چونکە لە دژی پاشـا و گەورەترین زلهێزی دونیا کە ئینگلستان بوو دەرکرابوو.

ئایەتوڵڵا بە سـاڵاچووەکە پێشـبینی لێکەوتەی فتواکەی بۆ سـەد سـاڵی دوای خۆی نەدەکرد هەروەهـا نەیـدەزانی ڕەفتـاری بـازرگـانی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا دەگۆڕێ.

ئایەتوڵڵا میرزای شیرازی قسەی خۆی کرد و گەڕایەوە هۆدە سادەکەی خۆی. دیاربوو قســـەکانی ئەو بەهێزتر و کاریگەرتر بوون لە هەزاران گوللە تۆپ. ئینجـا بۆ مـاوەیەکی درێژ بێدەنگی لە حەوشـــەی مـاڵی ئایەتوڵڵا، لە گەڕەکەکە، لە شـارەکە و لە وڵات، هەروەها لای پاشـا و لە لەندەنیش باڵکێش بوو.

# ٤٧



# قلیان

هیچ کەس ڕەچاوی لێکەوتەی ڕووداوەکانی شـیرازی نەکردبوو. بەوەی ئینگلسـتان کەوتبووە بەر شـالاوەکە، ئەوا بۆ ڕوسـیا بەختێک بوو لە ئاسـمانەوە بۆی باریبوو. لەبەر ئەوەی تێبینی ئەوە کرابوو، پاشـا هەم متمانەی خۆی و هەم جڵەوی وڵاتەکەی لە دەسـت داوە، بۆیە باڵوێزی ڕوسـیا لە تاران دوا گرێبەسـتی یەکلاکەرەوەی هێڵی ئاسـنینی بۆ واژۆکردن لەبەردەم پاشای دانا.

پاشـا هێشـتا بە تەواوی لە واتای فتواکە نەگەیشـتبوو چ جای ئەوەی کەسێکی دیکە بزانێ ئاخۆ فتواکە چۆن بە کردەوە جێبەجێ بکرێ.

ئایەتوڵڵا شـیرازی خۆیشـی سـەری لێدەرنەدەچوو. لە پیاسـە ڕۆژانەییەکانی کاتێک پشـووی دەدا، ئاوڕێکی بۆ پشـتەوە دەدایەوە. بینی قلیانەکەی لەسەر تەختەبەندەکەی پشودان دانراوە. لەوانەیە خزمەتکارەکە لەوێی دانابێ.

شـیرازی گەڕایەوە و بەسـەری گۆپاڵەکەی لە قلیانەکەی داو وەریگێڕا، پشـکۆی توتنەسـوتاوەکە بەگوڕێ وەربوو. خزمەتکارەکە ئەمەی بینی و

ڕەفتارەکەی وەک کردەوەیەکی بەرهەڵستی لێکدایەوە. هەواڵەکە وەک ئاگری بن پووش بڵاوبووەوە. بەدوای ئەودا هەزاران و هەزاران قلیانی دیکە تێکشکێنران و فڕێدران.
لە ماوەیەکی کەمدا وایلێهات قلیان لە وڵاتدا نەما. هەروەها لەبەردەم باڵوێزخانەی بریتانی لە تاران خۆپیشاندان لە دژی قلیاندا کرا. وەک ڕێکارێکی خۆپارێزی دەرگەوانی باڵوێزخانەکە بە زنجیرێکی ئەستوور دەرگای باڵویزخانەکەی قفڵ دا و کارمەندەکانیش چوونەوە ماڵی خۆیان.

پاشا لە کردەوەی دژ بە قلیان ئاگادارکرایەوە. سەرەتا وایزانی ئەم کارە هی بەدکارانە، لێ وەها دەرکەوت خەڵک بە هەموو چین و توێژەکانیەوە بەشدارییان لەو هەڵمەتەدا کردووە. تۆ بڵێی بانگەوازی داهاتووی ئایەتوڵڵا چی بێ؟ تۆ بڵێی بوێرێ ڕاستەوخۆ گەل لە دژی پاشا تیختیخە بدا؟
پاشا بە پەشێوحاڵییەوە لە ڕاڕەوکانی کۆشکەکەیدا ڕاوێچکەی دەدا. تەنانەت چووە نهۆمی دووەم، ئەو شوێنەی بە دەگمەن سەری پێدادەکرد. کەوا و جلوبەرگ و کەلوپەلە هەڵگیراوەکانی باوکی کۆچکردوو و پاشاکانی دیکەی تێدا هەڵگیرابوون. هەر لەوێش تابلۆیەکی گەورەی باوکی هەڵواسرابوو. ئەو بە تابلۆکە بەڵەد بوو، ئەو تابلۆیەی باوکی بە خۆی و تاج و کەوای پاشایەتییەوە، بەوپەڕی شکۆی خۆیەوە لەسەر تەختەزێڕینەکەی پاڵی بە سەرینی ئاوریشمین دایەوە، بەڵام تازە بۆی دەرکەوت باوکی قلیانی دەکێشا. شتێک بوو مایەی لێتێگەیشتن نەبوو. باشە بۆچی پێشتر هەرگیز ئەوەی بەخەیاڵیدا نەهاتووە و قلیانی لەدەستی باوکیدا ببینێ؟ ئێستا تێگەیشت ئەمە پۆرترێتی باوکی نەبوو، بەڵکو هی قلیان بوو.

کاتێکیش ڕەوتی بەرهەڵستییەکە بە تێکوپێکشکاندنی قلیانەکان تەقییەوە و گەیشـــتە کۆشـــک، دەرفەتێک هەبوو بەوەی ژنەکانیشـــی گوێڕایەڵی ئایەتوڵڵا بەسالاچووەکە بن. ئەوەی پاشاش چاوەڕێی نەدەکرد، ئەوەبوو پشـــێوی دەرکەی حەوشـــەی ماڵی خۆیشـــی لێ بگرێ. هەموو ڕۆژێ مەلیچکی دەناردە حەرەمســـەرا ئاخۆ قلیانەکان شـکێنراون یان نا. هەموو جارێکیش مەلیچک بەو چیرۆکە ناڕوونە دەگەڕایەوە.

پاشا لێی دەپرسی: "ئەرێ قلیانت بینین؟"

مەلیچکیش گەمژانە دەیگوت: "بەڵێ، قلیان."

"ئایا قلیانەکان ساغ بوون؟"

مەلیچکیش پرسی: "ساغ؟"

"ئایا قلیانەکان شکێنرابوون یان نا؟"

"نەخێر، بەڕاستی نەشکابوون."

"ئایا ژنان قلیانیان دەکێشا؟"

مەلیچک وەڵامی دەدایەوە: "ژنەکان؟ بەڵێ بێگومان."

"ئایا ئەوانت بینین؟"

هەروەک ئەوەی ئاگای لێنەبووبێ، مەلیچک بە چاوی خێلەوە تەماشـــای پاشای دەکرد.. پاشا هاتبووە سەر ئەوەی زللەیەکی تێ بسرەوێنێ، بەڵام بەهۆی نیگای کوڕیژگە خەپە خۆشـەویستەکەی، کە مایەی بەزەیی بوو، تووڕەییەکەی دامرکایەوە.

پاشـــا زۆر بەرگەی نەگرت. بە درەنگانێکی نیوەڕۆیەکە، لە کاتێکدا ژنانی حەرەمســـەرا لە یەک کۆدەبوونەوە تا بەیەکەوە قلیان بکێشـن، لەو کاتەدا پاشـــا بەخۆی و مەلیچک پیاســـەی بەناو حەرەمســـەرادا کرد. لەوێ بە شێوەیەکی سەیر سڵاوی لە قەرەواشەکان کرد و چاوەڕێی خواجەباشی، بەرپرســـی حەرەمســـەرای کرد، کە هەمیشـــە لە هۆدەکەی خۆی لای

دەرگاکە دادەنیشت. کەچی ئێستا ئەویش لەوێ نەبوو، هەروەها قلیانەکەشی دیار نەبوو.

پاشا بۆ ئەوەی دڵی خۆی بداتەوە بە مەلیچکی گوت: "ئەو سەرقاڵە، ها بینا هاتەوە."

هەر بەڕاستیش بێدەنگییەکی سەرنجراکێش بوو. جاران ژنەکان هەر کاتێ پاشایان لە دەرکە ببینیبووایە، بەغار دەڕۆیشتنە ژوورەکانیان و جلی جوانیان لەبەر دەکرد و خۆیان دەڕازاندەوە و لەسەر ئەوە بەشەڕ دەهاتن ئاخۆ کێیان زووتر سەرنجی پاشا بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، بەڵام خۆ ئێستا هیچ ژنێک لەوێ دیار نەبوو. هەموو قلیانەکانیاش بە دیوارەوە هەڵپەسێدرابوون.

لەپڕ قلیانێک لە نهۆمی دووەمەوە بەربووە و لە خوارەوە بەر پاردە بەردینەکە کەوت و هەلا بەهەلا بوو. مەلیچک دەستبەجێ خۆی لەپشت پاشا پەنادا، ئەو وایکرد وەک ئەوەی نەهیچی دیبێ و نە هیچیشی بیستبێ. خۆ ئەگەر ئەمە پێش مانگێک ڕوویدابا، هەڵبەت پاشا خەتابارەکەی پارچە پارچە دەکرد، لێ ئێستا نازانێ ئاخۆ دەتوانێ وەها بکا یان نا. ئەو لەوە دڵنیا بوو، ژنانی حەرەمسەرا ئەوانەی ڕقیان لێیەتی، فتواکە دەقۆزنەوە تا تۆڵەی بکەنەوە. خۆ ئەگەر یەکێکیشیان سزا بدا، سکاڵا دەبەنە لای ئایەتوڵڵا و ئیدی ئەو وەک کەسێکی خوانەناس وێنادەکەن.

پاشا بانگی کرد: "خواجەباشی!"

بەرپرسی حەرەمسەرا لەپشت بارستاییەک لیفە و پەتۆی پیسوپۆخڵ وەدەرکەوت و بە شێوەیەکی نارێکوپێک چەمایەوە.

شا پێیگوت: "بانگی ژنەکان بکە. دەمانەوێ قلیان بکێشین."

نۆکەرەکـان بە پەلەپەل بەخۆ کەوتن تـا قلیـانەکـان ئـامـادە بکەن. خواجەباشـــییش چووە ژوورەکان و بە دەنگێکی لەرزۆک بانگیکردن:
"خانمان قلیانەکان ئامادەن، خاوەنشکۆ دەیەوێ قلیانتان لەگەڵ بکێشێ."
شـــا بەدەســـت لەپشـــتەوە گریدان بەلای ژوورەکاندا چوو. مەلیچکیش غاریدایە لای خشـخشـۆکەکە، بەڵام بۆ خوارە لێی نەخزی. هەسـتی بە نائارامی کەشـەکە کرد، بۆیە لەسـەر تۆقەڵی خشـخشـۆکەکە مایەوە و هەڵتروشکا تا چاودێری پاشا بکا.
ژنەکان بەپیر بانگەوازەکە نەهاتن. ئەو نۆکەرانەی قلیانەکانیان ئامادەکرد، لە ژیانی خۆیان دەترســـان. خەمی ئەوەیان بوو لە دەوروبەری پاشـــا دوورکەونەوە. خواجەباشـی کورسـییەکی پاشـای هەڵگرت و لە نزیک فوارەی ئاوەکەی دانا. کاتێک قلیانەکەســی دایەدەســت، بانگی کردەوە:
"خانمان، شا خەریکە قلیان دەکێشێ!"

خڕەی قفڵدانی دەرکەکان بە نەرمی دەبیســـترا. شـــا یەک دوو مژی لە قلیانەکە دا و لە ماسـییە سـوور و کەسـکەکانی نافوورەکە نزبووەوە.[83] ئاخر بە گوێرەی فتواکە بووایە، نەدەبوو کەس توتن بکێشـێ و هەر کەسێکیش وەها بکا ئەوا گڵاوە. ئێستاش پاشا گڵاو بووە، ژنەکانیش لە خواوە ئەو مافە یان پێدرا پیاوەکە یان پشـتگوێ بخەن و نابێ توخن بکەون.
شا بانگی کرد: "ئەرێ ئەوانە لە کوێن؟"
نۆکەرەکـان لە قوژبنە تـاریکەکـان خۆیـان گرمۆڵە کرد تـا نەبینرێن. خواجەباشـــییش جارێکی دیکە خۆی لەپشـــت بارســـتایی لیفە و پەتۆ پیســـەکان حەشـــار دایەوە. هەرچەندە ئەو پاشـــا بوو، لێ تێکەیشـــت دەســـەڵاتی بەقەد ئاخوندە بەســـاڵاچووەکە نییە. تەنانەت ئەگەر لەجاران

[83] لێ نزبوونەوە: بە وردی و چاوی مۆلەقەوە سەیرکردن و تێرامان.

توندتر ســـزای ژنەکانیشـــی بدا، ئەوا هیچ ژنێکی زات ناکا دەســـت بۆ قلیانێک ببا یان سەرجێی لەگەڵدا بکا.

شا نەڕاندی: "وا پێتدەڵێم ئەوانە لەکوێن؟"

مەلیچک لەسەر خشخشۆکەکە بازی داو بە دوودڵییەوە چووە لای پاشا. دەســـتی پاشـــای گرت و بەرەو دەرگای برد. بۆ مایەی خۆشـــحاڵیی هەمووان، پاشا بەدوای مەلیچکدا لە حەرەمسەرا چووەدەر.

## ٤٨

# دانیشتنی سەرچۆکان

فتوای ئایەتوڵڵا وڵاتی بێدار کردەوە. بە هۆیەوە هیوا لە چاوی خەڵکیدا دەبینرا. بـازرگـانێکی گەورەی توتن لە ئیسـفەهـانێ هەموو تووتنە داکراوەکەی خۆی هێنایە گۆرەپانی بازاڕ و ئاگرێکیان بۆ کردەوە فەردە فەردە دەیانخستە ناوگڕەکە و بە نمایشەوە سوتاندیان.
تێکوپێکشـکاندنی قلیانەکانیش هەموو خەڵکیان لە دەسـەڵات و هێزی خۆیان بە ئاگا هێنایەوە. پێگەی پاشـا ناسـک و شـلۆق دەرکەوت، بەهێواشـی ترس لە دەسـەڵاتداران دەڕەوایەوە. دوکاندارانی تاران و تەورێز و ئیسـفەهان و شـیراز بە گوڕدەم بەرەو مزگەوتی گەورەی[٨٤] شارەکانیان دەچوون تا لەسەر چۆکان لێی دابنیشن. ئەو لەسەر چۆکان دانیشتنە شێوە دانیشتنێکی ناسراوە بۆ ناڕەزایەتی دەربڕین. بنیادەم پەنا بۆ ماڵی خوا دەبا لەوێ تا ماوەیەکی درێژ دادەنیشـێ تا ئەو کاتەی

---

[٨٤] مەبەست ئەو مزگەوتەیە کە نوێژی هەینی لێدەکرێ، لە شارەکانی ئێران تەنیا لە یەک مزگەوتدا نوێژی هەینی دەکرێ. وەرگێڕ

داواكانى جێبەجێ دەكرێن. بەم جۆرە خەڵكى خۆپیشـــاندەر و ناڕازى ڕوویان لە مزگەوت و ســەر مەزارەكان دەكرد و لەوێ لەســەر چۆكان لێى دادەنیشـــتن، لەوێ تەنـاهییـان[85]پـارێزراو بوو. ئـاخر لەوێ كەس تەشـــقەڵەى پێنەدەكردن. تەنانەت فەرمانێكى شـــاهانەش بۆ گرتن لەو شوێنانە نەیدەخوارد.

ئیدى خەڵكێكى زۆر بۆ پاڵپشـــتیى مانگرتووان ڕوویان لە مزگەوتەكان دەكرد. ئەو كەســـانەى لەپشـــت مانگرتنەكانەوە بوون، پەیوەندییان بە كۆمیتەكەى جەمال خان لە تارانەوە هەبوو. لە هەموو وڵات هەر یەك دروشم بەرزدەكرایەوە: "ئینگلیز، واز لە توتنەكەى ئێمە بێنە!" "ڕایەڵەیەكى نیشـتمانیى تێلێگرافمان دەوێ دەنا هەموو دارتێل و كێبڵەكان هەڵدەقەنین و فڕێیان دەدەین!"

هەندێ لە ئەندامانى دەســـتەكەى جەمال خان داخوازیى دیكەیان هەبوو. ئەوان ویســتیان پسـپۆڕە ئێرانییەكان سـەرپەرشـتیى پشـكنین و گەڕان بەدواى نەوت لە ئەسـتۆ بگرن، بەڵام ئەوانى دیكە پێیان وابوو جارێ بۆ ئەوم داواكارییە زووە. سـەربارى ئەوەش هێشـتا پسـپۆڕى ئەو بوارە پەیدا نەبوون تا كارى ســـەرپەرشـــتییان پێ بســـپێردرێ. ئیدى هەر دەســـتیان بەو داخوازییانە گرت كە لە لاى گەلەوە هەســـتى پێدەكرا و مایەى ئەوەش بوون جێبەجێ بكرێن.

تا دەهات ڕەوتى بەرهەڵســتییەكە پەرەیدەســەند. هێشـتا حەشـاماتى زۆرترى خەڵك دەچوونە پاڵ دانیشـــتنى ســـەرچۆكانى بازرگان و دوكاندارەكان. پاشـــاش وەها خۆى نواند، وەك ئەوەى نەباى دیبێ و نەباران، بە هیچ شـــێوەیەكیش ئامادەنەبوو بچێتە ژێر بارى داخوازیى خۆنیشـــاندەرەكان. ئاخر ئەو جۆرە ڕێككەوتنە داهاتەكەى دەخســـتە

[85] تەناهى: ئاسایش

مەترسییەوە. ئەو سەرانە جێگیرە شاهانەییەی لەسەر هێڵی تێلێگراف و پرۆژەی کانەنەوتییەکان بۆ پاشـا دەهات، تێچوونە زۆروزەوەندەکانی کۆشک و حەرەمسەرا و گەشتەکانی پاشای پێ دادەپۆشی. بەتایبەتیش ئێستا کە هەست بە هەڕەشەی گەل دەکا، نەیدەویست دەستکاریی گرێبەستەکانی لەگەڵ ئینگلستانی زلهێزدا بکا. لەم رۆژە تەنگاو و پشێویانەدا پێویست نەبوو پشت بە گەلە نەخوێندەوارەکەی ببەستێ، بەڵکو پشت بە باڵوێزخانەی بریتانیا ببەستێ.
لە جارانیش پتر دوودڵ بوو. هەر لەبەر ئەمە بوو بەردەوام سەردانی پیرەدایکی دەکرد، کە پێشتر بە تیژبینی خۆیەوە یارمەتیی پاشای دابوو. مەهدولیا کوڕەکەی خۆی باش دەناسی، قسەی لەگەڵ دەکرد و ورەی دەدایەبەر: "ئەمانە ئەو ساتەوەختانەن کە هەموو پاشایەک لە ژیانی خۆیدا پێیاندا دەڕوا. ڕەعیەتەکەت نازانێ ئاخۆ ئەوان بۆ ژیانیان چییان دەوێ. خۆی ئەمە ئەرکی پاشایە هەڵیانسوڕێنێ. ئەوە فەرامۆش نەکەی، ڕوسیا لە پشتی تۆیە، باوکت و من پەیوەندییەکی تۆکمەمان لەگەڵ ئەواندا گرێداوە. ڕۆڵە، هیچ هەنگاوێک بۆ دواوە نەگەڕێیتەوە، تەنانەت ئەوکاتە دوژمن بیەوێ بتکوژێ. پیاوانی هۆزەکەمان هەرگیز لە مردن نەترساون."

شا گومانی لەو پەیوەندییە تۆکمەیەی هەبوو، ئەوەی زیاتر لە جارێک دایکی بە بیری دەهێنایەوە. بەلای ئەو ڕوسەکانیش لەوانی دیکە شەریفتر نەبوون. خۆ ئەگەر دەرفەتیان بۆ هاتبا ئەوانیش هەر خۆیان ڕەپێش دەخست. پاشا لەو پلانەدا بوو تا کۆتاییە تاڵەکەی لەگەڵیدا بڕوا. ئەو ویستی ئەوە نیشانی ئینگلیز بدا، لە بارێکی وەهادایە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان بکا. هەر بۆیە فەرمانی دەکرد هێزی هەیتە و

یاساوڵ دەستی کراوەبێ تا جووڵەی بەرگری بە زەبروزەنگ سەرکوت بکەن.
هێشتا فتوای ئایەتوڵڵا بەسالاچووەکە ڕاستەوخۆ کاریگەریی بەسەر هێزی لەشکرەوە نەبوو. هەمیشە سوپا هەر بەدڵسۆزیی بۆ پاشا مابووەوە. دواتر وشەکانی ئایەتوڵا پێستە ئەستوورەکەی هێزی جەنگاوەری وڵاتیشی بڕی.
لە تاران هەیتە چەکدارەکان بەسەر مزگەوتی گەورەی شاریان دادا و کەوتنە گیانی دوکاندارە مانگرتووەکان و بەزۆر لە مزگەوتییان هێنانەدەر. چەند دانەیەک لە دوکاندارەکان دەستیان کردەوە و یەکێکیشیان لەو شەڕە دەستەویەخەیەدا گیانی خۆی لەسەر دانا. کاتێکیش ئەوان تەرمی هاوڕێکەیان لەسەر شان بۆ مزگەوتی بازاڕ برد، تاقمێک لە دز و جەردە خەریک بوون دوکانەکانی بازاڕ ئاگرتێبەردەن. ئیدی خەڵکەکە بە سەتڵی ئاوەوە خەریکی کوژاندنەوەی ئاگرەکە بوون، نەوەک تەواوی بازارەکە بگرێتەوە.
ئەم سوتاندنە هەواڵێکی ئاگادارکردنەوە بوو بۆ شارە گەورەکانی دیکە. ئیدی بە ڕۆژ و شەو ئێشک لە بازاڕەکە دەگیرا.

لە تاران سەرۆکی هێزی هەیتەی ناوشار دەرگای مزگەوتە گەورەکەی گاڵە دا و فەرمانی ئەوەشی ڕاگەیاند هەرکەسێک لەو دەوروبەرە ببینرێ، دەگیرێ و ڕاپێچی زیندان دەکرێ. ئەم دانیشتنەی سەرچۆکان لە مزگەوتە بچووکەکانی دیکە درێژەی پێدرا و بێژمار خەڵک لە گۆڕەپانی مزگەوتی گەورە بۆ پاراستنی گیانی دوکاندارەکان گردبوونەوە.
هەیتەکان دڵڕەق بوون. بە تێڵاکانیان وەرگەڕانە ئاپۆرای خەڵک لە کۆتاییدا توانیان خەڵک لە گۆڕەپانی مزگەوتەکە وەدەرنێن. دوکاندارەکان لە مزگەوتە بچووکەکانیان وەدەرنران. بەم کردە توند و گرتن و

ڕاپێچکردنی بە زۆرەملێ، ئەو بوارە بۆ بازرگان و دوکاندارەکان نەما تا تاکلایەنە بەرگە بگرن.

هەرچەندە ئێشک لە بازاڕ دەگیرا، لێ تاقم و باندەکان بە شەوان بەسەر بانەکانەوە خۆیان دەگەیاندە دوکانەکان، تا ئەمبار و کۆگای دوکانەکان بسووتێنن. ترس و گومان باڵی بەسەر دوکاندارەکاندا کێشا. ئەوان لە مەزندەی ئەوە دابوون بەڵکو ژیرانەترین کار ئەوەبێ، دوکانەکانیان بکەنەوە.

کۆمیتەکەی جەمال خان ئاماژەی دوودڵی و گۆڕانی هزری خاوەنکارەکانیان بۆ هات و لێی تێگەیشتن. تا ئێستا ئەوان سەروکاری بەرگرییان هێنابوو، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە دەستپێشخەرییەکی نوێ بکەن. ئەگەر وەهایان نەکردبا، لە کۆتاییدا دەیاندۆڕاند.

لەپاش چەندین کۆبوونەوە بڕیاردرا لە هەر شوێنێک کاڵا و شتی بەریتانییەکان هەبێ، هێرشی بکرێتەسەر. ئیدی لە هەموو وڵات دەست بەسەر کارخانە و بەروبوومەکانیاندا گیرا و کارمەندی بریتانی و هیندیەکانیشیان دەردەکردن.

ئینگلستان فشاری زۆری خستە سەر پاشا تا گیانی کەسەکانی بپارێزێ و کارخانە و کاڵاکانی لەدەستی خەڵکەکە بپارێزێ. ئەوە بوو پاشا سوپای خستەگەڕ تا باڵوێزخانەی بریتانی بپارێزن و کارخانەکانی توتنیش لە خۆپیشاندەران و خەڵکیی ناڕازی پاک بکەنەوە. لە کێڵگەکانی توتندا جوتیارەکان ئەوەیان نیشاندان، ئەوانیش بایەخی خۆیان هەیە، بۆیە بە پاچ و بێڵەکانیان لە دژی هێزی چەکدار وەستانەوە، تا کار گەیشتە ئەوە سوپا تەقە بکا.

ئەم دەستکردنەوە توندەی سوپا تووڕەیی خەڵکی بە جارێک وروژاند. ئیدی کێبڵی تیلێگراف بڕدرا، دارتێلەکان خرانە خوار و لەسەر یەک دانران و ئاگریان تێبەردرا.

هەموو بریتانییەکانی ئێران بەرەو پارێزگا ئارامەکەی باشــوور نێردران. هەر بە تەنیا باڵوێزخانە و دەســـتەکەی لە تاران مانەوە بۆ ئەوەی تا بکرێ لە نزیک پاشاوە بن، ئاگایان لە ڕەوتی پێشهاتەکان بێ.
لە نـاوچەی دەوڵەمەند بە کانە نەوتەکـان و لە مـاوەیەکی زۆر کورتـدا چەنــدین گونــد لەگەڵ خــاک تەختکران. بریتــانییەکــان لەوێ هەموو هۆکارێکی مانەوەیان جێگیر کردبوو. هەر کەسێک سـەرنجی دامودەزگا، خـانوبەرە، گۆڕەپـانی یـاری و ڕاکێشـــانی بۆڕی ئـاوی بـدابـایە، لەوە تێدەگەیشـت ئینگلسـتان نەخشـەیەکی وەهای هەیە، بەلای کەمییەوە تا سەد ساڵ لەم وڵاتە لێی دابکوتێ.

ئەوی بریتانییەکان لێی دەترســـان، قەوما. پاشـــاش لەباریدا نەبوو پشێویەکە جڵەو بکا. لەڕاستیدا ئینگلستان ئەو دەسەڵاتە لاوازەی وڵاتی بە خاڵێکی باش بۆخۆی بینی. ئەوان بەوە خۆشحاڵ بوون شێخ ئاغاسی جێگەی وەزیرەکەی پێش خۆی گرتۆتەوە. لێ هەنووکە هەر بەڕاســـتی بەرژەوەندییەکانیان کەوتۆتە بەر مەترســـی، ئیدی بە شـــێوەیەکی دیکە بیریـان لێکردەوە. بۆ ئەوەی پێگەی خۆیـان لەوێ بە ئـارامی بپـارێزن، دەبووایە کار لەگەڵ ڕەوتی بازاڕدا بکەن. هەربۆیە لەندەن باڵوێزەکەی خۆی ڕاسپارد تا چۆن وتوویژی لەگەڵ شادا دەکرد، بە هەمان شێوەش قســـە لەگەڵ ڕاپەڕیوەکانیش بکا. دەســـتبەجێ پاشـــا هەر شـــەقڵێکی نێوەندگیری لەو شێوەی باڵوێزخانەی لەگەڵ خۆپیشاندەران ڕەتکردەوە.
پاشـــا بە باڵوێزی بریتانیای گوت: "ئێمە لە ئێوە باشـــتر ڕەعیەتەکەی خۆمان دەناســـین. خۆ ئەگەر بوار بە ئایەتوڵلاکان بدەین، هەرگیز لە کۆڵمان نابنەوە. دوکاندار و کاســـبکارەکانیش ناتوانن بۆ هەتا هەتایە دوکـانەکـانیـان دابخەن. ڕۆژێـک دێ لە مـانگرتنەکەیـان بێزار دەبن و

دەگەڕێنەوە سەر کار و کاسبییان. دەی، ئێوەش هەروەک ئێمە ئارام بگرن."

سەرلەنوێ جەمال خان و پیاوەکانی دۆخەکەیان تاوتوێ کردەوە. ئەوان دوو ئەگەریان لەپێش چاوی خۆیان بینین. یان دەبێ هێرش و پەلامارەکانیان بۆ سەر کاڵا و شتەکانی بریتانی بۆ باشووری وڵات پەرەپێبدەن یان بە حەشاماتی خەڵکییەوە بەرەو کۆشک بکشێن و شا بخەنە ژێر فشاری خۆیانەوە.
پەلاماردانی بریتانییەکان لە باشوور کارێک نەبوو دەرەقەتی بێن. هەر بۆیە کۆمیتەکە بڕیاریدا سەرنج بخاتە سەر دوو شوێنی ستراتیژی لە تاران: باڵوێزخانەی بریتانی کە پێویستە دەستی بەسەردا بگرن، هەروەها بەرەو کۆشکی پاشاش بڕۆن و گەمارۆی بدەن.
جەمال خان لە میانەی قسەکانیدا گوتی: "پێویستە ئێمە باڵوێزخانەی بریتانی بەرکەنار بکەین. ئاخر ئەوان پێویستیان بە ئێمەیە و ئێمەش بە ئەوان. ئێمە دەبی بەرهەڵستیان بکەین و لەهەمان کاتیشدا وەک هاوکارێک لە دژی چەوساندنەوەی شادا بیانبینین، دەنا شەڕەکە لە هەردوو بەرەکەدا دەدۆڕێنین. خۆ ئەگەر بەسەر باڵوێزخانەی بریتانیدا بدەین، ئەوا پاشا ئەو بیانوەی بۆ پەیدا دەبێ، لەناومان بەرێ. من وای بۆ دەچم فشاری زیاتر بخەینە سەر شا و لە هەمان کاتیشدا لە بەریتانییەکان داوای ڕاچاندنی هێڵی تێلێگرافی نیشمانی بکەین."
پێدەچوو نەخشەکە باش بێ، لێ هێشتا لە سەرچڵی بەدەر نەبوو. وەهای دابنێ کارلەکار بترازێ و خەڵکەکە هێرش بکاتە سەر کۆشک. وەها دابنێ پاشا بە بارمتە بگیرێ، لەوەش پۆلکتر بیکوژن. ئینجا ئایا بریتانیا و ڕوسیا ئەو پاشاگەردانییەی وڵاتیان نەدەقۆستەوە تا لە نێوانی خۆیاندا دابەشی بکەن؟ ئایا ئەمە بۆ هەمیشە نەدەبووە کۆتاییهێنان بە دەوڵەتی

کۆنی ئێرانی؟ دیاربوو داگیرکردنی باڵوێزخانەی بریتانی باشترین ڕێگە بێ. ئاخر ئەمە چەند بریتانیای پێ قەڵس دەبوو ئەوەندەش پاشا و وای لێدەکردن سازش بکەن.
دوای هەفتەیەک لە دەمەتەقێ و لێکدانەوەی دوورودرێژ، ئەمیر نیزام بەخۆی و هەواڵێکی سەرسام دەرکەوت. "کۆمپانیای توتنی بریتانی ئامادەیە لەبارەی پرژەی توتنی نیشتمانی دانوستان بکا."
باڵویزخانە لە ڕێی پێناوێکەوە پێشنیازێکی خستبووە ڕوو. پێناوەکە کۆنە ناسیاوێکی ئەمیر نیزام بوو، زۆر جاران لە چاخانە یەکدییان دەبینی. کابرا وەک کوڕی گەورە بازرگانێکی مافوور، یەک دوو ساڵان لە لەندەن ژیا بوو. ئێستاش کاروباری تایبەت بەخۆی هەیە و مافووری ئێرانی دەنێرێتە ئینگلستانێ و لەوێ دەیانفرۆشێ. پەیوەندییەکی باشیشی لەگەڵ باڵوێزخانەی بریتانی هەیە.
"برادەران، لە میانەی وتووێژێکم لەگەڵ کابرای پێناو، دەرکەوتووە لەندەن بە شێخ ئاغاسی وەک وەزیر خۆشحاڵ نییە. بەرژەوەندیی ئەوان لە ئێرانێکی ئارام و سەقامگیردا هەیە و بەدوای شێوازێکدا دەگەڕێن تا پێشهاتەکان کەڵک وەربگرن. لەنێو دێرەکاندا وەها تێگەیشتم، لەندەن ئامادەبێ سازش بکا."
تالیبۆڤ پرسی: "سازش لەسەر چی؟"
"لەبارەی ڕایەڵەی ناوەخۆ بۆ تێلێگراف."
جەمال خان لێیپرسی: "ئایا پێناوەکە دەقاودەق وەهای پێگوتی؟"
"نەخێر، دەقاودەق نا. باڵوێز بۆ پاشای ڕوون کردۆتەوە، بەڵام خۆ ئەو نایەوێ هەر باسیش بکرێ. پاشا دەترسێ ئەگەر هات و مل بۆ ئەو داخوازییانە کەچ بکا، چیدی جڵەوی وڵاتی پێ نەکرێ."
هەمووان کەوتنە بن باندۆری هەواڵەکە.
ئینجا میرزا ڕەزا پرسی: "ئایا ئەو پیاوە پێناوە چی دەوێ؟"

"هیچ. ئەو تەنیا هەواڵەکەی گەیاند."
ئەمیر هاتەوە قســـــە: "ئینگلســـــتان بەمە دەیەوێ بڵێ بە هەبوونی شـــا دڵخۆش نییە و بە دوای هاوکارێکی متمانەدار دەگەڕێ."
جەمال خانیش هەڵیدایێ: "خواســتە دنەدەرەکانی ئینگلســتان لەوەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە ئاڵۆزترن. بۆیە دەبێ ئێمە ستراتیژی خۆمان دابڕێژین و قورگی پاشا بگرین."
خۆی هەر بەتەنیا ئەمیر نیزام نەبوو، ئەو ئـامـاژانەی پێگەیشـــتبوون. بریتانییەکان گەمەیەکی دووســـەرەیان دەکرد. ئەوان لەوە دەترســـان لە کاتی تەنگانەدا ڕوســـەکان پشــتی پاشـا بگرن و بە هانایەوە بێن. لە ڕێی کەســـــانێکی نزیکیش لە ئـایەتوڵڵا ئەوەیـان بە گوێی ئـاخوندەکەد دا: "ئینگلســـتان ئامادەیە مل بدا، بەڵام پاشـــا لەبەردەم چارەســـەر ڕێگرە. یارمەتیی تۆمان پێویستە."

دوکاندارەکان دوای نوێژی هەینی، مانگرتنی دانیشـــتنی ســـەرچۆکانیان شکاند و بە کۆمەڵ بەرەو کۆشکی پاشا ڕۆیشتن، لە ڕێڕۆیشتنەکەیاندا حەشـاماتێکی زۆری خەڵکیان ڕەگەڵ کەوت. لە ڕۆیشـتنەکاندا هەموویان بە یەک دەنگ هاواریان دەکرد: "توتن! توتن! توتنی خۆمان! تێلێگراف! تێلێگراف! تێلێگرافی خۆمان!"
کاتێک یەکێک لە پاسـەوانەکانی کۆشـک لە دەرکەی پاشـای دا، پاشـا لە ســەر مێزێک دانیشـتبوو: "خاوەنشـکۆ! خاوەنشـکۆ! بە هەزاران کەس لە ڕەعیەتەکە وا بەرەو کۆشک دێن!
پاشا لە ئاوێنەکەدا بینی، ڕەنگی بزڕکا.
- "چی دەڵێن؟
- "دروشمی دژ بە ئینگلستان دەڵێنەوە!"
- "چ جۆرە دروشمێک؟"

- "خاوەنشـــكۆ، نازانم، من هەواڵەکەم لە یەکێ لە پاســـەوانەکانم بیست."

پاشا ویستی بزانێ ئاخۆ خەڵکەکە دروشم لە دژی ئەویش دەڵێنەوە.

- "ئەوان چی دەڵێنەوە؟"

کابرای پاسەوان بە نادڵنیاییەوە: "شت لەبارەی توتن و تێلیگراف."

- "ئێستا لە کوێن؟"

- "ئەوان لە گۆرەپـانی بـازارەکە بەرێکەوتوون، لە نیوەی رێگـان بگەنە ئێرە."

شـــا فەرمانی پێکرد: "دەی برۆ تۆپەکان ئامادە بکەن. ڕیزێک تۆپ لە گۆرەپانی کۆشـکەکە دابمەزرێنن و لوولەشـی لە خۆپیشـاندەران بکە و دەستبەجێش عەینولدەولە ئاگادار بکەوە."

پاشـا عەینولدەولەی کردبووە ڕاوێژکاری سـەربازی. بە پێدانی پێگەیەکی وەها گرنگ و بەرپرسـیارێتی لە نێو سـوپادا، زاواکەی تۆکمەتر بە خۆی بەسـتبووەوە. عەیندولدەولەش ئازا و متمانەدار بوو. شـا هیواخواز بوو نەوەکەی خاسیەتەکانی ئەویان بەمیرات بۆ بمێنێتەوە. تاج سوڵتان تەواو عەیار بوو. ئەویش هەروەک پاشا بە منداڵەکەی شادمان بوو.

پاشـــا دووبەدوو عەینەولدەولەی بینی و قســـەی لەگەڵ کرد و فەرمانی پێکرد بەهەر هێزێکی لەبەردەست دایە کۆشک بپارێزێ.

تا ئەو کاتەش ئاپۆرای خەڵک گەیشـتبوونە گۆرەپانەکەی کۆشـک، بەڵام پاســـەوانە چەکدارەکان توانییان خەڵکەکە لە مەودایەکی هەندێک دوور ڕابگرن. سـەرۆکی دەسـتەی پاسـەوانەکانیش بە ئۆقرەلێبڕاوی چاوەڕێی هێزی پشـــتیوانیی دەکرد. هۆشـداری دایە خۆپیشـــاندەران لەوەی یەک هەنگاوی دیکە نەیەنە پێشـــەوە، ئەگەرنا پیاوەکانی بە تۆپەکانیان لێیان دەدەن.

کاتێکیش عەینولدەولە بە خۆی و تیپێک لە سـوارە گەیشـتە گۆڕەپانی کۆشـک، سـەرۆکی دەسـتەی پاسـەوانان ئۆخژنێکی بەرهاتەوە. عەینودەولە سـوارەکانی خۆی خسـتە نێوان خەڵک و ڕیزی تۆپە دانراوەکان. بە خۆشی بە سواری ئەسپە ڕەشە زەبەلاحەکەی بۆ ڕێزی هەرە پێشـەوە ملی لێنا. بە شـمشـێری هەڵکێشـراو لە کالان لەبەردەم گوردەمی خەڵکەکە وەستا.

ئاپۆرا خۆپیشـاندەرەکەش پڕ بەدەنگیان هاواریان کرد: "پاشـا! پاشـا! پاشا!"

"توتن! توتن! توتن!"

عەینولدەولە شمشێرەکەی خستەوە کالان. ئینجا دەستی بۆ دەمانچەکەی برد. بەم هەڕەشـەیە هەڵەشـەییەی ئاپۆراکەی زیاتر وروژاند، هەر بۆ پێشەوەش هەنگیاویان دەنا.

عەینولدەولە بانگی کرد: "خەڵکینە، بوەستن! دەنا تەقە دەکەم."

کەس گوێی پێنەدا.

ئاپۆراکە هەر هاواری دەکرد: "تێلێگراف! تێلێگراف! تێلێگراف!"

"پاشا! پاشا! پاشا!"

پاشـا چووبووە سـەر بان و بە دووربینەکەی تەماشـای دەکرد ئاخۆ زاواکەی چۆن کێشە قورسەکە چارەسەر دەکا.

عەینولدەولە جارێکی دیکە هەڕەشەی کردەوە: "بوەستن!"

بەڵام خۆ کەس گوێی پێنەدا.

"بوەسـتن!" جارێکی دیکەش وەها هاواری کرد و سـێ تەقەی بەسـەر سەری حەشاماتەکەدا کرد.

خەڵکەکە سـڵەمینەوە. ئەوان پەرت بوون تا گەمارۆی بدەن. ئەسـپەکەی هەستی بە مەترسی کرد، بە ترسەوە حیلاندی و هەوڵیدا بەنێو ئاپۆرای

خەڵکەکە ڕێگەی خۆی بکاتەوە. کەچی خۆپیشـــاندەران ڕێگەی هەڵاتنیان لێگرت و تا دەهات هەڕەشەکە نزیکتر دەبووەوە.
"تەقە بکەن!" کـاتێ ئەم قســـەیە لە دەم عەینولـدەولە دەرچوو کرداری بەدوادا هات.
ســـوارەکانی پشـــت ئەو، پەنجەیان لەســـەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان گیرسـاند و ئاگر لە لە لوولەی تفەنگیان هەڵسـا، مەیدانەکە بووە مەیدانی شـەڕێکی نابەرابەر. خۆپیشـاندەرە بێ چەکەکان هەوڵیاندا بە لاڕێیەکانی گۆڕەپانەکە ڕابکەن و خۆیان دەرباز بکەن. لەوێش دەسـتەیەک سـواری دیکە بە تێڵاوە چاوەڕوانیان دەکردن. خەڵکەکە بە داماوییەوە خۆیان بەو خانووانەی حکوومەت لە دوروبەری گۆرڕەپانەکەدا کرد و چوونە ناوی، ئینجا چەندین باڵەخانەیان ئاگر تێبەردا. کەسیش دیارنەبوو ڕابەرایەتیان بکا. لەو پاشاگەردانییەدا هەر کەسێک ئەوەی بۆی هات کردی. دووکەڵی ڕەش لەو باڵەخانانە بەرز بووەوە و گۆرەپانی کۆشـــک بە تەمومژێکی چڕ داپۆشـــرا. لە هەموو لایەک تەرمی مردوو کەوتبوون و خەڵکەکەش بریندارەکانی بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشایە خانووە نزیکەکانی ئەوێ.
جەمال خان و کۆمیتەکەی مەزندەی ئەو جۆرە پەرەسندنەیان نەکردبوو. ئەوان دەیـانزانی کوژراو دەکەون، بەڵام چـاوەڕێیـان ئەوەیـان نەدەکرد دۆخەکە وەهای لێبێ. ئەو نامرادییە بەردرێژەی خەڵک بۆ چەندین سەدە هەیبوو، هەمووی لەو ڕۆژدا تەقیەوە.
شـــەڕو پێکدادان تەوای ئێوارەکە درێژەی کێشـــا، کە تاریک داهات و لەسەر منارەی مزگەوتێ دەنگی بانگ هات و خەڵکیان بۆ نوێژی مەغریب بانگ کرد، ئیدی خەلکەکە کشـایەوە. جارێ بۆ ماوەیەکی کاتی شـەڕەکە کرا و وەســـتا، چیدی دەنگی تەقە نەدەبیســـترا و هیچ دروشـــمێکیش نەدەکێشرا.

هەرچەندە بۆ شەوەکەی لە دەرەوەی کۆشک تا ڕاددەیەک کڕ و خامۆش بوو، لێ لەناوەوە هەر جەنجاڵی و دەنگەدەنگ بوو. پاشا لەگەڵ وەزیر و ڕاوێژکارەکانی کۆبووەوە و چەند جارێک تەتەری بۆ لای دایکی دەنارد و دەناردەوە.

لە تاریکیدا تەتەرێک بەرەو باڵوێزخانەی بریتانی نێردرا و گەڕایەوە.

لە پشـــت پەردەی ئەســـتوورەوە کە هیچی پێدا تێنەدەپەڕی، باڵوێز و دەســـتەکەی لە تاوتوێکردنی ڕێگەیەکدا بوون ئاخۆ چۆن چۆنی مۆری خۆیـان لە هەنیەی ڕەوتی ڕووداوەکـان بـدەن. هەموو هەفتەکە لەگەڵ ئایەتوڵلایەک لە تـاران لەپەیوەندیدا بوون، کە وەک نوێنەری ئـایەتوڵلا بەساڵاچووەکەی شیراز دەجووڵایەوە.

لە هەمان کاتیشدا دایکی پاشا دووجاران لە کۆشک پێشوازی لە تەتەری باڵوێزخانەی ڕوسی کرد.

خۆپیشـاندەران تا نیوەی شـەو هەر سـەرقاڵی ئەوە بوون شـەقامەکانی دەوروبەری کۆشک بە کیسەی خۆڵ بگرن و تا هاتن و چوونی کۆشک ئاستەنگ بکەن.

بە هەڵاتنی خۆر سـوارەکانی کۆشـک سـەریان لەوە سـوڕما، پیاوەکانیان لەپشت پاردەیەک لە بارستایی کیسەی خۆڵ وەستاون. خەڵکەکە دلێرانە وەســتاون و چەکداریشــن، ئاخر لەکاتی شــەڕەکەی دوێنێ توانیبوویان ســەربازەکان چەک بکەن و دەسـت بەسـەر چەکەکانیشـیاندا بگرن. ئیدی هەردوولا لەشـــوێنی خۆیان بێ جووڵە بەرامبەر یەک وەســـتاون. مرۆ چاوەڕێی ئەوەبوو ڕۆژ بگاتە تاقی ئاسمان. ئێستا کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، کەچی بانگ نەدرا.

کـاتێکیش جووڵە بە ئـاپۆراکە کەوت، خەڵکەکە ڕێگەیـان بۆ تەبـاتەبـائی، یەکێک لە ئایەتوڵلا بەتەمەنەکانی تاران کردەوە. ئەو ئەوکەســـە بوو بە ناوی شـــیرازییەوە بڕیاری دەردەکرد. دوێنێ شــەو پەیامێکی تایبەتی لە

باڵوێزخانەی بریتانیاییەوە پێگەیشـــتبوو، ڕاســـتەوخۆش جەمال خانی لێ ئاگادار کردەوە. ئینجا ئایەتوڵڵا پیرەکە بە خۆی و کۆچانەکەی دەستی و بە یاوەری حەفت کەس لە بازرگانە ناودارەکانی بازاڕی تاران بەرەو کۆشک ڕۆیشت، لەوێ پاشا چاوەڕێی دەکرد.

سەرۆکی پاسەوانانی کۆشک پێشوازی لە نێردەکە کرد. دانوستانەکان تا درەنگانێکی دوای نیوەڕۆ درێژەیان کێشـــا، تا ئەوکاتیش هەمووان بە ئارامییەوە چاوەڕێی پێشـهاتەکەیان دەکرد. لە کۆتاییدا کاتێک نێردەکە لە کۆشـــک هاتەدەر، ئایەتوڵڵا کۆچانەکەی وەک نیشـانەیەکی ســـەرکەوتن بەرزکردەوە. پاشـــا بڕوانـامەکـانی مۆرکرد، ئەوانەی تێیـانـدا هـاتبوو کۆمپانیای توتنی بریتانی لەبن هەلومەرجێکی دیاریکراودا کاروبارەکانی بازرگانی توتن ڕادەستی حکومەتی ئێرانی دەکا.
هەروەها ڕێککەوتنێکیش لەگەڵ باڵوێزخانەی بریتانی لەبارەی نەخشـــەی ڕایەڵەیەکی نێوخۆی بۆ تێلێگراف کرا. دەبوو ئەندازیاری بریتانی بێن و نەخشـــەکە لەگەڵ شـــادا جێبەجێبکەن. لەوەش زیـاتر ئەوەی کەس نەیدەزانی ئەوەبوو، باڵوێز لەبەردەم پاشـادا پێی لەســـەر ئەوە داگرتبوو شێخ ئاغاسی بگۆڕێ. ئەو خاڵی لاواز بوو.
ئەوەی بەدوایدا هات شـــتێکی گەورە بوو. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا خەڵکەکە بەخۆیان ئاڵاکانەوە ڕژانە ســـەر شـــەقامەکان و لە هەموو لایەکیش موزیک و گۆرانی بوو. دوکاندارەکان کێک و چایان بەســـەر ڕێبواراندا دەبەشـیيەوە. لە گۆڕەپانی بازاڕەکانی ســەرتاپای شـارەکانی وڵات مەنجەڵی گەورژنە گەورژنە لەســـەر ســـێکوچکەی ئاگر دانران. خەڵکەکە بۆ ماوەی یەک هەفتەی ڕەبەق ئاهەنگیان گێڕا.

## ٤٩

## گەشتەکە

شا لەو باوەڕەدا بوو تاج سولتان نەوەیەکی بۆ دێنێ. کەس هەستی نەکرد پاشا بەو شتە سەرقاڵە، کەچی ئەو بە دزییەوە لەسەر گۆری عەبدولداودا نەزری کردبوو وشترێک بکاتە قوربانی.

کەمێک پێش ئەوەی تاج سولتان منداڵەکەی ببێ، پاشا لە خەونیدا پیرەدارێکی بینی، لقێکی تازەی دەرکردبوو. لەپڕێکدا زریان هەڵیکرد، پیرەدارەکە ڕاقەنا، کەچی لقە تازەدەرهاتووەکە مایەوە و گەشەی دەکرد. لقەکە تا دەهات گەورە و گەورەتر دەبوو.

شا لە خەونەکەی حەپەسا، ویستی یەکسەر خەونلێکدەرەوەکە بانگ بکا و بۆی بگێڕێتەوە، لێ زاتی نەکرد وەها بکا. ئەو خەونەکەی هەر لە دڵی خۆیدا هێشتەوە و بە ڕۆژژمێرەکەی خۆی سپارد. ئێستاش لەسەر ئانوساتی بەدیهاتنەکەیەتی.

کاتێ عەینولدەولەی زاوای بە سـوـاری ئەسـپەکەی بۆ ناو کۆشـک دەیهاژۆت، پاشـا لەپشـت پەنجەرەوە هەر خەونی دەبینی. لەوە بترازێ شـتێکی دیکە نییە، کە کیژەکەی کوڕێکی بووە. عەینولدەولە خۆی بە هۆڵی مینابەندەکەدا کرد، دەسـتی ڕاسـتەی پاشـای گرت، ماچیکرد و گوتی: "خوا بە باشترین شێوە خەمی ئێوەی خواردووە."

نەریتەکە وەها بوو، باوک پاش چل ڕۆژ لە منداڵبوونی کچەکەی، ئەوسا دەیتوانی سەردانی کچەکەی بکا، لێ پاشا نەریتەکەی شکاند و داوایکرد ئەسپەکەی بۆ زین بکەن و بەرەو لای تاج سوڵتان تاودا.
بەگوێرەی دابونەریت پێویسـت بوو پیاوێکی هۆشـمەندی بنەماڵە کورتە سـورەتێکی قورئـان بە گوێی زراسـکەسـکە[86] تـازە لەدایکبووەکەدا بخوێندبا، بەڵام پێشـوەخت پاشـا ئەم خووەی قەدەغە کردبوو. ئەو ویسـتی خۆی یەکەمین وشـە بە گوێی نەوەکەیدا بچرپێنێ. لە قەڵا بچووکەکە، دوای ئەوەی تاج سـوڵتان مێردی کرد، پاشـا بە یاوەریی خزمەتکارە پیرەکەی لە شوێنی مێوان پێشوازی لێکرا. کەمێکی پێچوو تا مامانەکە منداڵەکەی لە پەتۆیەکی جوانەوە وەرپێچابوو، لەسـەر دەسـتان بۆیان هێنا.
پاشا دەیەویست باش لە ڕوخساری زراسکەکە ڕابمێنێ، بەڵام ڕووەکەی هێشـتا لەبەر ئەو دەسـتەسـڕە تەنکە ڕازاوە ڕەنگشـیرییەکەی پێداپۆشـرابوو، نەدەبینرا. بەرلەوەی کۆرپەلەکە ببینێ، پێویسـت بوو "ڕونما"[87] مزگێنی و دیاریی بداتە مامانەکە. بە ڕووی گەشـاوەوە یەک دوو دراوی ئاڵتوونی لە دەسـتی ژنەی مامان کردن. ئێسـتا دەیتوانی

---

[86] زراسک: کۆرپەلەی تازە لەدایکبوو.

[87] ڕونما: وشـەیەکی فارسـییە، نووسـەر هەر وشـە فارسـییەکەی بەکارهێناوە، واتای خەڵات دەگەیەنێ.

سەرپۆشەکە لەسەر دەموچاوی کۆرپەلەکە لابدا و بیبینێ. بە ڕوویەکی گەش و بە خەندەوە بە ئەسپایی چەچەکانی[88] ماچکردن، کە بە سەرنجەوە لێیراما.
ئینجا پاشا بە شکۆوە دیوانە شیعرەکەی شاعیری سەدەکانی ناوەڕاست، حافزی شیرازی دەرهێنا، بەرگەکەی ماچ کرد و چاوەکانی نووقاندن، ئینجا هەر لە گۆترە لاپەڕەیەکی کتێبەکەی کردەوە، پاشان سەری لە گوێچکەی ڕاستەی کۆرپەکەی نزیک کردەوە و بە ویردەوە ئەم شیعرەی حافزی لەبارەی خۆشەویستییەوە بۆ چرپاند:
*بولبولێ چڵێ گوڵی لە دەنووک دایە*
*ئەو پەلک و نەوایە چ ناڵەناڵێکی خۆش ئاوایە*
*کاتی پێکەیشتن پێمگوت، ئەم ناڵە و هاوارە چییە؟*
*گوتی جیلوەی مەعشوقەکەی ئێمەی تێدایە*[89]

---

[88] بۆ خۆشەویستی بە زمانی منداڵ بە دەستی منداڵان دەڵێن چەچە. منیش لێرە بەپێویستم زانی ئەو وشەیە لێرە بەکاربێنم . وەرگێڕ
[89] ڕۆماننووس دەقی ئەو دێڕە شیعرەی حافزی هەر بە فارسی و بە ڕێنووسی هۆڵەندی و بێ وەرگێران یاداشت کردووە. من هانام بردە بەر کاک ڕێباز مستەفا (وەرگێڕ لە فارسییەوە) تا ئەم دێڕانە و چەند دێڕی دیکەی فارسی نێو ئەم ڕۆمانەم بۆ بکاتە کوردی. دەقە فارسییەکەش بەم شێوەیە:
بلبلی برگ گلی خوش رنگ در منقار داشت
و اندر آن برگ و نوا خوش نالەهای زار داشت
گفتمش در عین وصل، این نالە و فریاد چیست؟
گفت ما را جلوه معشوق در این کار داشت

دوای خوێندنەوەی ئەو هۆنراوەیە بە ئەسپایی پەنجەی بەسەر کەپووی نەوەکەی داهێنا و گوتی: "ئەو دەقاودەق بە ئێمە دەچێ. ئەو کەپووی وەک هی ئێمەیە." شا بایی پێویست کورپەکەی بینی.
کاتێک ویستی بڕوا، بانگی قەرەواشەکەی کرد و پێیگوت: "سڵاومان بگەیەنە تاج سوڵتان، پێی بڵێ ئەو ئێمەی بەختەوەر کرد."
لە ڕێگا بەرەو کۆشک هێشتا ڕووی جێنشینەکەی هەر لەبەرچاو بوو.

پاشا دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ بازنەی باوەڕپێکراوی خۆی، بە دوای بەربژێرێکی شایستە بۆ پێگەی وەزیردا گەڕا. کەسێک هەم بۆ ئینگلستان و هەم بۆ نەیارەکانیشی مایەی پەسەندی بێ.
لەپاش ڕاوێژی زۆر و بیستنی ڕای زۆر کەس لە ناودارانی بازاڕ و لە کۆتاییدا هاتەسەر ئەوەی مستەوفی ئەلمەمالیک دەستنیشان بکا. دایکی دژی ئەوە بوو شێخ ئاغاسی لە مەیدانەکە ڕابماڵرێ، بەڵام خۆ مستەوفی ئەلمەمالیکیش هەروەک پاشا سەر بە هەمان هۆز بوو. مەهدولیا هیچ بژاردەی بۆ نەمایەوە مەگەر مل بدا و پەسەندی بکا.

سەرەتا پاشا نیازی وەهابوو بانگی شێخ ئاغاسی بکا و بە درێژی قسەی لەگەڵ بکا، بەڵام ئێستا کە ئەو نەوەیەکی بۆ پەیدا بووە، ویستی هەر لەکورتی بیبڕێنێتەوە.
لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا دەرکەوت شێخ ئاغاسی لەباریدا نییە لەو بارە شڵەژاو و تەنگانەیەدا کەڵکی پاشای هەبێ. لەوکاتەی ئاپۆرای خەڵکەکە بەرەو کۆشک هاتن و کوشتار و بریندار لەو گۆڕەی کەوتن، ئەو لەجێی خۆی داماوانە ئەوق مابوو، چاوی لێ زەق بووبوو. کاتی هاتبوو دەبووایە هەنگاوێک بکشێتەوە و ڕێگا چۆڵ کا.

پاشا هەر بۆ ماوەی یەک سەعات قسەی لەگەڵ کرد، پاشان بۆماڵەوەی ناردەوە و دەمودەستیش مستەوفی ئەلمەمالیکی وەک سەروەزیری نوێ دانا.
شێخ ئاغاسی بەبێ ڕەتکردنەوە و منگەمنگ گوێڕایەڵ بوو وەڵامەکەشی وەها بوو: "بڕیار بڕیاری شایە، بڕیاری شاش ڕەوایە."
پاشا ئەوەی بۆ قسەکانی خۆی زیاد کرد تا ئاغاسی هەست بە کەموکورتی خۆی نەکا: "بەڵام پێویستە تۆ بەردەوام بەردەست بیت، ئاخر ڕاوێژەکانی تۆ ئاسوودەمان دەکا."
شێخ ئاغاسییش بەدەم ئەو قسەیەی: "من هەمیشە لە خزمەتی تۆم، مایەی شەرەفمەندیمە هەر خزمەتی تۆ بکەم" و سەری بەردایەوە.
لە کۆتاییدا پاشا بارە قورسەکەی لەسەر شانی ئاغاسی لابرد. ئەو گەڕایەوە خەڵوەتگەکەی تا لەوێ پشوو بدا و خۆی بۆ نوێژ و ویردەکانی تەرخان بکا، کاتی ئەوە هات چێژ لە خوێندنەوەی کتێبە کۆنە پەڕزەردەکان و خواپەرستی لەنێو شاخەکەندا ببینێ.
وەزیرە نوێیەکە سیاسەتوانێکی کارامە بوو. لە کابینەی پێشووی میرزا کەبیری کوژراودا وەک وەزیری پیشەسازی و بازرگانی کاریدەکرد. ئەو لەو گەنجە سەرەتاییانە بوو، باوکی ئەم پاشایە بۆ خوێندن ڕەوانەی ئەورووپای کردبوون. ئەو لە پاریس زانستی ئامێرناسی خوێندبوو و بڕوانامەی ئەندازیاریی لەوێ وەرگرتبوو.
مستەوفی ئەلمەمالیک لەسەر ڕێگەی وەزیرە کوژراوەکە ڕۆیشت و دەستی دایە نەخشە و پلانەکانی ئەو. لەوەش بەئاگا بوو لەگەڵ پاشادا زۆر زەحمەتی دەبینێ، چونکە دەمی لە هەموو شتێکەوە دەژەند و لێنەدەگەڕا وەزیرە نوێیەکە بەبێ پەسەندنامەی ئەو هیچ بڕیارێک بدا.
دایکی پاشا و دەستوپێوەندەکانی هەوڵیاندا وەزیری نوێش بخەنە ژێر باندۆری خۆیان. مستەوفی ئەلمەمالیکیش بە تەواوی لەوەوە بەئاگا بوو

و ئەزمونیشـــی بابی پێویســـت هەبوو تا لە بەرانبەر پاشـــا و دایکی بوەستێتەوە. هەروەها ئەو پەیوەندییەکی تۆکمەی بنەماڵەیی لەگەڵ پاشا هەبوو، ئەوەش مایەی پاراستنی بوو.
پاشا پێزانینی ئەوەی بۆ مستەوفی هەبوو بەوەی سیاسەتوانێکی کردەییە و هیچ ئەجێندایەکی شاراوەشی نییە. بە ئاسوودەییەوە گوێی لێدەگرت و وردە وردە تا دەهات جڵەوی دەســـەڵاتی بۆ شـــل دەکرد و مەودای دەرفەتی بۆ بەرینتر دەکرد.
پاشـا لە ناخی دڵییەوە کەیفی بە چارەی وەزیرە نوێیەکە دەهات، چونکە لە میرزا کەبیر دەچوو. لەبەر ئەوەی مستەوفی زۆر لەگەڵ سەروەزیری پێشـوو کاری کردبوو، هەندێ خەسـڵەتی ئەویشـی هەڵگرتبوو، ئاماژە و شێوازی قسەکردنیشی لەو دەچوو. هەر هەمان پێکەنینەکەیشی هەبوو، هەمـان درێژی ڕدێن، لێ هەرچی لەبـارەی کڵاوەوە بێ، ئەو هەروەک دیپلۆماتە ئەوروپییەکان شەپقەی لەسەر دەنا.
لەکاتی گفتوگۆی لەگەڵ پاشـادا، وەزیر بە پێشـنیازەکەی بەرانبەرەکەی سەرسام کرد: "لەبەر بەرژەوەندیی وڵات و مایەی لێ تێگەیشتنە جەنابی خاوەنشـــکۆ ســـەردانێکی ئەوروپا بکا، تا لە نزیکەوە گۆڕانکارییەکانی ئەوێ ببینێ و لێیان ڕابمێنێ."
پاشا نەیدەزانی چۆن وەڵامی بداتەوە، زەنگوڵی سەر مێزەکەی هەژاند و داوای لە پەردەدار کرد چادانێک و دوو پیاڵەی بۆ بێنێ.

چەند ســاڵێک پێشـتر، وەزیری پێشـوو لە میانەی وتووێژیدا پێشـنیازی گەشتێکی وەهای بۆ ئەوروپا بۆ کردبوو. ئەوکات پاشا هێشتا شازادەی جێنشـــین بوو، وەزیر ویســـتی لەگەڵ خۆی بباتە ڕوســـیا، بەڵام لەبەر زستانە قورسەکە ڕێگاوبان گیرابوون، گەشتەکە بۆ مۆسکۆ بۆ مەیسەر نەبوو. وێڕای ئەمەش ئەو گۆڕانکاری و پێشـــهاتە نوێیانە، ئەوکات وەک

هی ئێستا سەرنجڕاکێش نەبوون. ئەو ڕووداوانەی ئەم دواییە وایکرد ئەم پێشنیازە بەلاوە بنرێ، بەلام ئێستا ئارامی بۆ ولات گەڕاوەتەوە، پرسی گەشتەکە بووە ئەگەرێکی ڕاستی.
پرسی گەشتەکە چیدی وەک پرسێکی نێوخۆیی و بیرۆکەیەکی وەزیر و پاشا نامێنێتەوە، ئاخر ئەورووپا خۆی لە دەرکەی مالی پاشای دابوو.
پێشتر پاشا هەر تەنیا چاوی بە نوێنەرانی سیاسیی ولاتە ڕۆژئاواییەکان دەکەوت، کەچی بەردەوام بیانییە جۆراوجۆرەکان دەهاتنە نێو ولات. ئەو بیانیانە ئەو کەسانە بوون بە دوای مافوورە کالبووەکاندا دەگەڕان. ئەوان لە گوندێکەوە بۆ ئەویدیکە دەڕۆیشتن. ئەوان زۆر هەلوەدای گۆزە و دەفری شکاو بوون، ئەو شتانەیان دەکڕی و لە هەگبەکانیان دەنان و دەڕۆیشتن. هەرچۆنێک بێ مرۆ لە چیاکانیش تووشی هەندێ لەو کەسانە دەهات. دیاربوو ئەوان بە وردبین لە دیمەنی هەلکۆلراوی سەر تاشەبەردەکانیان دەڕوانی.
ڕۆژێکیان پاشا لە زاواکەی پرسی: "ئەرێ ئەوانە لە چی دەگەڕێن؟"
"پایەبەرز ئەوانە ڕۆژئاوایین، ئەوانە لە فەرەنگستانێ (لە ئەورووپاوە) هاتوون و دەیانەوێ مێژووی مرۆڤایەتی بسەلمێنن."
"مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر ئەو گۆزە و دەفرە شکاوانە دەخوێننەوە؟"
"من لەگەل ئەوان دواوم، ئەوان لەو بڕوایەدان، مێژووی مەزن لەو پارچە دەرە شکاوانە خۆیان شاردبێتەوە."

ئێستاش وەزیرە نوێیەکە پێشنیازی ئەوی کردەوە، گەشتێک بۆ ئەورووپا شتێکی پێویستە و گرنگییەکی زۆریشی هەیە، ئیجا پاشا باشتر لە جاران لە بابەتەکە گەیشت. کەچی هێشتاش هەر دوودل بوو.

پاشا وەها وەڵامی وەزیری دایەوە: "ئێمە لەو بارەیەوە بیرمان کردۆتەوە، بەڵام خۆ ناکرێ وڵات بە بێ حوکمڕان بەجێبێڵین. ئەو هەرا و پشێویەی ساڵانی دوایی ڕاستیی قسەکانمی سەلماندووە."
"بەڵام خۆ ئێستا دۆخەکە ئارامە."
"ئێمە گومانمان لە سوود و کەڵکی گەشتەکە نییە، بەڵام وڵات وا خەریکە ئاراســـتەیەکی نوێ وەردەگرێ. ناکرێ ئێمە لێرە نەبین. ســـەرباری ئەوەش، خودا جێنشینێکی بەدیاری پێبەخشیوین، دەمانەوێ گەورەبوونی منداڵەکە ببینین ببێتە پیاو."
"بەدڵنیاییەوە ئامادەکردنی ئەم گەشتە ساڵێک دەخایەنێ. تا ئەو ماوەیەش دەکرێ پاشـــا چێژ لە نەوەکەی ببینێ. گەشـــتەکەش ئەوپەڕی هەر چەند مانگێکی پێدەچێ. خۆی گەشـــتەکە قورســـە، وزەی زۆری جەســـتەی گەرەکە. بۆ خۆشبەختییش پاشا لە تەندروستییەکی باش دایە. پێویست ناکا پاشا ئەو جۆرە گەشتە لەوە زیاتر دوا بخا، بەناوی نیشتمانەوە داوا لە پاشا دەکەم جارێکی دیکە ئەم بابەتە هەڵبسەنگێنێتەوە."
وەزیر بەم داواکارییە ســـەنگینە ئاماژەیەکی وەهای بە پاشـــا دا، کاتی گەشتەکەی هاتووە.
پاشاش وەڵامی دایەوە: "باشە، بیری لێدەکەینەوە."
پاشـــــان، لە گفتوگۆیەکدا دایکی پێیگوت: "من متمـانە بە مســـــتەوفی ئەلمەمالیک دەکەم، ئەو ڕاســـت دەکا، بەڵام نازانم ئاخۆ گەشـــتێکی وەها لەو ڕۆژانەدا کارێکی هۆشمەندانەیە یان نا. باشە پاشا چی دەڵێ؟"
"ئێمە دژی ئەوە نین گەشـــت بۆ ئەورووپا بکەین و پاشـــاکانیان ببینین. پاشـــا ئێرانییەکان هەمیشـــە لە پێشـــدا بەرلەوەی لەو وڵاتانە بکۆڵنەوە، پەلاماریان داون و داگیریان کردووە. ئێمە دەبینە یەکەمین پاشای ئێرانی ئەم دۆخە تێدەپەڕێنێ. بۆیە ئێمە دەترسێین، هەرکاتێ لە سنوور ئاودیو بووین، ئینگلســـــتان تاجەکەمان بخاتە ســـــەری یەکێک لە یاخیبووەکان.



هەینێ هەرگیز نـاتوانین بگەڕێینەوە و ئەوسـا بەمەرەدی جوویەکی ئاوارەی ولاتان و دوور لە ماڵ و حاڵی خۆی دەچین."
"تۆ ئێستا جێنشینێکت هەیە. من نازانم ئاخۆ دەبێ بۆ ئەم گەشتە جۆش و خرۆشـت پێبدەم یان ڕێک بەپێچەوانەوە ڕێگریت لێبکەم. ئێمە دەبێ ئەو بابەتە لەگەڵ هۆشمەند و ڕیشسـپییانی هۆزەکە تاوتوێ بکەین. لێ یەک شـت هەقە ڕوون بێ؛ ئەگەر تۆ گەشـتەکە بکەی ئەوا من وەک شێرێک تەخت و تاجەکەت دەپارێزم."

مستەوفی ئەلمەمالیکی بۆ ئەوەی گەشتەکە لەبەرچاوی پاشا شیرین بکا و دنەی بدا، داوای لە باڵوێزی ڕوسـی و فرەنسـی و بریتانی کرد بەڵکو کتێبێکی وێنەدار بە کارخانە و شـێوەی ژیانی ئێسـتای ولاتەکانیان بخەنەڕوو تا نیشانی پاشای بدا.
زۆری پێنەچوو تـا ئەو جۆرە کتێبە وێنەدارانەی لە بـاڵوێزخـانەکـانەوە پێگەیشـت. ئەوانە لە شـێوەی ئەلبومدا چاپ کرابوون، بە ڕەنگی ئاڵا و پۆرتریتی سـەرۆکەکـانیـان ڕازابوونەوە. ئەلبوومەکە پڕبوو لە وێنەی قیتار، ڕۆژنامە، چلچرا، دارتێلی کارەبا، قاوەخانە، هێڵی ئاسـنین، بەندەر، گۆڕەپان، نافوورە، پرد، شـانۆ، تیاترۆخانەکان و وێنەی نووسـەر و شاعیر و ژن و خواردنەوە و خواردنەکان.

لە کۆتاییدا پاشا ملی دا بە دەستی خۆی کاغەزێکی هێنا و ئەم وشانەی لەسەر نووسی و مۆری کرد:
"بیسمیللاهـ
ئەم گەشتە بۆ من شتێکی حەتمی هات و نەهاتە. پێویستە ئەو ئەزمونەش بکەین، هەر بۆیە دانی پێدادەنێین. دەکرێ وەزیرەکەمـان ئامادەکارییە پێویستەکان بکا."

کاتێکیش نامەکە گەیشتە دەستی وەزیر، پاشا مەرجێکی دانابوو: "ئەمە هەر لەنێوان خۆماندا بێ، نابێ کەس بەوە بزانێ ئێمە گەشت دەکەین."
وەزیریش لە پاشای پرسی: "ئەمە ئامادەکارییەکان زەحمەت دەکا، وێڕای ئەمەش، چۆن دەتوانین ئەو دیارنەمانە ماوەدرێژەی پاشا روون بکەینەوە؟"
"کاتێک ئێمە بەرێکەوتین، وای بڵاوبکەنەوە ئێمە بەرەو کەربەلا رۆیشتووین تا لەوێ سەردانی گۆڕی مەزارە پیرۆزەکان بکەین. دواتر ئەگەر پێویست بوو دەکرێ ڕاستییەکە بدرکێنن. خۆت دەزانی، ئێمە ئەوە لەبەر خاتری نیشتمان، لەبەر خاتری ئارامی و ئاسایش دەکەین، وانییە؟"
مستەوفی ئەلمەمالیکیش گوتی: "زۆر باشە، ڕێککەوتین!" پاشا ئەو سروکە دوودڵییەی وەزیری هەست پێنەکرد.

# ٥٠

# ڕوناکی

بەدرێژایی ئەو ماوەیەی ئایەتوڵلا شـــیرازی توتنکێشـــانی حەرام کرد، ژنانی حەرەمســـەرا پاشـــایان پشـــتگوێخســـت، ئاخر ئەو ویڕای فتواکە، هێشتا هەر قلیانی دەکێشا. پاشاش لای خۆی بڕیاری تۆڵەکردنەوەی دا، نەچووە حەرەمســـەرا و ســـەرجێی نەکردن. لای خۆی بڕیاریدا ڕێگەی سەبوحی (صبوحی)[٩٠] بگرێتەبەر.

ســـەبوحی تەگبیرێکی زیرەکانەی بوو، ئاهەنگێکی پاشـــایانی ئێرانی بوو، بۆ ئەوانە بوو خواردنەوەی مەییـان لێ حەرامکرابوو، ئەوەش هەر لەو کاتەی ئیســلام بە فەرمی بووبووە ئاینی وڵات. شـتێکی ئەسـتەمیش بوو پاشـــاکان واز لە خواردنەوەی مەی بهێنن، ئیدی شـــتێکی دیکەیان

[٩٠] صـبوحی وشـەیەکی فارسـییە، نووسـەر وشـەکەی وەک خۆی و بە ڕێنوسـی هۆڵەندی بەکارهێناوە، بە گوێرەی فەرهەنگی دهـخدا واتای خواردنەوەی مەی لە بەیانیان دەگەیەنێ. وەرگێڕ

نەدەخواردەوە لەوە زیاتر کە شـەراب (شـەربەتی) ترێی شـاری شـیراز بخۆنەوە.

شـەرابی شیراز شـەرابی بەهەشت بوو، تۆ هەر دەبێ شـیعری شـاعیرە ئوستادەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بخوێنیتەوە، تا لەوە تێبگەی ئاخۆ چ جۆرە شـەرابێکە.

شیعرێکی حافز:

*ساقیا زووکە، پەیمانەکەم پڕ لە مەی کە*
*هۆ خۆشخوان مەستم کە، دڵ کامیاب کە*
*ڕووی یارم لە پێکمدا دەبینم*
*کە تۆ جارێک ڕێی مەیخانەت گرتەبەر*
*لێی دامەبڕێ و سەر بەڕێی دیدا مەگرە*

بە ئاشـکرا خواردنەوەی مەی لە لایەن پاشـایەک کە بە سـێبەری خودا لەسـەر زەوی دادەنرا، شـتێکی نەخوازراو بوو. بەڵام خۆ ئەگەر ئوسـتادێکی وەها گەورە بەم جۆرە لەگەڵ مەی جووڵابێتەوە، ئەدی بۆچی پاشـا لەمە بەختەوەر نەبێ؟ ژیان کورتە و هەروەک حافزی شـاعیریش لێی تێگەیشـتوە، ئەوەی دەمێنێتەوە هەر شـەراب و یادکردنەوەی خۆشەویستانە. هەر بۆیە ئەوان دەرچەیەکی ڕیزپەڕانەیان دۆزیەوە تا بۆ ماوەیەکی کاتی خۆیان لە جەنجاڵیی ژیان بکێشنەوە و بە تەواوی خۆیان بدەنە دەست شەراب و یادەوەریی خۆشەویستان.

ئیدی دوای ئەو بۆنەیە، ئاوێکیان بەخۆدا دەکرد، داوای لێبوردنیان لە خودا دەکرد و دەگەڕانەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیان، ژیانێک جەنگ و ناپاکی فەرمانڕەوابوو.

پاشا بۆ بەزمی سەبوحی ژنێکی بەئەزموونی لە خزمەتدا بوو، مشووری تەواوی بۆنەکە و ژنانی بۆ خوارد. ئەم جارەیان حەوت ژنی بۆ هێنانە جێهەوارەکەی خۆی.
کاتێکیش پاشـــا گەیشـــتە ئەوێ، لەســـەر مافوورێک لەنێو ســـەرینەکان دانیشت، کە بەتەواوی بۆ ئەو مەبەستە ڕازابوونەوە. ژنە موزیکژەنەکان موزیکیان لێدا، کچە گۆرانیبێژێکی لاو گۆرانییەکی خەمگینانەی لەپشـــت پەردەیەکی کەسکی تەنکەوە دەچریکاند، سەماکەرانیش بایان دەدا:
*ئاخ ئەحمەدی ئەزیزەم، ئەزیزەم، ئەزیزەم*
*وا من ئینجا مونتەزەر ئەزیزەم ئەزیزەم ئەزیزەم*
لە کۆتاییدا تۆ هاتی، ئای ئازیزم، ئازیزم، ئازیزم
من لەمێژە چاوەڕێم کردی، هۆ ئازیزم، ئازیزم، ئازیزم
لەنێوانماندا شێری دڕ هەبوون، ئازیزم، ئازیزم، ئازیزم
کێوی بەرز بەرز هەبوون، ئازیزم ئازیزم ئازیزم

ئینجا حەفت ژنی نیمچە ڕووت بە شـــەرمنییەوە بە خۆیان و شـــەراب و پێک و پیاڵەوە هـاتنەژوور. بەم جۆرە پـاشـــــا هەفتەیەک بەشـــێوە تایبەتییەکەی خۆی بەخۆشـــــی ڕایبوارد. ماوەیەکی درێژیش بوو لەگەڵ ژنەکانی نەنوســـــتبوو، هەر بۆیە ســـــەبوحەکەی زۆر خۆش و ناوازە گوزەراند.

کاتێکیش پاشـــا گەڕایەوە کۆشـــک، پەیامێکی لە خانمەکە، ئەو ژنەی بەزموڕەزمی ســـەبوحەکەی بۆ ڕێکخســـتبوو پێگەیشـــت. پەیامەکەش ژنە گەنجێکی شـــۆخ بوو، جوانییەکی بێوێنەی هەبوو، پاشـــاش بەوە دڵەند نەبوو جارێکی دیکە لە کۆشـــک دەرچێ و بگەڕێتەوە هەمان هەوارەکەی

سەبوح، بۆیە لە ژنەکەی پرسی ئاخۆ چی تایبەت لەو ژنەدا هەیە، کە بەم جۆرە پێداگرە لەسەری.

"ئەم کچەیان خەڵکی ئازربایجانی بندەستی ڕوسیایە. دایکێکی ڕوسی و باوکیکی ئازەری هەیە. پاشا دەتوانێ هەم بە ڕوسی و هەم بە ئازەریش بیدوێنێ. من زۆر ژنی گەنجم بینیون، بەڵام ئەم کچەیان دانسقە و تاکە. دەکرێ بینێرمە کۆشک."

پاشا مەراق بوو، لێ نەیدەویست ئەم ژنە بهێننە کۆشک. کاتێکیش پەردەدار دڵنیای کردەوە کەس پێی نازانێ، پاشا بێدەنگ بوو.

پەردەدار لە ژنەکەی پرسی: "ئایا کچەکە دەزانێ بە پاشا دەناسێنرێ؟"

"بەڵێ، بە خاترجەمییەوە، دەنا لەگەڵم نەدەهات. ئەمە لە جۆرێکی دەگمەنە، گەوهەرە. لەوانەیە شەرمن دیاربێ، لێ بە دڵنیاییەوە وەها نییە."

بۆ شەوەکەی سەرۆکی نۆکەران کچەکەی لە بەرگی پیاوێکی گەنج بەخۆی و کڵاوێکەوە تا دەرگەی هۆڵی مینابەندەکەی برد و هانیدا لەوێوە بەتەنیا بچێتەژوور. ئەویش بە پێدزیلکە و بەسەری پەنجە لە هۆڵەکە چووە ژوور. لەوێ کاتێ پاشای بە کەوای پاشایەتییەوە لە نێوەڕاستی هۆڵەکە بینی سڵەمیەوە. بە نەرمییەوە بە فارسی سڵاوێکی لێکرد: "سەلام".

شا لە ڕوخساری ژنە ڕاما، ئەوەش لە دەموچاوی خۆی دەخوێنرایەوە، کەوا ئەو چاوەڕێی شتێکی دیکەی دەکرد.

پاشا بە خوێنساردی و بە ڕوسی پێیگوت: "دەی کڵاوەکەت داکەنە."

کچەش بە شەرمنییەوە کڵاوەکەی داکەند، بە هۆیەی پرچە کەژەکەی بەسەر دەفەی شانەکاندا دەرکەوت.

پاشا مسکە بووەوە.[٩١]

---

[٩١] مسکەبوونەوە: خەندەگرتن.

به تاســـەوە پێیگوت: "ئای چەند جوانی، ئەو پرچە ئاڵتوونیەت لەکوێ هێناوە".

"لە دایکمەوە."

کچە لەوە گەنجتر بوو کە پاشا ڕەچاوی دەکرد، هەر لەبەر گەنجیی کچە نازەنینەکە، هەستی بە پیریی خۆی کرد. ئینجا پشتی تێکرد پێیگوت: "تۆ لێرە لای ئێمە هەروا بزانە لە ماڵی خۆتی."

کچەکە بە هێواشی پێڵاوەکانی داکەند و بەرەو بەردەم ئاوێنەکە ڕۆیشت، جانتا چەرمینەکەی لەسەر کورسییەکی شاهانە دانا، جلە کوڕانەییەکانی داکەند، فیستانێکی لەبەر کرد و لەبەر ئاوێنەشدا قژی داهێنا، لە بوتڵێکی بچکۆلەشدا هەندێ بۆنی لەخۆی دا و ئینجا بە نەرمی گوتی:

"ئێستا من خۆمم."

پاشا ئاوڕی لێدایەوە. بە چاوی مۆلەق و زاری بەشەوە لێیەوە ڕاما. ئەو گەشـــاوەیەی کچە شـــتێکی نەبینراو، پەرییەک بوو بۆ خۆی، هەر بۆیە هەســـتی کرد ئاســـوودە نییە. ئاخر ئەو هیچی لەو ژنانە نەدەچوو کە لە جێهەواری ژنەکە بەســـەری بردبوو. ئەو زۆر ناســـک و نازدار بوو. لەوانەی ناو حەکایەتی پەرییان دەچوو. تەنانەت نەیدەزانی چۆن لەگەڵیدا بجووڵێتەوە.

شـــا لە شـــوێنی خۆی بە شـــێوەیەکی نەفامانە گوتی: "بەڵکو شـــتێک بخۆینەوە؟" بە دەم ئەم قســـەی، ئاماژەی بەو ســـوراحییەکی پڕ لە شەربەت لەسەر مێزەکە کرد.

کچەش بەرەو لای مێزەکە ڕۆیشـــت، لە بوتڵەکە ڕاما، بۆنیکرد و گوتی:

"شەربەتی ترێی سپیم پێخۆشە. پەرداخێکت بۆ تێبکەم."

پاشا بەو پرسیارە چاوەڕواننەکراوە غافڵگیر بوو، ئاخر تا ئێستا ژنێک بە عیشوە و نازەوە لێی نەپرسیوە ئاخۆ دەیەوێ بخواتەوە.

پاشا وەڵامی دایەوە: "نا، نەخێر، هەنووکە، ئەوەی ڕاستی بێ بەڵێ، بۆچی نا."
کچە بە نازەوە کەمێک شەربەتی ترێی سپی بۆ شا لە پەرداخێک کرد و دایەدەستی.
دوای ئەوەی بۆ خۆیشـــی نیوەی پەرداخەکەی تێکرد تا بەیەک هەڵدان بیخواتەوە.
"ببورە، من تینوومە."
پاشاش گوتی: "نا ، نەخێر، کێشە نییە."
کچە هاتە وەلام: "دیدارەکەی ئێوە بۆ من ئەوەندە وروژێنەر بوو، هەر بۆیە گەرووم وشک بوو."
پاشـا ڕوونکردنەوەی کچەی پێ پێکەنیناوی بوو، بەلام خۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ کچێکی وەها ئاسان نەبوو. پێیگوت: "ئەگەر برسی بێت خواردنیش ئامادەیە."
"نەخێر خواردن نا، جارێ نا، بەڵکو دواتر، من دەبێ جارێ هەناســەم بێتەوە بەر."
باشـە تۆ بڵێی ئێستا چی دی بڵێ؟ خۆ ناکرێ هەر یەکسـەر لەگەڵ خۆی بیباتە ژووری نوســتن. ئەم بیرۆکەیەی یەکســـەر بۆ نەهات. ئەو بە هاتنەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو، هەربۆیە دەیەویست چێژی لێوەرگرێ.
یەکســەر شــا شــتێکی بۆ هات: "ئێمە لەو دواییانەدا بە دیاری ئەلبومێکی وێنەمان بۆ هاتووە، تا ئێستاش سـەیرم نەکردووە. ئەگەر بتەوێ پێکەوە سەیری دەکەین."
"چ جۆرە وێنەیەکی تێدایە؟"
"ئەوانە نیگار نین، بەڵکو وێنەی ڕوناکی و شــتی دیکەن. ئێمە خۆشـــمان بۆی تاسەمەندین."

ئەو هەستی کرد بە کەیفە و بۆ کچەکەش دەرفەتێکە تا باشتر لێی نزیک بێتەوە. لێ هێشتا دوودڵ بوو ئاخۆ لەسەر تەختەبەندەکە دابنیشێ یان بچێتە سەر سەر ناوکەوەکە، ئەو شوێنەی قلیانەکەی لێدەکێشا. کچەش بە ئەسپایی لەسەر سەرینە ئاوریشمییەکەدا نەوی بووەوە، هەروەک پشیلەیەک لەپاڵ پاشا دانیشت، بەجۆرێک ئەو هەستی بە جەستە نەرم و گەرمی کچە نازەنینەکە کرد.

پاشا دەستی دایە ئەلبوومە ڕوسییەکە و لاپەڕەی یەکەمی هەڵدایەوە. کچەش سەری هێنا پێشەوە تا تەماشای وێنەکان بکا.

پاشا وەک شێرێکی برسی هەڵوەدای ڕاوکردنی ئاسکێک بێ، لێی پرسی: "ئەرێ ناوت چییە؟"

کچە وەلامی دایەوە: "ئانجان ئاناستازیا، ئانیتا، ئانی، ئانتۆنیا، ئانیسیا."

شا بە شۆخییەوە پێیگوتەوە: "ئەو هەموو ناوانە؟"

"لەوەتەی بوومەتە پانزەساڵ چیدی ناوی خۆم نازانم. پیاوان هەر خۆیان ناوم بۆ دەبیننەوە، منیش هیچ گرفتێکم لەگەڵ ئەو ناوانەدا نییە." کچە وەها وەلامی دایەوە، ئینجا ئەویش بە دەوری خۆی پرسی: "ئەدی ناوی تۆ چییە؟".

پاشا واقی وڕما، هەر بەڕاستی بەو پرسیارە لەناکاوە غافڵگیر بوو، ئاخر هەرگیز کەس ئەو پرسیارەی لێنەکردبوو، لە قاقای پێکەنینی دا، ئەوەندە پێکەنی ئاوی لە چاوان هات، ئینجا بە چاوی تەڕەوە گوتی: "ئێمەش چیدی نازانین ئاخۆ ناومان چییە."

کچە هاتەوە قسە: "هەر بەڕاستی نازانی؟ قەیناکا، تۆ پیاوێکی دلۆڤانی."

بەم وشە بێوەییانە کاری لە دڵی پاشا کرد. ئاخر پێشتر کەس پێی نەگوتبوو، کەسێکی دلۆڤانە. ئیدی بە هەردوو دەست کچەی توند گرت و شلپەی ماچێکی لە گۆنای لای چەپییەوە هێنا.

کچە بێ پەردە گوتی: "سمێڵەکەت قدیلەم دەکاتەوە."

شـــا دەبووایە جارێکی دیکە پێبکەنێتەوە: "ئەرێ بەڕاســـت تۆ کێی، تۆ ئەوەندە ... ئەوەندە.. نازانم چۆن بیڵێم، تۆ بۆ ئێمە ئاشـــنای، هەر بۆیە هەست دەکەم تۆ هی ئێمە بیت."

کچە بە دەستەکەی خۆی فرمێسکەکانی پاشای سڕین.

ئینجا شـــا هاتە قســـە و پێیگوت: "بەبیرمان هاتەوە. ناوی ئێمە ناســـر محەمەد فەتعەلی موزەفەرە."

کچەش پرسی: "ئەوانە هەموو نازناون؟"

"ئەوانە هیچیان نازناوم نین، ئەمانە ناوی خۆم و باوک و باپیرەم و باپیرە هەرە گەورەکەمە."

"ئەوانیش هەروەک خۆت پاشا بوون؟"

"بەڵێ، بێگومان، با پیشـــانت بدەین. دەی لەگەڵم دێی؟ دەکرێ دواتر تەماشای ئەلبومەکە بکەین."

پاشـــا ئەلبومەکەی لەلایەک دانا، هەڵســـتا، دەســـتی کچەی گرت بردییە نهۆمی ســـەرەوەی کۆشـــک، بردییە هۆدەیەکی گەورە، لای کتێبخانەیەک، تێیدا کەلوپەلە هەڵگیراوەکانی پاشاکانی لێ پارێزرابوو.

بێجگە لە کەســـوکارە نزیکەکانی پاشـــا بۆ کەس نەبوو پێ بنێتە ئەو هۆدە ئەفســـووناوییە. لەوێدا مافووری ناوازە ڕاخرابوون، نەخش و نیگار بە دیوارەکان هەڵواســـرابوون، پارچە جلوبەرگ لە دۆڵابەکان دانرابوون، هەروەها شمشێر و خەنجەریش بە دیوارەوە بوون.

پاشـــا لە یەکێک لە جۆرکەکان[٩٢]خۆڵی هەراتی هەڵگرتبوو. لە یەکێ لە باولە کۆنەکاندا چەکمە و قاپقاپەی چەرمینی پاشاکانی بەرێ داندرابوون. تریانێک، کە لە شـــوارکەبی دروســـتکرابوو، گۆرەوی و دەســـتەســـڕ و پەرداخی ئاودامانزێڕ و ئەڵقە و ئەنگوستیلە و خەناوکەی تێدا هەڵگیرابوو. باولێکی دیکەش پڕ لە دەفتەر و پەڕی مراوی و مقەس و شـــانە بوون.

---

[٩٢] جۆرک: کیسە کە لە قوماش دروستکرابێ.

کچە بە چاوی زەق و گەورەوە سـەیری ئەو ڕیزە شـوشـانەی کرد کە کەللەسەر و ڕیشی پاشاکانی تێدا هەڵگیرابوو.
ئینجا ئاماژەی بە پۆرترێتێکی سـەر دیوار کرد و گوتی: "ئەمە باوکمانە، ئەو لە خەفەتان مرد."
"لە خەفەتان؟"
پاشـا بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە گوتی: "ئەو بەشـە ئازربایجانەی تۆی لێوە هاتووی، پێشـتر هی ئێمە بووە. ڕوسـەکان لەکاتی جەنگ لەگەڵ باوکمدا دەسـتیان بەسـەردا گرت و بۆ خۆیان برد. خەمی لەدەسـتدانی ئەوێ کوشتی."
کچە بۆ دڵدانەوە دەستێکی بەسەر پیلی پاشادا هێنا.
"ئەمەش باپیرەمانە، ئەو پیاوێکی ناوازە بوو، ئەو ئەو وڵاتەی بەیەکەوە نا، ئەو جارێکی دیکە ئەفغانسـتانە خۆشـەویسـتەکەمانی خسـتەوە سـەر نیشتمان و لە نەخشەشیدا بوو هیندستانیش لەگەڵ ئێران یەک بخا، بەڵام سەری لەسەر دانا."
کچە پرسی: "سەری لەسەر دانا؟"
"پاسەوانێکی ئەفغانی بە خەنجەرەکەی لە خەوێدا پەلاماری دا و کوشتی. سەیرکە هێشتا کەوا بە خوێنەکەی هەر بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە."

پاشـان، چوونە سـەر پێخەف و لەوێ تەماشـای ئەلبومەکەیان کرد. لەو ئەلبومە ڕوسـیيەدا وێنەی نایابی کارخانە ڕوسـیيەکان، ئامێرەکانی هـاتوچۆی بێوێنە و دەزگـا و مـاکینە بزوێنەرە زەبەلاحەکانی تێدا بوو. باشە تۆ بڵێی مرۆڤ چۆن توانیویەتی ئەو ئامێرە زۆر سەیرانە دروست بکا؟

شــــا زۆر بە وێنەی قیتـارەکە مـاهی مـابوو،[٩٣] وێنەکە وێنەی یەکەمین شـەمەندەفەر بوو لە مۆسـکۆوە بەرەو سـەنت پیترۆسـبورگ دەڕۆیشـت. هەر کەمێک پێش ڕاپەڕینەکە لەگەڵ ڕوســەکان گەیشـتبووە ڕێککەوتنێک بۆ ئەوەی هێڵی ئاسنینی تەوریز بۆ تاران لێبدەن. دوای ئەوەی لە وێنەکە ڕاما، ئینجا لەوە تێگەیشـت چۆن فارگۆن و هێڵە ئاسـنینەکەی ژێرەوە بە یەکەوە دەگونجێن و کـاردەکەن. کـاتێکیش وێنەی ســــەرنشــینـانی شەمەندەفەرەکەی بینی چۆن لە فارگۆنەکە دادەبەزین، ئەوسا بە تەواوی شەمەندەفەری کەوتەبەر دڵ.

ڕووی لە کچە کرد و پرسی: "نایابن، وا نییە؟ سەیرە مرۆ لەنێو ئەو شتە زەبەلاحە دابنیشێ و لەسەر دوو ئاسندا بڕوا."

لەپڕێکەوە کچە گوتی: "من سواری ئەو قیتارە بوومە!"

"چی؟ تۆ؟ ئەم قیتارە؟"

"بەڵێ!"

"چۆن، مەبەستمە بڵێم کەی؟"

ئەویش وەڵامی دایەوە: "لە سەنت پیترۆسبورگەوە بۆ مۆسکۆ."

"تۆ؟ بۆ مۆسکۆ؟ چیت دەکرد لەوێ؟"

کچەش گوتی: "من لەگەڵ ئەو پیاوانەدا بووم، من لەگەڵ ئەوان چووم."

"پیاوان؟ کامە پیاوگەل؟" پاشا ویستی زیاتر بپرسێ، بەڵام وەهای نەکرد. پێیوابوو کچە درۆ دەکا، خەیاڵپڵاوە، بەڵام خۆ کچە بە خۆی چیرۆکەکەی سـەری لە پاشــا شـێواندبوو. تۆ بڵێی سـیخوڕێکی ڕوسـی بێ، تا بەو ڕەفتارە بێوەییانەی خۆی دڵی داگیربکا پاشـان هێزە پاشـایەتییەکەی لێ بستێنێ؟

کچە ئەلبوومە ڕووسـیەکەی لە لایەک دانا و دەسـتی بۆ ئەلبوومە فرەنسـییەکە برد، پەڕەکانی هەڵدانەوە و تەماشـای باڵەخانەی مۆزەی

---

[٩٣] ماهیمان: سەرسامبوون.

پاریس و ئەنجوومەنی نیشتمانی و کڵێسای نۆتەردام و پردە ڕازاوەکەی سەر ڕووباری سێنی کرد.
کچە پاشـای بۆ خۆی ڕاکێشـا و گوتی: "گوناحە سـەیری ئەمە نەکەی." لەگەڵ ئەم جووڵەیەی مۆمی مۆمـدانەکە کەوت و دڵۆپەکـانی مۆمە تواوەکە کەوتە سەر قاچی کچە.
"ئای چەند گەرمە!" وەها دەنگی لێوەهات و قاچەکانی کشـاندەوە. پاشـا مۆمەکەی هەڵگرتەوە خسـتییەوە سـەر مۆمدانەکە و لە شـوێنی خۆی دانایەوە. کچە هەندێ نـامراد بوو بەوەی پاشـــا هیچ مەیلی بە لای قاچەکانی ئەو نەدا، کە سوور هەڵگەڕان.
کچە بە گلەییەکەوە گوتی: "تۆ لای خۆتەوە پاشـای و کەچی هێشـتا هەر مۆم بەکاردێنی. ژووری نوستنەکەت بۆگەنی کردوە. من لای خۆم وەهام دانابوو، چرا نوێیەکەت هەبێ."
پاشا هەراسانیی کچەی ڕەواندەوە، دەستی بردە سەر قاچە ڕووتەکەی کچە و سـەری ماچ کرد. لای کچە پاڵکەوت و سـەیری نیگارەکەی کرد. وێنەی شـەوێکی پاریس بوو. پردێکی نازدار هەردوولای ڕوباری سـێنی بەیەک دەبەسـتەوە، دوو دارتێلی ئاسـنیی تێلێگراف وەک دوو شـتی هونەریی جوان بە هەردوولای پردەکەوە داندرابوون. کێبلی تێلێگرافەکە وەک هێڵێکی ڕەش بەسـەر پردەکە ڕاچانرابوو. لقێکی دارێـک نیوەی وێنەکەی داگرتبوو. لەم کەشوهەوا تەلیسماوییەدا ژنێکی گەنج بەخۆی و کڵاوە ڕەشـە مۆدەکەی لەبن گڵۆپی سـتونی کارەبای سـەرپردەکە دەڕۆیشت.
کچە بە پەنجەی ئاماژەی کرد و گوتی: "من چوومەتە ئێرە و بەسەر ئەو پردەشدا پەڕیومەتەوە."
پاشا خەندەیەکی بۆ کرد، ویستی نەیڵێ، بەڵام دەبەر خۆی نەکرد و هەر گوتی: "لەوانەیە لەگەڵ ئەو پیاوانە چووبێتیە پاریسیش."

"نەخێر، من تەنیا بووم، ئەو شـــەوەش لای ئەو ســـتوونە کارەباییەدا وەستام."
کەواتە ئەم کچە سیخوڕ نییە، وەهای بۆچوو. هەردەبێ خەیاڵپلاو بێ.
"خاتوون، تۆ سەرنجت ڕاکێشام، زۆر شتی جوانت لە بن سەردایە."
کچە درێژەی بە قســـەی خۆی دا: "کاتێ لەســـەر پردەکە لەپاڵ دارتێلی تێلێگرافەکە وەستا بووم، لەپڕ گوێم لە دەنگە دەنگێک بوو."
پاشا بە مەراقەوە پرسی: "دەنگی چی؟"
کچە گوتی: "گوێم بە دارتێلەکەوە نا، هەستم کرد جووڵەیەک هەیە. وشە، ڕستە لە نووسینگەی تێلێگرافەکەوە دەنێردرا."
پاشا بە هێواشی دەستی بەسەر پشت و سمتی کچەدا هێنا.
کچە خێرا وەرسووڕایەوە و دەستی پاشای بۆ خۆی ڕاکێشا و پێیگوت:
"چاوت بنووقێنە."
ئەویش گوێڕایەڵ بوو. کچە بە ســـەری پەنجە چەند جارێک لەبەری دەستی پاشای دا."
"دەکرێ پێم بڵێ من چیم کرد؟"
پاشـا بە سـەرسـامییەوە چاوی کردنەوە و سـەیری لەپی دەسـتی خۆی کرد.
کچە پێیگوتەوە: "دەی چـاوت دابخەوە، جـارێکی دی دەیکەمەوە. ئینجـا مەتەڵەکە هەڵبێنە."
پاشاش گوتی: "نایزانین."
کچە بە خەنـدەوە گوتی: "من بە پەنجەکـانم نووســـیم: تۆ پیـاوێکی کەشخەی. ئەوە کۆدی مۆرسە."
شا نەیدەزانی پێویستە چ کاردانەوەیەکی هەبێ، دەمی کچەی ماچ کرد و زەق زەقیش لێی نزبووەوە.

"بۆچی وەها سەیرم دەکەی؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟"کچە وەهای پێگوت و سەری بە سینگە ڕەقەکەی کرد و بە نەرمی هەنسکی دا.
"کیژێ، ئەوە بۆچی دەگری؟"
"تۆ لە ڕوخسار کەسێکی ڕەقی لێ لە هەناوەوە نەرمی. من هەرگیز پێشتر لەگەڵ پیاوێکی سەرنجڕاکێشی وەها نەبوومە. لای تۆ هەست دەکەم خاتونە شازادەیەکی ڕاستەقینەم، دەکرێ بە تەوای خۆمت ڕادەست کەم، شتێک پێشتر لە ژیانمدا لەگەڵ کەسی دیکەدا نەمکردووە."
شا بێدەنگ بوو.
"دەی شتێک بڵێ، بۆ وا مات بوی؟"
پاشاش گوتی: "بیر لە سبەینێ دەکەینەوە."
"منیش، بەیانی دەرم دەکەی."
"نەخێر، بیر لەوە ناکەمەوە. کەسێک ئەوەندە هاتبێتەپێش، ناکرێ بڕوا."
"مەبەستت چییە؟"
ئەویش گوتی: "هیچ، لەبیری کە."
شا دەستی بەسەردا هێنا و جارێکی دیکە کڕبووەوە.
"تۆ بەو بێدەنگییەت دەمترسێنی"
"تۆ شتێکی وەک قیتارت تێدایە، ڕوەک و ڕوناکی و مەل، ئەوانەی بەرز لەسەر دارتێلەکانی تێلێگراف دەنیشنەوە، ئێمە حەزمان لێتە."
ئەمەش یەکێک بوو لەو ساتە دەگمەنانەی پاشا بە ژنێک بڵێ حەزم لێتە. هەر وشەکانی خۆی هەژاندیان. چەکمەجەی دۆلابی خەوەکەی کردەوە و جۆرکێکی زێڕینی مەخمەلی ڕەنگەناری دەرهێنا .کاتێکیش کچە گوێی لە زرینگەی دراوە ئاڵتوونییەکان بوو، هەڵسایەوە و قیت دانیشت و گوتی: "ئەوە خەریکی چی؟"
پاشا کیسەکەی کردەوە، دراوە ئاڵتوونییەکانی خستنە ناو بەرۆکی کچە خاڵیکرد.

کچە بەسەرسامییەوە دەستی بۆ مەمکەکانی خۆی بردنەوە و پاشاش بە ئەوقماوی سـەیری کرد. ئەویش گەمەی بە سـینگی کرد، ئیدی دراوە ئاڵتوونییەکان زرنگانەوە.

پاشا لەسەر پێخەفەکە هەڵسا و گوتی: "لەگەڵم دێی؟"

"بۆ کوێ؟"

"ئێمە تۆ دەنێرینەوە."

کچە بە سەرسامی تەماشای پاشای کرد.

"بۆچی دەرم دەکەی؟ پێموابوو ڕێگەم دەدەی بمێنمەوە."

"ئێمە ڕای خۆمان گۆڕی."

"دەمەوێ ئەمشەو لای تۆ بخەوم."

شا دووڵ بوو.

لێیەوە نزبووەوە.

کچە پرسی: "شتێکی هەڵەم کردووە؟"

لەو کاتەی پاشـا بیری لە پرسـیارەکەی دەکردەوە، دۆلابەکەی خۆی کردەوە لەنێو فایلێکدا ملوانکەیەکی کۆنینەی هیندی پڕ لە بەردی کەسک، دەرهێنا. ملوانکەکەی لە ملی کچە کرد و گوتی: "نەخێر، تۆ هیچ هەڵەیەکت نەکردووە."

پاشا لە ژوورەکە چووە دەر و زەنگوڵەکەی لێدا.

ئەمەی بە پەردەدارەکەی گوت: "ئەم کچە بنێرنەوە مـاڵی خۆی!" ئینجـا لەبەر تریفەی مانگەشەودا بە پەیژەکان بەرەو باخەکە ڕۆیشت.

چەند سـاڵێک دواتر، پێش مردنی، پاشـا کچەی وەبیر هاتەوە هەم خشـڵە نایابەکە و هەم گوێی لە دراوە ئاڵتوونییەکان بوو کە خسـتییە بەرۆکی کچە. ئەمانە دوایین یادەوەریی ژیان بوو، دەکرا تامی بکا.

# ٥١

# گەشتنامە

وەزیر پەیوەندیی بە نوێنەرایەتیی حکوومەتی ڕووسی، سویسری، نەمسایی، ئالمانی، ئیتالیایی، هۆڵەندی، بەلژیکی، فرانسەیی و ئینگلستانییەوە کرد، بەڵکو کارئاسانی بۆ گەشتی پاشا بۆ ئەورووپا بکەن. بۆ مایەی کامەرانیی ئەو، بە شێوەیەکی بەرچاو لەو هەموو وڵاتانە کاردانەوەکەیان یەک جار باش بوو.

هەمیشە ئەورووپییەکان لە کتێبی مێژووییەوە لەبارەی ئێرانییەکانیان خوێندبووەوە، ئەوان هەمیشە بە گوێرەی قسە باوەکە "ڕێسای میدیا و ئێرانی" کاتێ بیریان لە ئێران دەکردەوە، ئەوا بیریان بۆ زێڕ، بۆ مافووری باڵدار، بۆ پاشا تەلیسماوەکانی، بۆ خاتوونە شازادە جوانەکان، بۆ حەکایەتی هەزارویەک شەوە و کاڤیار دەچوو. بەڵام هیچیان ڕووبەڕوو پاشایەکی ئێرانییان نەبینیبوو.

هیچ کام لەو کتێبانە باســـی ئەوەیان نەکردبوو، پاشـــایەکی ئێرانی ســەردانی ئەورووپای کردبێ. پاشــا یەکەمین کەس بوو گەشــتێکی وەها بکا. هەر بۆیە خانەوادەی پاشا و کۆشکە سەرۆکایەتییەکانی ئەورووپا بۆ ئەو جۆرە گەشـــتە بەپەرۆش بوون. وەزیریش ئەوەندە دڵمەند بوو نەیدەتوانی چیدی ئەم هەواڵە خۆشـــە لای خۆی بهێڵێتەوە، مەراق بوو هەرچی زووە کاردانەوەی ئەو وڵاتانە بە پاشا ڕابگەیەنێ.

"پاشا و سەرۆکی وڵاتە جۆربەجۆرەکانی ئەورووپا سڵاوی تایبەتیان بۆ خاوەنشکۆ هەیە و زۆریش خۆشحاڵن پێشوازیی لە پاشا بکە."

پاشـــا بەم ڕاگەیـاندنە غـافڵگیر بوو. هەرچۆنێـک بوو دەرکی بەو بانگهێشتنە گەرمە کرد و بە خەندەوە گوتی: "لەوانەیە پاشاکانی ڕۆژئاوا وەها بزانن شـاهەنشـا (پاشـای پاشـایان) دەیەوێ بە دیداری وڵاتەکانیان شـاد ببێ. دیارە ئەوان نازانن ئێمە لە پاشـای سـوپایەکی هەژار و نەدار بەولاوە هیچی دیکە نین."

"خاوەنشکۆ، ئەوەی ئێوە دەیڵێن وا نییە. خاوەنشکۆ، وڵاتەکەی تۆ یەکێکە لە جوانترین وڵاتی ســـەر زەوی. ئێمەش خەڵکی دەوڵەمەندمان زۆرە، شـاری زۆر سـەرنجڕاکێشـمان هەن، ئێمە ئیسـفەهانمان هەیە، لە ڕووی جوانی و ناوازەییدا بێوێنەیە. ئێمە شـــاری شـــیرازمان هەیە، ڕۆژێ لە ڕۆژان پـایتەختی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهـان بووە، ئێمە مزگەوتەکانمان هەن، بە وەستایەتییەکی تەلارسازیی نایاب دروستکراون، ئێمە ئەدەبیاتێکی قووڵ و ڕەگئاژۆمان بە ســـەدان شـــاعیر و ئەدیبی کلاسیک هەیە، ژنانی ئێمە لە هەموو ژنانی جیهان ئەفسووناویترن. ئێمە مـافوورمـان هەن، کە دەتوانین لەســـەری بـاڵبگرین و بفڕین. ئێمە زافەرانمان هەیە، ئێمە خۆشترین چای جیهانمان هەیە، هەروەها شاکاری هەزارویەک شـــەوە و تاوســـی شـاهانەمان هەیە. ناوبانگی ئێمە بۆ هەمووان ناسراوە. تۆ پاشای پاشماوەی ماد و فارسەکانی.

ئەم وشە هاندەرانەی وەزیر ورەی پاشایان بەرزکردوە.
وردە وردە گەشتەکە شەقڵی خۆی وەردەگرت. ئەوان لە ڕێی سنوری ئازربایجان لەگەڵ ڕوسیا بەرەو مۆسکۆ دەڕۆیشتن، لەوێشەوە بە نێو ئەوروپادا دەگەیشتنە فرەنسا، ئینجا بە بەلەم بۆ ئینگلستان. دوای ئەو سەردانە دورودرێژە شاهانەیە، بە کورتەڕێگەیەکدا دەگەڕایەوە وڵات.
پاشا بۆ ئەوەی بەتەواوی دوودڵییەکەی لەمەڕ گەشتەکەدا نەهێڵێ، هانای بۆ قورئان برد. بە چاوی نووقاوەوە لاپەڕەیەکی هەڵدایەوە. کاتێکیش چاوی کردنەوە، پێی سەیر بوو، دیاربوو خودا ڕێگە ڕاستەکەی نیشان داوە، ئاخر کاتێ ئەو لاپەڕەی لێکیکردبووەوە تەماشای ناونیشانی سورەتەکەی کرد، سورەتی سورەتی ڕۆم بوو. ڕۆمیش سورەتێک بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان ئێرانییەکان دەوڵەتی بێزەنتیان بەزاندبوو: "ئاخۆ هیچ گەشت و گوزاریان لەم زەمینە نەکردووە، تا بڕوانن پێشینەکانی ڕابردوو - کە لەمان تواناتر بوون و زەوییان کێڵا و ئاوەدانتریشیان کرد و پێغەمبەرانیش بە نیشانەگەلی ئاشکراوە هاتنە لایان - چییان بەسەر هات؟"[94] ئیدی پاشا قورئانەکەی ماچ کرد و بە هەردوو دەستی بە سینگییەوە نووساند.
ئینجا پاشا بە خاترجەمییەوە هەموو تیشکی هزری خۆی خستە سەر گەشتەکە. ئەو بانگی پیرنیای کرد. پیرنیا نەوەی خانەوادەیەکی بازرگانی بەناوبانگ بوو، بۆ وتووێژ بانگهێشتی کرد. ئاخر پیرنیا یەک دوو ساڵ لە ڤیەننا بووە و وەک بازرگانێک لەنێوان نەمسا و سویسرادا لە گەشت و کارواندا بووە.

---

[94] ئایەتی نۆیەمی سورەتی ڕۆم: (أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ. من پەنام وەرگێڕانەکەی مام هەژار بردوە. وەرگێڕ

ئەو ڕۆژەیان ڕۆژێکی خۆش و گەرم بوو، پاشا لە سێبەری دارەکان لە شوێنی پشوودان دانیشتبوو. پێشخزمەت سینیەکی بۆ هێنا، کاهوو و ئەسکەنجەمینی[95] لەسەر بوو. پاشا حەزی لە کاهووی تەڕوتازی بوو، گەڵای کاهووەکەی لە ئەسکەنجەمینەکە هەڵدەکێشا و دەیخستە دەمی. کاتێکیش لە خواردنی کاهووەکە بووەوە، پێشخزمەتەکە لە هاتنی میوانەکە ئاگاداری کردەوە.

پیاوە گەنجەکە بە چاویلکەیەکی خڕەوە لەبن قاتێکی نائاساییدا بەدەرکەوت. ڕۆنی لە پرچی دابوو، ڕدێنەکەشی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێشانە قەڵەم کردبوو. سەری خۆی هەندێ نەوی کرد و سڵاوی لە پاشا کرد. ئەو بۆنەی لەخۆی دابوو، لە کەپووی پاشای دا، یەکسەریش پژمی.

پاشا بەدەم گوتنی "فەرموو دانیشە" ئاماژەیەکی بۆ کرد.

پیرینیا چەمایەوە لەسەر سەرینێک دانیشت، بەڵام وەنەبێ وەک دانیشتنە ئاساییانەی خۆی کەلە سەرچۆک دادەنیشت، ئاسوودە بێ. خزمەتکارێکیش قلیانێکی لە تەنیشت پاشادا دانا، ئیدی پاشا بە قلیانکێشانەوە سەرنجی ئەوەی دا گەنجەکە جووت پێڵاوێکی ڕەشی ناوازەی لەپێدایە، لە ڕەشییان هەر بریقەی دەداتەوە. پێدەچوو بە هەمان ئەو ڕۆنەی لە پرچی داوە، پێڵاوەکەشی پێ بریقەدار کردبێ.

"ئێمە وامان زانیوە ئێوە ماوەیەک لە ئەورووپا ژیاون، ئێمە باوکت دەناسین، ئەو بازرگانێکی ناودارە. بۆیە تۆمان بانگ کردووەتە ئێرە، تا ئەزموونەکەی خۆتمان لەبارەی ئەورووپا بۆ باس بکەی. دەی ئێمە گوێمان لێتە."

---

[95] ئەسکەنجەمین لە سرکە و شیلەی شەکر پێکدێ، واتە ترش و شیرینە، کاهووی پێ دەخورێ. وەرگێڕ

به شێوەیەکی ئاسایی ئەو کەسانەی بۆ لای پاشا دەهاتن پەسنیان دەدا، ئینجا دەهاتنە سەر بابەتەکەی خۆیان، کەچی پیرینیا بێ پێشەکی و ڕاستەوخۆ باسی مانەوەی خۆی لە ئەوروپا بۆ پاشا کرد. بە کورتی بۆی ڕوونکردەوە لەکوێ ژیا بووە و گەشتی بۆ چەند وڵات کردووە.

"باشە ڕێک پێمبڵێ لەوێ چیت دەکرد؟"

"بازرگانییم بە بەردە گەوهەرە خاوەکان دەکرد، بەڵام لەوێ مەیلم بەرەو لای ناسینی زمان و دابونەریتەکانیان ڕۆیشت! بازرگانییەکەشم ڕێگەی ئەو جۆرە گەشتانەی بۆ خۆش کردم."

ئەو لەخۆڕازیبوونەی کابرا بە دڵی پاشا نەبوو. بەتایبەتیش ئەو بۆنە تیژەی لێوەی دەهات.

پاشا بە پێداگیرییەوە گوتی: "کەواتە گەشت. دەی بۆمان بگێڕەوە چیت بینی؟"

"شتی زۆر سەرنجڕاکێش!" بەم جۆرە پیرینیا بە کورتی وەڵامی دایەوە.

"ناوی یەک دووانێکیان بڵێ!"

"زۆر سەختە گەشتەکە بە یەک دوو دێڕ وێنا بکەی، من گەشتنامەی خۆمم لەو بارەیەوە نووسیوە. ئەگەر لێیبوومەوە، دەکرێ بۆ خاوەنشکۆی بنێرم."

"کات بۆ ئەوە نەماوە، جارێ وەک نموونە یەک دوو شتی سەرنجڕاکێشم بۆ باس بکە.

پیرنیا، کە جەمال خانی دەناسی و ئەندامی کۆمیتەکەیان بوو، ئاگاداری دۆخی سیاسیی وڵات بوو. یەکسەریش بانگهێشتنامەی پاشای پەسەند کرد، بەڵکو ئەو بۆنەیە بقۆزێتەوە تا لەگەڵیدا باسوخواسی بەڕێوەبردنی وڵات بهێنێتە گۆڕێ.

"هەر بۆ نموونە، ئەوان دوو ژووریان هەن."

شا بە سەرسامییەوە: "ژوور؟"

"بەڵێ، ژوور."

"جا چی سەیر لەو ژوورانەدا هەیە؟"

"لەو ژوورانە باسوخواسی گرنگترین کاروبارەکانی وڵاتی تێدا تاوتوێ دەکرێ و پاشان بڕیاری لەبارەوە دەدرێ."

"ئەوان؟ ئەوان کێن؟"

"نوێنەرانی گەل."

پاشا قورسایی خۆی لەسەر ئەژنۆیەک بۆ ئەوی دیکە گواستەوە. هەستێک بەوەی میوانێکی ڕەزاقورسی هاتووە، هی ئەوە نەبوو بەرگەی بگرێ.

پاشا گوتی: "پێشتر شتمان لەوبارەوە زانیوە، دەی باسی شتی نوێمان بۆ بکە."

پیرنیاش هەستیکرد شا سەخڵەت بووە، تێهەڵچووەوە: "یەکێ لە دیاردە سەیرەکانی دیکە ڕۆژنامە یان ڕۆژنامەکان بوون."

دەمودەست شا هاتە وەڵام: "ئەمەشمان زانیوە."

"بەڵام لەو ڕۆژنامانەدا خەڵک ڕامانی خۆیان لەبارەی هەموو شتێک دەنووسن و بۆ ئەمەش جۆرە کێبڕکێیەکی قەڵەم دەکەن."

"کێبڕکێی قەڵەم؟ لەبارەی چی؟"

"لەبارەی هەموو شتێک! لەبارەی سیاسەت، لەبارەی شارەکان، لەبارەی پرد، لەبارەی ژنان، لەبارەی تەلار و باڵەخانە و لەبارەی هونەریش."

"کێبڕکێی قەڵەم لەبارەی ژنان و پرد، گەنجۆ، وات لە ئێمە کرد پرسن بین."

"ئەم هەموو وڵاتانە کتێبێکی تایبەتیان هەیە، دەستوور هەیە هەموو قانون و ڕێساکانی وڵاتی تێدا نووسراوەتەوە. هەرچی بۆ مرۆڤ هەیە بیکا و ئەوەی بۆشی نییە بیکا، هەمووی لەو کتێبەدایە."

پاشا سەری لەقاند. وەرگێڕانەکەی وەزیری پێشووی بۆ دەستوری فرەنسی بیرکەوتەوە.
"هەر وڵاتێک سیستمی دەوڵەتییانەی خۆی هەیە. ڕژێمی وڵاتێک بۆ وڵاتێکی دیکە دەستنادا، هەر یەکەیان ڕژێمی خۆی هەیە. لە سەرێکی دیکەوە ئەم کتێبە باری قورسی سەرشانمان سووک دەکا. ئاخر وا دەکا دەستمان واڵا بێت و کاتی زیاتر بە خۆمانەوە خەریک بین. ئایا شتێکی زانستیت هەیە تا پێمان بڵێی؟"
ئاماژەیەکی بۆ خزمەتکارەکەی کرد: "قلیانەکەمان سارد بۆتەوە!"
دەستبەجێ قلیانێکی نوێی بۆ هێنا.
پرینیا دەترسا لەوەی پاشا لە قسەکانی وەڕز بێت، بۆیە بابەتەکەی گۆڕی.
"هەرچەندە نهێنی لە ڕۆژهەڵاتدا هەیە و ئێمە لەبارەی گێڕانەوەی چیرۆکە ئەفسانەییەکان وەستاین، لێ ڕۆژئاواییەکانیش شتی وەهایان هەیە کە ئێمە نیمانە. لای ئێمە ڕازەکە لە مێژوو دایە، لە نێو کتێبان دایە، لە گێڕانەوەکانمان و لەپشت پەردەوەیە، بەڵام ئەوروپییەکان ئەوەی بن بەڕەیان هێناوەتە سەر بەڕە. تۆ لەوێ دەتوانی دەست لە ڕازەکان بدەی، تەنانەت دەتوانی لەنێویشیاندا بژی و دابنیشی. یەکێک لە نموونەکانیش قیتارە."
"ئێمە ئەوەش دەزانین، لە کۆشکدا بارستاییەک لە ناملیکەی وێنەدار لەبارەی قیتارەوە هەن. دەی پێمبڵێ تۆ لەو گەشتانەتدا بە چ زمانێک دەدوای؟"
"هەرچەندە هەموو وڵاتێک زمانی تایبەتی خۆی هەیە، لێ لە کۆڕبەندە باڵاکاندا بە زۆری هەر بە فرەنسی قسە دەکرێ."
پاشا بە شانازی و بە فرەنسییەوە پێیگوت: "فرەنسییەکەمان باشە؟"

ئەو مژی لە قلیـانەکەی دەدا، یەک دوو جـار دووکەڵی هەڵمژی و دەریدایەوە، ئینجا گوتی: "ئەرێ بە فرەنسی قلیان چییە؟"
"ئەوان قلیانیان نییە."
پاشا سەرنجەکەی خۆی وەها دەربڕی: "ئاها، ڕاست دەکەی. سەیرە!"
پیرنیا ویستی شتی دیکە بڵێ، بەڵام بینی داڵغەی پاشا بۆ شوێنێکی دیکە ڕۆیشتووە.
ئەوسـا بە شـێوەیەکی ڕەچاونەکراو بانگیکرد: "پیاڵەیەک چا بۆ میوان بێنن. ئەرێ تۆ باسـی ژنانیشـت کرد، شـتێکی تایبەت و ناوازەت لەبارەیانەوە هەیە بیڵێی؟"
پیرنیاش گوتی: "نازانم چۆن باسی بکەم. بەڵام... لەوێ ژنان بە ڕاشکاوی دەموچاوی خۆیان بۆ خەڵک دەردەخەن. دەکرێ هەموو کەس چاو و کەپوو و لێو و گەردن و باسکیان ببینێ. لە ئاهەنگەکانیش هەر بەخۆیان شان و مل و بەشێکی سینگیشیان دەردەخەن."
پاشا ئاماژەیەکی وەهای کرد وەک ئەوەی ئەم شتەی لا گرنگ نەبێ.
"باشە، هەر کاتێک چایەکەت خواردەوە، دەتوانی بڕۆی."
ئیدی پیرنیا چاوەڕێی خواردنەوەی چایەکەی نەکرد.
پاشا لەپشت پیرنیاوە گوتی: "ئەگەر شتێکی شایستەت هەبێ و نەگوتبێ، دەکرێ ئێسـتا بیڵێی." ئاخر هەسـتی کرد ئەو هەموو شـتێکی باس نەکردووە.
پیرنیاش وەسـتا و گوتی: "لەم دواییانەدا ئەندازیارێکی فرەنسـی شـتێکی زۆر سـەیری داهێناوە. قوللەیەکی یەکجار بەرزی لە ملیۆنان کیلۆ ئاسـن دروستکردووە."
"چەند بەرزە؟"
"زۆر بەرز. بە دڵنیاییەوە ئەوەندە بەرز بەقەد ئەو کێوەی ئەوێ!" ئاماژەی بە کێوێکی دوور کرد.

"باشه بۆچی وەهایان کردووە؟"
"کەس نایزانێ. بەندوباویشـــی لەبارەوە هەن. لە ڕۆژنامەکاندا لایەنگر و دژیشی هەن. لەهەمان کاتدا بە ڕۆژ و شەو، ژن و پیاو هەر بۆ خۆشی و لەبەر مەراق بوون بەسەریدا هەڵدەگەڕێن."
"بەسەر چیدا هەڵدەگەڕێن؟"
"بەسەر قوللەکە!"
ئینجا شـا گوتی: "بە ملیۆن کیلۆ ئاســن بەیەکەوە نرایە و لەســەر یەک دانراوە تا لە دواییدا خەڵک بەسەریدا هەڵبگەڕێن؟"
"ئەو ئەندازیارەی شــتەکی دروســتکردوە، بەناوبانگە. بزوێنەرێکیشــی داهێناوە، جۆرە گالیســکەیەکە بە بێ ئەســپ، دەکرێ لەگەڵ یەک دوو نازانم چەند، بەڵکو بیســت کەس ســواری ببن. ئیدی تۆ دوگمەیەک دادەگری. لەپڕێکدا گالیسکەکە دەجووڵێ. سەیر ئەوەیە نە بۆ پێشەوە نە بۆ پشــتەوە دەڕوا، تەنیا بۆ ســەرەوە دەڕوا و پاشــان بۆ خوارەوە دەگەڕێتەوە. هەر ئەوەندەیە یەک دوو جار چاوت لەیەک بدەی، ئیدی گەیشتوویتە تۆقەڵی قوللەکە."
پاشا بە مەراقەوە پرسی: "باشە لە سەر دوندی قوللەکە چی دەکەن؟"
"سەیرکردن. تەماشای پاریس دەکەن! لە شەودا دیمەنێکی پەرجووانەیە. تۆ سەیری سێن دەکەی، ئەو ڕووبارەی بەنێو شاردا دەڕوا، لەوێ گڵۆپە نوێیەکـان دەبینی، لەبەر ڕونـاکی گڵۆپەکـان لەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەدا ژنە نازدارەکانی فرەنسی دەبینی ڕێدەکەن."
پاشـا قســەکەی پێبڕی: "لێیگەڕێ." و ســەیری تاوســێکی دەکرد کە پەرەکـانی لێککردبوونەوە. "دەتوانی بڕۆی." داڵغەی بۆ لای ئەو کچە ڕۆیشـت، کە ملوانەکەکەی دابوویێ. ئاخر ئەویش بەســەر لای ڕووباری سێندا پیاسەی کردبوو.

ئامادەکارییەکانی گەشتەکە سالێکیان خایاند. تا دەهات ڕۆژی گەشتەکەی نزیکتر دەبووەوە. لە مانگی دواییدا زۆرتر سەری حەرەمسەرای دەدا و لە جاران زیاتر شەوان لای ژنەکانی دەمایەوە. ئەو بە کۆمەل دەیبینین، لە دەوری کۆدەبوونەوە وای کرد نازی بکێشن. ئەو خۆشیی لە نازوعیشوەی ژنەکان دەبینی، ماچ ماچانێ و دەستبازیی لەگەل دەکردن، گازی لێدەگرتن و لەگەلیان پێدەکەنی.
زۆر جاریش لای دایکی دەبینرا و نانی ئێوارانی لا دەخوارد. دانیشتنەکانیان لەگەل یەکدی لەوانی جاران جیاوازتر بوون، یەکدییان بۆ ماوەیەکی درێژ لەباوەش دەکرد و بە نەرمییش لەگەل یەک دەدوان.
مەهدولیا بە چاوی فرمێسکاوییەوە دەستەکانی ماچکردن و گوتی: "ڕۆلە، تۆ هەم کوڕ و هەم پاشای منی." پاشان فرمێسکەکانی بۆ سڕین پرچە سپییەکەی ماچ کرد و لە لای ڕۆیشت.

ڕۆژێک بەر لە بەڕێکەوتنی کاروانی گەشتەکەی، بەرەو لای تاج سولتانی کیژی کەوتەڕێ. لەوکاتەی نەوەکەی لەدایک بووبوو، تا ڕاددەیەک ڕۆژانە کچ و نەوەی لە کۆشکەکەی دەبینی، بەلام ئێستا ئەو خۆی چووبووە سەردانی کیژەکەی.

تاج بینی باوکی دلتەنگە، ویستی لێی بپرسێ ئاخۆ خەمی چی لەبەرە، لێ وەهاشی نەکرد. پێشان کاتێ هێشتا شووی نەکردبوو، بە ئاسانی لەگەلی دەدوا و لێیدەپرسی: "ئەرێ باوکە بۆ وا غەمباری؟"
لێ لەوکاتەی مێردی کردووە، پاشا مەودایەک خۆی لێ دوور گرتووە. وەک ئەوەی کچێکی دیکە یان ژنی پیاوێک بێ و کچی ئەو نەبێ. کچە هەستی بە ئازار کرد لەوەی ئەو پەیوەندییە گەرم و بەتینەی جارانییان بە یەکەوە نەماوە و ڕازونیاز باوکانەی بۆ نادرکێنێ. ئەو بایەخەی

جاران بۆ کچەکەی هەیبوو ئێستا بۆ نەوەکەی چووە، تەنانەت ئەم ڕەفتارە بۆ کچە مایەی هەندێ ئیرەیی بوو، بەڵام خۆ باش لە باوکی خۆی دەگەیشت. ئەو ئێستا بۆتە هی پیاوێکی دیکە. ئەوەش مایەی خۆشبەختی بوو، کە پاشا بە منداڵەکەی ئەو دڵخۆشە و هەردووکیانی خۆش دەوێ، هەم خۆی و هەم منداڵەکەی.
تاج منداڵەکەی خستە باوەشی باوکی و گوتی: "ئای من چەند بەختەوەرم، کە پاشا خۆی ئاگای لە شازادە بێ."
پاشا بە مسکەبوونەوە گوتی: "بە خۆشییەوە، شایانی نییە." بە خۆی و منداڵ لەباوەشەوە چووە سەر کورسییەکی هەژۆک دانیشت.

هەمیشە پاشا بە ڕستە و وشە وگۆکردنی تەواوەوە قسەی لەگەڵ منداڵەکە دەکرد، ئاخر پێیوابوو ئەم جۆرە قسانە بۆ گەشەکردنی مێشک پێویستە. ئەو چەند دێڕێکی لە کتێبێکی کلاسیک بۆ خوێندەوە و خۆیشی زەوقی لێبینی. ئەم جارەیان چیرۆکێکی لە کتێبێکی زۆر کۆنی فارسی کە ناوی کلیلە و دیمنە بوو بۆ خوێندەوە.
"هەبوو نەبوو بازرگانێک هەبوو، لە هەرات دەژیا. ژنەکەی ناوی جامیس بوو، هێندەی مانگ جوان بوو. کەس لەو شارە پێشتر ژنێکی وەها شۆخ و جوانی نەدیبوو. ڕووی وەک ڕۆژی سەرکەوتن دەدرەوشایەوە پرچیشی ڕەش و درێژ وەک شەو وابوو، شەوێک کە بێهوودە چاوەڕێی دڵدار بکەی.
هونەرمەندێکی بەناوودەنگ، کە فڵچە و خامەی دەستی جادووی دەخوڵقاند، لە ماڵێکی گەڕەکی ژنە دەژیا. پەیوەندییەکی ژێربەژێریشی لەگەڵ ژنەدا هەبوو..."

تاج بە پێکەنینەوە ناڕەزایی لەم ڕەفتارەی پاشا دەربڕی و گوتی: "باوکە، بۆچی ئەو جۆرە شتانە بۆ ئەو منداڵە دەخوێنیتەوە، خۆ ئەو هێشتا هەر مەمکمژەیە."

پاشــاش خۆشــیی لە قســەی تاج بینی و وەها وەڵامی دایەوە: "ئەو هەم منداڵە و هەم پیاو. پێویستە بە زوویی فێری ئەو هەموو شتانە بێ."

ئینجا تـاج بە پێکەنینەوە: "پـاشـــــای بـاوک، کوڕەکەی من بە چیرۆکی خۆشەویستی پەروەردە نەبووە."

پاشاش گوتی: "ئەو پیاوە. ئەو دەبێتە پاشا."

تاجیش پێیگوتەوە: "هەر بۆیە لە ئێســتاوە باسـوخواســی هەراتی بەگوێدا دەدەی."

پاشا منداڵە جێنشینەکەی دایەوە دەست دایکی. دەیزانی ئەم منداڵە چەند بۆ پاشەڕۆژ گرنگە.

پاشــا لە درەنگانێکی پاش نیوەڕۆکەدا داوای لە تاج ســولتان کرد بەڵکو پیاســـــەیەک بۆ نێو باخەکە بکەن. لەکاتی قەدەملێدانەکەدا بە تاجی گوت بەنیازە گەشتی ئەورووپا بکا نەوەک وەک ڕاگەیەنراوە بچێتە کەربەلا.

"کچم گوێبگرە، تەنیا هەر یەک دوو کەس بەم گەشـــتەم دەزانن. لەپاش ڕۆیشـتنی من نیشـتمان لە عۆدەی تۆ دەبێ. چاوەکانت باش بکەوە، زۆر باش ئاگات لە کوڕەکەت بێ. ئەو لە ئێســـــتاوە دوژمنی زۆری هەن. خۆ ئەگەر بە من بووایە، گەشتەکەم تا دوای ئەوەی گەورە و بەهێز دەبوو، دوادەخست، بەڵام چار نییە، حوکمی ژیانە و دەبێ منیش لەگەڵی بڕۆم."

پاشا ویستی گەنجینە پڕ زێڕ و گەوهەرەکەی ژێرزەمینی کۆشکەکەشی پێ بڵێ. ئاخر خۆ لەگوینە[٦٦] لەکاتی گەشـتەکەیدا شـت بقەومێ، شـتی وەها بۆ ئەو دژوار و چارەنووســـاز بێ. بۆ ئەو جۆرە ســەرکێشــییە، لەســەر

[٦٦] لەگوینە: نزیکە، لەوانەیە، خەریکە.

شـانی پێویسـتە ڕازەکە بۆ جێنشـینەکەی بدرکێنێ. پاشـا کچەکەی بردە دیوەکەی دیکەی باخەکە، تا هیچ کەس گوێی لە قسـەیان نەبێ. ئینجا بە چرپەوە پێیگوت: "گوێبگرە! من دەمەوێ نهێنییەکی دەوڵەتت بۆ بدرکێنم. شـتەکەش بۆ تۆ نییە، بەڵکو بۆ کوڕەکەتە. ناپاکییە ئەگەر بۆ هەر کەسـێکی دیکەی باس بکەی. ئەم ڕازە هەر لە سـینگی خۆت بهێڵەوە تا ئەوکاتەی کوڕەکەت دەبێتە پاشای وڵات."

تاجیش گوتی: "باوکە، وا مەڵێ، تۆ هەر دەمێنی."

"مەرگ بۆ هەمووان لە ئان و سـاتدایە، کێ دەیزانێ. باش گوێم لێبگرە و لەبەری کە."

پاشا دەستی دایە چڵەدارێک و لەسەر زەوییەکە وێنەی ژوورێکی کێشا، نەخشـەی دۆڵابەکە و کونی پشـتی دۆڵابەکە و بووبڕە تەسـکەکە و پەیژەکان و ڕاڕەوە کورتەکە پاشـان پەیژەکانی بە باشـی کێشـا. دوای ئەوە ڕاڕەوەکە ئینجا دەرکەیەکی بچکۆلە و گەنجینەکە، ئەو باسـی ئەو زێڕ و زیو گەوهەرەی بۆ کرد، ئەوەی لە هیندسـتانەوە هێنرابوو. هەروەها باسی ئەو دەرووە و ئەو بووبڕەشی بۆ کرد، کە لە بارودۆخی ناچارییدا دەکرێ وەک ڕێی هەڵاتن و دەربازبوون بگیرێتەبەر.

تاج سـوڵتان باوەشـی بە باوکیدا کرد و بە سـرتەوە گوتی: "باوکە، زۆر سـوپاسـت دەکەم بۆ ئەو متمانە زۆرەی بە منت هەیە. من ژیانم بۆ ئەو ئەرکە تەرخان دەکەم و پەیامەکەشت لەکاتی خۆی دەدەمە جێنشینەکەت."

شـەوی سـەفەرەکە، عەینولدەولەی لە ژووری کارکردنەکەی خۆی بینی. هەرچەندە سەرەتا بڕیاریدا بوو هیچی لەبارەی گەشتەکەی بۆ ئەورووپا پێ نەڵێ، لێ هەسـتیکرد ئەو هەم زاوایەتی و هەم پلەیەکی بەرزی لە سوپاشدا هەیە، بۆیە شتێکی ئەستەمە ئەو گەشتەی لێ بشاردرێتەوە. ئیدی پێیگوت لەوانەیە سـەری چەند وڵاتێکی ئەورووپی بدا، پاشـان

ئەوەشـــی پێڕاگەیاند: "ئەمەیان فەرمانێکی ئێمەیە: لە دیارنەمانی ئێمە هەموو لادەرەکان بگرە. کاتێکیش گەڕاینەوە، نامانەوێ هیچیان لەبارەوە ببیســـتینەوە. بەم نامەیەش هەموو دەســـەڵاتێکت بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە پێدەدەم."
پاشا هەر بەخۆی نامەکەی خستە بەرکی عەینولدەولە و گوتی: "بەردەوام تاج سـولتان و منداڵەکە بێنە کۆشـک. لێیانگەڕێ نەوەک هەر ڕۆژەکانیان بەڵکو شـەویش لێرە بەســەر ببەن، ئاخر بۆ منداڵەکە باشـە لە کۆشـک رابێ."
پاشـــا توند پیلی عەینولدەولەی گرت و بە نەرمی پێیگوت: "بە گیانی خۆت ژن و منـداڵەکەت بپـارێزە. ئەوانە شـــتە هەرە بـایەخـدارەکەی دەوڵەتن. لەبەر ئەوان بڕوا بە هیچ کەسێک مەکە."

بۆ ڕۆژی پاشتر، شا گەشتەکەی دەستپێکرد، کە شەش مانگی دەخایاند. ئەو دەســـتەیەکی لێبژاردەی لەگەڵ خۆی برد، کە پێشـــوەخت ئاگاداری کردبوونەوە بەوەی ئەرکێکی تایبەتیان لەپێشـــە. وەزیر پێی باش نەبوو مەلیچک لەگەڵ خۆی ببا، بەڵام پاشـــا بەگوێی نەکرد: "ئەو شـــتە ناکرێ، خۆ ئەگەر بەتەنیا لێرە بەجێی بێڵم، وەکو پشـــیلەکەم فەرامۆش دەکرێ. ســـەرباری ئەوەش کاتێک بێزار دەبم و لە غەریبیدا پێویســـتم بە یەکێک هەیە قسەی لەگەڵ بکەم."
شـا بڕیاریدابوو لەکاتی گەشـتەکەیدا ڕۆژژمێرێکی پێبێ و لێی بنووسێ. کتێبەکەش بۆ خەڵکی ئێســتا نەبوو بەڵکو بۆ پاشـەڕۆژ بوو، بۆ ئەو کاتە بوو، پاشا لە ژیاندا نەمابوو.
ئەو لەوە بە ئاگا بوو، وەک پاشـــا کۆنەکانی ئێران بە شـــکۆوە یادی ناکرێتەوە، بەوەی مۆری خۆی لە تەوێڵی چەرخی ئێســـتای خۆیدا بێ، بەڵام خۆ دەکرێ لە ڕێی گەشتنامەکەی خۆی جیابکاتەوە و بناسرێتەوە.

دەزگا نوێیەکان کتێبەکەی ئەو چاپ دەکەن. ڕۆژێک دادێ لای هەموو کەسێک دەخوێندرێتەوە. ئەو ویستی گەشتەکەی بۆ ئەوان بکا، ئەوانەی هێشـــتا لە ژیـانـدا نین، بەڵام بەدڵنیـاییەوە دواڕۆژ دێن و دەیبینن و دەیخوێننەوە.

لە نیوەی شەودا، پەردەی پەنجەرەکەی تیدا و سەیری ئاسمانێکی ساماڵ و پڕ لە ئەستێرەی کرد. لەوانەشە ئەمەیان دوا شەوێکی ئێرانییانە بێ بە مەراقەوە لێی ڕابمێنێ.

هەرچەندە خەمی وڵاتەکەشـــی بوو، لێ هەســـتێکی خۆشـــیی نامۆشـــی هەبوو. هەستەکە وەک ئەوە وابوو، لەپڕێکەوە لەو بارە قورسـەی سـەر شـانی ڕزگاری دەبێ، ئەو بارەی وەها لەچارەی نووسـرابوو دەبوایە تا مردن هەڵیبگرتبایە. ئەو وەک مەلێکی قەفەسکراو وابوو، بەرەو ئاسمانی شینی بێ بن باڵ بگرێ.

هەرچەندە درەنگیش خۆی خزاندە بن لێفە، لێ بەیانی زوو لەخەو ڕابوو. پیاسـەیەکی بەناو باخەکەدا کرد. سـەرەتای وەرزی بەهار بوو. ئەو ناوە هەر گوڵ بوو ســـــەری دەرهێنابوو. هەدادانی نەمابوو، تەنانەت حەزی دەکرد زووتر کاروانی گەشـــتەکەی بەڕێ بکەوێ، بەڵام خۆ دەبووایە چاوەڕێی بکردبایە تا هاوسەفەرەکانی ئامادە بووبان.

ئەو ویستی دوا نیگا لە حەرەمسەرا ببڕێ، لێ بۆ مایەی سەرسامی ئەو، ژنەکانی بە جلی ڕازاوەوە لە باخەکەدا وەســـتابوون. هەموویان یەکە و ئاوێنەیەکیان بە دەســـتەوە بوو. ئەوان بە هێواشـــی دەگریان لەهەمان کاتیشـــدا پێدەکەنین. یەک دوو دانەیان بە دەفرێکی پڕ لە ئاوی روون هاتنە پێش و ئاوەکەیان وەک نیشـــانەیەکی بەخت لەبەر پێدا ڕژاند. ئەمەش پاشـــای هەژاند و چاوەکانی پڕ لە ئاوکرد. ژنەکان زیاتر لیی

هاتنەپێش، خۆیان گەیاندێ و تا بەردەرگا یاوەرییان کرد، لەوێش هاوسەفەرەکانی چاوەڕێیان دەکرد.
خزمەتکاران بە خۆیان ئاگردانی بچووک لەسەر سینی و هاتن و بوخوریان لەسەر دەسووتاند و دوکەڵە بۆندارەکەشیان بە بەرکەپووی مێوانەکاندا دەکرد. تیپێکیش لە موزیکژەنان یاوەریی گۆرانیبێژێکی گەنجیان دەکرد کە گۆرانییەکی ماتەمبارانەی خواحافیزی دەچریکاند.
پاشاش بە دەستەسڕەکەی فرمێسکەکانی سڕینەوە و دەستی بۆ هەمووان ڕاوەشاند.

حەوت گالیسکەی پاشایەتی حازروبازر وەستابوون. کاربەدەستانی حکوومەت، ئەندامانی خانەوادەی پاشایەتی، نێردەی بازاڕ و باڵوێزی بریتانی و ڕوسی پەرژینێکیان بۆ خواحافیزی لە پاشا دروستکردبوو.
دایکیشی پێشوەختە خواحافیزی لێکردبوو، دوعای گەشتێکی سەرکەوتووی بۆ کردبوو.
پاشا سەری بۆ هەندێکیان هەژاند، تۆقەی لەگەڵ هەندێکیان کرد، دۆستانەش لەگەڵ باڵوێزی ڕوسی دوا و چەند وشەیەکیشی لەگەڵ هەڵسوڕێنەری کاروباری بریتانی ئاڵوگۆر کرد. دانیشتوانی تارانیش دەستیان بۆ پاشا هەڵوەشاند. سەرۆکی نۆکەرانیش بە خۆی و سینییەکی پڕ لە دراوی نوێ هاتە لای پاشا وەستا، ئەویش چەنگی لێدەدا و بۆ پەیوەندیدارەکانی فڕێ دەدا. تا ئێستا ئەوەندە دراوی نەبەخشیبوو، بەڵام بۆ ئەوە کردی، پێیوابوو بەم کارەی ئەو کەسانە هەرگیز لەبیری ناکەن لەکاتێکدا ئەگەر هات و ئەو نەگەڕایەوە.
کاتێکیش دوا دراوەکانی بەشینەوە، دەستێکی بۆ هەوا بەرزکردەوە و سواری گالیسکەکەی بوو.

## ٥٢

# دەستور

یەک دوو مانگ بوو شا لە گەشت و گەڕانی خۆی بوو، هەمووانیش وەهایان دەزانی لە سەردانی شارە پیرۆزەکاندایە. کاتێکیش مانەوەی زیاتر لە کاتی چاوەڕوانکراوی خایاند، دەنگۆی وەها بڵاوبوەوە، گوایە لە کەربەلا و نەجەفەوە ڕێگەی مەککە و مەدینەی گرتۆتەبەر تا حەجەکەش نەکا نایەتەوە. هەر موسڵمانێکی باوەڕدار لەسەری پێویستە لە ماوەی ژیانیدا یەک جار بچێتە مەککە و جەژنی قوربان لەوێ بکا.

پاشا ئێستا لەنیوەی ڕێگای گەشتەکەی خۆی دایە و یەک دوو کورتەنامەشی بۆ تاران ناردبوونەوە.

بۆ دایکی وەهای نووسیبوو:

"دایکە، وەک پاشایەکی گەورەی ئێرانی لە ڕوسیای دراوسێوە پێشوازیی لێکراین. ئەوان پێیان گوتم، هێشتا ئەو سەردانەی دایکتمان بۆ مۆسکۆ هەر لە یادگەدا ماوە. ئەوان چەند وێنەیەکی تۆیان نیشان دام. تۆ باسی ئەوەت بۆ نەکردم، نیگارکێشێکی دەرباری قراڵ تابلۆیەکی تۆی کێشاوە.

داوام لێکردن بەڵکو بتوانم تـابلۆکەت لەگەڵ خۆم بێنمەوە. بەداخەوە، ئەوان هێنـدە تۆیـان بەدڵ بووە، ویسـتیـان تـابلۆکەت لەگەڵ کۆمەڵە تابلۆکانی ئەوی بمێنێتەوە."

بۆ تاج سوڵتانیشی نووسی:

"ئای چەند خۆش بوو لەگەڵ خۆمم هێنابای، ئاخر ئەو گەشـتە زیاتر بۆ تۆ دونیا نەوەک ئێمە. هەرشتێک کە لەنێو پەڕەی کتێبان خوێندبێتەوە، لێرە لە بـازاڕەکـاندا لەبەرچـاوە. ژنـان، قـاوەخـانە، پرد، چرا، کڵێسـا، نانەواخـانە و تیـاترۆخـانەکان. لێ گوێی پێ مەدە، تۆ هێشـتـا گەنجی، جارێکی دیکە دەتنێرینە مۆسکۆ.

ئێمە غەریبیی ئەحمەد موزەفەر، شـازادەی جێنشـین دەکەین. باش ئاگات لێی بێ، بە باشـی شـیری خۆتی پێبدە، باش بەخۆتیەوە بنوسـێنە، بە ڕسـتەی تەواوەوە لەگەڵی بدوێ. چیرۆکی خەوهێنەرانەی بۆ مەگێڕەوە، هەروەها ئەو گۆرانییە ڕۆژانەییانەشـی بۆ مەڵێ تا خەوی لێبکەوێ. لە دیوانەکەی حافز بۆی بخوێنەوە، گۆرانی فرەنسی فێربکە.

تا دیدار، زوو دەگەڕێینەوە."

بۆ ئەوەی ژنانی حەرەمسـەراش ئیرەیی نەبەن، بۆ ئەوانیش هەمووان، ئەم نامەیەی نووسی:

"ژنینە! پاشـا غەریبیی ژنانی حەرەمسـەرا دەکا. خۆی ئەوە ئەرک بوو لەسەرمان، ئەم گەشتە بکەین، دەنا نەماندەکرد. مەوداکان زۆر گەورەن، ڕێگاکان هی هات و نەهاتن، لە هەموو لایەک مەترسـی خۆی مەڵاس داوە. سـوپاس بۆ خوا ئێوەم لەگەڵ خۆمدا نەهێنا، دەنا دەبووە مایەی

کوێرەوەری. داواتـان لێـدەکەم دوعـامـان بۆ بکەن. ئێمە بەم زووانە دەگەڕێینەوە ماڵێ."

بۆ وەزیریشی وەها نووسیبوو:

"لێرە خەڵـک ژیـان و گورەزانی بەتەواوی لەوەی ئێمە جیـاوازە، بەردەوامیش لە خۆم دەپرسـم تۆ بڵێی ژیـانی ئێرە بۆ ڕەعیەتەکەی ئێمەش دەسـت بدا. من لەوە دەترسـم ئەگەر هات و ئێمە هەموو ئەو شتانەی ئێرە وەربگرین، بیروباوەڕ و دابونەریتمان لەدەست دەدەین. ئەگەر هاتمەوە، بەدرێژی لەو بارەیەوە قسـەدەکەین. هەر بەڕاسـتی گەشـتێکی سـوودبەخش بوو، ئێمە تۆپخـانەمـان بۆ وڵات کڕی و تفەنگیشمان بە ڕادان دان و چەندین گرێبەستیشمان مۆرکردن.

کورتەنامەیەکم لە عەینولدەولە پێگەیشـت، ئەو بەڕوونی پێ لەسـەر ئەوە دادەگرێ، ئامادەبوونی پاشـا پێویسـت و گرنگە. هەربۆیە ویسـتم لە مـانەوەیەکی درێژخـایەن بەرپرسـیـار بم. ئێمە گەشـتەکەمـان کورت دەکەینەوە. تا ئەو کاتەی شتەکان هەڵبسەنگێنین، گەیشتووینەتە ئامانجی خۆمان. لە داهاتوودا جارێکی دیکە گەشتێکی درێژتر دەکەین."

مسـتەوفی ئەلمەمالیکی وەزیر گومانی بۆ کورتەنامەکەی عەینولدەولە چوو باسـی چی تێدابێ. لەوانەیە عەینولدەولە لە نامەکەیدا پاشـای لەوە ئاگادار کردبێتەوە، هەرچەنـدە وا پێدەچێ وڵات ئارام بێ، لێ نەیاران سەرقاڵی ئەوەن ڕایەڵەی خۆیان لەژێرەوە بەباشی بپارێزن.

هەروەها عەینولدەولە هۆشـداری دابووە وەزیر لەوەی: "تۆ نابێ وا بیربکەیتەوە، کە ئەوان بێدەنگ بووبن، یان هاتبنە سـەر ڕایەکی دیکە، نا بە هیچ شـێوەیەک شـتی وا لەگۆڕێدا نییە. من بەڵگەم هەن ئەوان خۆیان بۆ کات و ساتی گونجاو ئامادە دەکەن تا دەسەڵات بگرنەدەست."

مستەوفی ئەلمەمالیکیش هیوای وابوو بەڵکو لەو ماوەیەی پاشا لە وڵات نییە، بەشێک لە نەخشەکانی جێبەجی بکا، بەڵام بەکردەوە شتێکی نەکردەبوو بە بێ پەسەندنامەی پاشا هەنگاوەکانی بهاوێژێ.
عەینولدەولەش سەد جاران زیاتر لە پاشا بەدتر بوو. ئەو هەر بەڕاستی سەگەپاسێکی نمونەیی بوو. ئەو لەیەک ڕستەدا پێگەی وەزیری پوخت کردبووەوە: "تا پاشا دەگەڕێتەوە بیر لە هیچ شتێکی نوێ نەکەیتەوە!"
عەینولدەولە بۆ گرتن و لەناوبردنی ڕکابەرە نەیارەکان، لە تاران یەکەیەکی تایبەتی چەکداری پێکهێنابوو. بەمە خوازیاربوو بەر لەوەی شا لە گەشتەکەی بگەڕێتەوە، ئەرکەکەی خۆی بەدیبێنێ، بەڵام تا دەهات پەی بەوە دەبرد، ئەم شتە کارێکی ئاسان نییە. ئەو لەو بڕوایەدا بوو تەنانەت مستەوفی ئەلمەمالیکیش پەیوەندیی بەو کەسە بەرهەڵستکارانەوە هەیە. ناوبەناو مستەوفی ئەلمەمالیک قسەی لەگەڵ جەمال خان و ئەمیر نیزام دەکرد، بەڵام نیازی نەبوو دژی پاشا بوەستێتەوە. ئەو دەیەویست گەنجە ڕۆشنبیرەکان لە دەوری بیرۆکەکانی کۆبکاتەوە.
لەکاتی دەستبەکاربوونی وەزیر، پاشا داوای لێکردبوو هەموو بڕوانامە و گرێبەستەکانی لا دابنێ تا تاوتوێیان بکا، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر بوون و هەندێکیشیان زۆر سادە و ئاسان بوون، ئیدی کاغەزەکان بۆ ماوەیەکی درێژ هەر لە نووسینگەی ئەو مابوونەوە. وەزیر نەیدەتوانی بەرگەی کەموکورتی بەرپرسیارێتی پاشا بگرێ.
پاشا ڕووبەڕووی ئەو ژمارە گرێبەستانە دەبێتەوە کە پاشا بە تاقی تەنیا لەگەڵ دامودەزگا و کارخانە و بازرگانانی ئەورووپا واژۆی کردبوون.

ئەندامانی کۆمیتەی بەرگرییش لەمێژبوو لەو بڕوایەدا بوون، پاشا گەورەترین بەربەستی گۆڕانکارییە چارەنووسسازەکانە. بۆیە ئەوان

شـــێلگیرانە کاریان بۆدەکرد. ئەندامانی کۆمیتەکە لە دوایین کۆبوونەوە، کە لەتاران ڕێکیانخستبوو، ئەمانەی خوارەوە ئامادە بووبوون:
جەمال خان، میرزا ڕەزا کرمانی، شـــازادە مولکم خان، عەبدولڕەحیم تالیبۆڤ، حاجی زەینولعابدین مەراغەیی، شـــێخ ئەحمەد ڕوحی، میرزا محەمەد حەسەن ئاستیانی، شێخ عەبدولحەسەن، میرزا سولەیمان خان، میرزا یەحیـا دەوڵەتئـابـادی، میرزا محەمەد عەلیخـان، شـــێخ ئەحمەد خەرقانی، میرزا موحسین سەدولما، میرزا سولەیمان دهخدا، میرزا عیسا قائیمەقام، ئەمیر نیزام، عەبدولقاسم لاهوتی، مستەشار ئەلدەولە.

زۆربەی ئەو ئەندامانە خەریکی کاروباری کەلتور، ئەدەبیات، سیاسەت و زانســت بوون. بەشـێکیان لە تاران دەژیان و ئەوانی دیکەش لە شـارە گەورەکانی دیکەوە هاتبوون. کۆبوونەوەکەیان خاســـیەتی کۆنگرەیەکی نیشتمانیی بچووکی لەخۆگرتبوو، بۆ ئەوەی هێز و گوڕیان یەک بخەن.
جەمال خان کۆبوونەوەکەی بەم وتەیە کردەوە:
"دۆستینە، بەخێربێن!
مـایەی خۆشـــبەختیمە ئێوە لێرە دەبینم. بێگومـان ئەمەش خەڵاتێکی خودایيە، ئەمشـــەو هەموومان لێرە کۆبووینەتەوە. هەندێکتان یەک دوو ڕۆژە و هەندێکی دیکەشتان هەفتەیەک دەبێ بەڕێکەوتوون تا بگەنە ئێرە. دووبارە بەخێر بێن.
ئەوە باش بزانن، یەکە یەکەی ئێوە بۆ ئەم وڵاتە گرنگن. هەنـدێک جار دەترســـم لەوەی نەتوانین خەونەکەمـان بەدیبێنین، بەوەی تووشـــی کوێرەوەرییەکی هەمیشـــەیی بووین و لێی دەرنەچین، بەڵام بەنیگـا و دیوێکی دیکەدا هیوا لە لە دڵمدا قوڵپە دەدا.
دۆسـتان، لەو دواییانەدا سـەردانی بەشـی باشـووری وڵاتم کرد، تا بزانم ئاخۆ بریتانییەکان خەریکی چین. خۆی زۆریش ســـەخت بوو پێ بنێمە

سەر خاکەکەی خۆمان لەوێ، بەڵام وەها خۆم نواند وەک ئەوەی وەرگێڕی کارمەندەکانی خۆمانەی ئەوێ بم. لەوێ پەرجووی تەواو ڕوودەدا. بریتانییەکان دامودەزگای نوێیان دامەزراندووە، دەزگا، ماشێن و بزوێنەر، ئامێر و پۆمپا. ئەوان دیوارێکی درێژیان هەڵناوە و هەموو شتێک بەڕەوای خۆیان دەزانن، بەڵام خۆ ئەو دیوارە هەروا بەردەوام نامێنێ. زوو یان درەنگ پێویستە ئیمە لەگەڵ ئەوانەی تازە خوێندنیان تەواوکردووە و لەگەڵ کرێکارەکانمان هاوکاری بکەین. بەڵام جارێ ئێمە خۆمان کێشەی هەرە گەورەکەین. ئەوەی ئیمە پێویستمان پێی هەبێ قانونەکانن، کە لە یەک کتێبی قانوننامەدا جێگیربکرێن. دەسەڵاتەکانی پاشاش بە تەواوی سنووردار بکرێن.

ئێمە بۆ ئەو کارە ڕێگەیەکی درێژمان لەپێشە، بەڵام کاتێ من ئێستا ئێوە دەبینم، پاشەڕۆژیشم لێ دیارە.

دۆستینە، وەزیری کوژراو بەش بەشی دەستوری فرەنسی وەرگێراوە و وای لێکردووە بۆ وڵاتەکەشمان بگونجێ. توانیومە دەقی تەواوی دەستورەکە بەدەست بێنم، و چەند دانەیەکیشم لێ چاپکردووە. بە خۆشییەوە دەمەوێ وەک دیارییەکی زۆر بەهادار سەر و دانەیەکتان پێشکەش بکەم.

دەی با دەستوورەکە تاوتوێ بکەین و بەپێی پێویستیش کونج و کەلەبەرەکانی پڕبکەینەوە. ئەمە خەونێکە دەبێتە راستی.

دۆستان، سوپاسی ئامادەبونتان دەکەم."

میرزا ڕەزا لە ژوورەکە چووەدەر، ئینجا بە سندوقەدارێکی قورسەوە گەڕایەوە. سندوقەکەی کردەوە، سەروو دانەیەکی لە دەستوورە کاتییەکەی ئێرانی بەسەر ئامادەبووان دابەش کرد. هەمووان لە شوێنی خۆیان بە دڵخۆشی و هەلهەلەوە چەپڵەیان لێدا.

جەمال خان کتێبێکی بەلاوە نا، تا لەگەڵ خۆیدا بیباتە ماڵی ئایەتوڵڵا تەباتەبائی. ئە ئەو ئاخوندە بوو، وەک نوێنەری ئایەتوڵڵا شیرازی لەگەڵ دەستەی بازرگان و دوکاندارانی بازار و لەگەڵ پاشادا قسەی کردبوو.
دوای ئەم دیدارە ئەو بووبووە گرنگترین بیچمی سیاسی لە وڵات.
ئایەتوڵڵا بەساڵاچووەکەی شیرازیش، دوای سەرکەوتنی فتواکەی لەبارەی توتن، بەیەکجاری خۆی لە ژیانی گشتی دزییەوە و چووەوە خەڵوەتە تایبەتیەکەی خۆی. ویستی دوارۆژەکانی ژیانی بە ئارامی و بە نوێژ و دوعا بەسەر ببا.
ئیدی هەموو چاو کەوتبوونە سەر ئایەتوڵڵا تەباتەبائی. ئەویش باش لەگەڵ جەمال خان دەهاتەوە و لێی تێدەگەیشت و پێیگوتبوو دەتوانێ بۆ هەمیشە پشتی پێببەستێ. دوای کۆبوونەوەی دەستورەکە، جەمال خان بەخۆی و دەستوورەکە سەردانی ئایەتوڵڵا تەباتەبائی کرد.

کەسێک دانەیەکی لە دەستورەکە گەیاندبووە دەستی عەینولدەولە. ئەویش بە دانیشتن و پاڵدانەوە بەسەر سەریندا هەر لاپەڕەکانی هەڵدەدانەوە و لە تورەییشدا لەنێو خۆیدا دەکوڵی. ئەو کەسەی دانەی دەستورەکەی بۆ هێنابوو، ڕاپۆرتیشی لەسەر کۆبوونەوەی دەستەکەی جەمال خان دابووێ. لەوانەیە یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەکە شتەکەی لە دەم دەرچووبێ.
عەینولدەولە بۆ ڕۆژی پاشتر چووە نوسینگەی هەواڵگریی تا لەبارەی ئەو پێشهاتە لەگەڵ سەرۆکی دەزگای نهێنی قسە بکا: "بیست و پێنج دانە لەم کتێبە چاپ کراون."
عەیندولدەولەش پرسی: "ئەو کتێبانەیان لە کوێ چاپ کردوون؟"
"ئەوانە لە بۆمبایەوە چاپکراون و لە ڕێی هەراتیشەوە ئاودیوی وڵات کراون."

عەیندولدەولە هەستیکرد ئەم کارە کاری جەمال خان بێ. ئاخر زۆر جاران ناوی جەمال خان وەک عەقڵی پشت هەموو پشێوی و هەراوزەنای وڵات دەهات. لێ زۆر جاریش ناوی میرزا ڕەزای کوڕی ئایەتوڵڵا کرمانیشی دەبیست.

لە ڕاپۆرتەکەدا شتێکی تایبەت لەبارەی میرزا ڕەزاوە باس نەکرابوو، هەربۆیە عەینولدەولە هیچ ڕێکارێکی لە بەرانبەر ناوی ئەو نەگرتەبەر. هەروەها هەرگیز جەمال خانیشی نەبینیبوو، بەڵام بۆ ئەو وێنەیەکی ڕوونی لە مێشکیدا هەبوو. پیاوێک بە سمێڵێکی شۆڕبووەوە بە خۆی و چاکەتێک و کڵاوێکی ڕەشەوە لە خەیاڵدانی ئەودا بوو.

سەرۆکی سیخوڕان بە عەینولدەولەی گوت: "دانەیەک لەو قانوننامەیە لای قورئان لە سەر تاقی ئاگردانەکەی ژووری دانیشتنی ئایەتوڵڵا تەباتەبائی دانراوە."

عەینولدەولەش هێشتا هەر سەرقاڵی خواردنەوەی پیاڵە چایەکەی خۆی بوو.

سەرۆکی سیخوڕان درێژەی بە قسەکانی خۆیدا: "ئایەتوڵڵاش لەسەر هەر لاپەڕەیەکی کتێبەکە تێبینی خۆی نووسیون. ئەمەش دوا دانەیە، بەڵام ئێمە هێشتا هەواڵێکی پشتڕاستکراومان لەسەر قانوننامەکەی ئەوان پێنەگەیشتووە. هەمووان دانەیەکیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە ماڵ تا لە دەقەکەی بکۆڵنەوە و تێبینیی خۆیان لەبارەیەوە دەرببڕن. لێرەدا دانەکەی لای ئایەتوڵڵا بەڵگەیە. ئێمە دڵنیاین ئەوان جارێکی دیکەش کۆدەبنەوە، بەڵام دەقاودەق نازانین کەی."

عەینولدەولە پیاڵە چایەکەی خۆی دانایەوە. ئەم قانوننامەیە کێشەکەی لێ ئاڵۆزتر کرد لەوەی پاشا گومانی بۆ چووبوو. بۆ ئێوارەکەی کورتەنامەیەکی بۆ شا نووسی، تێیدا پێشنیازی کردبوو بەڵکو پاشا درێژە بە گەشتەکەی نەدا و لەبەر باری پێویست بە زوویی بگەڕێتەوە."

بەم جۆرە، دوای سێ مانگ، جارێکی دیکە کۆمیتەکە بۆ قسەکردن لەبارەی قانوننامەکە کۆبووەوە. سەرۆکی دەزگای هەواڵگری لە کۆبوونەوەکەی تاران ئاگادار بوو، بەڵام نەیتوانیبوو کات و شوێنەکە بزانێ.
عەینولدەولەش فشاری خستە سەر کابرای سەرۆکی دەزگا و گوتی:
"من ناتوانم هیچ لەم زانیارییانە بکەم، من زانیاریی دەقاودەقم دەوێ، بەرلەوەی پاشا بگەڕێتەوە، دەمەوێ هەموو ئەوانە بخەمە زیندان. دەمەوێ بە پاشای نیشان بدەم. دەی شتێک بدۆزەرەوە، شتێک بکە، ناونیشانێکم بدەرێ، خۆ ئەگەر ئێستا نەیانگرین، ئەوا گەورە دەبن و ناتوانین دژیان بوەستینەوە. دەی نیشانەی ڕێکوڕەوانم بدەرێ منیش هەموو دەروازەکان دادەخەم و هەموو ماڵەکان، یەک لەدوای یەک دەپشکنین تا دەیاندۆزمەوە و دەیانگرم. من ئەو جەمال خانەم دەوێ! دەی ڕۆژێکم پێ بڵێ، با زنجیریان لە مل بکەم و تا پاشا دێتەوە لە دیوار بیانبەستمەوە. ئەوسا بە قانوننامەکەی خۆیان لە سەروچاویان بدەم. ئەمە بۆ میرزا ڕەزاش هەر دروستە."

سەرۆکی سیخوڕان چەند چاوێکی خۆی ناردنە ئەو خان و ماڵ و شوێنانەی کە کەسانی لایدە و غەوارە کاتێک دەهاتنە شار، لێی دەمانەوە، بەڵکو لەوێ بیاندۆزنەوە و سایەیان بکەن. لەو هەموو زانیارییانەی بەدەستیان هێنابوو، ئەوە دەرکەوتبوو ئەندامانی کۆمیتەکە لەماوەی یەک دوو ڕۆژی دیکەدا کۆدەبنەوە. عەیندولدەولەش ڕاستەوخۆ هەموو دەروازەکانی تارانی داخستن و یەکەی سوارەشی ناردنە شوێنی حەوانەوەکانی دەرەوەی شار. فەرمانی پێدان هەرکەسێک کتێبێکی پێبێ یان پارچە کاغەزی لە جانتادا پێبێ یەکسەر کۆتوپێوەندی بکەن و

بیگرن. تەنانەت سوارەکان تا شاری قەزوینیش ڕۆیشتن. سەریان بە هەموو کاروانسەراکاندا کرد و هەر کەسێک گومانیان لێکردبا دەیانگرت. کەچی لە هیچ شوێنێک کتێبەکەیان نەدۆزیەوە، لێ ڕیزێک پیاوی بە زنجیربەستراویان بۆ ناو شار ڕاکێشان. عەینولدەولەش یەک بەیەک لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دەکردن و پاشان دەیخستنە کونجی زیندان.

عەینولدەولە دەینەڕاند: خۆ ئەگەر پیاوەکانی جەمال خان لە دەرەوەی شار نەبن، ئەوا هەر دەبێ لەنێو شاردا بن."

بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو سوارەکان بە سەر شوێنی حەوانەوەی مێوانەکانی شاریان دادا و لێنەگەڕان کەس لێیوە دەربچێتە دەر تا عەینولدەولە بەخۆی دێت و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکا. لێ دەرکەوت ئەو ڕێبوارانە هیچیان بەسەر هیچەوە نییە و هەریەکە و بۆ مەبەستێکی خۆی هاتۆتە تاران و دەڕواتەوە.

بۆ ڕۆژی سێیەم ئاماژەیەکی وەها بۆ عەینولدەولە هات، گوایە یەک دوو کەسی لایەدە لە حوجرەیەکی مەلایەتی لەپشت مزگەوتی گەورەی شارەوە بینراون. هەر خێرا عەینولدەولە بە یاوەریی دەستەی سواران خۆی گەیاندە ئەوێ و بەسەری دادان و بەهێز دەرگای حوجرەکەی کردەوە. لە یەکێ لە ژوورەکان پیاوێک پاڵی بە عەینولدەولەوە ناو خستی و بەسەریدا بازیدا و لە پەنجەرەکەوە بەرەو باخەکە تێیتەقاند. پیاوە ڕاکردووەکە جەمال خان بوو. ئەو بەرەو دەرگا هەڵات، بەڵام عەینولدەولەی بۆی ڕاستبووە و تەقەی لێکرد. جەمال خانیش سەرپەلۆ چوو و پاشان لەنێو داروتەڕاشدا ون بوو.

عەینولدەولە کە هێشتا نەیدەزانی پیاوە ڕاکردووەکە کێیە بانگی کرد: "بڕۆن بیگرن، ئەو بریندارە!"

یاساوڵە چەکدارەکانیش غاریاندایە ئەو شوێنەی جەمال خان لێی بەربووبووەوە و لە گوترە لە دەوروبەری خۆیاندا تەقەیان کرد. لەو

ساتەشدا لە تاریکیدا تەقە لە یاساوڵەکان کرایەوە. ئەوانیش ناچار خۆیان پەنادا و تەقەیان کردەوە. تەقەکەرە هێرشبەرەکەش میرزا ڕەزا بوو. ئەو لە ژوورێکی دیکەوە تەقەی لێکردن ئەوەندەش تەقەی کرد تـا هەموو ئەندامانی کۆمیتەکە بە پەنجەرە و بەسەر باندا هەڵاتن و دەربازیان بوو. عەینولدەولە خۆی گەیاندە ئەو هۆدەیەی تەقەکەی لێوە دەهات، بەســەر دەرکە کەوت و دەمـانچەکەی خـاڵی کرد. میرزا ڕەزاش ڕێـک لە کـاتی خۆیدا خۆی گەیاندبووە حەوشــەکە و لەپاڵ درەختەکاندا خۆی حەشــار دا. یاساوڵەکان ئەوەیان بینی میرزا ڕەزا لەکوێ خۆی شاردۆتەوە. وایان گومــان کرد گوللەی لەبەر برا بن. بۆ ئەوەی بیگرن غــاریــان دایێ. یەکێکیان بە قۆنداغە تفەنگ بەتوندی لێی دا و دوو کەسی دیکەش خۆیان هەڵدایەسەر و لەزەویان داو بەرزەفتیان کرد.

جەمال خان توانی ڕزگاری بێ، بەلام یاســــاوڵەکان چەند ئەندامێکی دەســـتەکەیان گرتبوو. عەینولدەولە میرزا ڕەزای زنجیر کرد و خســـتییە کونجی زیندانێ.

## ٥٣

# گەڕانەوە لە گەشت

پاشا دوای گەشتێکی شەش مانگە گەڕایەوە. وەک وەڵامێک بۆ نامەکەی عەینولدەولە، پاشـا تەتەرێکی پێش گەڕانەوەی ناردبووەوە تا نمایشـێک بکا، ئەویش هەندێک جاران ئێواران درەنگ بە گالیسـکەی شـاهانە بەناو شاردا بگەڕێ تا خەڵک وەها بزانن گوایە پاشا گەڕاوەتەوە.
گەشـتەکەی پاشـا زیاد لەوەی خۆی چاوەڕێی کردبوو کات و پارەی تێچوو. لەهەر وڵاتێک دیاریی گەورە و گرانبەهای بۆ خۆی، بۆ ژنەکانی و بۆ ئەندامانی ماڵباتەکەی کڕی. ئاخر ئەوە خووخدەیەکی ئێرانیانە بوو، کەسـێک بۆ گەشـت بچێ، دەبووایە بە دەسـت و دیاری بگەڕابایەوە. پاشـاش ڕێزی لەو دابە گرت. ئەو دیارییانەی پاشـا کڕیبوونی، جوان و سـەرنجڕاکێش بوون. ئەوانیش بەرهەمی نوێ، پارچە جل و کەلوپەلی ناوماڵ بوون، پێدەچوو هەرگیز لە بازاڕەکانی ئێراندا دەسـت نەکەون.

پاشـــا هەر شـــتێکی لە ڕێگا بەرچاو کەوتبا و دڵی گرتبا، دەیکڕی و بەلاوەی دەنا تا لە کاتی گەڕانەوەیدا لەگەڵ خۆی هێنابایەوە.
ئێستاش کۆتایی بە گەشتەکەی هاتووە، و لە دیوەکەی ڕوسیای دەریای قەزوێنەوە لە ڕێی دەریاوە دەگەیشـــتەوە وڵات، ســـێزدە گالیســـکەی گەورەی پڕ لە کەلوپەل، کاروانیان لەدوای ئەو بەســـتبوو. ٣٦٧ هەگبە و ســـاکی گەورەی پڕ لە کەلوپەل و ٣٢ دەرزەنی گەورەی پێڵاو، کڵاو، چـاکەت، کتێـب، فەخفوری، ئـامێ و بووکەڵە و گەمە، بـازن، وێنەکـانی لەگەڵ مەزنـانی وڵاتە خـانەخوێکـان. چوارچێوەی وێنە و چـاویلکە، کـاتژمێر، دووربین، گڵۆپ، جگەرە و قەنـدەشـــەکر، زێڕ، ئەڵقە و ئەنگوسـتیلە، ئەو مێدالیانەی لە لایەن سـەرۆکی وڵاتە خانەخوێکان وەک دیاری پێی درابوون. چادان و جزوی قاوە، دەنکی قاوە، کرێم و مەڵهەم بۆ ژنان، ئاوێنە و دەیان شتی جوان و نایاب و ردەواڵەی دیکە.
کاتێکیش کاروانەکەی بە بەردەم لادێ ڕوسـییەکاندا تێدەپەڕی، خەڵک بە دوایدا ڕایـاندەکرد و داوای پـارەیـان لێدەکرد. بۆ ئەوەی کەلوپەلەکـانی سەلامەت دەربچن، دراوی ڕوسی بۆ هەڵدەدان. ئەو خەڵکەش نەیاندەزانی ئاخۆ باری ئەو هەموو گالیسـکانە چییە، هەروەها خەیاڵیشـیان بۆ ئەوە نەدەچوو پاشـا لە یەکێک لە گالیســکەکان دانیشـتبێ، دەنا هەر بەو برە دراوە کەمە وازیان لێنەدەهێنا.
گومرگی ڕوســـی مشـــوری ئەوەی خواردبوو شـــا زووتر بە بەلەمێکی هێزی دەریاوانی خۆیان بۆ نیشـــتمانەکەی خۆی بگەڕێتەوە. بەدوایدا کەلوپەلەکـانی بۆ ڕەوانە بکەن. کـاتێکیش پـاشـــا بینی چـاوچنۆکە بەدرەفـتـارەکـان بە دوای کەلـوپەلەکـانـی غـاردەدەن، ویســـتـی شتومەکەکانیشی لەگەڵ خۆیدا بەهەمان بەلەم ببا.
ئەوەش ڕوون نەبوو ئـاخۆ بۆچی کـارمەنـدانی گومرگە خۆجێیەکە نەیـانـدەویســـت هـاوکـار بن. ئەوان هەر بە دەق و ڕێنمـایی دیکەوە

دەهاتنەوە لای پاشـــا بەوەی ڕێگە نادرێ کەلوپەلەکان بە هەمان بەلەم بگوازرێنەوە، بۆیە دەبێ بە شێوەیەکی دیکە باربکرێن و بگوازرێنەوە.
پاشـــا بە ڕێنوێنەکەی خۆی گوت: "ئێمە متمانە بە ئەوانە ناکەین. من لە چاوی ئەوان مەبەستێکی بەدفەڕانە دەبینم. نابێ ئێمە کەلوپەلەکانمان بەم جۆرە بێ مشوور لە دواوە بەجێبێڵین.
ڕێنوێنەکەش وەڵامی دایەوە: "کەلوپەلەکان بێ مشوورخۆر نین، گومرگی ڕوسی چاودێرییان دەکا و لێناگەڕێ دەستکاری بکرێن."
"ئاخر ڕوســەکان زیاتر لە نیوەی ئازربایجانە خۆشــەویســتەکەمانیان لە باوکمان ســـتاند و هەرگیزیش نەیاندایەوە. خۆ ئەگەر بزانن چی لەناو ئەو هەگبە و ســـاکانەدا هەیە، ئەوا هەمووی لە دەســـت دەدەین، ئێمە هەرگیز لە شـتەکانمان دوور ناکەوینەوە، ئێمە لە ڕوسـیا ناڕۆین مەگەر کەلوپەلەکانمان لەگەڵ خۆماندا نەبەین."
سەرۆکی گومرگیش نەیدەسەلماند، ویستی سەرەتا لەگەڵ بەرپرسەکەی خۆی لە باکو ڕاوێژ بکا. بە نابەدڵی پاشـــا بۆ شـــەوەکەی لە یەکێ لە مێوانخانەکان مایەوە. لەو شـــەوەشـــدا شـــتێک قەوما، بۆ پاشـــا لە داگیرکردنی ڕوســـیا بۆ ئازربایجان پۆلکتر بوو. بۆ بەیانییەکەی هەرگیز ئەوە بۆ پاشـا ڕوون نەبووە و ئاخۆ چۆن و کێ بەســەر گالیسکەکانیان دادا و تالانیان کردبوون.

مەیدان و کایەی گومرگەکە لەســەر دەریای قەزوین خۆی لە بەندەرێکدا دەبینییەوە کە بازرگانانی وڵاتەکانی دووروبەر بەکاریان دەهێنا. ئەوان کاڵاکانی خۆیان بە بەلەمی کەچەکە[٩٧] دەگەیاندنە بازارەکانیان. بۆیە هیچ پێویستیەکی وەها لە ئارادنە بوو تا کەلوپەکان بپارێزرێن.

---

[٩٧] کەچەکە: شەقوشر.

پۆلیسی ڕوسی لە ماوەی گەشتەکەی پاشادا، ئاسایشەکەیان دەپاراست و پاسەوانییان دەکرد، بەڵام ئەگەرێکی زۆر هەبوو پۆلیسی خۆجێی بەشێکی گەورەی کەلوپەلەکانیان بردبێ، وردیلەکانیشیان بۆ خەڵکی ئاسایی بەجێهێشتبێ تا تالانی بکەن. لەوە شەوەدا تەقەش کرا، لێ لەبەر با و دەنگی شەپۆلەکانی دەریا پاشا هەستی بە هیچ نەکردبوو.

بۆ ڕۆژی پاشتر کەس نەیدەوێرا هەواڵە کارەساتبارەکە بە پاشا ڕابگەیەنێ. کاتێکیش لە خەو بێدار نەکرایەوە و ناشتای بۆ نەهات. هەر خۆی بۆ هەواڵوباس مەلیچکی ناردە دەرەوە:
"برۆ بزانە ئەوانە لە کوێن؟"
مەلیچک، ئەوی لە میانەی گەشتەکە خەپەتر بووبوو، بە زەحمەتیەوە ڕێیدەکرد و چووە دەرەوەی شوێنی حەوانەوەکە و بە هەناسەبڕکێ گەڕایەوە: "هیچ کەسێک لێرە نەماوە. هەگبە و ساکەکانیش نەماون."
لەسەرەتاوە پاشا هیچی لێ تێنەگەیشت، لێ کاتێ لەسەر پێخەفەکەی هەڵسا، هاواری کرد: "ئەوە چیت گوت؟"
مەلیچک قسەکەی دووبارە کردەوە: "هەمووان ڕۆیشتوون. هەگبە و ساکەکانیش نەماون."
لە شوێنی حەوانەوەکە هیچ کەس نەدەبینرا، بەڵام بەندەرەکە جەنجاڵ بوو. ئەو گالیسکانەی دوێنێ ئێوارە بە باری تەواوەوە لەبەردەم گومرگەکەوە ڕاگیرابوون، ئێستا بەتاڵن و تێکیشکێنراون. هەگبەی دڕاو و دیاری شکاو لەو گۆڕە کەوتبوون و هەندێکیشیان بووبونە سوتماک.
پاشا بە شپرزەییەوە بانگی ڕاوێژکارەکانی کرد، بەڵام کەس بەپیر دەنگییەوە نەهات. ئینجا بانگی نۆکەرە تایبەتییەکەی خۆی کرد: "مەشەدی! مەشەدی!

ئەویش سەروسەکوتی[٩٨] وەدەرنەکەوت. وەک ئەوەی شتێکی لە قورگ گیر بووبێ، بانگی کرد: "مەلیچک."
مەلیچکیش بە هەڵەداوان هاتەوە لای پاشا و بە گریانەوە دەستی گرت.

پاشا دەبووایە شەوێکی دیکەش لەو شوێنە بمێنێتەوە تا بۆ بەیانییەکەی قسە لەگەڵ سەرۆکی پۆلیسی گومرگەکە بکا. کابراش بەیانییەکی زوو وەدەرکەوت. لە ناخەوە داوای لێبووردنی کرد و بەڵێنی دا ڕوسیا قەرەبووی پێویستیی شتەکان بکاتەوە و پارەکەی بۆ بژمێرێتەوە. پاشا نامەیەکی بۆ قڕاڵ نووسی و سکاڵای دۆخە ئازاربەخشەکەی لێکرد، کە لەسەر وڵاتەکەی ئەو پێیگەیشتووە و بەم تێبینییە کۆتایی بە نامەکەی هێنا: "تاقمێک لە چەتە و دز سێبەری ناشیرینی خۆیان خستە سەر یادەورییە شیرینەکانی قڕاڵی خاوەن پایە و خانەوادە خۆشەویستەکەی."

لەگەڵ ڕۆیشتنی پاشا لەوێ حەوت تۆپ تەقێنران. دەستەیەکیش لە پۆلیسەکان ئیکلامیان بۆ پاشا کێشا و تا سەر بەلەمەکە یاوەرییان کرد. سەرۆکی گومرگی ڕوسیش گوتی: "ئێمە لێکۆڵینەوەیەکی ورد دەکەین و هەمووی ساغ دەکەینەوە و خاوەنشکۆ ئاگادار دەکەینەوە. هەگبە و ساکەکانی بۆ دەگەڕێتەوە." ئینجا پاشا بە نامرادی و خەمبار و بە دەستی بەتاڵەوە بە خۆی و مەلیچک سواری بەلەمێکی ڕوسی بوون.
گەشتەکەی پاشا لە دەریای قەزوینەوە بۆ تاران مایەی خەم و ژان بوو. لە بەشێکی زۆری ماوەی گەڕانەوەی نەخۆش کەوت. لە تارانیش یەکسەر لەناو جێگەدا کەوت. بە سەرۆکی نۆکەرانی گوت، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ نایەوێ هیچ کەسێک ببینێ.

---

[٩٨] سەروسەکوت: سەروبیچم.

پاشــا تای هاتنێ و گەرووشــی زۆر ئازاری دەدا. ئەو ڕووداوەی ســەر بەندەرە ڕوسیەکە، خراپی بەسەر هێنا، بەڵام گەشتە سەرنجڕاکیشەکەی زۆر لە گوڕوتینی بردبوو، شەکەتی کردبوو.
هەمیشـە ئەو کۆشکەی خۆی بە بەهەشتێکی سـەر زەوی دەچوواند، لێ ئێســتا، کە ئەو هەموو کۆشــکانەی لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بینین، ئیدی زانی ســـەرۆکی وڵاتەکان چۆن دەژین، کۆشـــکەکەی خۆی لە چاو هی ئەوان وەک هی سەدەکانی ناوەڕاست هاتە پێشچاو.
تەنانەت زاتی ئەوەشی نەمابوو خۆی نیشانی ژنانی حەرەمسەراکەی بدا، بەردەوام دەبووایە زەنگ بۆ ســـەرۆکی نۆکەرانی لێبدا تا ئاگاداری بکاتەوە، کە نایەوێ هەمان پاسـەوان و سـواڵکەر و بازاڕ و خەسـاوەکان ببینێ.
لە هۆڵی مینابەندەکە و لە ژووری نوســـتنیشـــی هەر هەمان شـــتە کۆنباوەکانی دەبینینەوە. دۆلاب، کورســـی، مێز، ئاوێنە پەیژە، پێڵاو و کڵاوەکان هەر هەمووشیان پەڕپووت بوو دیاربوون. ئیدی لێفەی بەسەر دەموچاودا دەدا و پێی باشـــتر بوو بخەوێ و هەرگیز بێدارنەبێتەوە تا ئەو ژیانە پاشکەوتووە چیدی بەرۆکی پێ نەگرێتەوە.

بۆ ڕۆژی چوارەم، تاج ســـوڵتان کوڕەکەی خۆی لەباوەش کرد و هاتە کۆشـک تا بەخێرهاتنەوەی پاشـا بکا. ئەمەش تاکە ڕێگە بوو، پاشـا بێدار بکرێتەوە و بگەڕێندرێتەوە ســـەر ژیانی ئاســـاییانەی خۆی. لە کۆتاییدا پاشا ملی دا بیبینێ.
"ئای باوکە، چۆن لاواز بووی؟"
پاشـاش کچەکەی خۆی ماچ کرد و بە تاسـەوە سـەیری منداڵەکەی کرد، لەبن پەتۆ شیرڕەنگییەکەدا خەوی لێکەوتبوو.
پاشا بە نەرمییەکەوە گوتی: "گەورە بووە و گۆڕاوە."

"مەبەستت چییە؟ خۆم هیچ شتێکی وەهای لێ نابینم."
پاشا بە دەستی پەتۆکەی لەسەر سەری نەوەکەی لادا.
"باوکە بۆچی بێزار دیاری؟"
پاشا هەر یەکسەر باسی بەتالانبردنی کەلوپەلەکانی لای گومرگی ڕوسی بۆ کرد: "جلی زۆر جوانمان بۆ هێنابوون. کتێب و دەرزەنێک گەمەی منداڵانیشمان کڕیبوو، لێ ڕوسەکان هەموویان دزی.
هەستێکی وام هەیە بۆیە تالانیان کردین، چونکە ڕێگەم نەدا هەگبە و ساکەکانمان لەوێ جێبێڵێن تا دواتر بۆمان بنێرنەوە. ملوانکەیەکی زێڕ میدالیایەکمان بۆ منداڵەکە لە پاریس کڕیبوو. بۆ خۆشبەختی ئەو دوو یادگارییەم خستبووە نێو ئەو باولەی کە ڕۆژژمێرەکەم تێدا هەڵدەگرت. دیارە خوا نەیویستووە بە دەستی بەتاڵ بۆ لای تۆ و منداڵەکەت بگەڕێمەوە. تەماشاکە، فەرموو ئەوەتان."
بە دەم ئەم قسەیە ملوانکە زێڕینە نازدارەکەی دەرهێنا و لە ملی کچەکەی کرد.
تاج سوڵتانیش گوتی: "باوکە، زۆر جوانە، زۆر نازەنینە." ئینجا دەستی باوکی گرت و ماچی کرد.
"میدالیاکەش بۆ جێنشینەکەمانە، باش بۆی هەڵبگرە، بۆ ڕۆژانی دادێ، تا ببێتە یادەوەریی گەشتەکەمان بۆی."
لەوکاتەدا منداڵەکە چاوەکانی کردنەوە و لە پاشا نزبووەوە.[99] تاج سوڵتان بەرزی کردەوە و لە باوەشی باوکی دانا. پاشاش لە خۆشبەختیان شاگەشکە بوو: "ماشەڵڵا، ماشەڵڵا، تادێ هەر بە ئێمە دەچێ." منداڵەکەی ماچ کرد و بەرزی کردەوە. کاتێکیش زیاتر بەرزی کردەوە.
تاج بەپێکەنین بەڵام بە ترسەوە گوتی: "باوکە، وا مەکە. ئاگادار بە."

[99] لێ نزبوونەوە: لێڕامان، بە سەیری تەماشاکردن.

"مەترسە، ئاگامان لێیە، بێگومان ئاگامان لێیە." ئەمەی گوت و منداڵەکەی ئەوەندە بەرزکردەوە تا لە ترسا گریا.
"باوکە، بیدەوە من، دەی پێم بڵێ گەشتەکەت چۆن بوو؟"
"گەشتێک بوو لەڕادەبەر پڕ ئەزموون بوو، نازانین چۆن دەستی پێ بکەین، لەکوێوە بیگێڕینەوە. لە هەموو لایەکەوە وەک پاشایەکی ڕاستەقینە پێشوازیمان لێدەکرا. سەرۆک و مەزنی وڵاتانی ڕۆژئاوا هەمیشە وەها بیردەکەنەوە کە ئێمە لە ڕۆژگاری شکۆمەندیی دێرینی ئێرانیدا دەژین. پێمان سەیربوو، جیهان ئەوەندە زۆر لەبارەی ڕابردووی ئێمەوە بزانێ. ئێمە گەشتنامەمان نووسیوەتەوە، هێشتا وردەکاریی زۆرتریشی دەخەینەسەر. پاشان دەیخەینە بەردەستی ئێوە. تەنیا دوای مردنم، دەکرێ ناوەڕۆکی گەشتنامەکە ئاشکرا بکەی."
هەندێک شت هەیە تەنیا دەکرێ بۆ تۆی باس بکەین. ئەوانە شتی خۆش و پێکەنیناوین. هەر جارێک بیریان لێبکەینەوە، دەبێ سەرلەنوێ پێبکەنینەوە.
لە مۆسکۆ بانگهێشتی سەر خوانی شیوانی قراڵ کراین، شان بەشانی ئەو بەسەر سەکۆیەکە کەوتین. من لە دەستەڕاستی دەڕۆیشتم و شمشێرەکەشم بەکەلەکەمەوە بوو. هەستم کرد شتێک لە دەستم کەوتە سەر زەوی، ئەوەش پارچەیەکی شمشێرەکەم بوو، بەڵام زوو نەمزانی ئاخۆ چییە. لەپڕ نیگام پەڕییە سەر گەوهەرێکی کەسک لەسەر مافورەکە، تومەز یاقوتەکەی دەسکی شمشێرەکەم بوو. باشە دەبووایە چی بکەم؟ نووشتامەوە تا هەڵیبگرمەوە. قراڵ سەیرێکی کردم، لێ تێنەگەیشت ئاخۆ من چیدەکەم."
پاشا مرواریيە کەسکەکەی لە بەرکی چاکەتەکەی دەرهێنا، دایە تاج سوڵتان و بە خەندەوە گوتی: "ڕوسەکان پێیان نەکرا ئەمەم لێ بستێنن."
"باوکە، نابێ لەو تاڵانکردنە بێدەنگ بێت."

"دەزانم، بەڵام ئەوانە دیارییەکان بوون، دیاری بۆ تۆ و بۆ ژنەکانی ئێمە بوون. خۆ خەڵک چاوەڕێی شتێک لە ئێمە دەکەن."
"بەڵێ، ئەوە دەزانم، بەڵام خۆ دەبێ لێشی تێبگەین. من زۆر مەراقم ئاخۆ لە گەشتەکەتدا چیت بینیوە، دەی هەموویم بۆ بگێڕەوە."
دیسان پاشا پێکەنیەوە: "ئەمەشیان هەر تەنیا بۆ تۆی باس دەکەین. بە شێوەیەکی ئاسایی، دوولینگەکەم[100] لەمیشە لەنێوەڕاستی توند دەکرا، بەڵام لە شانۆنامەیەکی هەنگاریدا هەر لێم دەهاتەخوار. شەوێکیان بۆ کۆنسێرتێک بانگهێشت کرابووین. کاتێکیش ژنی پاشای هەنگاری پیلی ئێمەی توند گرت تا بمانگەیەنێتەوە شوێنی حەوانەوەمان، دوولینگەکەم دیسان لێهاتەخوار. ئێمەش هەوڵماندەدا بە ئانیشکمان توند بیگرینەوە و نەکەوێتە خوار، بەڵام پێم نەکرا. هەر بۆیە دەبێ ئەوە بێنیتە بەرچاو کە بۆچی بەڕێگاوە چەند کیلۆیەکمان لێ کەم بۆتەوە." گەشتێکی وا دووردرێژ، بێ پشوودان و بەو هەموو ورووژانە چۆن بووە.
تاج سوڵتان دەستی خستە سەر دەمی بەڵکو پێکەنینەکەی بشارێتەوە.
"باوکە، دەکرێ بیهێنمە بەرچاوی خۆم، کەچی هێشتا هەر گەش و دیاری."
"لە بەرلین چووینە باخچەی ئاژەڵان. لەوێدا شێر و پڵنگ و مار و فیلیان هەبوون. زۆرمان پێ سەیر بوو. مەلیچک زۆری پێ کەیفخۆش بوو، نەیدەویست لەوێ بڕوا. پێشتر، کاتێ هێشتا گەنج بووین، لە جەنگەڵ تووشی شێر و پڵنگ دەهاتین، بەڵام خۆ هەنووکە لە هیچ کوێیەک نابینرێن. بیرمان لێکردۆتەوە، ئێمەش لە تاران باخچەیەکی ئاژەڵان دروست بکەین. دەکرێ یەکێک بۆ کوڕەکەت دروست بکەین. بۆ ئەو زۆر باش دەبێ لە نزیکەوە ئاژەڵەکان ببینێ. لەوانەیە هێشتا شێر و مار و

---

[100] دوولینگە: شلوار، پانتۆل.

پڵنگ لە وڵاتەکەمان بدۆزینەوە. دەکرێ مەیمون و فیلیش لە هیندستانەوە بهێنین."

"باوکە، ئەرێ پێم ناڵێی پاریس چۆن بوو، ئایا بە فرەنسـی لەگەڵ خەڵکی سەر جادە ئاخاوتی؟"

"بە دڵنیاییەوە، بەڵام کیژم، خۆ خەڵکی سـەر جادە بە شـێوەیەکی دیکە لەوەی ئێمە قسـە دەکەن. بە گوێرەی مەزندەمان، ئێمە لە پاریسـییەکان باشـتر فرەنسـی قسـە دەکەین. ئەوان بە دروسـتی دەدوێن، بەڵام جۆرە فرەنسـییەکی تێکشـکاوە. ئێمە هەمووشـتمان نووسـیوەتەوە، شـتی زۆر سـەرنجڕاکێشـمان لە پاریس بینی. ڕووباری سێن وەک مار بەنێو شـاردا دەکشێ و لە هەردوو دیوی ڕۆخەکەی ڕێگەیان لێداوە. شەوێکیان لەوێ پیاسـەمان دەکرد، ڕووبار و ڕێگاکە و پردەکان بە شـێوەیەکی ناوازە بە گڵۆپی کـارەبـایی ڕوونـاک کرابوونەوە. هەروەک ئەوە وابوو بەنێو حەکایەتێکی ئەفسـووناویدا ڕێبکەین. مرواریی‌یەکانی چاکەتەکەم و ئەڵقە و ئەنگوسـتیلەی دەسـتم بە شـێوەیەکی جـادوویی دەبریقـانەوە، سێبەرەکەشمان شکۆدارانە بەدوامانـدا دەهات

کاتێکیش تاج سـوڵتان ڕۆیشـتەوە ماڵی خۆی، پاشـا بانگی مسـتەوفی ئەلمەمالیکی سەرووەزیری کرد، ئەویش دەستبەجێ گەیشت.

وەزیر بە تاسەوە پرسی: "ئەرێ پاشا گەشتەکەی پێ چۆن بوو؟"

پاشاش سوپاسی نەخشە نایابەکەی کرد کە بۆ گەشتەکەی دایڕشتبوو.

"لە میانەی گەشـتەکەمانـدا جار لەسـەر جار تێبینی ئەوەمان کرد، وەزیرەکەمان لە پێناو ئێمەدا ئەرکی زۆر کێشـاوە و ماندوو بووە. ئێمە یـادگـارێکی نـایـابمـان بۆ هێنـا، لێ بەداخەوە لە بەنـدەرە ڕوسـییەکە لەدەسـتمان دا. ئەنجامی گەشـتە درێژەکەمان لەناو جانتاکەماندا بوو، ئێستاش جانتا و ساکەکان ڕۆیشتوون، وەک ئەوە وایە گەشتەکە لەپێناو هیچ بووبێ."

"بەداخەوە بۆ ئەو ڕووداوە نەخوازراوە، بەڵام خۆ گەشتەکە واتای زۆر قووڵتری لە دیارییەکان هەبوو."

"هەر بەڕاستیش سەردانی زۆر کارخانە و پرۆژەی تەلارسازی و مۆزە و پێشانگای کشتوکاڵیمان کرد. ئێستا ئێمە نەهاتووینەتە سەر خۆ، هەست ناکەم باش بم، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا لە گەڵ دەستەی حکومەت قسە لەسەر ئەوەی لەوێ بینیم دەکەم."

وەزیر خوازیاربوو هەموو شتێکی لەسەر گەشتەکەی بزانێ، بەڵام پاشا هەر بەوەندە براندیەوە کە سەردانی کارخانەکانی کردووە و قسەی لەگەڵ بەڵێندەر و بازرگانە گەورەکاندا کردووە: "لە ئاڵمان سەردانی کروپەKrupp، ئەو کارخانەیەی ئاسن و چەکی لێ بەرهەم دەهێنرێ کرد. کارگەکە زۆر کاری تێکردم. بەڕێوەبەری کارگەکە تۆپی تازەدروستکراوی نیشاندام. ئێمە باوەڕمان بە چاوی خۆمان نەدەکرد! من درێژیی لوولەی تۆپێکم بە پێیەکانم پێوانەکرد، تۆپەکە بیستویەک پێ بوو. نەوجەوانێکی چواردەساڵی بە ئاسانی دەیتوانی بە سکەخشکێ بەنێو لوولەکەیدا بڕوا. ئێمە ڕیزێک لەو تۆپانە و ژمارەیەک لە تفەنگمان بەڕادان دان. لە ڕوسیا، لە هەنگاریا، لە ئەمستردام، لە بەلژیک و فەرەنگستانیشدا چاومان بە کارخانەی دروستکردی پێڵاو، فەخفوری و توتن و کاتژمێر و ڕستنوچنین کەوت و زۆر گرێبەستمان لەگەڵدا واژۆکردن و بەهۆیەوە نوێنەرکانیان بێنە تاران و تا زیاتر لەو بارەیەوە لەگەڵ ئێمە بدوێن."

وەزیر پێیوابوو جارێ کاتی ئەوە نییە ڕەخنە لە گرێبەستەکان بگرێ، ئاخر تێبینیی ئەوەی کرد، پاشا پێویستە زۆر وریا بێ: "هەست بە خۆشبەختی دەکەم کە پاشا لە گەشتەکەیدا شتی سەرنجڕاکێشی بینوە و بە دڵی بووە، بەڵام بۆ وڵات وەها باشترە لە کابینەی حکومەت بە شێوەیەکی گردەبڕانە چاو لەو گرێبەستانە بکا و تاوتوێیان بکا."

"زۆر باشە، ئێمەش نەخشەی نوێمان هەیە، دواتر باسیان لێوە دەکەین."
ئینجا پاشا هەڵستا، هێشتا شتێک هەبوو پاشا نەیدەویست وەزیر پێی بزانێ. وەزیر تا لای دەرکە بەدوای پاشادا ڕۆیشت.
"لە بەرلین شتێکمان بینی، بەدڵمان نەبوو. ویستمان سەرنجەکەمان بە بەرپرسەکان بڵێین، بەڵام وەهاشمان نەکرد."
"خاوەنشکۆ، چی بوو؟"
"لە بەرلین نهۆمی مێوانخانەیەک بۆ ئێمە ڕێکخرابوو. شوێنەکە زۆر باش بوو، ئێمە لێی ڕازی بووین. لێ بە درەنگانی شەو کاتێ ویستمان پشوو بدەین و پاڵ بکەوین، گوێمان لە دەنگەدەنگی تاقمە پیاوێکی بەرەڵا بوو. گومانمان بۆ ئەوە چوو ئەوان زانیبێتیان ئێمە شەو لەوێ بەسەردەبەین. ئەوان وەک کەر دەیانزەڕاند، وەک مانگا دەیانبۆڕاند و وەک سەگیش دەیانحەپاند. ویستمان پەنجەرەکەمان بکەینەوە، بانگیان بکەین و بێدەنگیان بکەین، لێ وەهامان نەکرد. سەرمان خستە بن سەرین و لێفە تا گوێمان لە هەراوزەناکەیان نەبێ. پۆلیسیش نەهات چارەیان بکا."
"دەترسم پیاوەکان بەدمەست بووبن. خەڵک لە بەرلین زۆر دەخواتەوە. پۆلیس لە وڵاتە خۆرئاواییەکاندا لەچاو وڵاتی ئێمەدا دەسەڵاتیان کەمترە. خاوەنشکۆ ڕەفتارێکی باشی نواندووە. گەشتی وەها لایەنی نەرێنیشی تێدەکەوێ. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە، پاشامان بە تەندروستیی باش گەڕاوەتەوە، ئیدی شانشینەکەمان دەکرێ سوود لە ئەزموونەکەی ئەوێ وەربگرێ."
کاتێکیش وەزیر لەوێ ڕۆیشت، پاشا گەڕایەوە ژووری کاری خۆی، دەرکەی لەسەر خۆی داخست و سەری بەسەر ڕۆژژمێرەکەدا گرت. تا درەنگانێکی شەو هەر لەوێ مایەوە و دەستیشی بۆ نانی شێوان نەبرد. پاشا دەینووسی، لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، دەیخوێندەوە جارێکی دیکە بەسەریدا دەچووەوە و دەیخوێندەوە.

"ئەمرۆ ئێمە لە گۆڕەپانی کرملین قەدەممان لێدا، هەر بەڕاستی کۆشکێکی گەورەی دەروازە پتەوە. لەوێ جۆرە پرتەقالێکمان خوارد ناوەکەی سوور بوو، شتێکی بەتام بوو.
ژنەکەی قڕاڵ پیلی ئێمەی گرت، قڕاڵیش قۆڵی ژنێکی گەنجی توند گرتبوو، ناوەکەیم نایەتەوە بیر. ئێمە پێمان نایە ژوورێکی گەورەوە، لەو قاوشە گەورەیەدا سەما دەکرا و ناوبەناویش ئاهەنگی دەمامکداری تێدا دەکرا. شتێکی وەها لەوانەیە بە دڵی ژنەکانی ئێمەش بێ.
لەکاتی نانی شێواندا ژنەکەی قڕاڵ لە تەنیشت منەوە دانیشت، هەرچی ژنە جوانەکەش بوو لە بەرانبەرمان جێی گرتبوو. ژنێکی کەژەمان بینی، ئێمە حەزمان لێبوو لەگەڵ ژنەکە بدوێین، بەڵام ژنەکەی قڕاڵ هەموو شەوەکە هەر دەیچرپاندە بن گوێم و بواری پێنەدام، دەمی بۆگەن کردبوو. خوا لەپای ئەوە هەر سزامان دەدا."
پاشا بە خەندەوە ئەو نووسینەی خۆی دەخوێندەوە. بیری کەوتەوە لە پاریس دیمەنێکی زۆر جوانی بینیبوو، بەڵام بیری چووبوو تۆماری بکا، ئیدی ئێستا ئەویشی بۆ زیاد کرد: "لە پاریس لە ئاوێنەی گالیسکەکەماندا ژنێکی نازدارمان بینی. وەک ئەوە وابوو وێنەکە لە چوارچێوەیەکدا گیرابێ، ئاخر هیچ ژنێک بەقەد ئەو جوان نەبوو. گالیسکەکەش درێژەی بە ڕێڕۆیشتنەکەی خۆی دا، ژنەش لە ئاوێنەکەوە ون بوو. ئێمە ئامادەبووین ئەو شۆخە لەبەر زێڕ هەڵبکێشین و بیکڕین، بەڵام خۆ پاشاش سنووری خۆی هەیە."
درەنگانێکی شەو بوو، جاران لەو کاتانەدا لەسەر پێخەفەکەی کشابوو کتێبی دەخوێندەوە، بەڵام خۆ نەیدەتوانی دەست لە نووسینەکەی هەڵگرێ. پەڕەکانی گەشتنامەکەی هەڵدایەوە، گەیشتە سەر ئەو بەندەی لەبارەی سەردانەکەی بۆ هۆڵەندای نووسیبوو. کاتێک خوێندیەوە خەریکبوو دڵی لە شەوقی غەریبیکردن هەڵدەفڕێ، لەوێدا وەهای

[illegible]ندەوە: "کاتێ ئێمە بە قیتار گەیشتینە وێستگەی ئەمستردام، سەرۆکی
[illegible] ارەوانی و یەک دوو ژەنەڕاڵ و سەرۆکی پۆلیسی شارەکە لە
پێشوازییدا وەستابوون. کاتێکیش لە قیتارەکە دابەزین، موزیکژەنەکانیش
[illegible] موزیک دەژەند گوێیان کەڕ دەکرد، هەر یەکسەر ئەو هەستەمان
[illegible] هات، ئێمە لەو وڵاتە بە گەرمییەوە بەخێرهێنراوین.
ئەمستردام شارێکی جوانە، شەقامەکانی پاک و خاوێنن، خانووەکانی
[illegible] کورتوی کێک وان و پاڵیان بەیەکدا داوە، شتێکی وەهات بە مێشکدا
[illegible] شارەکە لە لایەن منداڵانەوە دروستکرابێ. پاشای هۆڵەندا نەخۆشە،
[illegible] کەیەکی هەیە، کاتێ مرد جێگەی ئەو لەسەر تەخت دەگرێتەوە. خۆ
[illegible] ئەو نیشە لای ئێمەش ڕێی تێچووبایە، ئێمەش تاج سوڵتانمان
[illegible] جێنشین دەناساند.
[illegible] وێستگەی قیتار بە گالیسکە بەنێو شاردا ڕۆیشتین، خەڵکێکی
[illegible] لەسەر شەقام وەستابوون تا کەژاوەی ئێمە ببینن. ئێمە زۆر
[illegible] جوانمان بینین، پێموایە ئەم وڵاتە هیچ ژنێکی ناشیرینی لێ نییە.
[illegible]کەی پێشتر هەرگیز ئێرانیان نەبینیبوو، چ جای پاشای ئێران.
[illegible] دەستیان بۆ ئێمە ڕادەوەشاند و هەندێک لە ژنانیش بە دەستیان
[illegible] بۆ دەهاوێشتین. هەرچەندە شتەکە هەندێک هەراسانیش بوو،
بەڵام خۆشیمان لێی هات.
[illegible]ەویش لە مێوانخانەیەکی زۆر نایابی سەر کەناڵێکی ئاو ماینەوە،
[illegible] هاوێنوبژوون بوو، بۆ خەوتنیشمان زۆر ئاسوودە بوو. ئەوان
[illegible] شارستانن، ئەو هۆڵەندییانە هیچ کامێکیان بە شەو وەک کەر
[illegible]ری.
[illegible] دوو هەفتە لەو وڵاتە ماینەوە، زۆر شتمان بینی، سەردانی زۆر
[illegible] خانەمان کرد و لەگەڵ زۆر لە خاوەن کار و بازرگانان قسەمان کرد،
[illegible] وەک دوکاندارانی بازاڕی وڵاتەکەمان ڕووقایم و زبر نین.

"ئەمڕۆ ئێمە لە کۆڕەپانی کرملین قەدەممان لێدا، هەر بەڕاستی کۆشکێکی گەورەی دەروازە پتەوە. لەوێ جۆرە پرتەقاڵێکمان خوارد ناوەکەی سوور بوو، شتێکی بەتام بوو.
ژنەکەی قراڵ پیلی ئێمەی گرت، قراڵیش قۆڵی ژنێکی گەنجی توند گرتبوو، ناوەکەیم نایەتەوە بیر. ئێمە پێمان نایە ژوورێکی گەورەوە، لەو قاوشە گەورەیەدا سەما دەکرا و ناوبەناویش ئاهەنگی دەمامکداری تێدا دەکرا. شتێکی وەها لەوانەیە بە دڵی ژنەکانی ئێمەش بێ.
لەکاتی نانی شێواندا ژنەکەی قراڵ لە تەنیشت منەوە دانیشت، هەرچی ژنە جوانەکەش بوو لە بەرانبەرمان جێی گرتبوو. ژنێکی کەژەمان بینی، ئێمە حەزمان لێبوو لەگەڵ ژنەکە بدوێین، بەڵام ژنەکەی قراڵ هەموو شەوەکە هەر دەیچرپاندە بن گوێم و بواری پێنەدام، دەمی بۆگەن کردبوو. خوا لەپای ئەوە هەر سزامان دەدا."
پاشا بە خەندەوە ئەو نووسینەی خۆی دەخوێندەوە. بیری کەوتەوە لە پاریس دیمەنێکی زۆر جوانی بینیبوو، بەڵام بیری چووبوو تۆماری بکا، ئیدی ئێستا ئەویشی بۆ زیاد کرد: "لە پاریس لە ئاوێنەی گالیسکەکەماندا ژنێکی نازدارمان بینی. وەک ئەوە وابوو وێنەکە لە چوارچێوەیەک گیرابێ، ئاخر هیچ ژنێک بەقەد ئەو جوان نەبوو. گالیسکەکەش درێژەی بە ڕێڕۆیشتنەکەی خۆی دا، ژنەش لە ئاوێنەکەوە ون بوو. ئێمە ئامادەبووین ئەو شۆخە لەبەر زێڕ هەڵبکێشین و بیکڕین، بەڵام خۆ پاشاش سنووری خۆی هەیە."
درەنگانێکی شەو بوو، جاران لەو کاتانەدا لەسەر پێخەفەکەی کشابوو کتێبی دەخوێندەوە، بەڵام خۆ نەیدەتوانی دەست لە نووسینەکەی هەڵگرێ. پەڕەکانی گەشتنامەکەی هەڵدایەوە، گەیشتە سەر ئەو بەندەی لەبارەی سەردانەکەی بۆ هۆڵەندای نووسیبوو. کاتێک خوێندیەوە خەریکبوو دڵی لە شەوقی غەریبیکردن هەڵدەفڕی، لەوێدا وەهای

خوێندەوە: "کاتێ ئێمە بە قیتار گەیشتینە وێستگەی ئەمستردام، سەرۆکی شـــارەوانی و یەک دوو ژەنەڕاڵ و ســـەرۆکی پۆلیســـی شـــارەکە لە پێشوازییدا وەستابوون. کاتێکیش لە قیتارەکە دابەزین، موزیکژەنەکانیش وەهایان موزیک دەژەند گوێیان کەڕ دەکرد، هەر یەکسەر ئەو هەستەمان بۆ هات، ئێمە لەو وڵاتە بە گەرمییەوە بەخێرهێنراوین.

ئەمســـتردام شـــارێکی جوانە، شـــەقامەکانی پاک و خاوێنن، خانووەکانی وەک قووتوی کێک وان و پاڵیان بەیەکدا داوە، شتێکی وەهات بە مێشکدا دێ، شارەکە لە لایەن منداڵانەوە دروستکرابێ. پاشای هۆڵەندا نەخۆشە، کیژۆڵەیەکی هەیە، کاتێ مرد جێگەی ئەو لەســـەر تەخت دەگرێتەوە. خۆ ئەگەر ئەو ئیشـــە لای ئێمەش ڕێی تێچووبایە، ئێمەش تاج ســـوڵتانمان وەک جێنشین دەناساند.

دوای وێســـتگەی قیتار بە گالیســـکە بەنێو شـــاردا ڕۆیشـــتین، خەڵکێکی زۆریش لەســـەر شـــەقام وەســـتابوون تا کەژاوەی ئێمە ببینن. ئێمە زۆر ژنی جوانمان بینین، پێموایە ئەم وڵاتە هیچ ژنێکی ناشیرینی لێ نییە.

خەڵکەکەی پێشـــتر هەرگیز ئێرانیان نەبینیبوو، چ جای پاشـــای ئێران. ئەوان دەســـتیان بۆ ئێمە ڕادەوەشـــاند و هەندێک لە ژنانیش بە دەســـتیان ماچیان بۆ دەهاوێشـــتین. هەرچەندە شـــتەکە هەندێک هەراســـانیش بوو، بەڵام خۆشیمان لێی هات.

بە شـــەویش لە مێوانخانەیەکی زۆر نایابی ســـەر کەناڵێکی ئاو ماینەوە، زۆر خاوێنوبژوون بوو، بۆ خەوتنیشـــمان زۆر ئاســـوودە بوو. ئەوان خەڵکێکی شـارسـتانن، ئەو هۆڵەندییانە هیچ کامێکیان بە شـەو وەک کەر نەدەزەڕی.

ئێمە دوو هەفتە لەو وڵاتە ماینەوە، زۆر شـــتمان بینی، ســـەردانی زۆر کارخانەمان کرد و لەگەڵ زۆر لە خاوەن کار و بازرگانان قسەمان کرد، ئەوان وەک دوکاندارانی بازاڕی وڵاتەکەمان ڕووقایم و زبر نین.

بەلام لە لاهای، لە شاری دەنهاخدا مەرگمان بە چاوی خۆمان بینی.
ئێمە چووینە شـــارەکە تـا ســـەردانی پەرلەمـانەکەیـان بکەین و ســـەروەزیرەکەیان ببینین. لەوێش خەڵکەکە بە هاتنمان زۆر شـــادمان بوون و ژنەکانیشـــیان بە دیدارمان دڵخۆش بوون. کاتێک ئێمەیان بینی، دروشـــمیان کێشـــا، چەپڵەیان لێدا. ئێمەش دەســـتمان بۆ ڕاوەشـــاندن و هەندێک بۆیان نوشتاینەوە.
ئەسـپە بەسـتەزمانەکان لەبەر ئاپۆرای خەڵکەکە ترسـان و شـڵەژان. لە هیکەوە ئەسـپەکان شـێت بوون. گالیسـکەوانەکە نەیتوانی جڵەویان بکا. ژنـان و منـداڵانیـاش لە قیژە و هـاواریـان داو ئێمەش لەو گۆڕە دەســتەوەسـتان لەنێو گالیسـکەکەداماینەوە. ئەسـپەکان خێرا بەســەر شۆستەکان کەوتن و لەو چیمەنە کەوتنە غار. گالیسکەکەمان بەر دار و شـــۆســـتەکە کەوت. ڕوخســـاری تۆقاوم بینین، هاتوهاوارەکانیش ئەســـپەکـانی مـاخۆلانتر دەکرد. پێمـان وابوو ئەمە کۆتـاییمـانە. گـالیســـکەکەمـان بەر دارتیلێکی کـارەبـا کەوت و تێیدا عـاســـێ بوو. پاســـەوانەکانیش بە پرتـاو خۆیـان گەیـاندینێ و بەهـانـامانەوە هـاتن. خەڵکەکە بە حەپەسـاوییەوە دەیڕوانی، لێ ئێمە پشـتمان ڕاسـتکردەوە و دەستمان بۆ ڕاوەشـاندن. بۆ سـاتێک دنیا کڕ و بێدەنگ. پاشـان خەڵکەکە بە خۆشییەوە تەقینەوە و هاواریان کرد: هەر بژی پاشا.
کە ئەمەمان بینی فرمێســـک لە چاوماندا قەتیس ما. هەر بەڕاســـتی خەڵکێکی باشن.
بە خەندەیەکەوە پاشا ڕۆژژمێرەکەی داخستەوە.

بۆ ڕۆژی پاشـــتر و بۆ ماوەیەکی درێژتر هەر لە نێو جێگەیدا مایەوە، بەلام خۆ هەر دەبووایە لە کۆتاییدا بەدوای ســـەرەداوەکانی ژیانیدا بڕوا

و هەڵیوێژنێتەوە. خۆی ئەمە ژیـانی ئەو بوو، وڵاتی ئەو وەهـا بوو، ئەویش پاشایان بوو، ئەو کەسە بوو دەبووایە ڕابەڕایەتیان بکا.
پاشـــا لەخەو هەڵســـا، بەرچایی خوارد و بانگی عەینولدەولەشـــی کرد. زاواکەی لە تاج سـولتانی بیسـتبوو، کە پاشـا لە گەڕانەوەی گەشـتەکەیدا کەســـــاس بووە. ئەو پێیوابوو ئەو ڕاپۆرتە وردەکارە لەبارەی گرتنی سەرانی گروپی بەرگری و ناڕازی دڵخۆشی دەکا.
"بەڵام خۆ نەتتوانیوە مەزنەکەیان بگری!"
"بەگوێرەی زانیارییەکانی من، مەترســـیدارترین پیاوی گرووپەکەمـان دەستگیرکردووە."
"کامە پیاو؟"
"میرزا ڕەزا کرمانی."

لەسەر پێداگرتنی عەینولدەولەدا، پاشا بۆ ڕۆژی پاشتر سەرێکی زیندانە بەدناوەکەی دەرەوەی شاری تارانی دا.
پاســـەوانەکان پاڵیان بە زیندانییەکانەوە نا ئەوانەی دەســـت و پێیان بە زنجیر بەســـترابوونەوە تا بیانهێننە حەوشـــەی زیندانەکەوە. پیاوەکەش هەردوو دەستی بە چاوەکانییەوە گرتبوو، تا لە دژی تیشکی خۆرەتاوی ڕاسـتەوخۆ بیانپارێزێ. عەینولدەولە چووە لای زیندانییەکە، دەسـتی دایە زنجیرەکەی و بانگی کرد: "دەی کڕنووش بۆ پاشا بەرە."
زینـدانییەکەش ڕەتیکردەوە وەهـا بکـا. عەینولـدەولە قۆنـداغە تفەنگێکی سرەواندە شانەکانی، بە جۆرێک زیندانییەکە لەبەردەم شادا کەوتە سەر زەوی.
عەینولدەولە گوتی: "ئەمە میرزا ڕەزا کرمانییە!"

پاشا بە سەری چەکمە بۆرەکەی لەسەر سەری میرزا ڕەزای دا و زیاتر بە خاکییەوە گیرساند، بە سووکایەتیپێکردنەوە پێیگوت: "ئایا ئەو پیاوۆکە[101]ئژوارە؟"

میرزا ڕەزا پیاوۆکە نەبوو، بەڵکو ئەو لە زیندانە تاریک و شێدارەکەی بەهۆی نەبوونی خۆر و کەم خۆراکییەوە لاواز بووبوو.

عەینولدەولە وەهای لە پاشا ڕەچاودەکرد پێی بڵێ: دەی لە قەنارەی بدەن."

کەچی پاشا ڕووی خۆی وەرسووڕاند و دوورتر ڕۆیشت.

لەوانەیە لەبەر گەشتەکەی بووبێ، هەروا نەیویستبێ لە گۆترە کەسێک لە سێدارە بدا. لەوانەشە ویستبێتی لە شانوشەوکەتی عەینولدەولە کەم بکاتەوە، ئاخر ئەو نەیتوانیبوو جەمال خان دەستگیر بکا.

دەکرێ چارەنووس شتێکی دیکەی لە هەنیەی میرزا ڕەزا نووسیبێ.

---

[101] ڕۆماننووس شێوازی بچووکرندوەی بەکارهێناوە، کە لە کوردیشدا پیاوۆکەی بەرانبەر دێ.

# ٥٤



# کێلەسکاڵا

عەینولدەولە لە دوای شـــەڕ و پێکدادانی حوجرەکەی پشـــت مزگەوتی گەورەی شار، هەموو دەروازەکانی تارانی خستە ژێر چاودێرییەکی توند تا ڕێگە لە هەڵاتنی جەمال خان بگرێ لەوەی لە شار بچێتەدەر. فەرمانی بە پشکنینی هەموو ئەو ماڵانە دەرکرد، ئەوانەی گومانی ئەوەیان لێدەکرا جەمال خان خۆی تێدا شـــاردبێتەوە. لێ مـاڵی ئـایەتوڵلا تەبـاتەبـائی هەڵاوێرد کرا. جەمال خانیش ڕێک لەوێ خۆی حەشاردابوو.
ئەو شـــەوەی گوللە بە پێی چەپەی جەمال خان کەوت و بریندار بوو، بە هەموو هێزی تێدامابوو توانی خۆی بگەیەنێتە ماڵی ئایەتوڵلا تەباتەبائی.
یەک دوو مانگی یەکەم تا بەخۆی هاتەوە و زامەکەی تیمار کرا و وای لێهات بەپێی خۆی بڕوا لە ماڵی ئایەتوڵلادا مایەوە. لەو ماوەیەشدا ڕیشی هێشتەوە و بە مۆڵەتی لە ئایەتوڵلا وەرگرت تا بەرگی ئاخوندێک بپۆشێ

و مێزەرێک لەســـەر بنی ناوی ئاخوندێک بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی بەکاربهێنێ.

جەمال خان تێکۆشـــا تەباتەبائی بهێنێتە ســـەر ئەو ڕایە، کە پێویســـتە دەســـەڵاتەکانی پاشـــا ســـنووردار بکرێ و *مەجلیس* (پەرلەمان) و *عەدالەتخانە*[102](دادگا) بۆ وڵات پێویستن و دەبێ دابمەزرێن.

جەمال خان لەســەر ئەو ڕێگەیە بەردەوام بوو، تا هاوڕێکانی کۆبکاتەوە، بەڵام خۆ ئەم کارە شتێکی ئاسان نەبوو.

پاشــا هەســتیکرد دەبێ لەمەوپاش لیبراوتر بێ و بەردەوامیش بیرۆکەی نوێی بۆ دەهاتن. ئەو گەشـــتەکەی لێ خۆش هاتبوو، بەڵام لە جارانیش پتر لەو ڕایەدا بوو، ئەو گۆڕانکارییانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا هی ئەوە نین لە وڵاتەکەی ئەو پیـادەبکرێن. ئەو لە کۆبوونەوەیەکـدا ئەم بیرۆکەیەی ئـاشـــکرا کرد و گوتی: "نـاکرێ ئێمە ئەو شـــێوازە ژیـانەی لەوێ پەیڕەودەکرێ بیهێنینە ئێرە، بەڵام دەکرێ داوایـان لێبکەین پرد و نەخۆشـــخانەمان بۆ دروســـت بکەن. ئێمە تۆپی وەهامان بینین دە جاران لە ئەوانەی ڕوســـی بەهێزتر بوون. ئێمە پێویســـتمان بەو شـــتانە هەیە. ئاڵمانەکان تفەنگیان بەدیاری پێبەخشـــیوین. من لەگەڵ ئەواندا کەوتمە گفتوگۆ، ئەوان دەتوانن بە شـــێوەیەکی تایبەت بۆ ســـوپاکەمان هەمان تفەنگمان بۆ بەرهەم بهێنن. گۆڕانکارییەکانی دیکە چارەنووســـاز نین. بەتایبەتیش شێوازی ژیانی ئەوان پێویست نییە لێرە پەیڕەوی لێبکەین."

پاشــا لە کۆشــکە تایبەتییەکەی خۆیدا بە پێچەوانەی ئەو شــتانە، ویستی چەند گۆڕانکارییەک بکا. مەزنی هەموو وڵاتان کابینیەکی تێلێگرافیان لە

---

[102] ڕۆماننووس هەر دوو وشە فارسییەکەی مەجلیس و عەدالەتخانە بە ڕێنووسی هۆڵەندی بەکارهێناون، منیش نەمویست بیانگۆڕم. وەرگێڕ

کۆشکەکەی خۆیان دانابوو. لە ئینگلستان ئەوەی هێنابووە بەرباس ئاخۆ دەتوانرێ شـــتێکی وەهـاش لە تاراندا جێبەجێبکرێ. ئەم کارەش زۆر خێراتر لەوەی پاشا چاوەڕێی دەکرد، جێبەجێ بوو.
پاش شـەش مانگ لە گەڕانەوەی پاشـا لە گەشـتەکەی، سێر جێمس مۆر، ئەندازیارێکی لاوی ئینگلیز ڕایگەیاند ئامادەیە کابینەیەکی تێلێگراف لە کۆشک دابمەزرێنێ، تا بەهۆیەوە پاشا بتوانێ پەیامە تێلێگرافەکانی خۆی بنێرێ و وەربگرێ.
ئەندازیارەکە نامەیەکی پێبوو، تێیدا هاتبوو ئینگلسـتان ئامێری تایبەتی بە تێلێگراف وەک یادگارییەک بۆ پاشـــا دابین دەکا. دیارییەکەش لەبەر گەورەیی پارچە پارچە لە باولی گەورەدا هێنرانە کۆشک. ئەندازیارەکەش ســـەری سـندوقە کانزایی و تەختەکەی هەڵدانەوە تا ئامێری تێلێگرافەکە ڕەنگزێڕینەکەی هێنایەدەر و لەبەر هەتاویشدا دەبریسکایەوە.
پاشـــان دوو دارتێلی لە کۆشـــکەکە بۆ چەقاندن و بە شـــیوەی ئێرانی ڕازاندنیەوە. کێبڵەکەشـــی لە دارتێلێکەوە بۆ ئەوی دیکە ڕاچاند. کاتێکیش هەموو شـتێک ئامادەکرا، کابینەیەک لە ژوورێکی لاچەپی تەنیشـت هۆڵی مینابەندەکە ساز کرا.
پاشـــا بە یارمەتیی تێلێگرافوانێکی بریتانی پەیامێکی کاتیی بۆ باڵوێزی ئێران لە لەندەن نارد. پاشـــا لە پایتەختی ئینگلیســـتانەوە شـــیعرێکی لە ڕۆژنامەیەکی بریتانی خوێندبووەوە، ئەو شـــتەی پێ زۆر ناوازە بوو کە مرۆ بەم شێوە بە شـیعر ئاشـنا ببێ. ئیدی پاشـا داوای لە تێلێگرافوانەکە کرد شـیعرێکی ئەو بە تێلێگراف بۆ باڵوێزی ئێرانی لە لەندەن بنێرێ بەم شێوەیەی خوارەوە:

*هەروەک چۆن مانگ زەریای خەمبار جێدێڵێ*
*عەشقەکەم منی لە بارێکی کەساسدا هێشتەوە*
*تەنیا یەک جیاوازی هەیە- عەشق هیچ شوێنەوارێک جێنامێڵێ*

باڵوێزیش بەم برووســـــکەیە وەڵامی دایەوە: "ئەمە شـــاکار بوو. ئەگەر خاوەنشـــکۆ ڕێگە بدا، شـــیعرەکە بۆ ســـەر زمانی ئینگلیزی وەردەگێڕین، چونکە لێرە لە لەندەن بۆ کاروباری پەیوەندیەکانمان بەکەڵکمان دێ."
پاشـاش بە کەیفی سـازەوە دەسـتبەجێ وەڵامی دایەوە: "ئێمەش ڕێگەمان پێدای!"

ئێســـتا پاشـــا پەیوەندیی ڕاســـتەوخۆی بە شـــارە گەورەکانەوە هەبوو، ڕۆژانە تێلێگرافی بۆ ئیسفەهان، شیراز، مەشهەد و بەندەرعەباس دەنارد پرسیاری ڕەوشی ئەوێی لێدەکردن.
ئەو هەســـتی کرد ئێســـتا باشـــتر کۆنترۆڵی وڵاتەکەی پێدەکرێ، ئاخر ڕۆژانە نامە و پەیامی لە کارمەندە خۆجێییەکان پێدەگەیشت و ئەویش بە سەرنجەوە هەموویانی دەخوێندنەوە.
تـا دەهـات ئەو نـامـانەی بۆ دەهـات کە نـاوی لێنـابوون کێبڵەســـکاڵا. دوکاندارەکان تێلێگراف لەســـەر تێلێگرافیان بۆ پاشـــا دەنارد و گلەیی و گازندەی خۆیان لەدەســت دەســەڵاتدارە خۆجێییەکان دەکرد کە بەردەوام ســـەرانەیان لێ دەســـەندن. لە ڕێی ئەو تێلێگرافانەوە لە پاشـــا دەپاڕانەوە بەڵکو سنوورێک بۆ ئەو نادادییانە دابنێ.
هەروەها سکاڵای لەو ماڵبات و خانەوادانەش پێدەگەیشت کە یاساوڵەکان بە زۆرەملێ و بێ ڕەزامەندیی دایبابیان کچەکانیان ڕاپێچی حەرەمسەرای خۆیان دەکردن.
ڕۆژانە بە سەدان لەو کێبڵەسکاڵایانە دەگەیشتن. پاشاش بە جدییەوە لە هەموویـان ڕادەمـا. ئەو هەســـتێکی خۆشـــــی هەبوو، ئـاخر هەنووکە پەیوەنـدیی ڕاســـــتەوخۆی لەگەڵ ڕەعیەت و مســـــکێنەکـانی خۆیـدا

پەیداکردووە. دەمودەستیش وەڵامی داواکارییەکان دەدرانەوە، کورتەپەیامی توندی بۆ کاربەدەستە خۆجێییەکان دەنارد و یارمەتیی کوێرەوەریی ماڵباتەکانی دەدا: "ئەو کچە ئازاد بکە، دەنا هەر خۆمان دەزانین چیت بەسەر دێنین!"
هەموو ڕۆژێک، بەیانیان سەرلەزوو دوای ئەوەی تازە لە خەو هەڵدەستا دەچووە لای کابینەی تێلێگرافەکە ئاخۆ نامە و پەیامی نوێ هاتوون. هەر زوو کاتێ لە خەو ڕادەبوو، دەموچاوی خۆی دەشوشت، جلەکانی خۆی لەبەر دەکردن و لەگەڵ بەرچاییەکەیدا سەری بەسەر بارستایی ئەو نامە و پەیامە تێلێگرافییانەدا دەگرت و بە تاسەوە دەیخوێندنەوە.
هەندێ جاریش لەپڕ بێ ئەوەی چوونەکەی ڕابگەیەنێ بەسەر شارێکیدا دەدا تا لێبپێچێتەوە ئاخۆ فەرمان و ڕێنماییەکانی وەک خۆی جێبەجێکراون یان نا. ئەم کارەی لێخۆش هاتبوو، چێژی لەو فەرمانە دادپەروەییانە دەبینی کە دەریدەکردن.
لەم دواییانەدا یەک دوو سکاڵای کێبڵییانەی لە بازاڕەکەی تاران پێگەیشت. دەستەیەک لە دوکاندارەکان دادوبێدادیان بوو لە دەست مەلیچک، ئاخر بەردەوام دەچووە بازاڕ و هەراسانی دەکردن. پاشا بەمە زۆر پێکەنی، ئاخر ناوی مەلیچکیش لەنێو پەیامی تێلەگرافەکاندا هاتبوو. ئینجا تێلێگرافەکەی نیشانی مەلیچک دا و بە پێکەنینەوە پێیگوت: "مەلیچک، تۆش بوویتە شتێکی گرنگ، ناوت بەنێو کێبڵەکاندا هاتوە."

هەواڵی ئەوەی پاشا لە ڕێی پەیامی تێلێگرافەوە لە سکاڵای ڕەعیەتەکەی دەپێچێتەوە، خێرا وەک برووسکە بە نێو سەرتاپای وڵاتدا بڵاوبووەوە. ئیدی گوندنشینان بە پشتی کەر ڕێگایەکی زۆر دووروودرێژیان دەبڕی تا خۆیان بگەیەننە شارە گەورەکان و لەوێوە خۆیان بگەیەننە

نووسـینگەکانی تێلێگراف. هەندێجار چەندین شـەو ڕۆژیان پێدەچوو تا دەگەیشتنە ئەوێ تا سکاڵاکەیان بۆ پاشا بەرز بکەنەوە.
لەبەر ئەوەی ئامێرەکەی پاشـا لە توانایدا نەبوو ئەو برە زۆرەی نامە و پەیـامـانە وەربگرێ و بنێرێتەوە، بۆیە هەنـدێکیـان بۆ نووسـینگەی سەرەکیی تاران دەنێردردان. کارمەندانی نووسینگەکەی تارانیش هەموو سکاڵاکانیان دەخستنە نێو کیسێک و ئیدی هەموو بەیانیان بۆ کۆشکیان بەڕێ دەکردن.

بەرە بەرە ئەم هەوڵە بێوچانە پاشـای شـەکەت و هیلاک کرد. ئیدی بووبووە بارگرانییەکی تاقەتپڕوکێن. پاشـا نەیدەزانی ئاخۆ چی لەو هەموو سـکاڵایانە بکا. ئەوانەی دەچەوسـێندرانەوە، ئەوانەی نەخۆش دەکەوتن، ئەوانەی خەرمانەی کردوکۆیان لەدەسـتدابوو، ئەوانەی تاڵان کرابوون، ئەو ژنـانەی مێردەکـانیـان لەمێژ بوو لە زینـدانـدا بوون، ئەو کەسانەی چیدی هەستیان نەدەکرد ژینگەکەیان سەلامەتە، نەخۆشەکان، نابینا، کەڕە و کەمئەنـدامـان هەر هەموویـان داوایـان دەکرد دەسـتی یارمەتییان بۆ درێژبکرێ.
پاشا لەو هەموو کوێرەوەرییەی لە وڵاتەکەیدا هەبوو، ترسا. ئاخر ئەوەی لە توانایدا هەبوو کردی، لێ ئەوەی بینی ئەمە یارمەتیی هەمووان نادا. و بەهێواشی ئەو تاسە و پەرۆشییەی جارانی لە دەست دا، ئیدی نامەکانی نەدەخوێندنەوە، بارسـتەی سـکاڵاکان لە گۆشـەیەکی ژووری کارکردنیدا لەسـەر یەک بێ ئاوڕ لێدانەوە کەڵەکە بووبوون، دواجار تێلێگرافوانەکەی ناردەوە ماڵێ و قفڵێکی گەورەشی لە دەرکەی کابینەکە دا.

دوای نیوەڕۆیەکیـان بە دڵتەنگییەوە ملی ڕێگەی مـاڵی دایکی گرتەبەر. مەهدولیا لەمێژ بوو نەخۆش کەوتبوو.

ئەو تیشــــک و تیریژە زەرد و ســــوورانەی دوای ئێوارەدرەنگ بە دیوارەکانی کۆشکی دایک کەوتن، ئەو کاتەی پاشا گەیشتە ئەوێ، مایەی دڵخۆشــیی ئەو بوون و کەیفی پێهات. ئەو هێشــتا هەر لەســەر پشــتی ئەســـپەکەی بوو، کاتێ بینی دایکی بە گۆچانێکەوە لەپاڵ دیوارەکەوە قەدەم لێدەدا. ســـەرباری نەخۆشـــی کەچی دایکی هەمیشـــە هەروەک شــاژنێک ڕەفتاری دەنواند. تاجێکی ئاڵتوونی لەســـەر بوو لەبەر ڕوناکی دەبریسکایەوە.

پاشــا هەســـتێکی تێکەڵی لەهەمبەر دایکیدا هەبوو. هەندێجار بێ ڕاددە خۆشی دەویست، هەندێ جاریش ڕقی لێ دەبووەوە. ئێستاش دەبووایە لە جاران زیاتر کەیفی پێهاتبا. ئاخر لەوە تێگەیشتبوو خەریکە لەدەستی بدا، لەوانەیە دیدارەکە دوادیدار بێ.

هەر بەڕاســـتیش ئەوە دایکی بوو ئەوی کردبووە پـاشــــا. ژنێکی دەسـتڕۆیشـتوو، سـەراو و دەراوی زۆری بینیبوو. ئەو بەرجەسـتەیەک بوو بۆ هەموو ژنانی ئێرانی، هەموو شـــاژنەکانی پێش خۆی لەخۆیدا ڕەنگ دەدایەوە. ئەو ژنەی دەبووایە وەک ماینێکی چەموش توندوبەند بێ، ژنێک دەبووایە ژیانی خۆی و ژیانی ڕۆڵەکەی لەنێو جەنگەڵێک لە گەندەڵی بپارێزێ و دەربازی بکا.

مێردەکەی ئەو پاشـــایەکی لاواز بوو، بەڵام هەمیشـــە وەک دینگەیەک لەپاڵیدا مایەوە. هەر ئەو ژنە بوو وای لە پاشـــای پێشـــوو کرد بڕیارە پێویســـتەکان دەربکا. کاتێکیش هیچ کەسـێک ئەو ژنەی نەدەناسـی، زۆر جاران لە ژووری نوسـتنی خۆیەوە سـەیری ئاوێنەی دەکرد و دەیگوت: "ڕۆژێک دێ ئەوان بزانن من کێم. من هەموو ژنە ئێرانییەکان دەناســـم، ئەوانەی لە ژیان ماون و هەن و ئەوانەی نەشـــماون. من هەموو هێز و هەموو مافێکی ژنانم هەیە ئەوەی لێیان سەندراوەتەوە."

ئەو لە کوڕەکەی خۆیدا هەم باوکە لاواز و هەم باپیرە بەهێزەکەشی دەبینی. کوڕەکەی لە نێوان کەلێنی گۆڕانکارییەکاندا گیری خواردبوو.
کاتێ پاشا گەیشت بانگی کرد: "سڵاومان لە شاژنی شاژنان."
شاژنە دایکیش سەیری کرد و بە خەندەوە گوتی: "پاشا زەندەقی ئەم پیرەژنەی برد."
ئینجا لە ئەسپەکەی دابەزی، بەرەو دایکی ڕۆیشت، دەستی ماچ کرد چووە بن شانی و لەپاڵ دیوارەکەدا یارمەتی دا بڕوا.
دایکەکە بە سەرنجەوە: "پاشا خەمبار دیارە."
ئەویش بە بێ دەنگی لەپاڵیدا دەڕۆیشت.
"دەی پێم بڵێ."
"دایکە، دایکە، چیدی ناتوانم. خەڵک دەگرییێن، خەڵک دەپارێنەوە، خەڵک دەمرن، خەڵک تالان دەکرێن، دەردوبەلای کوللە لە جوتیارانی داوە، ژنان بەزۆر لاقە دەکرێن، منداڵان بە دەردەخوریکە کوێر دەبن، گەنجان لەبەر فشاری دڵ دەناڵێنن. دایکە ئێمە لە ئاستیاندا هەست بە بێدەسەڵاتی دەکەین. هەندێ جار شتێ قێزەون لە کۆشکدا دەقەومێ. ئەوان مەلیچکیان ئەوەندە خەپە کردووە، ئیدی ئەو بەستەزمانە چیدی ناتوانێ بەڕێدا بڕوا. نازانم کێ وامان لێدەکا."
مەهدولیاش توند باسکی کوڕەکەی گرتبوو گوتی: "کوڕی خۆم، دڵتەنگ مەبە. تۆ میراتگری شارستانیەتی کۆنی. هەندێک جار لەسەر کێوە بەرزەکانەوە دەکەوینە دۆڵێکی زۆر قووڵەوە. من باوکت و باپیرەتم وەک پاشا بینیون. تۆ دە جاران باشتر لەوان وڵاتەکە هەڵدەسوڕێنی. ڕۆڵەکەم، خۆی ئەمە خەتای تۆ نییە. تۆ لە پاشاکانی دیکە زیاتر ئاستەنگت هاتوونەتەپێش. ئارام بگرە. من لە خودای خۆم دەپاڕێمەوە، نوێژی بۆدەکەم، لەبەری دەگرییم. ئەویش یارمەتیت دەدا."

"دایکە، زۆر ســـوپاســـت دەکەم، ئێمە داوات لێدەکەین بەتەنیا جێمان مەهێڵە."

ئەویش وەها وەڵامی دایەوە: "کوڕەکەم، من نامرم. من ئەوەندە دەژیم تا پاشا خۆی دەڵێ: دایکە، ئێستا دەکرێ تۆ ئۆغر بکەی."

پاشـــاش بە خەندەوە لێی پرســـی: "ئەرێ دایکە ، دەتەوێ لە دەســـتمان ڕزگارت بێ؟"

"من تۆ جێناهێڵم. تا پێویست بکا لەپاڵ تۆدا دەبم."

پاشاش گوتی: "دایکە، ئەمە بەڵێنێکی جوانە."

"دەی گەنجۆ یارمەتیم بدە، ئاخر بەتەنیا ناتوانم بەسەر پەیژەکان بکەوم."

ئەویش دایکی بەرزکردەوە و لە ئـــامێزی گرت و بەرەو ســـەرووی پەیژەکانی برد.

شاژن بە خەندەوە و بە گۆچانەکەی هەڕەشەی لێکرد: "دەی لێرە لەسەر زەوی دامنێ."

پاشاش بە ئەسپایی داینا و تاجی سەری ماچ کرد.



# له بازاڕ

تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵانە بەسەر روخساری پاشادا دیاربوو. بە خۆی و ڕیشی بۆز و سەری کەچەڵەوە چیدی زاتی ئەوەی نەدەکرد لەبەردەم ئـاوێنەدا کڵاوە قووچەکەی خۆی دابگرێ. کـاریگەریی تێپەڕینی ڕۆژ و ساڵ بەسەر مەلیچیکشدا دەبینرا.
پێشـان پاشـا دەردەدڵی خۆی لای پشـیلەکەی هەڵدەڕشـت و بەم جۆرە هەندێک ئاسـوودە دەبوو. لە ڕۆژژمێرەکەیدا ئەو هەسـتەی بە باشـی دەربڕیبوو. تەنیاییەکەی خۆی لەگەڵدا بەش دەکرد. دوای ئەوەی شـەرمین بەبێ هیچ هۆیەکی دیار و ڕوون بێسـەروشـوێن بوو، مەلیچک شـوێنی ئەوی بۆ پاشا گرتەوە. کاتێ مەلیچک هێشتا بچکۆلانە بوو ئەو زۆر پێی دڵخۆش بوو.
پاشا بە پێویستی نەدەزانی مەلیچک فێرە خوێندنەوە و نووسین بکرێ، بەلام بنەما سـەرەتاییەکانی گەمەی شـەترەنجی فێرکردبوو. خۆشـیی لە جووڵە گەمژانەکەی مەلیچک دەهات.
هەرچەند کوڕیژگەکە هەراشـتر دەبوو، پاشـا کەمتر بە هاموشـۆبوونی دڵی دەکرایەوە. ئاخر ئەو تا ئەوکاتەش هەر ڕقی لە خۆشـوشـتن

دەبووەوە و بۆنی گەنیوی لێدەهات. کاتێک مەلیچک منداڵ بوو، شـــا بەخۆی دەیبردە گەرماو ســەری لێدەشــوشــت، قژی بۆ دەتاشــی و جلی خاوێنی دەکردەبەر. لێ ئەو ڕۆژانە دەمێکە بەسەرچوون.

وەرز و ساڵ هاتن و ڕۆیشتن، شەو بەدوا ڕۆژدا دەهاتن و گەشتەکەی پاشاش ئەوەندە دوورکەتبووەوە وەک خەونی لێهاتبوو.
دواجاریش هەستیکرد گەشتەکە بەختەوەری نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانە بە بەدبەختی بۆی شکایەوە. نیازی ئەوەی ڕاستەوخۆ بەپیر کێشەوبێشەی ڕەعیەتەکەیدا بچێ و یارمەتییان بدا، نەیتوانی درێژە بەوە بدا شـــانی بداتەبەر و پشـــێویی ســـیاســـی جارێکی دیکە بەجۆش و خرۆش تاویسەندەوە.
باڵوێزەکەی خۆی لە مۆســـکۆوە لە نامەیەکدا وەهای بۆ نووســـیبوو: "ئەوەی پاشـــا لە نیشـــتمان لەبەری دەناڵێ، لەڕاســـتیدا هەر ئەو جۆرە کێشانە بەرۆکی قراڵی ڕوسیاشی گرتۆتەوە و تەنگەتاوی کردووە.
دەســت و تاقمە جۆربەجۆرەکان دەیانەوێ دەســەڵات لەبن دەســتی قراڵ دەربهێنن. ئەوان دەڵێن ئێستا دەستەبژێر کاروباری وڵات هەڵدەسووڕێنێ و خەڵکیش دەچەوسێنرێتەوە. ئەم دەستە و تاقمانە بۆ جۆرە هاوژیانێک تێدەکۆشـــن گوایە گەل لە ڕێی نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانیەوە کاروباری وڵات بەڕێوەبەرن.
ئەمە پێشـهاتێکە مایەی مشـوورخواردنە. ئەوان پێ لەسـەر مافی خەڵکی ئاسـاییدا دەگرن، واتە مافی خەڵکی سـەر جادە و ناو گەڕەک و کۆڵانان.
ئێمە وەهـــای دەبینین ئەو پشـــێوییـــانە لەوپەڕی هێز دان، پێـدەچێ ڕەشـەبایەکە بگاتە وڵاتەکەی ئێمەش. سـەرکردەکانی ڕاپەڕینی ڕوسی لە باکۆوە قســـەیان لەگەڵ ســـەرکردە ڕاپەڕیوە ئێرانییەکاندا کردووە، یەکێکیش لەوان ئاغا جەمالە."

بۆ شەوەکەی پاشا وەهای لە ڕۆژژمێرەکەیدا نووسی: "هەرچی بقەومێ هەر بەتەنیا پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە، قڕاڵیش هەمان کێشـــەی هەیە. لە تورکیاش دەسـەڵاتی سوڵتان لەلایەن خەڵکەوە سنووری بۆ دادەنرێت و هەڕەشە لەسەر دەسەڵاتەکەی هەیە.
ئەوەی خەڵک لە ڕوسیا و تورکیا دەیکەن، پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە. ئێمەش لێرەدا درێژە بە شێوازە ئاوەزمەندانەکەی حوکمڕانیمان دەدەین. پێدەچێ بەخت من وەک دوا پاشـــای کۆنی ئێران بخاتە نێو خانەی مێژووەوە. خۆ ئەگەر بەو شێوەیەش بێ، پێویستە تێبکۆشین تا لەژیاندا مابین بەوپەڕی خۆشییەوە بژیین و چێژی لێبینین."

میرزا ڕەزا کرمانی لە زیندانە سـامناکەکەی تاراندا هەموو هەوڵێکی ڕوحانیی خۆی بۆ ئەوە بوو تا لەوێ شـێت نەبێ. ئەو لەگەڵ تاوانبارە پەلڕەشـــەکان[۱۰۲] ئاندرا بوو. کاتێکیش پاســـەوانەکان خواردنیان بۆ دەبرد بە کتێبی قانوننامەکەی خۆی لەســـەریان دەدا. لەکاتی نانی بەیانیشـــدا جارێک لێیان دەدا. لەســەروبەندی دوای نیوەڕۆشـدا دووجار لێیان دەدا و شەوانیش بەر لە نانی شێوان سێ جاران لێیان دەدا.
میرزا ڕەزا دەیزانی دەبێ ئامانجە ســەرەکییەکەی لەپێشـچاو بێ نەوەک لەو ژینگە نـامرۆڤـانەیەی تێیکەوتبوو لاواز بێ و بەرگریی نەمێنێ. ئەو نهێنییەکی گەورەی لە سینگی خۆیدا شاردبووەوە، نهێنیەک وەک ئاگردان دەسووتا و ڕۆژانە گەرمی دەکردەوە.

جەمال خان چەند جارێک ســەردانی باکۆ و ئیســـتەنبولی کردبوو، تا لەگەڵ هاوبیرەکانی نیشـتەجێی تورکیا، لە عێراق، هیندسـتان، میسـر و ڕوســـیا کۆببێتەوە. ئەو، بە دووروودرێژی بارودۆخی پەرەســـەندووی

[۱۰۲] پەلڕەش: بەدفەڕ و خراپ. ئەوانەی بەدڕەفتارن.

سیاسییی وڵاتەکەی بۆ هاوڕێکانی لە دەرەوەی وڵات ڕوون دەکردەوە و بیروڕای لەبارەی ئەزموونەکانیان لەگەڵ یەکدی ئاڵوگۆڕدەکرد. بە هێواشیش ڕایەڵەیەکی توندوبەندی کاروباری ژێرزەمینی لە وڵاتەکەی خۆی ڕاچاندبوو. چاوەڕێی بۆنەی ڕاستودروستیان دەکرد تا دەستبکەنەوە و زەبری خۆیان بوەشێنن.

لە میانەی ئەو گرێبەستانەی پاشا لەکاتی گەشتەکەیدا لەگەڵ کاردار و بەڵێندەراندا واژۆی کردبوو، ڕێککەوتنێک هاتبووە ئاراوە، پێدەچوو کارەساتبار بێ.
بریتانیەکان لەماوەی بیست ساڵدا باڵوێزخانەکەی خۆیان زۆر بەرفرەوان کرد. ئەوان پارچە زەوییەکی پانوبەرینیان لەپشت باڵوێزخانەکە کڕی، تێیدا ڕیزە خانوویەکیان دروستکرد، بۆ شوێنی حەوانەوەی میوانە بریتانییەکانیان بەکارهێنا.
ڕوسەکان هێشتا هەر لە خانوە کۆنەکانیان دەژیان، ئەوانەی هی سەدەی ڕابردوو بوون.
کاتێک پاشا لە مۆسکۆ بوو، ئەم بابەتە لە کرملین هێنرایە بەرباس. پاشاش کە دوو بیرەی ڕوسی هەڵدابوو، بەڵێنی چەور چەوری بە ڕوسەکان دا تا بێ پارە پارچە زەوییەکی گەورەیان بداتێ و هەر هەمان شەویش بەڵێنەکەی خستەسەر کاغەز و بۆی مۆر کردن.
دوای ئەوە هیچی لێ شین نەبووەوە، پاشاش گرێبەستەکەی لەبیرکردبوو.
کار وەها ڕۆیشت تا ئەوکاتەی ڕوسەکان پەرژینێکی گەورەی داریان لە دەوری پارچە زەویە گەورەکە وەرێنا. کارەکەش لە لایەن هەندێ لە وەستا و کرێکارە خۆجێیەکان جێبەجێکرا، بە شێوەیەک کەس بیری نەدەکردەوە، کە بیرۆکەی ڕوسەکانە بۆ ئەوەی باڵوێزخانەکەیان فراوانتر

بکەن. نە پاشـــا و نە ڕوســـەکانیش نەیاندەزانی لەژێر زەویەکەدا گۆڕستانێکی سەدەی پێشوو هەیە.
جەمال خان لە ڕێی پەیوەندییەکانییەوە لە نیازی تەلارسازییە سـەرنجدارەکەی ڕوس ئاگادار کرایەوە. ئیدی چوو تا بە چاوی خۆی ببینێ، کاتێ بینی هێدمەگرتی بوو. بۆ ئەوەی بناغەی باڵەخانەکە لێبدەن، دەبووایە گۆڕەکان بشکێنن و ئێسکوپروسەکیش بەکۆمەڵ لە شوێنێک بن گڵ بکەن. لەم کارەیاندا پەرشوبڵاوی پەیدابووبوو، لە هەموو لایەک هەر بوتڵی بەتاڵی خواردنەوەی ڕوسی کەوتبوو لەگەڵ ئێسکوپروسک تێکەڵ بووبوون و وەک بارستایی خاشاکی لێهاتبوو.
بۆ شەوەکەی جەمال خان ئایەتوڵڵا تەباتەبائی لەگەڵ خۆی بردە شوێنی گۆڕستانەکە، کونێکیان لە پەرژینەکە کرد و ئایەتوڵڵای تێدا بردە ژوور و لەبەر ڕووناکی چرادا گۆڕەکانی نیشاندان، گۆڕ هەڵدرابوونەوە و ئێسقان و بوتڵە بەتاڵەکانیش لەو گۆڕە کەوتبوون.
ئایەتوڵڵا لە تووڕەییان دەلەرزی و گوتی: "ئەڵڵا، ئەڵڵا ، ئەمە مایەی پەژراندن نییە. خوایە هانام هێنایە بەر تۆ."

پاشـــا کەتنێکی گەورەی کردبوو، بەڵام ئاخۆ چی لەبەردەم ئایەتوڵڵادا بوو؟ ئەو هێزی هەبوو هەزاران کەس بنێرێتە سەر باڵوێزخانەی ڕوسی بۆ ئەوەی هەم سزای پاشا و هەم ڕوسەکانیش بدا. لێ ئایەتوڵڵا لەوە ترسا نەوەک حاڵەتەکە کوشتاری لێبکەوێتەوە.
بۆیە بڕیاریدا نامەیەکی کورت و پوخت بۆ پاشا بەو وشانەی خوارەوە بنووسێ:

**"وەها چاوەڕێ دەکرێ گۆڕەکان بەوپەڕی شکۆوە چاک بکرێنەوە.**
**هەر خوا لێبووردەیە و هەر ئەویش سزادەرە.**
**وەلسەلام.**
**تەباتەبائی."**

پاشا لە داخان دەکوڵی، بەڵام خۆ نەدەکرا لەگەڵ ئایەتوڵڵادا بێ دەسنوێژ بێ. بۆ ئەم مەبەســـتە پرســـی بە وەزیر کرد. مســـتەوفی ئەلمەمالیکیش گوتی: "هەر بەڕاستی ئەمە کێشەیەکی سەنگینە. پێویستە شتێک بکەین."
"ئاخر ئەمە گۆڕستانێکی کۆنی سەدان ساڵەیە و فەرامۆشیش کراوە."
"ئەم بەڵگەوبەندە نایخوا، خەڵک دەیەوێ ڕوسەکان لەوێ دوور بکەونەوە. من پێموایە دەبێ خواســتەکەی ئایەتوڵڵا بەجێبگەیەنین. پێویســتە داوا لە ڕوســـەکان بکەین، جارێ بۆ ماوەیەکی کاتی دەســـت لە نەخشـــەکەیان هەڵبگرن."
"نەخێر نابێ هەر بیر لە شـــتێکی وەها بکەیتەوە، دەنا لەبەرچاویان لاواز و بێ دەسەڵات دەردەکەوین، بەدوای چارەسەرێکی دیکەدا بگەڕێ."
"خاوەنشکۆ، لەوە بترازێ هیچ چارەسەرێکی دیکە نابینم."
"قسە لەگەڵ ئایەتوڵڵادا بکە."
"قسەکردن کەڵکی نییە، نابێ لەوێ باڵوێزخانەی ڕوسی دروستبکرێ."
"چۆن ئەوەت زانی؟" پاشـــا وەهای وەڵامی وەزیر دایەوە، لە خۆشـــی دەپرسی تۆ بڵێی وەزیر لایەنی کامەیان بگرێ.
مســـتەوفی ئەلەمامليکيش گوتی: "خاوەنشـکۆ، هەمووان ئەو شـتە دەزانن، هەروەها خۆشتان."

پاشا نەیدەتوانی ئایەتوڵڵا لە شوێنی خۆی بوەستێنێ، وەزیریش دەیزانی ســـازشـــکردن شـــتێکی نەکردەیە ئایەتوڵڵاش لە لای خۆیەوە لە ململانێدا

بوو ئاخۆ لە وتاری ڕۆژی هەینیدا خەڵکەکە لەو مەترسییە ئاگادار بکاتەوە یان نا.
مستەوفی ئەلمەمالیک بە باڵوێزخانەی ڕوسی ڕاگەیاند، کەوا شتێکی ئەستەمە لەو شوێنەی دەستیان پێکردووە باڵوێزخانەی نوێیان دروست بکەن. لێ ڕوسەکان وای بۆچوون بریتانییەکان لەپشت ئەو هەرایە بن، بۆیە هۆشدارییەکەی وەزیریان پشتگوێخست و درێژەیان بە کاروباری خۆیان دا. کرەملین ئامادە نەبوو لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا دەست لە تەلارسازییەکەی هەڵبگرێ.
ئینجا وەزیر خۆی چووە ماڵی ئایەتوللا تا قسەی لەگەڵدا بکا: "من لە خەمخۆریت تێدەگەم، هەر بۆیە زۆر سەرقاڵی ئەوەم شوێنێکی نوێ بۆ ڕوسەکان ببینمەوە. داوات لێدەکەم هەندێک لەسەرم بوەستی."
هەر بەڕاستیش مستەوفی ئەلمەمالیک لەوەدا سەرکەوت شوێنێکی دیکە بۆ ڕوسەکان ببینێتەوە و پەیامی خۆی بۆ پاشا نارد تا بە زووترین کات قسە لەو بابەتەوە بکەن.
پاشاش بە وەزیرەکەی خۆی ڕاگەیاند: "ئێستا نا، دواتر، ئاخر ئێمە بە ئەرکێک لە ڕێگەداین بەرەو مەشهەد دەچین. کاتێک گەڕاینەوە دەتوانیت بێیت و قسەی لێوە بکەین."
شاری مەشهەدیش لەسەر سنووری هیندستان هەڵکەوتبوو، سەردانەکەی پاشاش بۆ ئەوێ دوو هەفتەی پێدەچوو.
وەها دیاربوو پاشا ڕەتیکردبووەوە گوێ بە هەستیاریی پرسەکە بدا و دان بە سەنگینی کێشەکەدا نانێ، ئاخر لەوکاتەی ئەو لە تاران دەرچووە، وەها چاوەڕێ دەکرا تەقینەوەی دۆخەکە لە ئان و ساتی خۆیدا بێ.

ئایەتوللا متمانەی بە وەزیر هەبوو، هەر بۆیە ئامادەیی خۆی بۆ دەربڕی چاوەڕێ بکا تا پاشا لە مەشهەد دەگەڕێتەوە.

ماوەیەک بوو پاشـا مەلیچکی لەگەڵ خۆی نەدەگێڕا. ئاخر بۆ مەلیچکیش زۆر مایەی هەراسـانی بوو لەو گەشتە دوورودرێژانەدا لە جێگەی خۆی بنگرتی ببێ و هیچ بزۆزییەک نەکا، بۆیە ئەو لە ماڵدا مایەوە و بووە مایەی وەڕەزکردنی ئەوانی دیکە. ئەو چەند تفەنگ و دەمانچەی یاری لەو سـاڵانەی ڕابردوو پەیداکردبوون، ئەوانەی لە گەشـت و بۆنە جیاوازەکاندا بەدیاری وەرگرتبوون. یەکێ لەو تفەنگانە لەو گەشـتەی پاشـا بۆ ئەورووپا لە وڵاتی بەلژیک بۆی کڕیبوو. کاتێک بەو تفەنگە نیشانەت لەیەکێک گرتبا و تەقەت لێکردبا، بەهۆی دەنگە زۆرەکەی بابای نیشانەلێگیراوەکە دەشێوا.

کاتێکیش پاشـا بەرەو مەشـهەد کەوتەڕێ، هەموو ڕۆژەکەی مەلیچک بەخۆی و تفەنگە بەلژیکییەکەی بەنێو کۆشـکدا لەجرت و فرتدا بوو. هەرچەندە چاوەکانی وەک خۆیان نەمابوون، لێ ئەو ترسـوتۆقینەی بە لاسـارییەکەی پەیدا دەکرد، کەم نەبووبووەوە. هەمووان لە ترسـان خواردنیان دەدایێ ودەم و بەرکیان پڕ لە شیرینی دەکرد، بەڵکو خوا بکا دەستیان لێنەوەشێنێ و دۆستانە لەگەڵیان بجووڵێتەوە.

پزیشکە بریتانییەکەی پاشا، کە چارەسەری نەخۆشییەکانی مەلیچکیشی دەکرد، جارێک بە پاشـای گوتبوو: "پێویسـتە ئەو زیاتر بجووڵێتەوە و بڕەتێ[104] دەنا لەماوەی یەک دوو ساڵدا دەکەوێ و دەمرێ."

بۆ ئەوەی مەلیچکیش بجووڵێنن و وەرزشـی پێبکەن، پاشـا فەرمانی بە چەنـد نۆکەرێکی چوارشـانە کردبوو نـاوبەنـاو بە کورسـییە دارەبازئاسـاکەی بگەیەننە سـەر گردەکانی دەوروبەر. خۆی دەبووایە نۆکەرەکان قەفەزێکی پڕ لە مریشکیش لەگەڵ خۆیان ببەن. لەوێ لەسەر گردەکاندا مریشکەکانیان بەڕەڵا دەکردن، تا مەلیچک بە خۆی تفەنگەکەی

---

[104] ڕەتاندن: واتە غاردان بە کەسێک یان بە ئاژەڵێک تا کفت و ماندوو دەکەوێ.

بەدوایاندا بکەوێ و ڕاویان بکا. بەم جۆرە مەلیچک وەک یاریکردنێک دەکەوتە جووڵە و هەڵبەز و دابەز. لێ زۆر جاریش دەربەست نەدەهات. ڕۆژێکیان لەسەر گردەکە مەلیچک جەغری[105] پێیداگرت هەر دەبێ ببردرێتە لای بازاڕ. بۆ یەکێک کە یەکەمین جار بێ مەلیچک ببینێ، شتێکی سەیر و سەمەرە بوو، ئاخر شازادەیەکی کەمئەندامی خەپە بەچاوی سەیر و عەنتیکەوە و تفەنگێک بە دەستەوە و لەسەر کورسییەک بەسەر شانی نۆکەرانەوە. مەلیچک حەزی لە بازاڕ بوو، بۆ ئەو خۆشترین جێ بوو، ئاخر لەوێ تێروپڕ شیرنەمەنی دەدرایێ. لە بازاڕ کەس بە هاتنی ئەو دڵخۆش نەدەبوو، چونکە مەلیچک هەمووانی دەترساند، بگەیشتبایە هەر کەسێک بە تفەنگەکەی دەیتۆقاند. دوکاندارەکان چەند جارێک سکالایان لای سەرۆکی ئاسایشپارێزی بازاڕەکە کردبوو، کەوا هاتنی مەلیچک بۆ بازاڕ بە باش نازانن و پەسەندی ناکەن، ئاخر ئەو هەراسانیان دەکا، لێ سەرۆکی ئاسایشپارێزەکە ئەوەندە بوێر نەبوو پرسەکە بە کۆشک ڕابگەیەنێ. هەروەها بروسکەی ڕاستەوخۆش بە کێبڵی تێلێگرافەوە بۆ پاشا دادی نەدا.

ئێستاش شا لەوێ نییە، مەلیچک فەرمانی بە نۆکەران کرد زوو زوو هەڵیگرن و بیبەنە بازاڕ. ڕۆژ دوای ڕۆژ بازاڕی دەشێواند، ئیدی دوکاندارەکان گەیشتە لووتیان. ئەوان مەلیچکە هەرانسانکەریان بە درێژبوونەوەی سایەی پاشا دەبینی. بەندوباوێکی وەهاش کەوتە بازاڕ، گوایە بە مەبەست مەلیچک لە کۆشک هێنراوەتەوە تا بچێتە بازاڕ و دوکاندارەکان هەراسان بکا. ئەم تەنگەتاوبوونە دەروویەکی دەربازبوونی بۆ خۆی دۆزییەوە. هەروەک ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبن، دوای

[105] جەغرین: نەسەلماندن، پێداگرتن بەلایەنی نەرێنییەوە.

نیوەڕۆیەکیان شیرینییەکەی یەکجار زۆریان بەسەر مەلیچکدا هەڵڕشت. سواڵکەرەکانیش قەراپەستێنەیان بوو تا بگەنە ئەو کورسییەی مەلیچکی لەسەر شانان هەڵگیرابوو، یەکدیان پاڵ دەدا و نوکەرەکانیان بەلایەکدا دەخست تا خۆیان بگەیەننەوە شیرنییەکان.

مەلیچکیش ئەو شیرنبارانییە و شەڕی سواڵکەرانی پێخۆش بوو. لە قاقای پێکەنینی دەدا و دەستی دایە تفەنگەکەی. بەم جۆرە پشێوی کەوتە بازاڕ. هەڵگرانی کورسییەکەی مەلیچک پاڵیان پێوەنرا، کورسییەکەی مەلیچکیش لاربووەوە بە قورسایی خۆی و مەلیچکەوە کەوتە سەرزەوی. دوکاندارەکانیش وردە دراویان فڕێدەدا تا سەر لە سواڵکەرەکان بشێوێنن، بەڵام تا دەهات پشێوی و پاشاگەردانی گەورەتر دەبوو. یاساوڵەکان ئەوانەی ئاسایشیان بۆ بازاڕ دەگەڕاندەوە چەند تەقەیەکیان کرد، بە هۆیەوە چەند سواڵکەر و دوکاندار بەرکەوتن و بریندار بوون.

دوای ئەوەی دەرۆزەکەرانیان لەوێ دوورخستنەوە، بینیان مەلیچک بە برینداری لەسەر زەوی کەوتووە. ئینجا خستیانە سەر گالیسکەیەک و بەرەو کۆشکیان بردەوە.

کاتێکیش دوکاندارەکان بینییان وەک شازادەیەک ڕەفتار لەگەڵ مەلیچک دەکرێ، لەکاتێکدا هاوڕێکانی خۆیان بۆ بەخت و چارەنووسی خۆیان جێهێڵراون، بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی بازاڕیان داخست و بەرەو لای ماڵی ئایەتوڵڵا ڕۆیشتن و لە ڕێگاشدا هەر هاواریان دەکرد: "ئەڵڵا، ئەڵڵا، دادپەروەری!"

جەمال خان کە شاهید بوو بەسەر ئەو بارە ناڕەزایەتییەی خەڵک، دەرفەتەکەی قۆستەوە، ئەویش چووە ماڵی ئایەتوڵڵا، لەبەردەمیدا نوشتایەوە و گوتی: "مێژوو لە دەرکەی ماڵی تۆدا دەدا."

تەباتەبائییش گوێی لە هاوار و بانگی ئاپۆرای خەڵک بوو: *ئیلتیجا*(پەنا)، *ئیلتیجا*(پەنا)، ئێمە هەموو هیوایەکمان بە ئێوەیە."

ئایەتوڵڵاش دەرکەی ماڵی خۆی خستە سەر گازەرای پشت، بەڵام نەشیدەزانی ئاخۆ بەو ئاماژەیەی بەرسیاریتی خستە سەرشانی خۆی بەوەی نیشتمان بەرەو ڕۆژگاریکی نوێ دەبا. دوکاندارەکان مافووریان ڕاخست و لەماڵی ئایەتوڵڵا لەسەر چۆک لێی دانیشتن.

بە ڕابەرایەتیی جەمال خان، کەسانێک دروشمێکی گەورەیان بەسەر دەرکەکەدا هەڵواسی، دروشمەکە تەنیا کە لە سێ وشەی بەهێزی مێژوویی پێکهاتبوو: *قانون! مەجلیس! عەدالەتخانە!!* قانون! پەرلەمان، دادگا!

## ٥٦



# ئایەتوڵڵاکان

یەکەمین ئایینی ئێرانی بەناوی زەردەشتی پێغەمبەری ئێرانییەکانەوە بوو. ئاگر لای شوێنکەوتوانی زەردەشت پیرۆز بوو. ئەوان ئاگریان وەک هێمایەکی ئاهورامەزدای خواوەند لەسەر زەویدا دەبینی.

لە پەرستگا هەرە بەناوبانگەکەیان لە شاری یەزد، یەکەمین ئاگر کە مرۆڤ کردبێتییەوە پاراستبوویان. هەربۆیە پەرستگاکان بەناوی ئاتەشکەدەبوون، کە واتای "ماڵێک بۆ ئاگر"ی دەگەیاند.

موغەکانی زەردەشتی ڕێساکانی ژیانی ڕۆژانەیان دادەڕشت و خەڵکەکەش بەو پێیە دەجووڵانەوە.

کاتێکیش عەرەب لەژێر ئاڵای ئیسلامەوە بەسەر ئێرانیان دادا، دینی زەردەشتییان قەدەغە کرد. بەسەر پەرستگە دێرینەکەی یەزدیان دادا تا ئاگرەکەی بکوژێننەوە، بەڵام موبەدەکانی زووتر ئاگرەکەیان لەوێ

لابردبوو، به باوەڕیی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە شـوێنکەوتووان بەرەو هیندستان ڕایان کردبوو.
یەک دوو سەدەی خایاند تا خەڵکەکە ئیسلامی وەک دینی خۆی پەژراند، بەڵام هەر بۆ بەرگریکردن لە خۆیان، ئێرانیەکان ئیسـلامی داگیرکەرانیان ڕەتکردەوە و بیروبـاوەڕێکی نوێی ئیســــلامێتییـان بۆ خۆیـان داهێنـا. ئەوەیش ئیســـلامی ئێرانی بوو، کە پێیدەگوترێ بیروباوەڕی شـیعایەتی. لەو کـاتەوە ئێرانییەکـان ڕوحـانییەکـانی خۆیـان، ئیمـام و ئـایەتوڵڵاکـانی خۆیان هەن، ئایەتوڵڵاش دواپلەی پێگەیی دینییە، کە ئاخوندێک پێی بگا.

ئایەتوڵڵاکان ڕێسـای نوێیان بۆ لەسـەرڕۆیشـتن دارشـت. ئەوان ژیانێکی سادە دەژیان و خۆشیان لە کاروباری سیاسی هەڵناقورتێنن.
ئایەتوڵڵا شـــــیرازیی بەســـــاڵاچوو یەکەمین ئایەتوڵڵا بوو، کە لە لایەن جەمال خان و ئەوانەی وەک ئەو دەســــەڵاتە دینییەکەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی لە ڕێی فتواکەیەوە کۆمەک بە توتنفرۆشـە تووڕە و جوتیارەکانی توتن بکا. دوای ئەوە وردە وردە ئاخوندەکان خزانە نێو ســـیاســـەت و عەودالی سیاسەت بوون.
تەبـاتەبـائییش یەکێک بوو لەوان. دوای ڕووداوەکەی بـازاڕ، تەبـاتەبـائی چووە شـارە پیرۆزەکەی قوم. لەوێ پرسـی بێڕێزیکردنی گۆڕستانەکەی تاران و نەخشەی دروستکردنی باڵوێزخانەیەکی نوێی ڕوسی و ملنەدانی پاشا بۆ گرتنەبەری ڕێکارێکی پێویست لەگەڵدا باس کردن. ئاخر پاشا بە چوونی بۆ مەشهەد پشتی لەوە کرد کێشەکە چارەسەر بکا.
چیرۆکی گۆڕســــتانەکە کاری خۆی کرد، ئایەتوڵڵاکان شـــــتەکەیان بە پێشلکاری و بێڕێزییەکی گەورەی ڕوسەکان بینی بۆ سەر گۆڕستانێکی موسڵمانان. ئیدی لەم کارەدا ئەوانیش پشتی تەباتەبائییان گرت.

زووتر لەوەی چاوەڕێ دەکرا، پاشا لە گەشتەکەی بۆ مەشهەد گەڕایەوە. بە دڵنیابوونەوە لە پشـــتگیریی قومەوە، ئەوە بوو ئایەتوڵڵا تەباتەبائی نامەیەکی توندی لەبارەی پرســـی گۆڕســـتانەکە و کردەوە ســـامناک و تۆقێنەرەکەی مەلیچکی نووسی. ئەو ئەم دوو پرسەی وەها بەکارهێنا تا بگـاتە ئەو داخوازییەی: "گەل داوای قـانون و مەجلیس و عەدالەتخـانە دەکا."

ئایەتوڵڵا ویستی نامەکەی بە تەتەرێک ڕەوانەی کۆشک بکا، بەڵام جەمال خان ڕاوێژێکی دیکەی بۆ کرد. "پاشـــا تۆ پشـــتگوێ دەخا. هەروەها ئەم نامەیەش لای خۆی دادەنێ و دەیمرێنێ. پێموایە ئێمە دەبێ بە شێوەیەکی دیکە بۆی بچین."

ئایەتوڵڵاش پرسی: ""باشە پێشنیازت چییە؟"

"با نامەکەت لە ڕێی باڵوێزخانەی بریتانییەوە بگا. بە پەســـەندنامەی تۆ داوا لە بریتانییەکان دەکەین نامەکەی تۆ بە فەرمی ڕادەستی پاشا بکەن."

"پێموایە ئەمە بیرۆکەیەکی هۆشـمەندانە نییە. باشـە بۆچی ئینگلسـتان بە کاروباری ناوخۆمانەوە بگلێنین؟"

جەمال خانیش وەها وەڵامی دایەوە: "لەوە باشـــتر نییە، خۆ ناکرێ تا هەتایە هەر چاوەڕێی کاردانەوەی پاشـــا بکەین. بێگومان قانوننامەش مافێکی سروشتی هەر گەلێکە. لەم ململانێیەشمان لە دژی پاشا دەکرێ ئینگلستان ببێتە هاوپەیمانمان."

دەســـتەیەکی حەوت کەســـی لە بـازرگـانـان بە نوێنەرایەتیی بـازار، پەیامەکەی ئایەتوڵڵایان گەیاندە باڵوێزخانەی بریتانی. هیچ کەســـێکیش لەوان ئینگلیزیی نەدەزانی. هەر بەڕێکەوتیش پیاوێکی بەناوبانگی بریتانی لە باڵوێزخانەکە بوو، ئەویش براون ئێدوارد گرانڤیل[106] بۆو. ئەو شـــێت و

---

[106] Browne Edward Granvill

شـــەیدای ئێران بووبوو، بە هەموو شـــوێنە وێرانە و کاولگە دێرینەکاندا دەگەڕا و هەوڵی دەدا بەڵکو نهێنیی خەتە بزمـارییەکـان بـدۆزێتەوە و مەتەڵە مێژوویەکەیان هەڵبێنێ. لەو کاتدا بە دەگمەن کەسێکت دەدۆزیەوە ئەوەندەی ئەو براون ئیدوارد گرانڤیلە ئاگاداری مێژووی ئێران بێ. ئەو بە پیشــە پزیشــک بوو، بۆیە چووبایە هەر شــوێنێک پێشــوازیی لێدەکرا. تەمەنی ســی ســاڵان بوو، ســێ کەڕەت هاتبووە ئێران. هەر بۆ خۆیشــی فێرە زمانی فارسی بووبوو.

ئەو کـابرا بریتـانییە لە بـاشــــووری وڵات بوو کـاتێ دەنگوبـاســــی پشێوییەکانی ناو تارانی بیست. لە ناوچەی پاشارگاددا بە دوای کۆشکە کۆنەکـانـدا دەگەڕا ئەوانەی ئەســــکەنـدەری مەزن ئـاگری تێبەردابوون. کاتێک بە هەرایەکەی زانی دەســتی لەکارەکەی هەڵگرت و بە پەلەپڕوزێ بەرەو تاران گەڕایەوە تا پێشهاتە تازەکان لە نزیکەوە ببینێ.

گرانڤیل لەوێ لە شـــوێنی مانەوەی بریتانییەکاندا مایەوە، کاری لەســـەر گەشــتنامە بەناوبانگەکەی بەنێو ئێراندا دەکرد. لەو ڕۆژە دیارەشـــدا ئەو لەپشت پەنجەرەی ژووره بچکۆلەکەی لە نهۆمی دووەمی باڵوێزخانەکەدا وەستابوو، ڕووی لەسەر گۆڕەپانی بازار بوو، چاوەڕێی تێلێگرافوانەکەی دەکرد تا ڕاپۆرتی گەشتنامەکەی بۆ ڕۆژنامەیەکی بریتانی بنێرێ.

لەوێوە ئەو حەوت پیاوی بە کەوا و ســــەڵتە و کڵاوی قووچ و قیتەوە بینین، کە بە شـــــکووە بەرەو باڵوێزخـانەکە دەهـاتن. لەبەر ئەوەی ئەو زمانی فارسـی دەزانی و بەڕەفتار و ئاکاریان بەڵەد بوو، دەمودەسـت لە ڕێڕۆیشتنەکەیانی زانی، شتێکی گرنگ لە ئارادایە.

حەوت بازرگانەکە یاداشـــــتێکیان بە ئینگلیزی لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، کە تێیدا باسـکرابوو مەبەسـتیان لە سـەردانی باڵوێزخانەکە چییە. هەر زوو گرانڤیلیش چاوێکی بە دەقە نووســـراوەکەدا خشـــاند. تەنانەت دوودڵیش

بوو لەوەی ئاخۆ فەرموو لەو حەفت جوامێرە بکا بێنەژوور یان سەرەتا پێویستە باڵوێزی لێ ئاگاداربکاتەوە. ئیدی بڕیاری یەکەمی دا و فەرمووی ژوورەوەی لێکردن.

بۆ مایەی سەرسامی پیاوە ئێرانییەکان، کابرای ئینگلیز بە زمانی خۆیان بەخێریهێنان هەر ڕێک بەگوێرەی دابونەریتەکەشیان لەگەڵیاندا جووڵایەوە: "*خوش امدید، بفەرمائید تو. چای تازە حازر است.* بەخێربێن، فەرموون بۆ ژوورەوە، چاش دەمکراوە و بۆ ئێوە سازە."

بازرگانەکان دەستبەجێ متمانەیان بە کابرای ئینگلیز کرد و گرێی دڵیان لەلا کردەوە.

ئینجا گرانڤیل بە دڵگەرمییەوە چووە ژوورەکەی باڵوێز و دەرکەی لەسەر خۆی پێوەدا و پێیگوت: "حەوت پیاوی ئێرانی لێرە لە خوارەوە چاوەڕێی تۆ دەکەن. ئەوان نامەیەکیان پێیە بە مۆمی سوور مۆرکراوە، دەیانەوێ باڵوێزخانەی بریتانی نامەکەیان بە فەرمی ڕادەستی پاشا بکا."

"باشە بۆچی دەیانەوێ ئێمە ئەو کارەیان بۆ بکەین؟"

"ئەگەر من باش لە چیرۆکەکەیان حاڵی بووبم، ئەوان لە لایەن شاوە پشتگوێخراون. ئێستاش دەیانەوێ لە ڕێی باڵوێزخانەوە هەوڵی خۆیان بدەن و پاشا ناچار بکەن وەڵامی نامەکەیان بداتەوە."

"بەڵام ئەم شتە کارێکی نەکردەیە، بۆ ئێمە نییە لووتمان لە کاروباری ناوەخۆی ئەم وڵاتە بژەنین."

براون ئێدوارد گرانڤیل کەسێکی ئازاد بوو، هیچ چاوی لەسەر پلەوپایەی سیاسییانە نەبوو. نزیکەی سێیەکی ژیانی خۆی لە هیندستان و ئێران بەسەربردبوو، کەیفیشی بە هەڵسوکەوتی بریتانیا لەو وڵاتانە نەدەهات.

ئێستاش باڵوێزەکە پێیگوت ئەو ناتوانێ نامەی ئەو حەوت بازرگانە ئێرانییە وەربگرێ، ئینجا گرانڤیل هەندێ چەمایەوە و بەگوێی باڵوێزی

چرپـانـد: "ئەمە دەرفەتێکی بێوێنەیە بۆ ئیمپراتۆریەتی بریتـانی، دەی نامەکەیان لێوەربگرە."

باڵوێز دابەزیە نهۆمی خوارەوە و چووە لای مێوانەکان، کە بەتاســــەوە چاوەڕێیان دەکرد. یەکێ لە حەوت پیاوەکان نامە مۆرکراوەکەی وەک گەوهەرێک بە ســینگییەوە نووســاندبوو. ئەوان ســڵاویان لە باڵوێز کرد، پیاوەکە نامەکەی توند گرتبوو، خەریک بوو بە زمانی فارســــی چیرۆکی هاتنەکەی بۆ دەگێڕایەوە.
باڵوێزیش بانگی گرانڤیلی کرد تا ببێتە دیلمانج[107] باڵوێزەکە لە فارســــی دەگەیشــت، پێویســتی بە بانگکردنی براون ئیدوارد گرانڤیل نەبوو، بەڵام پێدەچوو بۆ ئەوەی بووبێ شـــتەکە بۆ ئەو کتێبەی گرانڤیل، کە خەریکی نووســــینی بوو، نموونەیی بێ. لەوانەیە هیوای بەوە بووبێ لە ڕێی گرانڤیلەوە هەروەک چۆن ڕووداوەکە دەچێتە نێو مێژووی ئێران، ئاوەهاش بچێتە نێو مێژووی بریتانی.
"باڵوێز دەڵێ ئەم کارە لە جیهانی دیپلۆماسیدا شتێکە نەکراوە و نەبووەتە خوو، کە باڵوێزێک خۆی لە کێشــەکانی ناوەخۆی ئەو وڵاتەی لێی مێوانە هەڵبقورتێنێ. لێ بۆ یەک تــاکەجــار بە شــــێوەیەکی تــایبەت ئەو بەرپرسیارێتییە هەڵدەگرێ و نامەکەی ئێوە بە فەرمی بە پۆســتی خۆیان بۆ پاشــای ڕەوانە دەکا. باڵوێز پێ لەســەر ئەوە دادەگرێ، کە ئینگلســتان لە دەرەوەی ئەو پرســــەیە و خۆی بەدوور دەگرێ لە نــاوەڕۆکی نامەگۆڕینەوەی ئێوە."
ئەو پیاوەی بە نوێنەرایەتیی دەســتەکە قســەی کرد، ســوپاســی باڵوێزی کرد و نامەکەی ڕادەست کرد. ئینجا هەر حەوت پیاوەکە هەندێ سەریان دانەواند و خواحافیزییان کرد و لەوێ ڕۆیشتن.

---

[107] دیلمانج: وەرگێڕ، پاچڤەکار.

کاتێکیش پاشــا نامه مۆردارەکەی بارزگانەکانی لەنێو زەرفێکی بە مۆری بەریتانی بەدەست گەیشت، خەریک بوو لەسەر کورسییەکەی بەربێتەوە. یەکســـەر بانگی وەزیر و عەینولدەولەی کرد. "بازرگانەکان پێیان لە بەرەی خۆیان زیاتر ڕاکێشـاوە. جاری پێشـتر ئێمە بە نەرمی و لاوازیی لەگەڵیان جووڵاینەوە، هەر بۆیە ڕووقایمیان کرد و پەنایان بردووەتە بەر باڵوێزخانەی بریتانی. ئێمە ئەو شـــتە وەک ناپاکییەک لە تەخت و تاجی پاشایەتی دەبینین. ئینگلستان بێ ئەوەی کەس داوای لێبکا خۆی لە کاروباری ئێمە هەڵقورتاندووە. ئێمە دەبێ ئەو بەڵایە ڕیشەکێش بکەین."
داوای لە وەزیر کرد سـکالایەک بگەیەنێتە باڵوێزخانەکە و پێگەی خۆیان پێ نیشـــان بدا، هەروەها داوای لە عەینولدەولەش کرد ئەو کەســـانەی پەیوەندییان بە باڵوێزخانەکە کردووە، بگرێ: "زۆر توند ســـزایان بدە، لەبەر چاوی خەڵکیش وا بکە!"
وەزیر وێرای ئەوە بڵێ: "بەم شـێوازەیە ناتوانین چارەســەری کێشـەکان بکەین. ئێمە ناوەڕۆکی نامەکەیان پشـتگوێ دەخەین، پێویسـتە داواکانیان بزانین."

- "کامە داخوازی، ئەوەی ئەوان دەیانەوێ دژوارە و بێ قانونییە. ئینگلســـتان بۆی نییە پێمانبڵێ لە وڵاتەکەی خۆمان چی بکەین و چی نەکەین."
- "ئەوانە داخوازیی ئینگلستان نین، بەڵکو داخوازی بازاڕن."
- "ئایا بازاڕ پاشایە یان ئێمە؟"
- "ئێوە پاشان و ئەوەش پێویستییەکانی ڕەعیەتەکەتانە، ڕەعیەتێک کە پێویستە گوێیان لێبگرین."
- "ئێمەی پاشای ئێران لەگەڵ ناپاکان لەسەر یەک مێز دانانیشین."
- "ئەم بژاردەیە لێکەوتەی نەخوازراوی بۆ شا لێدەکەوێتەوە."

- "پاشـــاکانی پێش ئێمە هەمیشـــە لەگەڵ هەســـتێکی وەهای نەخوازراوەوە جووڵاونەتەوە."

مســـتەوفی ئەلمەمـالیکیش جەختی کردەوە: "بۆ بەرژەونـدیی تـایبەتی خۆتـان ڕاوێژی من ئەوەیە لەم هەلومەرجەدا هیچ تونـدوتیژییەک بەکارنەهێنرێ."

پاشـا ڕووی دەمی کردە عەینولدەولە و گوتی: "ســەرەتا با ئەو کەسـانە بگرین، کە نامەکەیان گەیاندۆتە باڵوێزخانەکە. پاشـــان قســـە لەبارەی ناوەڕۆکی نامەکە دەکەین."

پاشا بەم قسەیەی براندییەوە و کۆتایی بە هەموو وتووێژێک هێنا.

هەر زوو عەینولدەولە بۆی دەرکەوت ئاخۆ ئەو بازرگانانەی نامەکەیان گەیـاندبووە بـاڵوێزخـانەکە کێن. ئینجـا بەخۆی و تیپێک لە یـاســـاوڵە چەکدارەکانەوە چووە ماڵی ئایەتوڵڵا، لەوێ بازرگان و دوکاندارەکان لەســەر چۆکان دانیشـتبوون. بە تفەنگی دەسـتییەوە ئەو لە نێوەڕاسـتی حەوشـــەی ماڵی ئایەتوڵڵا ڕاوەســـتا، لەکاتێکدا پیاوە چەکدارەکانی هەر حەوت بازرگانەکانی ڕاکێشـــانە دەرەوە. بازرگان و دوکاندارەکانی دیکە ویســـتیـان ڕێگەیـان لێبگرن. هـاواریـان دەکرد: 'لا ئیلاهە ئیللا ئەڵڵا." و پەلاماری یاساوڵەکانیان دا.

ئایەتوڵڵا تەباتەبائییش مێزەرە ڕەشـەکەی فڕێدایە بەرپێی عەینولدەولە و پێیگوت: "من لە ڕەفتارەکەت ئاگادار دەکەمەوە! خودا ئەوەی تۆ دەیکەی قەدەغەی کردووە!" ئینجا ویســتی بچێتە بەردەرکە و یارمەتیی بازرگانە گیراوەکان بدا، بەڵام ڕێگەی لێگیرا.

خەڵکەکەش هاواریان دەکرد: "ئەڵڵا! ئەڵڵا! خەڵکینە، یارمەتی!"

ئینجـا لە هەموو کونوقوژبنێکەوە خەڵـک ڕژانە مـاڵی ئـایەتوڵڵا، لەو شــوێنەی گیراوەکان ســواری گالیســکەیەک کرابوون. عەینولدەولە و

پیاوەکانی خەڵکەکەیان لە دوور ڕاگرت، ئیدی لەوکاتەدا و لەپڕ جەمال خان، کە هەمیشە بە جلێکی ئاخوندانە دەردەکەوت، بە خۆی و دەستەیەک لە شـــوێنکەوتە دڵســـۆزەکانی پەلاماری گالیســـکەکەیان دا. توانییان گیراوەکان ئازاد بکەن، هەروەها لەوەشـــدا ســـەرکەوتن خۆیان بگەیەننە نووسینگەی تێلێگراف و دەرگا ئاسنینە گەورەکەی باڵەخانەکەی پشتەوە لەسەر خۆیان دابخەن.

تا ئەوکات خەڵک هانای بۆ شـــوێنە پیرۆزەکان و ماڵی ئایەتوڵڵاکان دەبرد، بەڵام ئەمە یەکەمین جار بوو، باڵەخانەی تێلێگرافەکە ببێتە جێگەی داڵدەدانی ئەوانەی لەبەردەســتی یاســاوڵەکان هەڵدەهاتن. عەینولدەولەش لە گەمارۆدانی باڵەخانەکە پتر چیدیکەی پێنەدەکرا، پاشـــان ســـواری ئەسپەکەی بووە بۆ لای شا تێیتەقاند تا لە ڕەوشەکە ئاگاداری بکاتەوە.

ئێوارە داهات و دونیا تاریک داهاتبوو، کەچی ئەو یاســاولانەی دەورەی باڵەخانەی تێلێگرافیان گرتبوو، هیچیان لە عەینولدەولە هەڵنەکڕاند و ســەروســەکوتی هەر وەدەرنەکەوتەوە. دیاربوو پاشــاش لەو ئاراســتە نوێیەی ناڕەزایەتیی دوکاندارەکان ســەری لێشــێوابێ. لەنێو باڵەخانەی تێلێگرافەکە کەشــێکی ســەرکەوتن بەســەر داڵدەخوازەکاندا باڵکێش بوو. دوکاندارەکان چەندین تێلێگرافیان بۆ بازاڕەکانی وڵات نارد و بارودۆخی خۆیان لە تاران بۆ ڕوونکردبوونەوە. تێلێگرافەکەشــیان بە دروشـــمی نوێوە واژۆ کردبوو.

هەر هەمان شـــەوی زرینگەی تێلێگرافی باڵوێزخانەی بریتانی هات، ئەویش تێلێگرافێک بوو بۆ باڵوێز نێردرابوو. براون ئێدوارد گرانڤیل بروســکەکەی خوێندەوە: "شــتێکی باوەڕپێنەکراوە، ئەوان داواکارییەکانی خۆیان بە هەموو دنیادا ڕاگەیاندووە. ئەوان پەرلەمان و دادگایەکی باڵا و قانوننامەیان دەوێ و داواشیان لە ئینگلستان کردبوو تا لە ململانێیەکەدا پشتیان بگرێ."

باڵویزیش گوتی: "نازانم ئاخۆ ئەمە هەنگاویکی هۆشــمەندانەیە یان نا. خۆی پێم باشــتربوو ســەرەتا قســەم لەگەڵ کردبان. دەترســم هەموو شتێک لەدەست دەربچێ."

"لەوانەیە، بەڵام لەوانەش نییە. هەروەک پاشــا نەیارەکانیشــی دەزانن یــاریەکە چۆن بکەن. ئەوەی نوێ بێ ئەوەیە ئەوان تێــدەکۆشــن ئینگلستانیش بخەنە پاڵ ڕاپەرینەکەیان."

"ئەمە کـارێکی ئـاڵۆزە. من پرســم بە لەنـدەن کرد و ئێمە خۆمـان لە ڕەوشێکی بێزارکەردا دەبینینەوە."

پاشا لە ڕێی تێلێگرافەکەی خۆیەوە هەمان پەیامی پێگەیشت. کاتی ناوی بازرگانەکی خوێندەوە، ویسـتی ئەویش بخاتە سـەر بارسـتایی تێلێگرافە کەڵەکەبووەکان. ترس و سـڵەمینەوە پەڕیە نێو دڵی پاشـا. ئەم فەرمانەی بە عەینولـدەولە کرد: "کێبلی تێلێگرافی تـاران ببڕە، تـا نەتوانن چیـدی پەیوەنـدی بە دنیـای دەرەوە بکەن. لێنەگەڕێ کەس بچێتە ژوور لای ئەوان، با لە برسان و تینوێتیان ناچار بن بێنەدەرەوە."

هەر زوو هەواڵی داگیرکردنی باڵەخانەی تێلێگراف بەنێو ســـەرتاپای شــــارەکەدا بڵاوبووەوە. ئیدی خەڵک پۆل پۆل خەڵک بۆ پشــتگیریی دوکاندارەکان دەهاتن و ورەیان بەرز دەکردنەوە و بانگیان دەکردن و دروشــمیان بۆ دەکێشـــان. خەڵک هەوڵیدا خواردنیان بۆ لەســـەر شـــوورەکەوە فڕێبداتە ناو خانوەکە، بەڵام هەر کەســێک وەهای کردبا، یەکسـەر یاسـاوڵەکان دەیانگرت و لێیشـیان دەدا. دوکاندارەکانیش لەنێو باڵەخانەکە هەر هاواریان دەکرد: "*مەجلیس! عەدالەتخانە! قانون!*"

ئاپۆرای خەڵکیش هاوارەکەیان دەسـەندەوە: "*ما همە با هم هستیم*، ئێمە لەگەڵ ئێوە داین، ئێمە هەموومان بە یەکەوەین." وێڕای پاسـەوانییەکی توند، کەچی ئازوقە بۆ دوکاندارەکان هەر نێردرا. کاتێک گەورەکانیان

سەیریان نەدەکرد و ئاگایان لێنەدەبوو، هەندێ لە پاساوڵە پاسەوانەکان دەبەی ئاو و خواردنیان لە خەڵکەکە وەردەگرت و دەیاندایە ئەوانەی لەپشت دیوارەکانەوە خۆیان حەشاردابوو.

سێ ڕۆژ وەها ڕۆیشت و هیچ نەقەوما.
دوکاندارەکان لێبڕاوانە لەســـەر قاچی خۆیان وەســـتابوون و هاواریان دەکرد: "یان مەرگ یان قانون!" ئەم دروشـــمە توند و ئاگرینانە لە لایەن ئاپۆرای دەوروبەریان دەنگی دەدایەوە. ئەوانیش ســـەداکەیان دەگەیاندە تەواوی شارەکە.
ئێوارانیش ژنانی پاشا بە خۆیان و دووربینەکانیان وەسەر بان دەکەوتن. بە باشـیش خەڵکەکەیان نەدەبینی، بەڵام مەشـخەڵ و جووڵەی خەڵکیان دەبینی و گوێشیان لەو هاوارەیان دەبوو: "قانون! قانون! قانون!"
دروشـــمەکان شـــتێکیان لە هەناوی ژنانی حەرەمســـەرا دنەدەدا. ئەوان تێنەدەگەیشـــتن ئاخۆ بەکردەوە "قانون" چی دەگەیەنێ و ئاخۆ قانون چ ســـوودێک بە ئەوان دەگەیەنێ. ئەوانیش لەبەر خۆیانەوە وەک ویردێک بخوێنن دەیانگوت "قانون، قانون. قانون"، بە دووبارەکردنەوەی ئەو وشە نامۆییە خۆشییەکی نادیار دەپەڕیە جەستەیان.
پێدەچوو ڕەوشـــەکە بێهوودە بێ. پاشـــا نەیدەویســـت زەبروزەنگ بەکاربهێنێ. خۆنیشاندەرانیش نەیاندەویست باڵەخانەکە جێبهێڵن. باڵوێزی بریتانیا لە لەندەنەوە پێیگوترا بەدوای پەرەســەندنی ڕووداوەکاندا بڕوا، هیچ دەســتپێشـخەرییەک نەنوێنێ، لەگەڵ هەموانیش لەسـەر خەت بێ و قسـە بکا. لەندەن گەیشـتە ئەو ئەنجامە، کە پاشـا ئەو ململانێیە ناباتەوە، هەر بۆیە بە باڵوێز ڕاگەیەنرا لە حاڵەتی هەرە کۆتاییدا دەستێکی یارمەتی بۆ خۆنیشاندەران درێژ بکا.

باڵویزیش گوتی: "نازانم ئاخۆ ئەمە هەنگاویکی هۆشـــمەندانەیە یان نا. خۆی پێم باشــتربوو ســەرەتا قســەم لەگەڵ کردبان. دەترســم هەموو شتێک لەدەست دەربچێ."
"لەوانەیە، بەڵام لەوانەش نییە. هەروەک پاشـــا نەیارەکانیشـــی دەزانن یــاریەکە چۆن بکەن. ئەوەی نوێ بێ ئەوەیە ئەوان تێـدەکۆشـــن ئینگلستانیش بخەنە پاڵ راپەرینەکەیان."
"ئەمە کـارێکی ئـاڵۆزە. من پرســـم بە لەنـدەن کرد و ئێمە خۆمـان لە رەوشێکی بێزارکەردا دەبینینەوە."

پاشا لە رێی تێلێگرافەکەی خۆیەوە هەمان پەیامی پێگەیشت. کاتی ناوی بازرگانەکی خوێندەوە، ویسـتی ئەویش بخاتە سـەر بارسـتایی تێلێگرافە کەڵەکەبووەکان. ترس و سـڵەمینەوە پەرپە نێو دڵی پاشـا. ئەم فەرمانەی بە عەینولـدەولە کرد: "کێبلی تێلێگرافی تـاران ببڕە، تـا نەتوانن چیـدی پەیوەنـدی بە دنیـای دەرەوە بکەن. لێنەگەڕێ کەس بچێتە ژوور لای ئەوان، با لە برسان و تینوێتیان ناچار بن بێنەدەرەوە."
هەر زوو هەواڵی داگیرکردنی بـاڵەخـانەی تێلێگراف بەنێو ســـــەرتـاپـای شـــــارەکەدا بڵاوبووەوە. ئیدی خەڵک پۆل پۆل خەڵک بۆ پشــتگیریی دوکاندارەکان دەهاتن و ورەیان بەرز دەکردنەوە و بانگیان دەکردن و دروشــــمیان بۆ دەکێشـــــان. خەڵک هەوڵیدا خواردنیان بۆ لەســــەر شــــوورەکەوە فڕێبداتە ناو خانوەکە، بەڵام هەر کەســـێک وەهای کردبا، یەکســـەر یاســاوڵەکان دەیانگرت و لێیشـیان دەدا. دوکاندارەکانیش لەنێو باڵەخانەکە هەر هاواریان دەکرد: "*مەجلیس! عەدالەتخانە! قانون!*"
ئاپۆرای خەڵکیش هاوارەکەیان دەســەندەوە: "*ما همە با هم هسـتیم*، ئێمە لەگەڵ ئێوە داین، ئێمە هەمووومان بە یەکەوەین." وێرای پاســـەوانییەکی توند، کەچی ئازوقە بۆ دوکاندارەکان هەر نێردرا. کاتێک گەورەکانیان

سەیریان نەدەکرد و ئاگایان لێنەدەبوو، هەندێ لە یاساوڵە پاسەوانەکان دەبەی ئاو و خواردنیان لە خەڵکەکە وەردەگرت و دەیاندایە ئەوانەی لەپشت دیوارەکانەوە خۆیان حەشاردابوو.

سێ ڕۆژ وەها ڕۆیشت و هیچ نەقەوما.
دوکاندارەکان لێبڕاوانە لەسەر قاچی خۆیان وەستابوون و هاواریان دەکرد: "یان مەرگ یان قانون!" ئەم دروشمە توند و ئاگرینانە لە لایەن ئاپۆرای دەوروبەریان دەنگی دەدایەوە. ئەوانیش سەداکەیان دەگەیاندە تەواوی شارەکە.
ئێوارانیش ژنانی پاشا بە خۆیان و دووربینەکانیان وەسەر بان دەکەوتن. بە باشیش خەڵکەکەیان نەدەبینی، بەڵام مەشخەڵ و جووڵەی خەڵکیان دەبینی و گوێشیان لەو هاوارەیان دەبوو: "قانون! قانون! قانون!"
دروشمەکان شتێکیان لە هەناوی ژنانی حەرەمسەرا دنەدەدا. ئەوان تێنەدەگەیشتن ئاخۆ بەکردەوە "قانون" چی دەگەیەنێ و ئاخۆ قانون چ سوودێک بە ئەوان دەگەیەنێ. ئەوانیش لەبەر خۆیانەوە وەک ویردێک بخوێنن دەیانگوت "قانون، قانون، قانون"، بە دووبارەکردنەوەی ئەو وشە نامۆییە خۆشییەکی نادیار دەپەڕیە جەستەیان.
پێدەچوو ڕەوشەکە بێهوودە بێ. پاشا نەیدەویست زەبروزەنگ بەکاربهێنێ. خۆنیشاندەرانیش نەیاندەویست باڵەخانەکە جێبهێڵن. باڵوێزی بریتانیا لە لەندەنەوە پێیگوترا بەدوای پەرەسەندنی ڕووداوەکاندا بڕوا، هیچ دەستپێشخەرییەک نەنوێنێ، لەگەڵ هەمووانیش لەسەر خەت بێ و قسە بکا. لەندەن گەیشتە ئەو ئەنجامە، کە پاشا ئەو ململانێیە ناباتەوە، هەر بۆیە بە باڵوێز ڕاگەیەنرا لە حاڵەتی هەرە کۆتاییدا دەستێکی یارمەتی بۆ خۆنیشاندەران درێژ بکا.

جەمـال خـان و ئـایەتوڵڵا تەبـاتەبـائی هەموو هەوڵێکیـان دا گەورە ئـایەتوڵلاکـانی قوم بهێننە تـاران، بەو هیوایەی هـاتنی ئەوان دۆخەکە یەکلابکاتەوە. بۆ ئێوارە درەنگ سێ گالیسکە کە نۆ ئایەتوڵڵای تێدابوون گەیشتنە شار. خەڵکیش هەر هاواری دەکرد: "*خوش آمدید، خوش آمدید. سەلەلاهو عەلا محەمەد، سلام بر محمد.* بەخێر بێن، سڵاو لە محەمەد وماڵباتی."

یاساوڵەکانی لای تێلێگراف گالیسکەکانیان وەستاندن. ئایەتوڵڵاکانیش بە شـــەکەتی لە گالیســـکەکان دابەزین. ئایەتوڵڵاکان بەرەو باڵەخانەکەی تێلێگراف ڕۆیشـتن، هیچ یاســاوڵێکیش زاتی نەکرد بیانوەسـتێنی. ئاخر دەیانزانی ئەگەر هەڵەیەکی وەها بکەن، ئەوا ئاپۆرای خەڵک دەیانخاتە بن دەستوپێیان. هەر بۆیە خۆیان لادا بە بێدەنگی سەری خۆیان شۆڕکرد.

کاتێک خەڵکی نێو باڵەخانەی تێلێگراف ئایەتوڵڵاکانیان بینی، لە شـــوێنی خۆیانەوە وروژان و هاواریان دەکرد: "یان مەرگ، یان قانون!"

بەتەمەنترین ئایەتوڵڵا کە ناوی بەهبەهانی بوو، داردەســـتەکەی لە هەوا بەرزکردەوە و لەسـەر ڕیتمی دروشـمەکان ڕایدەوەشـاند. ئەم نیشـانەیە لای ئایەتولاکانی دیکەش دووبارە کرایەوە: "قانون! قانون! قانون!"

پاشـــان ئایەتوڵڵا ماندوو شـــەکەتەکان بەرەو ماڵی ئایەتوڵڵا تەباتەبائی ڕۆیشتن تا لەوێ وەک نارەزاییەک لەسەر چۆکان دابنیشن.

زۆری پێنەچوو دەیان ئاخوندی دیکە شـــوێنپێی ئەوانیان هەڵگرتەوە. باڵوێزخانەی بریتانی ئەمەی دەبینی و هەموو شـتێکی یاداشـت دەکرد و ڕۆژانەش بە تێلێگراف دەینێاردەوە لەندەن. ئیدی مرۆڤ بۆ هەموو شتێک ئامادەبوو.

ئەو دانیشتنەی سەر چۆکانی ئاخوندەکانی قوم پاڵپشتێکی دوکاندارەکانی باڵەخانەی تێلێگراف بوو، بەڵام خۆ هێشـــتا گۆڕانکاریی بەســـەر ڕەوشەکەدا نەهێنا.
پاشا بە هیچ شێوەیەک لە ژێر فشاردا نەچەمایەوە.
جەمال خانیش هەموو شەوان کۆدەبووەوە بەڵکو ئەگەری هاوکاریکردنی دوکاندار و ئایەتوڵڵاکان بگەیەنێتە قۆناغی داهاتوو. ئەوەبوو کۆمیتەکە یەک دوو شـەو لەپاش گەیشـتنی ئایەتوڵڵاکان بڕیارێکی یەکلاکەرەوەیان دا. ئەوان بەسـەر زیندانە سـامناکەکەی تاراندا بدەن و هاوڕێکانیان ئازاد بکەن.

بۆ ڕۆژی پاشـــتر بە ســـەدان لە خۆپیشـــاندەران زنجیر و کۆتی زیندانییەکانی زیندانە شێدارە و تاریکەکەیان پچڕاند.
میرزا ڕەزا لاواز و کەلەلا بووبوو، نەبەزانە وەســـتابوو کاتێ لە دالانە تاریکەکەدا گوێی لە دەنگی جەمال خان بوو بەرەو ژووری زیندانەکەی ئەو دەهات.
لەو شـەڕە تەقەیەی نێوان پاسـەوانانی زیندان و خۆپیشـاندەراندا چوار زینـدانی بوونە قوربـانی. خۆ ئەگەر پـاســـەوانەکـان زەبروزەنگیـان بەکارهێنـابا، بە دەیـان خۆپیشـــاندەر دەکوژران، بەڵام ئەوە ڕوون و ئاشـــکرا بوو، هەنـدێ لە پـاســـەوانەکـانی زینـدانەکە لەگەڵ کردەی خۆپیشاندانەکە هاوئاواز بوون.
کاتێکیش هەواڵی بەسەرداداني زیندانەکە گەیشتە باڵەخانەی تێلێگرافەکە، خۆپیشاندەران پەلاماری هێزی یاساوڵی ئاسایشپارێزی ئەوێیان دا.
عەینەولدەولەش لەبری ئەوەی پاشەکشە بکا، کەوتە حاڵەتی هێرشکردن. فەرمانی بە یاســاوڵەکان کرد بە باریەیەکی[108] گەورە دەرگەی نووسـنگەی

[108] باریە: ستوونێکی ئاسنینە بۆ شکانی بەرد بەکاردێ.

تێلێگرافەکە بشـــکێنن. بە قۆنداغە تفەنگ لە دوکـانـدارەکـانیـان دا، لێ دوکاندارەکانیش بەرگرییان لەخۆیان کرد و هاواریان دەکرد: "یان قانون یان مەرگ!"

چەند کەسـێک پەلاماری عەینولدەولەیان دا. گەمارۆیان دا، ئاخوندێکی گەنج بازی داو جڵەوی ئەسپەکەی گرت. یەکسمەکە هەستا سەر پاشوو و حیلاندی. عەینولدەولەش لولەتی تفەنگەکەی لە ئاخوندەکە کرد، بەڵام ئەو پێی چەپەی گرت و لەسـەر زین هێنایەخوار، ئیدی بەخۆی و تفەنگ و شیرەکەی کەوتە سەر زەوی. ئاخوندە گەنجەگە تفەنگەکەی لێستاند و ویسـتی تەقە لە عەینولدەولە بکا، بەڵام چاوەشـێکی عەینولدەولە لە ئاخوندەکە تەڕدەستتر بوو تەقەی لێکرد و بەریدایەوە.

براون ئێدوارد گرانڤیل لە سەربانی شوێنی حەوانەی بریتانییەکاندا بینی چی ڕوویدا. لەو پاشـاگەردانییەی تەقەی یاسـاوڵەکان و بەرد و داری خۆپیشـاندەران، کە بەرگرییان پێ لە گیانی خۆیان دەکرد، جەمال خان بەنێو گوڕدەمی خەڵکەکەدا ڕایکردە بـاڵوێزخـانەی بریتـانی. لە خوارەوە سـەری هەڵبڕی و هاواری بۆ سـەربانی باڵویزخانە کرد: "براون ئێدوارد گرانڤیل گوێبگرە. زۆری پێ ناچێ دەیان کەس دەکوژرێن. ئینگلسـتان پێویسـتە بە بەرپرسـیارێتیی خۆی ڕاببێ. خۆپیشـاندەران گەمارۆ دراون. دەی دەرگای باڵوێزخانەکەیان لێ بکەنەوە، تا هەمووان بێنەژوور!"

سـەرەتا براون ئێدوارد گرانڤیل لە قسـەکەی تێنەگەیشـت. کاتێک جەختی لێکردەوە ئینجا بانگی کرد: "وا باڵوێز ئاگاداردەکەمەوە."

پێشـتر لەندەن ئەو بوارەی دابووە باڵوێز لە کاتی پێویسـتدا کۆمەکی بەرەی ناکۆکی پاشـا بکا. بۆ دڵنیابوون ویسـتی هێشـتا تێلێگرافێک بۆ لەندەن بنێرێ تا مۆڵەت وەربگرێ. بەڵام گرانڤیل بە هەڵچوونەوە گوتی: "پاشـا لەبەر چـاوی بـاڵوێز خەڵەکەکەی خۆی دەکوژێ، بۆیە نـابێ چاوەڕێی لەندەن بکەی. تۆ دەبێ بڕیار بدەی!"

له دەرەوەش هێزی یاســـاوڵ تەقەی لە خۆپیشـــاندەرە بێ دیفاعەکان دەکرد.

باڵوێز گوتی: "دەرگاکان بکەنەوە!"

گرانڤیـل بەرەو دەرکە ڕایکرد. جەمـال خـان پڕ بەدەنگی بـانگی کرد: "خەڵکینە خۆ بگەیەننە باڵوێزخانەی بریتانی!"

یەک لەدوای یەک دەهاتنە نێو باخەکەی باڵوێزخانە.

لەوکاتەی باڵوێزی بریتانی تێلێگرافێکی بۆ لەندەن لێدەدا، دەیبینی چۆن خەڵکەکە لەپشـت پەرژینی باڵوێزخانەکە بە مسـتی لەهەوا بەرزکراوەوە بەرەو یاساوڵەکان هاواردەکەن: "یان مەرگ، یان قانون!"

# ٥٧

# باڵوێزخانەکە

بۆ ڕۆژی پاشـــتر زۆرینەی خەڵکی شـــار لەبەردەم باڵوێزخانەکە خڕبوونەوە. ئەوان ئەو کەسـانە بوون کە تا ئێسـتا ڕووداوەکانیان هەر دووربەدوور بیســـتبوو. کاتێکیش باخەکانی باڵوێزخانەکە لە ئاپۆرای خەڵکی لێوڕێژ بوو، خەڵک مافوور و ڕایەخیان لەسەر شۆستەی بەردەم باڵویزخـانەکە و لە گۆڕەپانەکە ڕاخســـتن، هیشـــتاش هەر خەڵـک تێکدەقژقژان و هەر دەهـاتن، تـا وای لێهات مۆنجەی دایەوە. مـاڵەکانی دەوروبەریش دەرکەی حەوشـــە و ماڵەکانی خۆیان کردنەوە بۆ ئەوەی هەموو کەسێک بتوانێ داوای ئاویان لێ بکا.

پاشـــا باوەڕی بەو قسـانەی عەیندولدەولە نەدەکرد کە لەبارەی خۆپیشـاندەران بۆی گێڕایەوە. لێوەکانی دەلەرزین و دەسـتیشی لەسـەر

مشتووی شمشێرەکەی بوو. ئەوە بوو عەینولدەولە شەنقاوێک بۆ دواوە گەڕایەوە.

"ئینجا تۆ چیت کرد؟ هەر تەماشات کرد؟" پاشا بە توورەییەوە هاواری بەسەردا دەکرد و گوتی: "تۆ تەنیا داهۆڵێکی چۆلەکەترسێنی، باشە ئەوان چۆن وێرایان بەسەر زیندانادا بدەن؟ چۆن وێرایان خەڵکی دیکە ببەنە نێو باڵوێزخانەی بریتانی؟ دەی لەبەردەممدا مەوەستە هەر دەڵێی بوکەڵەی نێو جامخانەی. برۆ گەمارۆی باڵوێزخانەکە بدە!"

دەستبەجێ عەینولدەولە بەرەو مۆڵگەی سەربازی بەڕێکەوت. بە پشتیوانیی هێزی سەربازی دیکە بەرەو باڵوێزخانەی بریتانی کشا.

تا ئەو بەو کارە ڕابوو، پاشا بانگی وەزیری کرد.

پاشا هێشتا سارد نەبووبوەوە، لەناوخۆی هەر دەکوڵا. "بریتانییەکان خەریکی کودەتان. برۆ ئاگاداریان بکەرەوە و با پێگەی خۆیان بزانن، دەنا داوای یارمەتی لە ڕوسیا دەکەم."

مستەوفی ئەلمەمالیکیش ویستی پاشا هێور بکاتەوە: "پاشا پێویستە بیر لە لەشساغی خۆی بکاتەوە. توورەیی زیان بە تەندروستیت دەگەیەنێ."

پاشاش وەها وەڵامی دایەوە: "باشترە بمرم لەوەی ببینم بریتانییەکان ناچارمان بکەن قانوننامەمان بەسەردا بسەپێنن. دەی برۆ پەیوەندی بە باڵوێزخانەکەوە بکە، فەرمانیان پێ بکە تا خۆپیشاندەران لەوێ دەربکەن و بیاننێرنەوە ماڵێ، دەنا ئەو کارەیان بە جاڕدانی جەنگ لەقەڵەم دەدەم."

ئاخر مایەی هۆشمەندی نییە دەستبەجێ وەها بە توندی لەگەڵیان بکەوینە قسە، کێشەکە، کێشەی باڵوێزخانەی بریتانی نییە."

"بەڵێ، ڕێکوپێک کێشەکە کێشەی باڵوێزخانەکەیە. بریتانییەکان هاوکاریی ئەو کۆمیتەیەن کە ناویان لەخۆ ناوە کۆمیتەی تاران."

"خاوەنشکۆ، ئێمە ناتوانیان بەردەوام هەر بریتانییەکان بە خەتابار بزانین. ئەوان سەرمایەیان لە باشووری وڵاتەکەمان وەبەرهێناوە. ئەوان حکومەتێکیان دەوێ کە خەڵک و دامەزراوەکانیان بپارێزێ."

پاشا گوتی: "ئێ باشە، خۆ حکومەت هەیە."

"بۆ ئەم پرۆژە ئاڵۆزانە، ئێمە حکومەتێکی بێ لایەن و پەرلەمانێکی بەهێزمان پێویستە."

"چییە دیارە وەزیر هەوڵدەدا دروشمی دوژمنەکانمان بە ئێمە بفرۆشێتەوە."

"نەخێر ئەوە ڕاست نییە. ئینگلستان دەیەوێ لە وڵاتەکەماندا بانک دابنێ. خۆ ئەگەر ئێمە قانوننامەیەکی دادوەرییمان نەبێ، ئەوا سەرمایەگوزاران ڕوومان تێناکەن. پاشا پێی سەیرە کە بۆچی باڵوێزخانەی بریتانی ڕێنەی داوە خۆپیشاندەران پەنا بۆ باخی باڵوێزخانەکەیان ببەن. خاوەنشکۆ، داواکانی ئینگلستان یەکسانن بە داواکانی ڕەعیەتەکەی خۆت، بۆیە ڕێگەی پێداون."

"وەزیر وتار بۆ ئێمە دەدا، بەڵام تۆ یەک شتت لە بەڵگەوبەندەکانی خۆت لەبیرچووە. من سەردانی چەند پەرلەمانێکی ئەورووپیم کردووە، ئەو جۆرە پەرلەمانانە بۆ ئێرە ناشێن. دەسەڵات پێویستە بە شێوەیەکی نهێنی بمێنێتەوە هی ئەوە نەبێ کەس بتوانێ دزەی بۆ بکا."

"بەڵێ هەروا دەمێنێتەوە. من ئەوە مسۆگەر دەکەم، بەڵام پرسیارەکە پەسەندنامەی فەرمیی تۆیە تا بتوانم دانوستان لەگەڵ ڕابەرانی خۆپیشاندەران بکەم."

"تا ئەوکاتەی ئەوان لە نێو باڵوێزخانەکەدا بن، من قایل نیم. باڵوێزخانەی بریتانی بە خاکی بریتانیا دادەندرێ. یەکەم جار دەبێ ئەوان لە باڵوێزخانەکە بێنەدەر، پاشان دەکرێ تۆ قسەیان لەگەڵدا بکەی."

وەزیر پێیگوتەوە: "باشە بابزانین چیمان پێدەکرێ."

پاشاش بە پێداگرتنەوە: "ئێمەش حەوسەڵەمان هەیە."

لە لایەکەی دیکەوە، ئایەتوڵلاکانیش لە کەڵکەڵەی ئاراستەی نوێی خۆیاندا بوون.
خۆ ئەگەر خەڵەکەکە هەر لە باخی باڵوێزخانەی بریتانیادا بمێننەوە، بۆ ئایەتوڵلاکانیش سەخت دەبێ ڕاستەوخۆ پشتگیرییان لێبکەن. ئەوکات ناتوانن بڕیاری بێ پێچوپەنا بدەن.
ئەوان بۆ ساتێک دەستیان لە ڕاوێژ و کۆبوونەوە لەگەڵ یەکدی هەڵگرت و بۆ هەڵمژینی هەوایەکی تەڕوتازی چوونە حەوشەی ماڵی ئایەتوڵلا تەباتەبائی.
تەباتەبائی، بەتەمەنترین ئایەتوڵلا بەرەو لای حەوزەکە چوو، دەستی شوشتن و مستە ئاوێکیشی بە دەموچاوی خۆیدا کرد.
قورسایی خۆی خستە سەر گۆچانەکەی بە چاوی نوقاوەوە گوێی لە هەراوزەنای گوڕدەمی خەڵکی سەر جادە گرت. پاشان چووە سەر پەیژەی سەربان.
لەسەر لێواری بانی ماڵی خۆیەوە ئاپۆرای خەڵکەکەی لە لای باڵوێزخانەکە و لەسەر شۆستە و سەکۆی گۆڕەپانەکەی ئەوێ دەبینی.
کاتێکیش خەڵکەکە ئایەتوڵلایان لەسەر بان بینی، تێکرا هاواریان کرد:
"یان مەرگ، یان قانون، یان مەرگ، یان قانون، یان مەرگ، یان قانون."
ئایەتوڵلا بەساڵاچووەکەش بە باسکی چەپەی لەسەر ڕیتمی دروشمە بەکۆمەڵەکەیان بۆ بەرزکردەوە هانیدەدان لەکاتێکدا قۆڵی چەپەی دابوە سەر گۆچانەکەی خۆی پێوە گرتبوو. پاشان چووە سەر لێواری بانەکە دا و لێی دانیشت.
ئاپۆراکە بە دەنگی بڵندتر هاواریان کردەوە: "قانون! قانون! قانون!"

ئێستا ئایەتوڵلایەکی دیکە لەسەر بانەکە لەپاڵ ئایەتوڵلا پیرەکە بەدیارکەوت. خەڵکەکەش دەستیان وەک مشت لە هەوادا بەرزدەکردەوە و پێیەکانیشیان لەزەوی دەکوتا: "یان مەرگ، یان قانون!" بە شێوەیەک هاواریان دەکرد و پێیان لەزەوی دەدا دەرکە و پەنجەرە و بانی باڵوێزخانەکە لەرزین.
یەکێک لە نۆکەران مافوورێکی گەورەی بردە سەربان رایخست و ئایەتوڵلاکانیش ڕوویان لە باڵوێزخانەکە کرد و لێی دانیشتن. بەم جۆرە ئەوانیش چوونە ڕیزی خەڵکە دارژاوەکەی سەر شەقام، بێ ئەوەی خۆیان ڕادەستی سەرانی باڵوێزخانەکە بکەن.

بەم کردەوەیە ئایەتوڵلاکان ئەرکی مستەوفی ئەلمەمالیک لە پێشتر ئاڵۆزتر و قورستر کرد. وەک هەنگاوی یەکەم پەیامێکی بۆ باڵوێز نارد بە زمانێکی ڕەوان و سەنگین داوای لێکرد وا لە خۆپیشاندەران بکا لە باڵوێزخانەکە بچنەدەر.
باڵوێزیش، کە ئایەتوڵلاکانی لەسەر بانەکە بینیبوو، زانی پێگەکەی ئەو لە جاران بەهێزتر بووە. بەلای خۆیەوە ئەویش تەتەرێکی بۆ لای وەزیر ناردەوە تا پێی بڵێ: "ئێمە هیچ لەشکرێکمان لەبەردەستدا نییە تا بتوانین ئەوانەی باڵوێزخانەیان داگیرکردووە وەدەربنێین. من بە تایبەتی سوپاسگوزار دەبم ئەگەر تۆ کۆتایی بەم دۆخە بهێنی. ئینگلستان لایەنی ئارامی لێ هەڵدەبژێرێ."
هەمووان چاوەڕێی ئەوە بوون بارێکی خەمگینی باڵ بەسەر گۆڕەپانەکەدا بکێشی، بەڵام بەپێچەوانەوە کەشێکی خۆشی و جەنجاڵی ژیان باڵکێش بوو. لە هەموو لایەکەوە هەر نان و سەوزە و میوە و قەندەشەکر و کولیچە دەهاتن. خەڵکەکە بەیەکەوە نانیان دەخوارد، بەیەکەوە دەنوستن،

بەیەکەوە قلیانیان دەکێشا و وتووێژیشیان هەر بەیەکەوە بوو. کەسیش نەیدەزانی ئەو دۆخە چەند دەخایەنێ.
لە دەورەی کۆشکیش بێدەنگی و خامۆشی زاڵ بوو. وەها دەردەکەوت پاشا هێشتا نایەوێ مل بۆ ئەو فشارەی خۆپیشاندەران کەچ بکا، بەڵام خۆ نەیدەتوانی هەروا بێ کار و کاردانەوە تەماشا بکا. دەنگوباسی دانیشتنی سەرچۆکانی باڵوێزخانەکە وەهای لێکەوتەوە، لە شارەکانی دیکەشەوە خەڵک بچنە نووسینگەکانی تێلێگراف بۆ پشتیوانیی هاوڕێکانیان ئەوانیش لەوێ درێژە بە دانیشتنی سەرچۆکان بدەن. ئیدی دەبووایە زوو ڕەوشەکە بەلایەکدا بخرێ.
پاشا بەهۆی وەزیرەکەی و لە ڕێی ئینگلستانەوە هەوڵیدەدا لەگەڵ ناکۆکەکان دانوستان بکا. لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ ڕاوێژکارە تایبەت و ئەفسەرانی سوپا کەوتە ڕاوێژ خۆیان بۆ ئەو حاڵەتە ئامادە بکەن کاتێک لە دواییدا پەلاماری تەخت و تاج بدرێ. لەو نێوەشدا زۆر بەنهێنی تەتەری ڕوسی لەنێوان کۆشک و باڵوێزخانەی ڕوسیدا لەجرت و فرتدا بوو.

هەفتەیەک تێپەڕی. دانوستانی وەزیر لەگەڵ نێردەی بازار و وتووێژی لەگەڵ ئایەتوڵلاکان هیچی لێ شین نەبوو. بەرەی ناڕازی نەیاندەویست هیچ هەنگاوێک بنێن بەرلەوەی پاشا داواکانیان نەسەلمێنێ.
پاشاش هەستی بە قورسایی ڕەوشەکە کرد چۆن فشاری بۆ دەهێنێ و سینگی دەگوشی، هەر لەبەر ئەوەش بوو هەندێ جار بە زەحمەت هەناسەی دەدا. ئەو یەک دوو جاران و لە نیوەی شەودا بێدار دەبووەوە، چونکە گوێی لە خوێنی دەبوو قوڵپی دەدا. ئەو خەونی مۆتەکەئاسای دەبینی، خەوی لێ تار دەبوو. لە خەونیدا شوێنی تۆپەکەی دەگواستەوە لوولەی لە باڵوێزخانەکە دەکرد و بەرەو ڕووی خۆپیشاندەرانی باخەکەی

باڵوێزخانه گڕی دەدا. نەخێر، ئەو نەیدەتوانی چیدی بەرگەی ڕەوشـــەکە بگرێ.
پاشا بە عەینولدەولەی گوت: "ئێمە دەبێ دەرسێک بە ئینگلستان دابدەین. بـاخی بـاڵوێزخـانەکە خـاوێن بکەوە. ئەگەر پێویســــت بکـا پەرژین و شوورەکەی دەورەی باڵوێزخانەکە بڕوخێنە و ناپاکەکان لەوێ دەربکە."
فەرمانی پاشـــا ڕوون بوو. ئینجا زاواکەی یەکەیەکی تایبەتی بۆ ئەو مەبەسـتە پێکهێنا، تیپێکی سـوارە چەکدار بە تفەنگ و بە شـمشـێر. دوای نیوەڕۆیەکی درەنـگ بوو کە عەینولـدەولە بە خۆی و هێزەکەی بەرەو باڵوێزخانەکە کشا.
ئێوارەی پێشتریش پێشهاتی دیکە لەگۆڕێدا بوو. گالیسکەی پڕ لە تفەنگ بە قاچاخ هێنرابوونە ناوشار.

کـاتێکیش یەکە تـایبەتیە سـەربـازییەکە لە گۆڕەپـانی بـاڵوێزخـانەکە بەدەرکەوت، گوریسـی دۆخەکە ئەوەندە کشـت بووبوو، لەسـەروبەندی پسـاندا بوو. جەمال خان بە بەرگی ئاخوندییەوە لە دەرکەی پشـتەوەی باڵوێزخانە دەرچوو، خۆی گەیاندە ماڵێکی لاکۆڵان.
عەینولدەولە پیاوەکانی کۆکردنەوە و قســـەی بۆ خەڵکە مانگرتووەکە کرد: "بەناوی پاشاوە داواتان لێدەکەم باڵوێزخانە جێبێڵن."
ئـاپۆرای خەڵکیش لە بـاخەکەی بـاڵوێزخـانەکەدا هـاواریـان دەکرد: "یـان مەرگ، یان قانون!"
"خەڵکینە گوێبگرن! من نامەوێ زەبروزەنگ بەکاربهێنم، دۆستانە داواتان لێدەکەم باڵوێزخانە چۆڵ کەن."
وەڵامەکەش هەر ئەوە بوو: "یان مەرگ، یان قانون."

"خەڵکینە! شـــەرمەزارییە لەبن ئاڵای بێگانەدا دژی پاشـــاکەی خۆتان ڕاپەڕن. من دەرفەتێک دەدەمە ئێوە. ڕێگەتان دەدەم بە ســـەلامەتی لێرە بڕۆنەدەر."
ئاپۆراکە بەرەو ئایەتوڵلاکان هاواریان کردەوە: "یان مەرگ، یان قانون!"
عەینولـدەولە تەقەیەکی بە هەوادا کرد و بـانگی کرد: "دەی هەمووتـان بڕۆنە دەرێ!"
خۆپیشـــــاندەران خۆیـان لە گورە نەبرد. عەینولـدەولە هـاواری کرد: "شمشێر!"
سوارەکان شمشێرەکانیان لە کالان دەرکێشا.
"خەڵکینە! ئەمە دوا ئاگادارکردنەوەیە. دەی باڵوێزخانەکە جێبێڵن!"
ئاپۆرای خەڵکیش هاواری کرد: *قانون! مەجلیس! عەدالەت*!"
عەینولدەولە جارِیدا: "هێرش ببەن!"
یەکەم جـار عەینولـدەولە هێرشـــی بردە ســـەر ڕیزی پێشـــەوەی خۆپیشـــاندەران ئەوانەی لەســـەر شـوســتەکان وەسـتابوون. کاتێکیش گۆڕەپانی باڵوێزخانەکە چۆڵ بوو، ئینجا ســـوارەکان ڕێگەی شـــەقامە لاڕێکەیان گرت.
جـارێکی دیکە عەینولـدەولە ڕووی خۆی لە خۆپیشـــــاندەرەکـانی نێو باڵوێزخانەکە کرد و پێیگوتن: "یەک دەرفەتی دیکەتان دەدەمێ تا بە بێ خوێنڕشتن باڵوێزخانە چۆڵ بکەن."
ئاپۆراکەش هاواری دەکرد: "قانون! قانون! قانون!"
ئینجا شـمشـێرەکەی کێشـایەوە و خسـتیەوە کالانی خۆی، دەسـتی دایە تفەنگەکەی و بانگیکرد: "بەناوی پاشـا داواتان لێدەکەم دەرگاکە بکەنەوە، دەنا تەقە لە هەمووتان دەکەم و بەرتان دەدەمەوە!"
ئاپۆراکە هەر هاواری دەکرد: "مەجلیس! مەجلیس! مەجلیس!"

عەینولدەولە بانگی سوارەکانی کرد ئەوانەی ڕاستەوخۆ لەپشت ئەو وەستابوون: "تفەنگ!"
لوولەی تفەنگی بەرەو باڵویزخانەکە درێژکرد، لەپشتی شوورەکە کپ و کڕی بوو. ئایەتوڵلاکانیش بێ هەستوخوست لەسەر بانەکە دانیشتبوون و ژنانیش کڕ و بێدەنگ. براون ئێدوارد گرانڤیل هەناسەی لەخۆ بڕیبوو، لە نهۆمی سەرەوەی باڵویزخانەکە لە پشت جامی پەنجەرەوە چاوەڕێی دەکرد.
"تەقە بکەن!"
یەک دوو کەس لەپشت شورەکەوە ڕاقەنان، هەر ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو دۆزەخ بەرپابوو. دەرگاکە کرایەوە گوڕدەمی خەڵکەکە بەرەو ڕووی عەینولدەولە و سوارەکان هاتن. گۆڕەپانەکە بووە گۆڕەپانی شەڕ و کوشتار. جەمال خان بە تفەنگەوە لەسەر بانی ماڵەکانەوە خۆی هەڵدایە سەربانێکی نزیک لە گۆڕەپانەکە. لەسەر لێوی بانێک خۆی درێژ کرد و سێرەی لە عەینولدەولە گرت. گوللەکەی بەر شانی کەوت، بەجۆرێک تفەنگی لەدەست پەڕی و خۆیشی لەسەر پشتی ئەسپەکەی گلا. سێ لە سەربازەکانی تەڕدەستانە لەوێ کێشایانەوە دوا و لایان برد.
ئینجا لەهیکەوە سەربازەکان لە هەموو لایەکەوە تەقەیان لێکرا. نەیاندەزانی ئەو فیشەکانە لەکوێوە دێن. کوژراوەکانیان لە شوێنی خۆیان جێهێشتن و بریندارەکانیان هەڵگرتن و لەوێ هەڵاتن.
ئێستا کە خەڵکەکە دەسەڵاتی پەیدابوو بەرەو کۆشک کشان.

عەینولدەولە بەسەختی بریندار بووبوو. یەکێک لە گەورەئەفسەران شوێنی ئەوی گرتەوە. خێرا بەرەو کۆشک لێیخوڕی تا هەواڵەکە بگەیەنێ. لەوێ لەبەردەم پاشا چۆکی دادا و گوتی: "خاوەنشکۆ! پاشایەتی

لە مەترسیدایە. ئێمە هەموو شتێکمان کرد تا کار نەگاتە ئەو ئاستەیە، بەڵام ئاپۆرای چەکدار وا بەرەو کۆشک بەڕێوەیە."
پاشا پرسی: "باشە ئەوان چەکیان لە کوێ بوو؟"
"هیچ لەوبارەوە نازانین، لەهیکەوە لەسەربانەکان و لە هەمولایەکەوە تەقە لە پیاوەکانمان کرا. یەک دو سەربازمان کوژراون و بە دەیانیش بریندارن، لەنێویاندا عەینولدەولەش بریندارە، بەڵام زۆر لە چەکی سەربازەکان کەوتنە دەستی هەڵەوە. دەترسم خۆپیشاندەرەکان بەسەر سەربازگەکەمانیان دادابێ."
پاشاش گوتی: "ئێمە کەوتوینەتە تەڵەوە، باوکم لەو ئینگلیزە بەدفەڕانە ئاگاداری کردبوومەوە."
ئینجا فەرمانی دا ڕیزێک تۆپ لە دەرکەی کۆشک دابەزێنن و ڕێگەی گەیشتنی هەموو شەقام و لارێیکان بە گۆڕەپانی کۆشک بگرن و بەربەست دابنێن.
کاتێکیش ئەفسەرەکە ڕۆیشت، پاشا بانگی سەرۆکی پاسەوانەکانی کرد: "دەی تۆپەکەم ئامادە بکە!"

## ٥٨

# (دوا)ئاگادارکردنەوە

پاشا بەرگی سەربازییانەی پۆشی، دەمانچەی لە خۆ بەست و چاوەڕێی هاتنی وەزیر بوو. لە حەوشەوە گوێی لە تەپەی یەکسمی سوارێک بوو. خۆی بوو، مستەوفی ئەلمەمالیک بوو. پاشا هەوڵیدا ئارام و لەسەرخۆ بێ: "پێموایە لە دانوستانەکان نەگەیشتیە هیچ."

"خاوەنشکۆ ڕاست دەکا. هیچ، بە دەستی بەتاڵ گەڕامەوە."

" ئێمە لە پێشدا دەمانزانی. ئەوانە ناپاکن."

وەزیریش وا وەڵامی دایەوە: "خاوەنشکۆ ئەنجامگیرییەکەت لەجێگەی خۆی نییە. پاشا منی بەبێ دەسەڵاتی دانوستان بەڕێگەدا نارد، چونکە پاشا باوەڕی بە دانوستان نییە. پاشا دەیەوێ ئەم ڕەوشە ئاڵۆزە بە زەبروزەنگ چارەسەر بکا."

پاشا بە سەرنجەوە گوتی: "بۆ وەزیر جوان نییە بەم چەشنە بدوێ."

"خاوەنشکۆ، تۆ ئەم وڵاتەت خستۆتە مەترسی."

"پاشا پێی لەسەر قسەکەی خۆی داگرتەوە: "بۆ وەزیر جوان نییە بەم چەشنە بدوێ."

"تەختوتاج لە مەترسی دایە. لێکەوتەکانی کردەی عەینولدەولە هی ئەوە نین پێشبینی بکرێن. کۆشک بە پیاوی چەکدار گەمارۆدراوە، ئەوان چیدی شەرم لەوە ناکەن بە خۆیان و تفەنگەکانیانەوە بە ڕووی پاشای خۆیان بوەستنەوە."
شتێکی نائاسایی بوو پاشا لێبگەڕێ وەزیرەکەی بەم چەشنە بدوێ. پەرداخێک ئاوی بۆ وەزیر تێکرد. "ئێمە لە پێگەی سەختی وەزیر حاڵیین. باشە ئێستا چ ڕاوێژێکی پێیە؟"
- "لە ئەوانەوە پەیامێکم بۆ خاوەنشکۆ پێیە."
- "لە کێ؟"
- "لە ڕابەرانی ئۆپۆزسیۆن."
- "ئەوان کێن؟"
- "پاشا ئەو کەسانە ناناسێ، بەڵام دوو ئایەتوڵلایان لەگەڵ دان، یەکێکیان پێشتر و لەکاتی هەرای توتندا بینیوتە."
- "ناوی چییە؟"
- "ئایەتوڵلا تەباتەبائی."
- "ئەدی ئەوی دیکە؟"
- "ئایەتوڵلا بەهبەهانی."
- "ئایا ئێمە پێشتر ئەومان بینیوە؟"
- "پێموانیە بینیبێتت، ئەو ئاخوندێکی بەتەمەنە، ئەوەی لەگەڵ نێردەیەک لە قومەوە هاتووەتە تاران. ئەو نوێنەری ئاخوندەکانی قومە."
- "پەیامەکەیان چییە؟"
- "ئەوان دوائاگادارکردنەوەیان بۆ تۆ هەیە."
- "شا بە توندی وەڵامی دایەوە: "ئەوان هیچ نین تا دوائاگادارکردنەوەم بۆ بنێرن."

- "دوامۆڵەتی ئەوان بۆ تۆ تا بەیانی دوای نیوەڕۆیە، تا نوێژی عەسر، بۆ ئەوەی داخوازییەکانیان بسەلمێنی."
- "داخوازییەکانیان چین؟"
- "ئەوان دەیانەوێ قانوننامەیەک، دەسەڵاتی دادوەری و پەرلەمانییان هەبێ."
- "پەرلەمان؟" شا بە زبرییەوە گوتی. "باشە ئەو ئایەتوڵڵا پیرە گەنیوانە چۆن لە پەرلەمان تێدەگەن؟"
- "خاوەنشکۆ، هەموو وڵاتەکە ڕاپەڕیوە. من خەممە. خاوەنشکۆ من بیر لە ئێوە دەکەمەوە. وەک وەزیر لەو بڕوایەدام نیشتمان پێویستی بە شایە. خۆ ئەگەر شا بکەوێ، ئەوا یەکێتییەکە لە بەین دەچێ."
- پاشا پرسی: "باشە دەتوانین چی بکەین؟"
- "هەستێکی وەهام هەیە خۆپیشاندەران ئامادەیەکی ئاشتبوونەوەیان لە پاشا دەوێ. بۆ ئەوەی پشێوییەکە نەهێڵرێ، دەکرێ پاشا بەشێک لە داواکانیان پەسەند بکا."
- "کامە داوایان؟"
- "داوای پەرلەمان. خۆ هەر بەلای کەمییەوە ساڵێکی دەوێ تا پەرلەمان ڕێکدەخرێ و دێتەکایە. لەو ماوەیەدا ئێوە دەتوانن ئارامی بۆ وڵات بگەڕێننەوە و لە هەمان کاتیشدا کایەی ئەوە دەرەخسێنی تێیدا بتوانین بیربکەینەوە."
- "پەرلەمانێک؟ باشە چ جۆرە کەسانێک وەک نوێنەری ئەو گەلە نەخوێندەوارە پەرلەمان پێکدەهێنن؟ مەلاکان؟ ئاخر ئەوان چی لە هەڵسوڕاندنی کاروباری وڵات تێدەگەن؟"
- "خاوەنشکۆ، ئێستا کاتی ئەو تاوتوێکردنە نییە."
- "شا هاواری کرد: "دەستی بریتانییەکان لەپشت ئەو ئایەتوڵڵایانەوە هەیە. بەڵام خۆ ئێمە دوژمنی گەورەتر لە ئینگلستانمان

قاوداوە. باشـە ڕێککەوتین. ئێمە دەسـەڵاتمان بە وەزیرەکەمان دا تا لەو بابەتە قسەیان لەگەڵدا بکا."

ئینجا پاشا یەکسەر چووە ژووری کاری خۆی، دەستی دایە قەڵەمێک و کورتەنامەیەکی نووسـی. کاغەزەکەی قەد کرد و خسـتییە زەرفێک و مۆری خۆی پێوەنا. تەتەرێک نامەکەی بۆ باڵوێزخانەی ڕوسی برد.

زۆری پێنەچوو تا تەتەرەکە لەگەڵ سـوارێک گەڕایەوە. سـوارەکە کاربەدەسـتێکی ڕوسـی بوو، ئەو کەسـەبوو زۆر جاران پاشـا لەگەڵیدا بیروڕای ئاڵوگۆڕ دەکرد. ئینجا بەیەکەوە لە باخی کۆشکدا پیاسەیان کرد و دوای کورتە گفتوگۆیەک لەگەڵ یەکدی، پاشـا کاربەدەسـتەکەی گەڕاندەوە باڵوێزخانەی ڕوسی.

پاشا لەسەر قوللە چاودێرییەکانی کۆشکەکەوە بە دووربین سەیری ئەو ناوەی دەکرد. هێشـتا خۆپیشـاندەران نەکەوتبوونە نێو سـێرەی دووربینەکەی، بەڵام گوێی لە هەراوزەنایان بوو. لە حەرەمسـەراشـدا دەنگەدەنگ پەیدابوو، ژنەکان بە دوو دەستە لە بەرانبەر یەک وەستابوون. شەڕ و دەمەقاڵێ و جوێندان بوو.

ئەو بەسـەر لێویەوە گوتی: "هەرگیز لە مێژوودا ژن هی متمانەپێکردن نەبوون. ئەوان یەکەمین کەسـن کە دەرکەی ژووری نوسـتن بۆ دوژمن تی بدەن."

لەو دەمەدا گالیسـکەیەکی شـاهانە گەیشـتە گۆڕەپانی کۆشـک. پاشـا کەژاوەی دایکی خۆی ناسییەوە. گالیسکەکە لە دەروازەکە هاتە ژوور و لەبەردەم پەیژەکاندا وەسـتا. مەهدولیا دابەزی، سـەرۆکی پاسـەوانەکان مەشخەڵێکی بەرز ڕاگرت تا ژنە بەرپێی خۆی ببینێ.

پاشـا بانگی کردێ: "دایکە، ئەوە تۆ بەو هەرایە و لە ناوەراسـتی شـەوێ لێرە چی دەکەی؟"
"رۆڵەکەم، مێژوو خۆی دووبـارە دەکـاتەوە. من بۆیە بەپەلە بۆ لای تۆ هاتم تا لەپاڵت بوەستم."
"دایکە، تۆ راســـت دەفەرمووی، هەر بە راســـتی مێژوو خۆی دووبارە کردەوە."
مەهدولیا وەڵامی دایەوە: "بەڵام یەک جیاوازی هەیە. جاری پێشـــتر من بەهێزوگوڕی خۆم بەسەر ئەو پەیژانە دەکەوتم."
پاشـاش پێیگوتەوە: "خۆ دەکرا هەر کاتێک پێویسـتت پێم هەبوایە بانگم بکەی." بەدەم ئەم قسـەیە یارمەتی دا تا لەسـەر کورسـییەک لە تەنیشتی ئەو دابنیشێ.
"ئاخر پاشا چۆن بەو هەموو بەربەستانە بیتوانییایە بێتە لام؟ رێکورەوان ویســـتم بەلای ئەو خەڵکەوە بێم تا نیشـــیانیان بدەم، ئێمە ناترســـین. کاتێکیش ئەوان منیان بینی هاواریان کرد: 'قانون، قانون، قانون.' بەڵام ئـاخۆ ئەو خەڵکە چی لە قـانون تێـدەگـا؟ ئەوان هەموویـان بۆگەنیـان کردووە، دەبوایە کە بەلایاندا تێدەپەڕیم بە دەسـتەسـرێک لووتم گرتبایە. هێشـتاش تێناگەم کێ ئەوانەی هێناوەتە سـەر ئەو بیرۆکەیە. کێ تەڵقینی داون و ئەو وشانەی فێرکردوون؟"
"ئێمە خۆمـان کردمـان، ئێمە خۆمـان هۆکـارەکەین. ئەو گەنجـانەی بۆ خوێندن رەوانەی ئەوروپامان کردن، ئێســـتا بوونەتە دوژمنمان. ئێمە ماری سڕبوومان لەنێو لفکەکراسی خۆمان دانابوو."
"کوڕم، من ئەوەت لێ قەدەغە دەکەم لە وەســـتانەوە لە بەرانبەر ئەو ڕێڕۆیشتنەوەی ئەوان لاواز بیت."
"خۆت دەبینی، ئێمە لاواز نـابین، بەڵام ئەوان دوا ئـاگـادارکردنەوەیـان داوینەتێ."

"چ ئاگاداركردنەوەیەك؟"
"دەیانەوێ بۆ بەیانی لەگەڵ نوێژی عەسر داواكانیان بۆ بسەلمێنین."
"ئەوان زۆریان پێ لێهەڵبڕیوە! بێ سـوودوو لە دەرەوەڕا پشـتیوانی دەكرێن، دەنـا زاتیـان نەدەكرد ئەم جۆرە داخوازییـانە بكەن." كـاتێ مەهدولیا وەهای گوت، بڕوانامەیەكی لە بن جلەكانی دەرهێنا.
بەڵگەنامەكەی دایە دەستی پاشا و گوتی: "ئەمە ئەو گرێبەستەیە، باوكت و من لەگەڵ ڕوسـەكاندا كردوومانە. هەمووی ڕەش و سـپی تێدا تۆماركراوە. بەگوێرەی گرێبەسـتەكە بێ، لەسـەر ڕوسـەكانە لە كاتی پێویستیدا یارمەتیتان بدەن. دەی داوای كۆمەكیان لێ بكە!"
پاشاش بەڵگەنامەكەی لێككردەوە، چاوێكی بە بڕگەكاندا خشاند و گوتی: "ئێمە لەگەڵ ڕوسـەكان لە پەیوەندیداین. ئەوان ئاگادارن، بەڵام شـتەكە وەها نییە، تا ئەوان ڕاستەوخۆ بە هانامەوە بێن."
"تێدەگەم. بۆ بەیانی پێویسـتە شـتێك بدۆزینەوە، كاتیش تا دێ تەنگتر دەبێ."
پاشا پێی گوتەوە: "دایكە، ئارام بەوە، هەموو شتێكمان ڕێكخستووە."
مەهدولیاش پرسـی: "چییە، چیت كردووە؟ چ بەڵێنێكت لە ڕوسـەكان وەرگرتووە؟"
لەپڕ پاشا هەڵسایەوە. مەودایەكی دەویست تا بتوانێ ڕووبەڕوو لەگەڵی بكەوێتە قسـە. مەهدولیا لەو ڕەفتارەی زانی دەیەوێ شـتێك بڵێ: "دایكە، من پاشـام، من ئەوە دیاری دەكەم كە تەداروكێك بكەم. بۆ ئەمەشـیان پێویستم بە بیروڕای تۆ نییە."
كەچی مەهدولیا پرسیارەكەی هەر دووپاتە كردەوە: "باشە چ بڕیارێكتان داوە؟"
"دایكە، شـتەكە ڕێكخراوە، حیسـابی خۆمان كردووە. پێویسـت ناكا خەم لەمە بخۆی. تۆ پێویستیت بە پشوودانە. نامەوێ زیاتر سەرت بئێشێنم."

مەهدولیا زانی پاشـــا پلانێکی نهێنی هەیە، ئەوە بۆ یەکەمین جاریشـــە نایەوێ بە دایکی بڵێ. لەنێو قسەکاندا گوتی: "کاتی ئێوە بەسەرچوو."
مەهدولیا ڕاســـتی کرد، پاشـــا نەخشـــەیەکی هەبوو، حەزی لێنەبوو بیدرکێنێ. تۆ بڵێی ئەو متمانەی بە دایکی و دەوروبەری نەبووبێ؟ بۆیە، نەیدەویست دایکی بەو نهێنییانە بزانێ کە دەبووایە جارێ هەر لای پاشا بێ.
مەهدولیا بە دڵڕەنجاوی، بەڵام بە شانازیشەوە بە چاوی فرمێسکاوییەوە گوتی: "پاشـا باشـی بینیوە، ئەز پیر بووم و ئیدی پێویسـتت بە من نییە. تۆ بابی ئەوەندە بەهێزی تا بەتاقی تەنیا دەربەسـتی شـتەکان بێیت. وەک دایکێک شانازیت پێوەدەکەم، من دەڕۆم."

پاشـا هەموو ڕۆژەکەی هیچی نەخوارد. ترسـێکی ناپاکانە بەسـەریدا زاڵ بوو. ئاخر ئەو بە زەبروزەنگ وەزیرە کۆنەکەی لادابوو. ئێســـتاش بە شێوازێکی هەستیارەوە دایکی لە تورەیە. پاشا سەرقاڵی ئەوەبوو هەموو بەرپرســیارییەک بخاتە ســـەرشـــانی خۆی. ئەو شـــتەکەی وەها دەبینی. ئەوەی ڕاستیش بێ ئەو تەنیا مابووەوە.
هەوڵیدا وەک پاشـایەکی ڕاسـتەقینە بجووڵێتەوە، لە ڕووداوە گەورەکانی وڵات نەترسێ. هەر وەهاشی کردبوو. لێ هەنووکە ڕەعیەتەکەی چەکدار و خۆیان لەپشـت تەلیســە خۆڵەکانی دەرەوەی کۆشـکەکە مەڵاس داوە، ئەم جارە هەسـتی بە مەترسـی کرد. لەوانەشـە هەندێک جار پاشـایانی مەزنیش لە ساتە تەنیاییەکانیاندا ترسیان بەسەردا زاڵ بێ.
لە شوێنی خۆی بردەبردێکی لێوەهات: "تاج، نەوەکەم."
ئەرێ باشە بۆچی پێشتر بیری لێنەکردبوونەوە؟ ئەرێ پەردەدارەکەی لە کوێ بوو؟ بۆ یەکەمین جار لەژیاندا بە نـاوی خۆی بـانگی کرد: "ئاغا موشیر!"

هیچ کاردانەوەیەک نەبوو.
جارێکی دیکە پاشا بانگی کردەوە: "ئاغا موشیرا!"
پێدەچوو پەردەدارەکە لە کۆشک نەبێ.
ئینجا کابرا دەستبەجێ و بە غاردان هات.
"برۆ، بە پەلە سواری ئەسپەکەت بە! شێخ ئاغاسیم بۆ بێنە."

پاشا گەڕایەوە ژووری کارەکەی، دەستی دایە قەڵەم و لەسەر کاغەزێک نووسی. لەبنی نامەکەش واژۆی کرد، پاشان لە پەنجەرەوە سەیری کرد ئاخۆ کەی ئاغاسی وەدەردەکەوێ.
لە کۆتاییدا سەرۆکی پاسەوانەکان لەگەڵ ئاغاسییدا هات. پاشا ئاغاسی لەگەڵ خۆی بردە ژوورە بچکۆلانەکەی وتوویژ. "ئێمە شـــتێکی گرنگمان بۆ تاج و بۆ منداڵەکەی، بۆ جێنشین جێهێشتووە. ئێمە دەبێ پێشتر ئەوان بگەیەنینە شوێنێکی ئاسایش پارێزراو."
پاشـــا نامەکەی دایەدەســـتی ئاغاســـی و گوتی: "ئەمە بۆ باڵوێزخانەی ڕوسـییە. تۆ دەبێ دوو شـت بکەی. یەکەمیان هەر بە دەسـتی خۆت ئەم نامەیە دەدەیە باڵوێزی ڕوسی. هەر بەتەنیا دەستی باڵوێز. پاشان بەیانی ســـەر لەزوو بە بێدەنگی تـاج و منـداڵەکەی هەڵـدەگری و دەیـانبەیتە جێهەواری خۆت. لەکاتی پشـێوی و هەرادا لای ئەوان دەمێنیتەوە. ئەگەر ڕەوشی تاران لەدەست دەرچوو، ئێوە بڕۆنە تەورێز. ئەگەر شتێکیشمان بەسەرهات، بۆ ڕوسیا رابکەن، بڕۆنە مۆسکۆ. باقی شتەکەم لەم نایە بۆ باڵوێز نووسیوە."
قسـەی لەوە پتر پێویسـت نەبوو. شـێخ ئاغاسـی بۆ ئەو هەموو متمانەیە دەسـتی پاشای ماچ کرد.
پاشا بە ئۆخەیەکەوە پەرداخێک ئاوی خواردەوە. ئێستا ئەو لەو خەڵکەی لە دەرەوە بوون ترسی نەما، ئەو پێشتر لە ناپاکی دەترسا. ئاخر دەکرێ

کەسانی بازنەی دوروبەری خۆی هەر ئەم شەوە بەسەری دابدەن و بیکوژن. هەر لە منداڵیشەوە ئەو ترسە دێرینەی لەگەڵدا هاتبوو.

باپیرەگەورەی ئەو دوای لەشکرکێشییەکی سەر هیندستان لەناو چادرێک لەسەر گردێکی ئەفغانستاندا نوستبوو. لە لایەن کەسانی بڕواپێکراوی خۆیەوە ئێشکی لێدەگیرا. لێ هەر ئەو پاسەوانە بڕواپێکراوانە بوون لە خەودا دایانە بەر خەنجەران و هەر لەوێ ساردیان کردبووەوە.

هەمیشە هۆزەکەی ئەو باسی ئەو کوشتنەی وەک دەرس و عیبرەتێک دەکرد. پاشا لە منداڵییەوە دەترسا لەوەی شەوێک یەکێک دیت و لە خەودا دەیکوژێ.

ئەمشەویش ترسەکە پتر بووبوو. کێ نالێ ئەمشەو لە لایەن پەردەدارە گوێڕایەڵەکەیەوە کۆتایی نایەت. تۆ بڵێی ئەو پەردەدارە کێیە کە هەرگیز قسەی نەکردووە؟ باشە لە دەرەوەی کۆشک لەگەڵ کێ پەیوەندی کردووە؟ باشە کێ ئەوی ناساندووە؟ بەڵێ، هەر بەڕاست ئەو پیاوە ئەفسووناوییە کێیە، هەر کاتێک پاشا زەنگوڵەکەی ڕاوەشاند ئەو بەدەردەکەوت؟

بۆ ئەوەی لە هەموو سەرەڕۆییەک دووربکەوێتەوە، بڕیاریدا شەوەکە، شەوی دوا ئاگادارکردنەوەکە، لە گەنجینەی ژێرزەمینەکە بەسەر ببا. لەکاتی پێویستیشدا دەتوانێ بەڕێڕەوە نهێنییەکەدا خۆی دەرباز بکا.

# ٥٩

# لەسەر تەختەی شەترەنج

پاشا لەگەڵ گەردەگەردەی بەیانیدا بە خێشکەیی لە کونێ هاتەدەر و بە ئەسپایی دەرکەی ژووری نووستنەکەی خۆی کردەوە، دەستی بە گوێیەوە وەنا و گوێی هەڵخست. کۆشک مات و خامۆش بوو. بۆ هۆڵی مینابەندەکە چوو، وەک هەمیشە جلی سەربازییانەی پۆشیبوو. پاسەوانەکان بێ هیچ کێشەیەک دەهاتن و دەچوون و سەربازەکانیش لە شوێنی خۆیان بوون.

پەردەدارەکە بەدیار کەوت. "ئێمە برسیمانە، بانگی ئاشپەزەکە بکە."

ئاشپەزەکە بەخۆی و مەجمەیەکی[109] گەورەی پڕ لە خواردنەوە هات. تەماشایەکی پاشای کرد و چاوەڕێی کرد تا دەستوور بدا خواردنەکە بۆ تاقیکردنەوە تام بکا.

"ئەرێ ئەمڕۆ بەیانی کەس بۆ لای تۆ هاتە ناندین؟"

ئاشپەزەکە وەڵامیدایەوە: "نەخێر خاوەنشکۆ."

"هیچ کەس؟"

---

[109] مەجمە: سینی، خوان.

"نەخێر خاوەنشکۆ، تەنیا پەردەدارەکە هات."
"ئەدی شەو کەس هاتبووە ناندینێ؟"
ئاشــپەزەکە شــڵەژا، زمانی تێکئاڵا: "نەخێر، خاوەنشــکۆ، من، من ئەوە نازانم."
"دەی هەموو ئەو شتانە بگەڕێنەوە!"
کاتێک ئاشــپەزەکە لەوێ ڕۆیشــت، پاشــا چووە لای ئەو دەرکەیەی هەمیشــە پەردەدارەکە بە ویدا دەهاتە ژوور، ئیدی وەژوور هۆدەکەی پشتەوە کەوت.
پەردەدارەکە لەسەر مێزێک دانیشتبوو، خەریکی بەرچایی خۆی بوو. ئەو لەوێ چاوەڕێی پاشای نەدەکرد، بۆیە کە بینی پەشۆکا و سڵەمیەوە.
"تۆ ئەمڕۆ ئـازاد بە، بڕۆوە مـاڵێ. دواتر پێت ڕادەگەیەنین ئـاخۆ کەی دەتوانی بگەڕێیتەوە."
پەردەدارەکە لە شوێنی خۆی دودڵ بوو.
شا لێبڕاوانە پێیگوتەوە: "تۆ بڕۆرەوە ماڵەوە."
پەردەدارەکە جانتا هەڵواســراوەکەی داگرت و بۆ پاشــا نووشــتایەوە و ڕۆیشــت. ئینجا پاشــا نانێکی تازە و پەنیر و جادانە پڕ چایەکەی پەردەداری لەســـەر مەجمەیەک دانـا و لەگەڵ خۆی بردییە هۆڵی میناپەندەکە.
ســەرۆکی پاســەوانەکان لە دەرکەی دا. تەتەرێکی ســوپا لەبەر دەرکە چاوەڕێی دەکرد.
پاشا گوتی: " چەکەکەی لێ وەربگرە و بینێرە ژوور."
 تەتەرەکە پێیڕاگەیاند، ئایەتوڵڵاکان بانگەوازیان بۆ سەربازان ڕاهێشتووە چەکیان دابنێن و بڕۆنەوە ماڵێ. شــا ویســتی لێی بپرســێ ئاخۆ هەر بەڕاســتی ســـەربازەکان گوێڕایەڵی بانگەوازەکە بوون یان نا، کەچی پرسیارەکەی نەکرد.

پاشا پرسی: "هەر ئەوە بوو؟"
تەتەرەکە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ خاوەنشکۆ." ئینجا چووە دەر.
جارێکی دیکە شا چووە پشت پەنجەرەکە. پاسەوانەکانی بە شێوەی جارانی خۆیان دەسووڕانەوە و سەربازەکانی دیکەش لەسەر دیواردا وشیارانە وەستابوون. ئەو چاوەڕێی وەزیر بوو، بەڵام ئۆقرەشی لەبەر هەڵگیرابوو. هەستیکرد پێویستی بە نوێژکردن هەیە. چوو دەستنوێژی هەڵگرت و ڕووی لە مەککە کرد. کاتێکیش لە نوێژەکەی بووەوە، دەستی دایە قورئانی سورەتی ئەلشەرحی خوێندوە، ئەو سورەتەی خوا قسە لەگەڵ پێغەمبەرەکەی دەکا:

***محەمەد!***
***ئەدی ئێمە دڵی تۆمان خاوێن نەکردەوە؟***
***ئەو بارە قورسەی لەسەر شانت هەبوو، لامان نەبرد؟***
***ئەدی وامان لێنەکردی بە ناوبانگ بیت؟***
***لەبیرت بێ! هەمیشە دوای کاتی تەنگانە، خۆشی دێ.***

شا نەیتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێ.
هەنووکە تەتەری وەزیر هات. ئەویش پەیامێکی زارەکی پێبوو.
پیاوەکە چرپاندییە گوێی پاشا: "من لەگەڵ بەرەی نەیار دانیشتووم و قسەیان لەگەڵدا دەکەم. دانوستانەکان زۆر توند و گرژن و کاتی دەوێ، ئێستا ناتوانم بێمە لات."

جەمال خان و هاوڕێکانی کۆبوونەوەیەکی لەناکاویان لەبارەی لێکەوتەکانی دەستبەسەرداگرتنی کۆشک تاوتوێ کرد. خۆ ئەگەر ئەوان شا دەستبەسەر بکەن و تەختەکەی بڕوخێنن، ئەوا کاردانەوەی [illegible]

و هەم ئایەتوللاکانیش پێشـبینی نەکراو دەبێ. ئەوان لەسـەر ئەوە کۆک بوون، دوا چارە کە دەستی بۆ ببردرێ لادانی پاشا بێ. ئەوان پێویستیان بە واژۆ و مۆری پاشـا هەبوو تا لەسـەر بەڵگەنامەی داواکاریەکانیان بدرێ، بەڵام ئاخۆ چۆن دەتوانن بە بێ خوێنڕشـتن ئەم شـتەیـان دەستبکەوێ؟

هەرچەندە سـەرەتا وەزیریان خسـتبووە ژێر فشـارێکی زۆرەوە، کەچی ئێسـتا سـتراتیژییەکەی ئەوان ئەوە بوو بوارێکی بەرفرەوانتری پێبدەن تاکو وەک ناوبژیوانێکی ڕاستەقینە بە ڕۆڵی خۆی رابێ.

ئینگلسـتانیش لەگەڵ هەرا و پاشـاگەردانییدا نەبوو. ئەوان سـوودیان لە سـیسـتمێکی جێگیر دەبینی. ئەوان دەترسـان کەوتنی شـا پاکانە بداتە دەسـتی ڕوسـەکان تا لە لای باکوورەوە پەلاماری وڵاتەکە بدەن. باڵوێزخانەی بریتانی لەبەر ئەم هۆکارە بوو پشتیوانیی لە ستراتیژییەکەی جەمال خان دەکرد.

دوای ئەوەی خوێندنەوەی قورئان هەندێ ئارامیی بە دڵی پاشا بەخشی، پیاسـەیەکی بەنێو باخەکەدا کرد و لەسـەر زاریشـی هەر سـورەتەکەی دەگوتەوە بەڵکو ورە بـداتەبەر خۆی: "هۆ محەمەد! ئـارام بگرە! ئـارام بگرە! بەرگەی ئەوە بگرە کە پێت دەڵێن!"

پاشـا گومانێکی بۆهات بەوەی پاسـەوان و سـەربازەکان هەر بۆئەوە لەوێن تا چاودێریی پاشـا بکەن.هەر بۆیە بە ئەنقەسـت زۆر لای گوڵ و چیمەنی لای دەریاچەکە مایەوە. دەبێ ئەوان بێنەسـەر ئەو ڕایە، پاشـا بەتەواوی هێوربووەتەوە.

لە پشـتەوەی ماڵی خزمەتکارەکانەوە لێ وەسـەر بانەکە کەوت تا بە دووربین گۆڕەپانەکە بخاتە بن چاودێریی خۆیەوە. هێشتا بەربەستەکان هەر وەک خۆیان بوون، بەڵام ئەوەی مایەی سـەرسـوڕمانی بوو، بینی

هەموویان پڕ لە سەرباز و پاسەوان نین. لای خۆی گومانی بۆ ئەوە چوو، بەشێک لە سەربازەکان بایاندابێتەوە لای ئایەتوڵڵاکان.
ئەوەی بۆ ئەو زۆر مایەی سەرسامی بوو، کشوماتیی گۆڕەپانەکە و کوچە و کۆڵانەکانی دەوروبەری بوون. هەرزوو ئەو بیرۆکەی هات، خۆپیشاندەراکان خۆیان بەدەستەوەدابێ.
شا چووە سەربانی ناندینەکە. لەوێوە بە ڕوونی ئەو کەسانە دەبینران کە لە پشت کیسەخۆڵەکانەوە وەستابوون. وەها دیاربوو وەک ئەوەی چاوەڕێی فەرمانێک بن.
تەماشایەکی لای حەرەمسەراشی کرد، ئەویش هەر کڕ و بێدەنگ بوو. هیچ کەسێک لە دەروازەکەوە دیار نەبوو.
شا هەستی کرد هیچ شوێنێکی دیکەی نییە بۆی بڕوا. ئەو شەترەنجزانێکی چاک بوو، باشتر بوو لە ڕکابەرەکانی و هەنگاوەکانی هەر بۆ پێشەوە بوون. زۆر کەم وابوو لەگەڵ باوکی بدۆڕابا. تەنیا لەگەڵ وەزیری کۆن دەبووایە زۆر جار دانی بە دۆرانەکەی خۆی بنابایە. کەچی لە ژیانی ڕاستەقەینەدا خراپ سەرپەرشتیی گۆڕەپانی یارییەکەی دەکرد. هەڕەشەی کشمات لەسەر پاشا هەبوو. ئەو ئێستا گەیشتبووە ئەو ئاستە، نەتوانێ لەوە زیاتر داشەکانی بجووڵێنێ. ئاخر هەردوو ئەسپ و وەزیر و دوو فیل و سەربازەکانی، هەر هەموویان لە گەمەکە دەرهێنرابوون. نیگای پەڕیە سەر تۆپەکەی خۆی، کە بێ ئیشوکار لەوێ لە حەوشەکە دانرابوو.
بیری بۆ گەنجینەی ژێرزەمینەکە، بۆ دەرچەی ناچاری، بۆ ئەو ئەسپەی لە تەویلەکە ئامادەکرابوو، بۆ هەموو ئەمانە ڕۆیشت. پاشا بەخۆی گوتەوە: "پاشای گەمارۆدراو لەسەر تەختەی شەترەنجدا پێویستە کاتەکەی درێژبکاتەوە. ئێمەش ئەوەمان کرد، وەزیرەکەمان لەگەڵ

نەیارەکان لە وتوویژدایە و ڕوسەکانیشمان بەگەڕ خستوون. هەنووکە من دەبێ وەک پاشایەکی ڕاستەقینە ئارام بگرم."
ڕۆژ گەیشتە تاقی ئاسمانێ. دوائاگادارکردنەوەکە خەریکبوو بەسەردەچوو. ئەرێ پێویستە بچێتە نێو کۆشکەکە و لەوێ ببینێ ئاخۆ چۆن خەڵکەکە بەسەر کۆشکدا دەدەن یان وەک شێرێکی ترسنۆک بچێتە کونی ژێرزەمینەکە و خۆی بشارێتەوە؟ ئەو هەر لەسەر بانەکە وەستا، هەستێکی وەهای بۆ پەیدابوو، هێشتا جڵەوی ڕووداوەکانی لەدەست دەرنەچووە.
نیگای پەڕیە سەر باخی پشتەوەی کۆشک. بینی چۆن خوشکەکەی مەلیچک یارمەتیی براکەی دەدا تا لە ژووری بیهێنێتە دەرێ. ئاخر مەلیچک لە ڕوداوەکەی بازاڕەوە قاچی چەپە و یەک دوو پەراسووی شکابوون. لەوکاتەوە لەسەر جێ کەوتبوو، بەو هۆیەشەوە تا دەهات قورستر دەبوو. پاشا هەموو ئێواران سەرێکی دەدا. خوشکەکەی مەلیچک کورسییەکی بۆ پاشا لای پێخەفی براکەی دانابوو، تا بتوانێ هەر کاتێک ویستی قسە لەگەڵ مەلیچک بکا. مەلیچک لەسەر دەست و پێ بەدەرکەدا هاتەدەر. پاشا بەئاستەم ناسییەوە.
بانگدەری مزگەوتی گەورەی شار بانگی دا: *ئەڵڵاهو ئەکبەر، حەییا عەلا ئەلسەلات*؛ دەی خێراکەن وەرنە نوێژێ.
پاشا هێدمەگرتی بوو. بەسەرچوو، کاتی دوا مۆڵەتەکە تێپەڕی. ئەو چاوەڕێی پشێویی دەکرد، لەوانەیە هەستی بە نائومێدی کردبێ، لێ ئەوەی مایەی سەرسامی ئەو بوو، بانگدەرەکە هێورەیی و بێدەنگی لەگەڵ خۆی هێنا. کۆتایی بە نادڵنیایی هات. ئێستا ئەو شتە دەقەومێ، ئەوەی لێی تۆقی بوو. ئەو هەموو شتێکی کردبوو تا ڕێ لەوە بگرێ و ڕوونەدا.
بانگدەرەکە دووبارەی کردەوە: "حەیا عەلا ئەلسەلات."

ئێستا پێویستە هەمووان چەکەکانیان دابنێن تا بۆ نوێژ کردن ڕوو بکەنە مەککە. ئەمە ساتی ئاشتی بوو، هیچ کەسێک بەسەریدا نادا، هیچ کەس نایکوژێ.
کاتێکیش بانگدەرەکە لە بانگی خۆی بووەوە، دیســـان بێدەنگی باڵکێش بووەوە. پاشـا هەر بەڕاسـتی بینی کە هەمووان پشـتیان لە کۆشـک و ڕوویان کردووەتە مەککە و نوێژەکەیان دابەستووە.

قەلەباچکەیەک بەســـەر گۆڕەپانەکدا فڕی و بە قیغە قیغەکەی دڕی بە بێدەنگیدا دا. نوێژیش تەواو بوو. جووڵە بە ئـاپۆرای خەڵکەکە کەوت. پاشـــا هەوڵیدا هیچی لەبەرچاو گوم نەبێ. خەڵکەکە لە باریەک ترازا و مەودایـان بەیەک دا. وەزیر و دوو ئایەتوڵلا و حەوت پیـاو بە قـاتەوە لەگەڵ دوو کەســـی بێگانە بە پێ بەربەســـتەکەیان تێپەڕاند و بەرەو گۆڕەپانی کۆشک هاتن. لەوێ وەستان و قسەیان کرد.
پاشـــا ئایەتوڵلا تەباتەبائی ناســـییەوە، ئایەتوڵلاکەی دیکەش بەهبەهانی بوو، ئەو ئاخوندە پیرەی یەکەمین کەس بوو چووە سـەربانی ئەو ماڵەی بەرانبەر باڵوێزخانەکە و لێی دانیشت.
پاشـا باڵوێزی بریتانیشـی ناسـییەوە، دووەمین بێگانەش براون ئێدوارد گرانڤیل بوو، بەڵام پێشـــتر ئەوی نەبینیبوو. شـــا گومانی بۆ ئەوەچوو، پیاوەکانی دیکە بازرگانەکانی بازاڕ بن.
ئینجـا پـاشـــا دووربینەکەی لەچـاوکردەوە. وەک ئەوەی نێردەکەی گۆڕەپانەکەی بۆ دیدار بانگ کردبێ، بۆیە لەســـەر بان دابەزی و چووە هۆڵی مینابەندەکە و چاوەڕێی ســـەردانەکەی کرد. لە بەرانبەر ئاوێنەدا کڵاوەکەی سەری ڕاست کردەوە، ئینجا بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆیشت.
وەزیر لەگەڵ سـەرۆکی پاسـەوانەکان قسـەی دەکرد. پاشـان سـەرۆکی پاسەوانەکان هات تا پاشا ئاگادار بکاتەوە.

کاتێک لە دەرکە درا، پاشا بە حەوسەڵەوە گوتی: "وەرە ژوورا!"
پیاوەکە ئیکلامی کێشــا و گوتی: "باڵوێزی شــانشــینی بریتانی لەگەڵ نێردەیەک لە دەروازەن، داوا دەکەن ئاخۆ پاشــا دەیەوێ بیانبینێ؟ هەروەها وەزیریشیان لەگەڵدایە و چاوەڕوانە."
هێشتا پاشا کشمات نەبووە، دەکرێ زیاتر یاری بکا.
" بۆ ژوور یاوەرییان بکە."
وەزیر مســتەوفی ئەلمەمالیک یەکەمین کەس هاتەژوور، هات و لەپشــت پاشا شتێکی بەگوێیدا چرپاند.
کاتێکیش مێوانەکان گەیشتنە نێو هۆڵی مینابەندەکە، پاشا لای کورسیی گەورەپاشاکانی ئێرانیدا وەستا.
بەهبەهانی بە سادەیی گوتی: "سڵاو لە پاشا."
پاشاش وەڵامی دایەوە": "سڵاو!"
باقی نێردەکەش سڵاویان کرد.
وەزیر هەر هەموویانی بە پاشــا ناســاند و ئینجا چوو لەپشــت پاشــاوە وەستا.
بریتانییەکان بەجیا وەســـتان. بازرگانەکانیش کڵاوی خۆیان داکرت. شوێنەکەیان لەپێش ئایەتوڵڵاکانەوە بوو.
بە ئاماژەیەکی شــاهانە پاشــا ئاماژەی بە ڕیزێک کورســی لەژێر ئاوێنە گەورەکە دا. لەبەرئەوەی ئایەتوڵڵا بەهبەهـانی هەر بەپێوە بوو، ئەوانی دیکەش دانەنیشتن.
باڵوێزی بریتانی دەســتپێشــخەری کرد. یەک هەنگاو هاتە پێشــەوە و بە ئینگلیزی گوتی: "خاوەنشکۆ، جارێ فارسییە شەقوشڕەکەم هەڵدەگرمەوە و قســەی پێناکەم. ئینگلســتان تێکەڵ بە کاروباری ناوەخۆیی ئێوە نابێ. بێ خواســتی خۆمان تێکەڵی ئەو ڕووداوانە بووین، بەڵام تۆ پێویســتە بزانی، ئینگلســتان پاڵپشــتی پاشــایە. پاشــایەکی دەســتڕۆیشــتوو زۆر لە

بەرژەوەندیی ئێمە دایە. پێدەچێ زۆر شـــتی ناروون لەبارەی ڕۆڵی باڵوێزخانەی بریتانی لە ڕووداوەکانی ئەو ئەو ماوەی ڕابردودا گوترابێ، بەڵام من پاشا مسۆگەر دەکەمەوە، ئینگلستان لەو بارەیەوە ناکارابووە. لەو ڕۆژانە من وەک پێناوێک قســـە دەکەم. براون ئێدوارد گرانڤیلیش وەک دیلمانج تا تەموژییەکە لەبەین بەرێ.

گرانڤیل بۆ پاشـا چەمایەوە و باڵوێزیش درێژەی بە قسـەکانی خۆی دا: "ئەو نێردەیەی لێرەیە بڕوانامەیەکیان لەگەڵ خۆ هێناوە، تێیدا داوا لە خاوەنشـکۆ دەکەن پەسـەندنامەی خۆی لەبارەی پێکهێنانی پەرلەمانێک دەرببڕێ. وەک باڵوێزی بریتانی داوام لێکرا وەک شـاهیدێک بێمە ناو. ئیدی لێرەوە دەستوەردانی ئینگلستان لەم پرسە دەوەستێ."

کاتێکیش باڵوێز یەک هەنگاو بۆ دواوە گەڕایەوە، ئایەتوڵڵا پیرەکە بە گۆچانەکەی خۆی ئاماژەی بۆ یەکێک لە بازرگانەکان کرد. ئەویش لێ چووە پێش و سـەری خۆی دانەواند و زەرفێکی ڕادەسـتی پاشـا کرد. پاشاش بڕوانامە سێ لاپەڕەییەکەی لەنێو زەرفەکە دەرهێنا و سەیرێکی کرد. لە ڕوخسارەکەی نەدەخوێندرایەوە ئاخۆ ڕامانی چییە.

ئەو جـارێکی دیکە ئـامـاژەی بە میوانەکـان کرد تـا لە شــوێنی دەستنیشـانکراوی خۆیان دابنیشن. ئایەتوڵڵا بەهبەهانی بە لەسـەرخۆیی بەرەو کورســییەک ڕۆیشــت. ئیدی کەشـــە دژوارەکە ڕەویەوە. هەر ئایەتوڵڵا دانیشـــت و دانەنیشـــت، گۆچانەکەی لەدەســـت بەربووەوە. ئایەتوڵڵا تەباتەبائی هەڵیگرتەوە و دایەوە دەستی بەهەبەهانی لە تەنیشت ئەودا دانیشت. ئەوانی دیکەش بەدوای ئەودا دانیشتن. پاشا زەنگوڵەکەی لێدا و بـانگی کرد: "چـا بۆ میوانـان!" لێ ئەوەی لەبیر کردبوو پەردەدارەکەی نـاردبووەوە مـاڵی خۆی. هیچی دیکەی نەگوت. بەو بەڵگەنامەی لەناو لەپی دەسـتی دابوو، بیری لێدەکردەوە. براون ئێدوارد گرانڤیل پرسی: "ڕێگەم دەدەی یەک دوو قسە بکەم؟"

پاشا بە سەرنجەوە سەیرێکی کرد و گوتی: "فەرموو قسە بکە."
"من گەڕیدەیەکم. من دەنووسم، من مەراقی مێژووی وڵاتەکەتانم. ساڵانی دوورودرێژ لە ئێران ژیاوم. یەک ڕاستی هەیە لای من ماوەتەوە، ئەگەر پاشا ڕێگە بدا، پێتانی ڕادەگەیەنم."
ئەو فارسییە نایابەی قسەی پێدەکرد سەرنجی پاشای ڕاکێشا. ئاماژەیەکی بۆ کرد درێژە بە قسەکەی بدا.
"من ئەوەم بەدی کردووە، ئێرانییەکان پاشاکەی خۆیان خۆشدەوێ. ئەو گەلەی کە ئێستا بە تفەنگەوە لەپشت کیسە خۆڵەکانیشەوە وەستاوە، ئێوەیان خۆشدەوێ."
بەم قسەیە خەندەیەک پەڕییە سەر ڕوخساری شا. دەستی بۆ بەرکی کەواکەی برد بەڵکو یەک دوو دراوی ئاڵتونی دەربێنێ و بۆ گرانڤیل فڕێی بدا. ترینگەی دراوەکان دەبیسترا، لێ لای خۆی هێشتنەوە. پاشا تا لای مێزەکە ڕۆیشت، پەرداخێک ئاوی بۆخۆی تێکرد و قومێکی لێدا. دەستەی ئامادەبووان چاویان لەسەر هەر جووڵەیەکی بوو. پاشا هەوڵیدا کات بەدەست بێنێ بەو مەبەستەی بەڵکو دەروویەکی لەسەر ببێتەوە و لەو دۆخە ڕزگاری ببێ. جارێکی دیکە لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد، نەخێر، هیچ شتێک ڕوونادا. نێردەکە بڕوانامەیەکی داوەتێ، ئێستا ماوەتەوە سەر ئەو.
ئەویش بۆ لای مێزەکە ڕۆیشت، دەستی دا خامەیەک لەپەڕی قاز، نووکەکەی لە مەرەکەب هەڵێنا، کاغەزەکەی واژۆ کرد و بە مۆری ئەنگوستیلەکەشی ناوەڕۆکەکەی سەلماند و پەسەندی کرد. ئامادەبووان بەو ڕاستییە سەرسام بوون، کە شا بەختی خۆی دیاریکرد. ئینجا بەڵگەنامەکەی لوول دا و دایە دەستی وەزیر. وەزیریش لای خۆیەوە دایە دەستی ئایەتوڵڵا بەهبەهانی. ئایەتوڵڵاش سەری نەوی کرد و تەماشای کرد. ئاخۆ پاشا دەستی بۆ دێنێ تا تۆقەی لەگەڵ بکا. لێ پاشا

ئەو جوولەیەی پشـــتگوێخســـت و ڕووی لە وەزیر کرد: "تا دەرەوە یاوەریی ئەو پیاوانە بکە."
لەکاتێکدا ئامادەبووان دەچوونەدەر و گرانفیل وەستا.
کاتێکیش نێردەکە لەوێ ڕۆیشـــت، شـــا گوتی: "تۆ دەڵێی نووســـەری، لەبارەی چییەوە دەنووسی؟"
"من لە کەلاوە کۆنەکاندا بەدوای مێژوودا دەگەڕێم، بەڵام خۆشەویستیی زۆرم بۆ خەڵکی ئاســـاییە. من زۆر گەشـــت دەکەم، ئەزموونەکەم دەنووسمەوە. دیدارم لەگەڵ ئێوە یەکێکە لەو ساتە هەستیارانە، بێ سێ و دوو لەسەری دەوەستم."
"تۆ مەیلت بە لای سیاسەتدا ناڕوا؟"
"نەخێر، من لەبارەی ژیانی ڕۆژانە، لەبارەی کەلتوور، لەبارەی بەها و دابونەریتەوە دەنووسم."
"خۆ ئەگەر لەبارەی منیشەوە بنووسی، ئەمەی خوارەوە بنووسە: "پاشا دەڵێ: من بڕیاردەدەم!"
"خاوەنشکۆ، مەبەستت چییە؟"
ئەویش وەها وەڵامی دایەوە: "دواتر لێی تێدەگەی."

کاتێکیش نێردەکە لە کۆشـــک هاتنەدەرەوە، پیاوەکانی بازاڕ کڵاوەکانیان بۆ هەوا بەرزکردنەوە. بەم جۆرە جەمال خان و میرزا ڕەزا و ئەندامەکانی دیکەی کۆمیتەکەیان تێگەیاند، پاشـــا بەڵگەنامەکەی مۆر کردووە. کەس باوەڕی نەدەکرد، هیچ کەس نەیدەویست بەرلەوەی مۆری پاشا لەسەر بڕوانامەکە ببینێ، فیکەی خۆشی لێبدا.
جەمال خان بەڵگەنامەکەی لێککردەوە و هاواری کرد: "*جاوید ئێران!* بژی ئێران!"
ئیدی هەزاران گەروو هاواریان کرد "*جاوید! جاوید!* با بژی!"

میرزا ڕەزا بە لاوازی و پەشـــێوحاڵی لەبەر زیندانییە دوورودرێژەکەی، دەسـتی دایە ئالایە سـێ ڕەنگەکەی وڵات، بازیدایە سـەر سـەکۆیەک و بانگی کرد: 'ئاهەنگەکە دەسـتپێکرد! پاشـا پەرلەمانی نیشـتمانیی پەسـەند کرد!'

ئامادەبووانیش هاواریان کرد: '*مەجلیس، مەجلیس، مەجلیس*! (پەرلەمان، پەرلەرمان، پەرلەمان)'

تاران وروژا، بووە شـایی و لۆغان، موزیک ژەنرا، گۆرانی گوترا، خەڵکی سـەر جادە باوەشـیان بەیەکدا دەکرد و ژنانیش لەسـەر بانان فرمێسـکی شـــادیيان لە چاو دەهاتەخوار. خەڵک هەڵپەڕی، کەوتنە ســـەما، ئەو بازرگانەکانی بازاڕیان لەسەر شانان دانان و پەسنی کۆڵنەدانەکەیان درا. دوو ئایەتوڵلاکەش بە یاوەری گوڕدەمی خەڵکەوە چوونە ئەو ماڵەی کە ئایەتوڵلاکانی قوم لەوێ لەسـەر چۆک دانیشـتبوون. ئیدی خەڵک هاواری کرد: '*موبارەک، موبارەک، مەجلیس موبارەک*: پیرۆزە، پیرۆزە، پەرلەمان پیرۆزە.'

جاران بە شـێوەیەکی ئاسـایی خەڵکی ئێران هەسـتوسـۆز و هەڵچوونیان بە وشــە و دروشــم دەردەبڕی، لێ ئەمە یەکەمین جار بوو لە مێژوودا، ئـاپۆرای خەڵکی بەیەکەوە وەک ســـوپاســنامەیەک چەپڵە لێبدەن. دوکـانـدارەکـان گەڕانەوە بـازار تـا دوای مـانگرتنێکی زۆر دەرگـای دوکانەکانیان بکەنەوە. ماوەی هەفتەیەکی ڕەبەق لە هەموو لایەکی وڵات ئاهەنگ گێڕدرا. خەلک بەیەکدییان دەگوت: 'هەوا بۆنی گوڵی لێدێ.' بەڵێ ئەوان ڕاسـت بوون، ئاخر جۆرە بەهارێک داهات. هەمووان هەسـتیان بە باشیی خۆیان دەکرد، هەمووان شادمان بوون. هەمووان پێدەکەنین.

# ٦٠

# مەجلیس

لە کشـــوماتییدا گەر لە کۆشـــک دەرزی بەربووبایەوە گوێت لێدەبوو، کەچی لە ناوجەرگەی تاراندا هەراوزەنایەک بوو هەر مەپرســـە. ڕۆژانە ئەندامـانی کۆمیتەی بەرگری، نوێنەرانی بـازار، بریگرتە ڕێپێدراوەکـانی ئـایەتوللاکـان تـا درەنگـانی شـــەو کۆدەبوونە تـا کـارێکی وەهـا بکەن دانیشتنی یەکەمی پەرلەمان ساز بکەن.

شـتێک بوو بە بیر کەسـدا نەدەهات بە ماوەیەکی کورت بتوانن نوێنەری هەموو چین و توێژ و پیشـــەکـان لەیەک کۆبکەنەوە. لێ کۆمیتەکە دەیەویســـت تا زووە بیچمێک بە پەرلەمان ببەخشـــن، چونکە کاتەکە بۆ ئەوان لەبار بوو. بڕیاریان دا نوێنەری هەموو شـارە گەورەکان بۆ تاران داوا بکەن، بەوەی لەماوەی مانگێکدا پەرلەمانێکی کاتیی پێکبهێنن. کەواتە شـتەکە پەیوەندی هەبوو بە نوێنەرانی شـەش چینە گرنگەکەی کۆمەڵگە: خانەوادەی پاشـایەتی، ئاخوندەکان، هۆزەکان، بازاڕ، کەرتی پیشـەسازی و زانایان.

هەروەها بڕیاریان دا لەدوای سێ مانگ کۆبوونەوەی داهاتوویان ببەسترێ. لەو دوو کۆبوونەوانەشدا پاشا بڕوانامەی دەستور واژۆ دەکا. بە دوای باڵەخانەیەکی شایستەتەدا بۆ بارەگای پەرلەمان دەگەڕان، بەڵام ئەو باڵەخانانەی بۆ ئەم کارە دەستیان دەدا، هەموویان موڵکی پاشا و شازادەکان بوون، هیچ کەسیش لەوان دەستبەرداری موڵکەکەی خۆی نەدەبوو. بگرەوبەردەی زۆر پەیدابوو، دوای کێشمەکێشێکی زۆر، لە کۆتاییدا پاشا قایلبوو، باڵەخانەیەکی کۆنی میریی بۆ پەرلەمان بەتاڵ بکا. ئەو وەهای دانابوو شتەکە بۆ ماوەیەکی کاتییە.

بە نابەدڵیشەوە فەرمانی ئەوەی بۆ چاپخانەی پاشایەتی دەرکرد سەد و پەنجا دانە لە دەستووری پێشنیازکراو چاپ بکا، بۆ ئەوەی نوێنەرانی گەل بیخوێننەوە و تاوتوێی بکەن لە کۆبوونەوەی دووەمی پەرلەماندا لێی کەم و زیاد بکەن و بڕیاری لەسەر بدەن. ئەم ژمارە زۆرەی کتێبەکە یەکەمین هەنگاوی ناچاکردن بوو بۆ شا تا ڕێگە بدا بیروڕای ڕەعیەتەکەی بزانێ و پەسەندی بکا.

لەپاش مانگێک لە تەداروک، نوێنەران لە میانەی ئاهەنگێکی گەورەی شار چوونە نێو تەلاری پەرلەمان. ئایەتوڵڵاکان لەپێشەوە بوون، شازادەکان بە دوایاندا ئینجا پیاوە ناودارەکانی بازاڕ، بەدوای ئەوانیشدا نوێنەران بوون، هەر هەمووشیان بە جلوبەرگی ڕازاوەی ئاهەنگ و کڵاوی بەرز و قووچەوە بوون. هەروەها جەمال خان و میرزا ڕەزای هاوخەباتی لەگەڵ چەند ئەندامی دیکەی کۆمیتەکە وەک ڕێکخەرانی بۆنەکە لەگەڵیاندا چوونەژوور.

چەند سوارێک بە سواری ئەسپ کە بە شێوەیەکی جوان ڕازابوونەوە لەپێشەوە دەڕۆیشتن و پاسەوانەکانیش بە جلی جوان و نایابەوە

کەرەنایان[110] بۆ لێدەدان. هەمووان هەسـتیان کرد ئەمە ڕێڕەوێشـتێکی بێوێنەیە، ئایەتوڵلا شـایستەکان، شـازادەکان بە خۆیان و داری زێڕکەڵت لەبن هەنگڵ، بـازرگـانەکـان و عەبا گرانبەهـاکـانیـان کە لە قومـاشـی ئینگلیزییەوە دروسـتکرابوون. لەوێوە دەسـتبەجێ نیگای تەماشـاکەران پەڕیە سـەر چەکمە ڕەشـە بریقەدارەکان، کە هەموو نوێنەران لەپێیاندا بوو. لەوانەیە هەر بەڕێکەوت بووبێ هەموویان لەم جۆرە پێڵاوانەیان لە پێ کردبێ، بەڵام یەکسەر وەک هێمای سەردەمێکی نوێ دەبینرا.

کـاتێکیش نوێنەران دانیشـتن، بەتەمەنترین نوێنەر وەک سـەرۆکی دانیشـتنی پەرلەمانەکە دانرا. هەمووان چاوەڕێی پێوقەدەی پاشـایان دەکرد. خەڵک گرەویان لەسـەر ئەوە دەکرد، لەدوا سـاتدا شـتەکەی بۆ قووت نەدرێ و بەرگە نەگرێ. یەک دوو لە نوێنەران پێشنیازی ئەوەیان کرد، ئەگەر هاتوو پاشـا ئەوان پشـتگوێ بخا و نەیەت، پەرلەمان پەک نەخرێ و بڕیاری خۆی بدا. بەڵام ئەم شـتە نەدەکرا، ئاخر ئامادەبوونی پاشا داواکراو بوو تا دانیشتنەکە ڕەوایەتیی خۆی وەربگرێ.
هاتنی پاشـا کۆتایی بە هەر مشـتومڕێکی لەو بابەتە هێنا. ئەو بەسـواری ئەسـپێکی کەتەی ڕەشـەوە گەیشـتە بەردەم تەلاری پەرلەمان. هەندێ شـڵەژاوی پەیدابوو، ئاخۆ کێ پێشـوازی لێبکا. جەمال خان ئاماژەی بۆ میرزا ڕەزا کرد. میرزاش ڕەزا بە خۆی پێڵاوە ڕەشـە بریقەدارە نوێیەکەوە بەرەو پیری شـا ڕۆیشـت، سـەری بۆ نەوی کرد و گوتی: "خاوەنشکۆ!"
پاشـا سـەیری نەکرد، هەر بۆیە هیچ گومانێک نەبوو بزانێ ئاخۆ ئەو پیاوە هەر هەمان ئەو کەسـەیە کە عەینولدەولە بە زنجیر کۆتوبەندی

---

[110] کەرەنا: ئامرازێکە لە شـاخی گا یان لە کانزا دروسـت دەکرێ، بۆ جاڕدان و ئاگادارکردنەوە لە شەڕ و مەترسییەکان لێدەدرێ.

کردبوو خســـتبوویه بەر پێیان. میرزا ڕەزا یاوەریی پاشـــای کرد و گەیاندییە سەر سەکۆی پەرلەمان. شا چاوێکی لە نوێنەران کرد و گوتی: "ئێمە پاشای ئێران، هەمیشە خەونمان بە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆوە دەبینی. سوپاسی خوداش دەکەین خەونەکەی ئێمەی بەدیهێنا."

پاشا بێباکانە لە شوێنی خۆی بێدەنگ بوو، دوودڵ بوو ئاخۆ لەمە زیاتر بڵێ یان نا، یان باشتر وایە بچێتە سـەر کورسـییەکی دیکە و دابنیشـێ. لەمە یـاتر هیچی دیکەیـان لەو چـاوەڕێ نەدەکرد. هەر بەتەنیـا ئامادەبوونەکەی داخواز بوو تا ڕەوایەتی بە دانیشـتەکەیان بدا. ئێسـتا بۆی هەبوو بگەڕێتەوە ماڵێ و تا دوای چەند مانگێک کاتێک پەرلەمان لە دانانی دەسـتور دەبێتەوە ئینجا بە فەرمی دەسـتوورەکە پەسـەند بکا و مۆری خۆی لێبدا. ئەو لەسەر سەکۆکە هاتە خوار بەرەو دەرگا ڕۆیشت پەرلەمانی بەجێهێشت.

هەر دوای ئەوەی ئەو ڕۆیشـــت، ئیدی یەکێک زاتی کرد چەپڵە لێبدا، هەرزوو بەدوایدا هەمووان چەپڵەیان لێدا. خۆی ئەمە چەپڵەیەکی توند و دوورودرێژ بوو، تەنانەت شـــا بەردەرکەی دەرەوەی پەرلەمانیش هەر گوێی لێبوو. لەوێ لەســـەر پەیژەکان وەســتا و گوێی لێگرت. پاشـــان بە هێواشـــی لە پەیژەکان دابەزی و بەلای تۆپەکەیدا تێپەڕی، کە لەســـەر گالیسکەیەک بارکرابوو، ئینجا ڕۆیشت.

لە کۆشک چووە ژووری کارکردنی و ڕۆژژمێرەکەی کردەوە. ئەوەندەی نووسی تا پەنجەکانی بە ژان کەوتن.

بەرلەوەی بچێتە نێو پێخەفەکەی، پیاســـەیەکی بە نێو حەوشـــەی کۆشـکەکەدا کرد. بینی دەرکەی ژووری مەلیچک تی درابوو، هێشتا چرا مۆمدارەکەی هەر دەسووتا.

پاشـــا چووە ژوور و لەســـەر کورســـییەکەی تەنیشـــت تەختی مەلیچک دانیشت. باشیش نەیدەبینی ئاخۆ مەلیچک بەئاگایە یان خەوتووە. کەچی

لەگەڵی کەوتە قسە: "ئەوان پەرلەمانێکیان بۆ خۆیان ڕێکخست. مەلای ریشداریش یەک لەپاڵ یەک لەڕیزی پێشەوە دانیشتبوون. هەموویان جلی گرانبەها و پێڵاوی چەرمینیان پۆشیبوو. پێیانوایە ئەگەر هات و جلی گرانبەها لەبەربکەن، دەمودەست دەبنە سیاسییەکی لێزان و باش. ئەوانە بووکەڵەن و ئینگلستان لەپشت ئەم کارەوەیە. ئێمە شتێکی پووچمان ڕاگەیاند و بەو هۆیەوە ئەوان زۆر بەکەیف بوون و چەپڵەیان لێدا، چەپڵەیان بۆ ئێمە لێدا. لێ گەلۆ، خۆ ئەوان نازانن چ نەخشەیەکمان بۆ دارشتوون. زۆر ناخایەنێ جارێکی دیکە کۆدەبنەوە. ئەوان دەیانەوێ دەستورەکەیان بۆ پەسەند بکەین. ئێمەش جارێ لێدەگەڕێین، خەون ببینن. مەلیچک، نابێ تۆ ئەم شتە بۆ کەس بگێڕیەوە. بۆ جاری داهاتوو، ئەگەر خەڵکەکە کۆبووەوە، ئەوا مەرگ بەرۆکیان دەگرێ. هەموو شتێک ڕێکخراوە، ڕوسەکان سۆزی خۆیان دەگەیننە سەر."

شا گوێی لە تەپەی پێ بوو. پاشان گوێی لە دەنگی خوشکی مەلیچک بوو. ئینجا هەڵسا و بەنێو تاریکایی شەودا گەڕایەوە شوێنی خۆی.

# ٦١

# کارەبا

ڕوسـیا داواکەی پاشـای پەسـەند کرد، چونکە وەهایان مەزندەکردبوو ئەگەر هاتوو ئینگلسـتان پەرلەمانیان بکەوێتە بن دەسـت، ئەوا دەبێتە گەورەترین براوەی ململانێیەکە. هەرچەندە سـەرچڵییەکی سـەربازیانەش بوو، بەڵام ڕوسیا وەک دوا دەرفەتی خۆی دەبینی تا ناوچەکەی لەدەست دەرنەچێ، چونکە بریتـانیـا وەردە وردە خەریکبوو بەرەی لەبن پێیـان دەردەهێنا.

هەروەها ڕوس هاتنەسـەر ئەوەی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ باوکی شـادا بەسـتبوویان جێبەجێ بکەن، بەوەی لە کاتی پێویسـتدا لەپشـت شـاوە بوەسـتن و نەهێڵن بکەوێ. وەهاشـیان نیشـان دا بە پەلە خەریکی ئامادەکارین و لەسـەر پێن. لەو نێوەشـدا دەبوایە پاشـا دانی بەخۆیدا بگرتایە.

بۆ ئەوەی کاتەکە بکوژێ لە کارەبا قووڵبووەوە. دوای گەشــــتەکەی بۆ ئەوروپا چەند گۆڕانکارییەکی لە کۆشــــک کردبوو. یەکێکیان دانانی تێلێگراف بوو، بەڵام خۆ لەمەیـانـدا ســــەرکەوتوو نەبوو. دەمێک بوو ئامێری تێلێگرافەکە لە کابینەی تەنیشـــــت هۆڵی مینـابەندەکەدا کـاری پێنەکرابوو.

نەخشــەی نوێی دانانی گڵۆپی نوێ بوون بۆ کۆشـک. لە فرەنسـادا لەگەڵ کارگەیەک رێککەوتبوو کارەبا بۆ کۆشــــکەکەی دابین بکا. ئەندازیارێکی فرەنسـایی بەر لە هەرایەکە هاتبووە تاران تا لەگەڵ پاشـادا قسـە لەسـەر پرۆژەکەدا بکا. ئەو هەوڵیدەدا پاشــــا بهێنێتە ســــەر ئەو ڕایە، تا لەپاڵ کۆشک چەند دانەیەکیش لە دامودەزگاکانی میری و ناوجەرگەی تارانیش ڕووناک بکاتەوە، لێ پاشا کارەبای تەنیاوتەنیا هەر بۆ خۆی دەویست.

کابرای فرەنســــی تازە خەریکبوو دەســــت بە جێبەجێکردنی نەخشــــەی پرۆژەکەی بکـا، کەچی لە هەموو لایەکی تــاران هەرای مــانگرتن و خۆپیشـــــاندان بەرپابوو. هەرایەکە وای لێکرد کارەکەی بوەســــتێنێ و بگەڕێتەوە فرەنســـا. هەنووکەش پاشــا داوای لە ئەندازیارە فرەنســییەکە کرد بێتەوە و کارەکەی تەواو بکا.

ئەندازیـارەکە مـانگێکی پێویســــــت بوو تـا ژووری دەزگـای کـارەبـا لە باخەکەی پشــتەوەی کۆشـک دروسـت بکا. پاشـا ڕۆژانە سـەری دەدا و ئەندازیارەکەی دەبینی و قســـەی لەگەڵدا دەکرد و چێژی لەو کارەدەبینی کە پەرجووی دەئـافرانـد. دەکرێ مرۆ وەهـای بۆ بچێ پـاشـــــا وەک یاریدەرێکی کابرای فرەنسی وابوو. پاشا دەستی دەدایە دەرنافیسێک و برغوی بادەدا تا توندی بکا. کێبلەکانی دەپێوا، لە وایەرە مسـینەکان ورد دەبووەوە و لە پرسنی خۆیەوە پرسیاری تەکنیکیانەی لێدەکردن.

ئەندازیارەکە ســــەدان مەتر کێبلی زیادەی هێنابوو، هەروەها چەندین ســندوقی پڕ لە گڵۆپیش. ئەو هێشــتا هەر هەوڵی دەدا قەناعەت بە پاشــا

بکا بەوەی کارەباکە نەوەک هەر بەشـــی کۆشـــک دەکا بەڵکو لە توانایدا هەیە گۆڕەپانی کۆشک و شـەقامەکانی دەوروبەریشـی ڕووناک بکاتەوە، لێ پاشـــا پێیداگرت هەر کۆشـــک و بەس. ئەو دەیەویســـت هەر بەتەنیا هۆڵی میناپەندەکە، ژووری کاری خۆی، ژووری نووستنی و ڕاڕەوەکانی کۆشـــک و حەوشـــەکەی کارەبادار بکا. وەک ئەوەی ئەو هیچ خەمێکی دیکەی نەبێ بەدەر لە ڕووناککردنەوە کۆشکەکەی نەبێ.

پێش وادەی نەخشەکە هەموو شتێک ئامادە کرا و ئەندازیارەکەش داوای لە پاشـــا کرد ڕۆژێک لە کۆشـــک بچێتەدەر، تا کارەکەی تاقی بکاتەوە. پاشاش وەهای کرد و بە تاسەوە چاوەڕێی هاتنی شەوی کرد.

ئەندازیارەکە لە هۆڵی میناپەندەکەدا پلاکێکی ڕەنگزێڕینی بۆ شـا لەسـەر مێزێک لە تەنیشت کورسیی پاشایەتی دانابوو.

هەر کاتێک تاریک دابهاتبایە، پاشـا پەردەی هەڵدەدایەوە دەچووە سـەر کورسییەکەی دادەنیشت. دەستێکی لەسەر پلاکەکە دادەنا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشـــا، ســـاتێک دەوەســـتا ئینجا دوگمەکەی دادەگرت و گڵۆپەکەی پێدەکرد.

پەرچوو ڕووی دەدا، تـاریکییەکە بەیەک جـار ڕاودەنرا و ڕونـاکییە ڕەنگزێڕینەکە بە هەموو لایەکی هۆڵەکە پەخش دەبوو. پـاشـــا بە حەپەسـاوی لەسـەر کورسـییەکەی دەمایەوە و تەماشـای دەوروبەری خۆی دەکرد. چلچرایەکە شـــەوقی دەدایەوە، ئاوێنەکە دەبریســـکایەوە، بیچمە ڕەنگـاوڕەنگەکـانی ســـەر مـافوورەکە وەک ئەوەی هەزاران بەردەگەوهەری بچکۆلەبن لەسـەر تەختەبەندە ڕەنگهەنارییەکە و لەسـەر فەرشە کەسکەکە، جادوویانە شەوقیان دەدایەوە.

لەسـەر کورسـییەکەی هەڵسـتا، لە ئاوێنەکەدا تەماشـایەکی خۆی دەکرد. پرچە ماشوبرنجییەکەی لەبن کڵاوەکەی وەک مسێکی شوراوە دیاربوو،

کوریشـــکەکانی[111] ســـەر دەموچاویشـــی وردەکاتر دەردەکەوتن. لەبەر ڕووناکییەکەدا، تەواو لە باوکی دەچوو، ئەمەش ورووژاندی و هێنایە جۆش و وردەفرمێسکی لەچاو باراندن.

ڕۆژەکانی پاشتر لە هۆڵی مینابەندەکەدا پێشوازیی لە دەستە دەستەی ژنەکانی کرد. ئاماژەی بۆ کردن لەوێ لەســـەر ناوکەوەکە دابنیشـــن. کاتێکیش بەتەواوی تاریک دەبوو، دەچووە ســـەرکورســـییەکەی و بانگی دەکرد: "بێدەنگی!" ئینجا یەک دەقە دەبووایە متەقیان لەخۆیان بڕیبا. ئینجا پاڵی بە دوگمەی کارەباکەوە دەنا، چێژ و خۆشـــی لەو ســـاتەوەختەی کاردانەوەی ژنەکانی دەبینی. دوای ئەوەی ژنەکان ســـەراسیمە و ئەوق دەمانەوە، پەسنی پاشایان بۆ گڵۆپەکان دەدا و تێدەکۆشان وای لێبکەن هەمان شتیش بۆ حەرەمسەرا بسازێنێ.
ئەویش بەڵێنی پێدان: "ئەمە دەکەین، بەڵام بە ژنەکانی دیکە مەڵێن. دەمەوێ ئەوانیش هەروەک ئێوە بەم شتە غافڵگیر بکەم."

بێجگە لەو داهێنانە نوێیە ئەو خۆشیی لە نەوەکەشی دەبینی. کوڕیژگەکە هەموو ڕۆژێک دوای بەرچایی دەهێنرایە کۆشـــک بۆ ئەوەی پاشـــا یەک ســـەعات یاری لەگەڵ بکردبایە. ئەو خۆی لەســـەر زگ درێژ دەکرد، کوڕیژگەکەی دەچووە سەر پشت، ئینجا تەکانێکی دەدا لەسەر دەست و پێ لەسەر مافوورەکە لەمسەری هۆڵەکە بۆ ئەوسەر دەڕۆیشت. شیعری خۆی بۆ دەخوێندەوە و دەنگی خۆیشـــی بۆ دەگۆڕی، بە شـــێوەیەک ئەو منداڵەی دەهێنایە پێکەنین. دەســـت لەدەســـت بەنێو حەوشـــە و باخەکەدا پیاسەی دەکرد، فێری دەکرد ئاگای لە گوڵ و چۆلەکە بێ.

---

[111] کوریشک: چرچولۆچی سەر دەموچاو.

عەککاسـباشـی، وێنەگرەکەی کۆشـک دەیان وێنەی پاشـا و نەوەکەی گرتبوو، وەک: وێنەی پاشـا کە منداڵەکەی لە کۆشـی[112]بێو، منداڵەکەی لەسـەر پشت، لەسـەر مل، لەسـەر مێزەکەی، لەسـەر پشتی ئەسپەکەی، لەسـەر تۆپەکەی و لەباوەشـی کە پلی خستبووە سـەر پلاکی کارەباکە، بەهەموو شێوەیەک وێنەی گرتبوو.

کاتێکیش ژنانی حەرەمسـەرا بێئومێد بوون لەوەی پاشـا بەڵێنی خۆی ناگەیەنێتە سـەر، بۆ ڕۆژێک ژنەکانی ناردنە سـەر مەزاری چاکی عەبدولداود. فەرمانی دا یەک دوو کێبل لە ژووری دەزگای کارەباوە بۆ حەرەمسـەرا ڕابکێشـرێ، لە نیوەڕۆدا چلچرا کۆنەکانی گۆڕین و گڵۆپی نوێی لە جێگە دانا. شـا داوای لە ئەندازیارەکە کرد ئاخۆ کێبل و گڵۆپی بەردەسـت هەن تا کارەبا بۆ ژووری موزیکیش ڕابکێشـێ و چلچرا کۆنەکەی ئەوێش بە گڵۆپی نوێ بگۆڕێ.
ئەندازیارە فرەنسیەکە بەخەنەدوە گوتی: "بۆ پاشا کار مەیسەرە."
بۆ شەوەکەی کاتێ ژنەکان ماندوو شەکەت گەڕانەوە کۆشک، خەریکبوو شـتەکە باوەڕ نەکەن. ئەوان لە خۆشـییان قیژاندیان کاتێک پاشـایان لە دەرکەی حەرەمسـەراوە بینی، ماچیان کرد و باوەشـیان پێداکرد و شەوێکی دووردوودرێژیان بە خۆشی لەگەڵدا بردەسەر.

دوو هەفتە مابوون بۆ دانیشـتنی دووەمی پەرلەمان. سـەربازانی ڕوسـی بە خێشکەیی بێئەوەی هەستیان پێبکرێ بە باشی لەسنوور پەڕیبوونەوە و خۆیان لە سـەربازگەکانی دەوروبەری تاران حەشـار دابوو. پاشـا ئەو بەختەی کەوا سـەربازانی ڕوس لە هاتنیاندا ئاشـکرا نەبووبوون و کەس

---

[112] کوش: باوەش.

هەستی پێ نەکردبوون، بە نیشانەیەکی خودایی بۆ سەرکەوتنی کردەنیازەکە زانی.
هەرچەند ڕۆژی ڕاستییەکە نزیک دەکەوتەوە، ئەوەندە لەسەر شانی پاشا قورستر دەبوو. بۆ ئەوەی خۆی لە وروژاوی و دڵەکوتە و هەڵچوون دەرباز بکا، نەوەک هەستی پێبکرێ، بیری لەشتێک کردەوە کە پێشتر نەیکردبوو.
لە پاریس بەشداریی ئاهەنگێکی دەمامکدارانەی کردبوو. ئیدی بڕیاری دا بە شێوازێکی فارسییانە هەمان ئاهەنگ لە ژووری موزیک ساز بکا. ئاخر بەم جۆرە خەڵک وا تێدەگەن گوایە پاشا بەتەواوی سیاسەتی بەلاوە ناوە و خووی داوەتە لایەنێکی خۆشی و ڕابواردنی پاشایەتی.
هاموشۆیەتی چل ژنی لە هەموو جۆرە تەمەنەکان لێهەڵبژارد، لەنێویاندا بەتەمەنترین و گەنجترین ژنی خۆیشی تێدابوو. فەرمانی پێکردن هەر یەکە و دەمامکێک بۆ خۆی پەیدابکا و خۆیان جوان بکەن و بە ئارایش و جلی کەشخە و جوان جوانەوە. ئەو ئازادیەی پێدان ئەو شەوە هەرچی دڵیان دەخوازێ بۆ خۆیان بیکەن.
ئاهەنگێکی وای لێکەوتەوە، هەرگیز لەبیرنەدەکرا. ژنە دەمامکدارەکان یەک بەدوای یەک لە ژوورەکانیان هاتنەدەر. ئەوان بە بوونەوەری ناوازە دەچوون، ئیرەیی لای ژنانی دیکە وروژاند. بە قاقای و تریقەی پێکەنینەوە ئەو ژنە لێگیراوانە بەسەر ڕایەخێکی سووردا چوونە ژووری موزیک. وەک ئەوە وابوو لە هەسارەیەکی دیکە دابەزیبنە سەر زەوی. شا لە خۆشییان خەنی بووبوو. ژنە دەمامکدارەکان کاری وەهایان دەکرد لە ژیانی ڕۆژانە و لەبەردەم پاشادا هەرگیز زاتیان نەدەکرد بیکەن. ئەوان بەناز و عیشوە دەجوڵان و بەدەست ئاماژەیان دەدا و پاشاش پێی شاگەشکە بووبوو. دووکەڵێکی چڕی بخوور لە ژوورەکە هەڵسا و سێ ژنی دەمامکدار موزیکژەن ئاهەنگێکی شادیان لێدەدا.

ئاهەنگی دەمامکەکە یەک هەفتە درێژەی کێشا. پاشا ژنە دەمامکدارەکانی دەگۆڕی، هەر شەوە و دەستەیەک. ئەو چێژی لەو بەزمە دەبینی، هەر بەڕاستییش بووبووە ئاهەنگێکی شاهانە، بەڵام خۆ ئەو هەر ئەوەندەی پێدەکرا دۆخە بێ ئۆقرەییەکەی و بخاتە ژێر فشار نەوەک بیرەوێنێتەوە. دەبوو گرژییەکە خاو بکرێتەوە پێویستی بەوە هەبوو شتێک بشکێنێ، بقیژێنێ، بگریێ، دەست بوەشێنێ. شەوێکیان بیرۆکەیەکی جەهەننەمی بۆ هات و ئاراستەی ئاهەنگەکەی گۆڕی.

"خانمینە گوێبگرن، ئەمشەو لە تاریکیدا یارییەک دەکەین. کاتێک گڵۆپەکان دەکوژێنەوە، موزیکژەنەکان لەسەر هەوای خۆیان دەبن. پاشان لە تاریکییدا هەرچی پێتانخۆشە بیڵێن و بیکەن. ئێوە بە تەواوی سەربەستن. دەکرێ پاڵ بەیەکەوە بنێن، لەیەک هەڵدەن، لەیەک بدەن، نوقرچ لەیەک بگرن، یەکدی بگەزن. هەموو ئامادەن؟ کاتێ ڕووناکی کوژایەوە، ئێوە دەستپێکەن."

پاشا گڵۆپەکەی کوژاندەوە، تاریک بوو، نووتەک، چاو چاوی نەدەبینی، بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان. موزیکژەنەکان نەیاندەوێرا ئامێرەکانیان لێبدەن. ژنەکان نەیاندەزانی چی بکەن. بۆ ساتێک پێکەنینێکی دەمارگرژانە درێ بە گرژیەکە دا. دواتر هیچی دی نەقەوما. تا ئەوکاتەی ژنێک بانگی کرد: "ئۆو، نەکەی، دەمهێشێ." دیاربوو ژنێکی دیکە نوقرچی لێگرتبوو. ئەویش بە دەوری خۆی گازی لێگرتەوە. بەم جۆرە تارماییەکان کەوتنە جووڵە.

ئیدی هاواریان دەکرد؛ "لێم دوورکەوە." "لێم مەدە." قاقای پێکەنینیش لەولاوە بوەستێ. "ئای، نوقرچم لێ مەگرە، چییە دەڵێی شێت بووی؟" "پێمکوتی، وا مەکە." "ئۆو، قەپاڵێکی لێگرتم، خۆ بگرە بۆت هاتم." ئەوە بوو قیژاندیان، پێکەنین. کەسیش نەیدەزانی کێ لە کێ دەدا و کێ کێ پاڵ

دەنێ. نامرادی چەند ساڵەیان لەو شەودا دەردەدا. موزیکژەنەکانیش کەوتنەوە سەر ژەنین. سەرەتا بە هێواش و بە ئەسپاییەوە، پاشان توندتر و سووکتر. ژنان جلیان لەبەر یەکدا دڕی، کەزی یەکدییان رادەکێشا و بانگ و هاواریان دەکرد: "تکایە گڵۆپەکە پێکەرەوە، یارمەتی، منیان پلیشاندەوە، کوشتمیان." موزیکژەنەکان ئاوازێکی هەڵچووی شێتانەیان بە ئامێرەکان لێدا. پاشاش پێدەکەنی و وەک شێت و هاران هاواری دەکرد.

ژنەکان لە پاشا پاڕانەوە کۆتایی بەم هەرا و پاشاگەردانییە بێنێ، ئاخر شەکەت شەکەت بوون، پرزەیان لێبڕا، هەستیان دەکرد دەکەونە خوار و دەبوورێنەوە. پاشا لەوەی بینی سەراسیمە بوو، ئەوق ما، ئاخر ژنەکان تەواو شڕ بووبوون، جلیان لەبەردا دڕابوو، دەمامکەکانیان شکا و بوو، ماسکارای تۆخ بە فرمێسک بەسەر ڕومەتیاندا هاتبووە خوار. هەموویان داماوانە لە شایان ڕوانی. ئەویش گڵۆپەکەی پێکردەوە و لەحەرەمسەرا چووەدەر.

# ٦٢

# قانون

ڕەشنووسی دەستوور ئامادەکرا. کۆمیتەکە لەوەدا سەرکەوتبوو وەک ڕێسای فەرمانبەردار هەم چەند بەشێک لە دەستووری فرەنسی هەم لە قورئانیش بخاتە نێو قانوننامەکەیان.

دەبووایە لە دانیشتنی دووەمی پەرلەماندا پاشا لەبەردەم هەموو ئەندامانداسوێندی ئەوە بخوا پارێزگاری لە دەستور بکا و ڕێز لە لەیەکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بگرێ.

پاشا هەموو بەڵگەنامەکانی ڕادەستکرابوون، بەڵام بێ ئەوەی بیانخوێنێتەوە لە لایەک فڕێیدابوون و بە کۆمیتەکەشی ڕاگەیاندبوو، بە پێشنیازەکەیان قایلە.

کۆمیتەکە لای خۆی گەیشتبووە ئەو بەرەنجامە، کە پاشا ناتوانێ بەرپەرەسەندنی ڕووداوەکان بگرێ. ئەوەی ڕاستیش بێ، شا هەرگیز وەها وڕوژا و بێ حەوسەڵە نەبووە. ڕوسەکانیش ماوەیەکی درێژ بوو هیچیان لەبارەی ئامادەکارییەکانی خۆیان بۆ کردەوەکە پێڕانەگەیاندبوو

تا پلانەکەیان نەخەنە مەترسییەوە. لێ شـا دڵنیا نەبوو، هەر بۆیە بەلای کەمییەوە لە تووڕەییان ئاگری گرتبوو. هەندێ جار وەهای بیردەکردەوە بەڵکو ڕوسەکانیش دەستبەرداری بووبن.

دووڕۆژ بەر لە کردنەوەی پەرلەمان خەریکبوو پاشـا لە تاج سـوڵتانی کیژی بدا، ئاخر چیدی لە کاتی خۆیدا منداڵەکەی بۆ نەدەهێنایە کۆشک.

شـا بانگی کرد: "ئەوە لە کوێ بووی، بۆچی وادەکەی هێندە چاوەڕێتان بکەین؟"

تاج سـوڵتانیش وەلامی دایەوە: "باوکە، تکایە لێم مەگرە، ئەو منداڵە جاربەجار جەنە[113] دەگرێ."

"پاکانەم ناوێ، ئەگەر یەک جاری دیکە دوا بکەوی، وادەکەم منداڵەکەت لێ بستێنن. تۆ سەرچیخ چووی ئەگەر وابزانی ئێستا تۆ بوویتە شاژنی وڵات."

"زۆر داوای لێبوردن دەکەم."

منداڵەکە کە بە کورسـیەکەدا هەڵدەگەڕا و کەوتە سـەر زەوی و دایە گریانێ. پاشا وەک کاردانەوەیەک دەستی بەرزکردەوە تا لە تاج سوڵتانی بدا، بەلام هەر زوو دەستی دانایەوە و لە شەرمان لە ژوورەکە چووەدەر. درەنگانێکی شـەوەکە تەتەرێکی مەهدولیا لە دەرگەی پاشـا بوو. شـا وایزانی ئەمەش هەر خۆتێهەڵقورتاندنێکی دایکییەتی و سـەرنج و ئاگاهی دەوێ. بە نەخوازراوییەوە پێشوازیی لە تەتەرەکە کرد.

ئەو کاتەی بابای تەتەر زەرفێکی بچووکی مۆرکراوی لە دەسـتی پاشـا دانـا، ئینجـا چـاوەکـانی لێ ئەبڵەق بوون. خۆ ئەمە پەیـامێکی نهێنیی ڕوسەکان بوو. شا دراوێکی ئاڵتونی بۆ کابرا فرێدا و یەکسەر گەڕایەوە ژووری کاری خۆی.

---

[113] جەنەگرتن: گڕ و وڕک گرتن، لاملییکردن.

بۆ ڕۆژی پاشتر، سەرلەبەیانی لەسەر پەیژەکانەوە بەدیارکەوت، بە جلی فەرمیی سەربازی تەواو و چەکمە قاوەییەکەی لەبەرخۆردا دەبریقایەوە.

لەشـــکری ڕوس لە شـــەوی پێش دانیشـــتنی پەرلەماندوا ئامادەکارییان تەواوکرد. فەرماندەکەشـــیان کۆلۆنێل لیاخۆفی کۆزاک بوو، بە ڕاوێژ لەگەڵ عەیـــندولـــدەولە، کە بـــریـــنەکەی تـــیـــمـــارکـــرابـــوو تـــۆپە سەرداپۆشراوەکانیان لە شوێنە ستراتیژییەکان دانا.
هێشـــتا ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، ســـەربازە ڕوســـەکان بە شـــاردا وەربوون. کـاتێکیش ئـاکنجییـانی تـاران لە مـاڵەکـانیـان دەچوونەدەر، ڕاســـتەوخۆ ڕووبەڕووی بـارگرژی و دۆخێکی توند و لەنـاکـاو بوونەوە. ڕێگـاکـانی گەیشـــتن بە پەرلەمان گیرابوون، هەر کەســـێکیش ماڵی لە دەوروبەری پەرلەمانەوە بووایە، بۆی نەبوو لە ماڵەکەی خۆی دەربچێ. ســـەربازانی ڕوس ڕێگەی گۆڕەپانی باڵوێزخانەی بریتانیشـــیان بەربەســـت کرد. ســـەربازێکی ڕوســـی لەوێ لێ وەســـەر تێلی تیلیگراف کەوت و کێبڵەکەی پچڕاند.
ڕوسەکان بەڵێنەکەی خۆیان بۆ پاشا بردەسەر.

هەر بەڕاستیش خەونەکەی پاشا بە ڕاست وەرنەگەڕا.
ئاخر دوو ڕۆژ پێشتر جەمال خان لە ڕێی یاخیبووە ڕوسەکانەوە پەیامی ئەوەی پێگەیشـــت کەوا لەشـــکرێک بە فەرماندەیی کۆلۆنێل لیاخۆف لە ڕێگادایە بەرەو تاران بڕوا. ئیدی مەزندەکە لەوە پتر نەبوو، کە شا داوای یارمەتیی لە ڕوس کردووە تا دەست بەسەر پەرلەماندا بگرێ.
دەستەیەک لە سواران چاودێرییان خستە سەر ڕێگەی گەیشتن بە تاران. جەمال خان باڵوێزخانەی بریتانی لە ڕەوشەکە ئاگاداركردبووەوە. زۆری

نەخایاند هەواڵەکە لە ڕێی بەدیکردنی لەشـکری ڕوســی لە مۆڵگە و قەلا سەربازییەکانی دەرەوەی تاران پشتڕاست کرایەوە.
کات تا دەهات تەنگ دەبوو، پاشـا هەمووانی خسـتبووە سـەر ڕێگەیەکی شاش. بە پەلە و پڕتاو کۆمیتەکە ئاگاداری سەرجەم نوێنەرانی پەرلەمانی کردەوە، هەر لەشـەوێوەڕا بچنە نێو تەلاری پەرلەمان. لەکاتێکدا کۆلۆنێل لیاخۆف و عەینولدەولە هێزی ڕوســـییان بەرەو تاران دەنارد، نوێنەران خۆیان گەیاندبووە نێو تەلاری پەرلەمـان. زۆرینەی نوێنەرانی تـاران و نوێنەرانی شـارەکانی دیکە ئەوانەی لە شـوێنی حەوانەوە لەناوجەرگەی شار بوون، لەکاتی خۆیدا گەیشتن، بەڵام دەستەیەکی هەژدە نوێنەری کە لە دەرەوەی دیوارەکانی شاردا شەویان بەسەربردبوو، بۆ ئەوان درەنگ بوو، پێڕا نەگەیشـتن. کۆمیتەی بەرگری هەموو هەوڵێکی خۆی دا بەڵکو ئەو ژمارەیەش بگەیەنێتە تەلارەکە تا زۆرینە ئامادە بین.
ئایەتوڵلا تەباتەبائی، کەســایەتییە ســەنگینەکەی پەرلەمانیش هێشـــتا نەگەیشتبووە پەرلەمان. ئاخر سەربازی ڕوسی لەبەردەم ماڵی ئەو لێیان داکوتـابوو، بۆیە نەیدەتوانی لە مـاڵێ بێتەدەر. میرزا ڕەزای کـارامە و کەمۆ[114]ئۆانی ڕوسـەکان لەخشـتە ببا و ئایەتوڵلا لەسـەر بانی مزگەوتێوە و لە ڕێی کۆڵانی لاڕێوە بگەیەنێتە باخی ماڵەکەی پشـت پەرلەمان. بەڵام ئەســـتەم بوو ئایەتوڵلاکە لەســـەربانی پەرلەمان بگەیەنرێتە نێو هۆڵی کۆبوونەوە. ئینجا میرزا ڕەزا تەڕدەستانە جووڵایەوە. سێ پیاوی کەتە و بەهێزی بـانگکردن تـا بە تەور و بێـڵ کونێکیـان لە دیواری تەلاری پەرلەمان کرد و ئایەتوڵلا لەڕولاوازەکەیان لە کونەکەی بردە نێو هۆڵی پەرلەمـان. ئـایەتوڵلا لەودیو دیوارەکەوە خۆی تەکـان دا، تۆزوخۆڵی لەسـەر خۆی لابرد و مێزەرەکەی ڕاسـتکردەوە، کەچی کاتێ لێ وەژوور هۆڵی کۆبوونەوەکە کەوت هێشتا هەندێک قوڕ بە کەواکەیەوە بوو.

---

[114] کەمۆ: زۆرزان و لەبلەبان.

کاتێکیش ڕۆژ ڕمێک لە کەلەوە هەڵکشا، کۆلۆنێل لیاخۆف ڕاپۆرتی خۆی دایە پاشا: "کردەوەکە سەرکەوتوو بوو."
پاشا برۆکانی هەڵکشاند.
کۆلۆنێلەکە ئەمەی بۆ قسەکەی پێشوو زیاد کرد: "بەڵام پێشتر بەشێک لەوان خۆیان گەیاندبووە تەلاری پەرلەمان."
پاشا بە خۆگرییەوە گوتی: "ئێمە ئەوە دەزانین." ئەو هەواڵە ناخۆشەی لە عەینولدەولەوە پێگەیشتبوو.
کۆلۆنێلیش گوتی: "پەرلەمان گەمارۆدراوە، کەس ناتوانێ لێی بێتەدەر. منیش ئەو دەسەڵاتەم نییە، لێ ئەگەر پاشا بخوازێ، دەتوانم هەموویان لە پەرلەمان بهێنمەدەر."
پاشاش پێیگوتەوە: "پێمانوایە ئەمە پێویست ناکا. باشترە وایە سەربازانی ڕوس نەچنە نێو تەلارەکە. زۆری پێناچێ لەگەڵ یەک دەچین و ئەوانەی ئەوێ بەدەستی خۆمان لە تەلارەکە فڕێدەدەینە دەرێ."
شا فەرمووی پیاڵە چایەکی لە کۆلۆنێل کرد، بەڵام ئەو سوپاسی کرد و نەیخواردەوە.
"ئەگەر پاشا ئامادە بێ، دەکرێ بڕۆین."
ئەویش وەڵامی دایەوە: "ئێمە ئامادەین!"

مستەوفی ئەلمەمالیکی سەرۆوەزیر یەک دوو جار هەوڵی دابوو پاشا ببینێ، بەڵام پاشا هەواڵی بۆ ناردبوو بۆ ڕۆژی بەیانی دەتوانێ بێتە لای. فەرمانی پێکرد جارێ لە ماڵی خۆی بمێنێتەوە.
پاشا بە یاوەریی تیپێک لە پاسەوانان سواری ئەسپەکەی بوو. کۆلۆنێل لیاخۆف لە دەستەڕاستی دەڕۆیشت. تۆپەکەشی لەلای چەپە و لەسەر گالیسکەیەک بارکرابوو. ئەوان بەرەو گۆڕەپانی بازاڕ لێیانخوڕی، تا

دەسـەڵاتی خۆیان لە بەردەم باڵوێزخانەی بریتانیدا نمایش بکەن، هەموو دەرکە و پەنجەرەکـانی ئەوێ داخرابوون و هیچ کەســێکیش لە خانووەکانی جێی مانەوەی بریتانییەکان نەدەبینرا. پاشـا گومانی هەبوو باڵوێزخانەی بریتانی سیخوڕی بەسەرەوە بکا، بۆیە پشتی ڕاستکردەوە و ڕووی دەمی لە کۆلۆنێلە ڕوسییەکە کرد و لەگەڵی کەوتە قسە.
لای تەلاری پەرلەمانیشـەوە کۆلۆنێل لیاخۆف چوە پێشـی پێشـەوە و بەرەو لای فەرماندە مەیدانییەکە، هەندێ قسـەی لەگەڵ کرد و بە کورتی بڕیەوە و گەڕایەوە لای پاشا.
- "کۆبوونەوەکە دەستپێکردووە و نوێنەرانیش بە چڕی سەرقاڵی قسەوباسی خۆیانن."
پاشا بەسەرسامییەوە پرسی: "کەی؟"
- "ئەفسـەرەکە پێیڕاگەیاندم، باقی نوێنەران لە ڕێی دیواری ماڵە دراوسـێکانی تەلارەکە توانیویانە خۆیان بگەیەننە نێو هۆڵەکە. هۆڵەکە ئێستا پڕ لە ئەندامە."
- "باشە ئەوان باسی چی دەکەن؟"
کۆلۆنێل نەیدەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە.
پاشا ئاماژەیەکی بۆ عەینولدەولە کرد، کە لای تۆپەکە وەستابوو.
"تۆ کۆنترۆڵت لەدەستداوە." پاشا بە شێوەیەکی خۆگرانە و بێ هەڵچوون قسەی کرد تا کۆلۆنێلە ڕوسەکە پەی بە تووڕەبوونەکەی نەبا. "ئەوان لە ئێمە زیرەکتر بوون."
عەینولدەولە ویستی شتێک بڵێ، بەڵام شا گوتی: "دەمت داخە. دەی بڕۆ ژوور و فەرمـان بە ئەوانەی نـاوەوە بکە چۆڵی بکەن. پێیـانبڵێ و ئـاگـاداریـان بکەوە، ئەگەر هـاتو ئەوێ جێنەهێڵن ئەوا زەبروزەنـگ بەکاردەهێنین."
عەینولدەولەش بەرئەمرانە ئەوەی کرد، کە پێی ڕاسپێردابوو.

چەند خولەکێک دواتر هاتەوە لای پاشـا: "سـەرۆکی پەرلەمانەکە ئەمەی خوارەوەی گوت: ئێمە ئێستا لە ناو وتووێژێکی قورس و چڕی دەستور داین. کەمێکی دیکە دەقی دەسـتورەکە دەخەینە دەنگدان. ئەگەر دەسـتورەکە پەسـەند کرا، دادوەرەکانی دادگای باڵا سـوێندی دەسـتبەکاربوونیان دەخۆن. پاشـان ئاهەنگۆکەیەکی بچکۆلە بۆ ئەو ڕووداوە ڕاسـتییە شـادمانە دەگێڕین. پێدەچێ ئەو هەموو شـتانە تا درەنگانی دوای نیوەڕۆ بخایەنێ. بۆ ئەمەش هیچ توندوتیژی پێویسـت نییە."

"دەی بڕۆ بگەڕێوە و بە سـەرۆکەکە بڵێ: دەی بۆ دەرەوە! هەر ئێسـتا! دەنا پاشا ئێوە لەدوای خۆی ڕادەکێشێتە دەرەوە."

عەینولدەولە گوێڕایەڵ بوو، لێ ئەوەندەی پێنەچوو یەکسـەر گەڕایەوە: "سەرۆکەکە دەڵێ: ئێمە پەیامەکەی شامان بە باشی وەرگرت."

پاشا پرسی: "هەر ئەوەندە بوو؟"

عەیندولدەولە: "بەڵێ هەر ئەوەندە."

پاشـا ئاماژەیەکی بۆ کۆلۆنێل لیاخۆف کرد، ئەوان یەک دوو هەنگاو دوورکەوتنەوە تا دووبەدوو ڕاوێژ بکەن و بزانین چی بکەن. پاشـان پاشـا گەڕایەوە لای عەینولدەولە و گوتی: "جارێکی دیکە بڕۆرەوە نێو تەلارەکە و ئەم قسە توندانەی من بە هەمووان بڵێ: یان ئێوە بەخۆشـیی خۆتان دێنەدەرەوە، یان پاشـا تەلارەکە دەداتە بەر گوللەی تۆپەکەی خۆی."

عەینولدەولە سـەری نەوی کردەوە و ڕۆیشـت پەیامەکەی بگەیەنێ. ئەمجارەیان زۆر درەنگتر لە جارەکانی پێشوو هاتەدەرەوە:

پاشا لێیپرسی: "ئەری پێت گوتن؟"

عەینولدەولەش وەلامی دایەوە: "بەڵێ خاوەنشکۆ."

- "ئەدی بۆ هێندەی پێچوو؟"

- "ئەوان زۆر بە چڕی بە دەنگدانەوە خەریک بوون."
- "دەنگدان لەسەر چی؟"
- "خاوەنشکۆ، لەسەر قانونەکان."
- "من دەبێ دەرسێکیان پێدادەم!"

لێ هەر لەجێگەی خۆی مایەوە، لە دەرگەی پەرلەمانەوە ڕاما و لێ نزبووەوە.

خۆی دەبووایە شتێک بقەومێ. پاشا لە ئەسپەکەی دابەزی. بە دانانی دەستەچەپی لەسەر پشتی بەرەو لای تۆپەکەی چوو. دەستی خستە سەر لوولەکەی بیری لێکردەوە.

"دەی ڕێک ڕووی لە پەنجەرەکە کەن." پاشا وەها فەرمانی بە عەریفێک کرد لە کاتێکدا بە دەستی ئاماژەی بۆ پەنجەرەیەکی شووشەڕەنگینی دیواری پەرلەمانەکە کرد.

عەریفەکەش فەرمانی بە دەستەی سەربازەکانی کرد: "ئامادە بن!"

سێ سەرباز بەغار هاتنە پێشەوە بەشی پشتەوەی گالیسکەکەیان کردەوە، دوو لەوحەی قورسیان هێنان و دایاننا و تۆپەکەیان پاڵ پێوەناو تا گەیاندیانە سەر زەوی. لەو شوێنەیان دانا کە عەریفەکە نیشانەی کردبوو و لوولەشیان ئاراستەی تەلاری پەرلەمان کرد.

پاشا ئاماژەی بۆ کردن.

عەریفەکە گوللەیەکی خستە ناو تۆپەکە.

کاتێکیش هەموو شتێک ئامادە کرا، پاشا چووە پشتەوەی تۆپەکە وەستا. هەمووان هەناسەیان ڕاگرت. ئەفسەرە ڕوسەکان چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد. پاشا خۆی تۆپەکە بتەقێنێ. عەریفەکە بە ڕێز و شکۆوە مەشخەڵی ئاگرەکەی دایە دەست پاشا. کاتێ پاشا فتیلەکەی ئاگر دا

کۆلۆنێل لیاخۆف ســـەری بۆ پاشـــا لەقاند. بە هورمژنێکی[١١٥] یەکجار زۆرەوە ئـاگر لە لوولەی تۆپەکە هـاتەدەر. گوللە تۆپەکە کونێکی لە تەلارەکە کرد. زەوی لەرزی، ئەسـپەکان لە حیلەیان دا و هەڵسـانە سـەر پاشوو.

لەپڕ ئـاگر لە تەلارەکە بەرزبووەوە و دووکەڵ لە پەنجەرە بچکۆلە جامڕەنگینەکە هاتەدەر. پاشـــا چاوەڕێی کرد، کۆلۆنێل چاوەڕێ بوو، ئەفسەرەکان چاوەڕێیان کرد، بەڵام خۆ هیچ کەس لە دەرکەی باڵەخانەکە نەهاتەدەر. شـا بە دڕدۆنگییەوە لای تۆپەکەی وەسـتابوو، لەو کاتەدا لە نەبوونەوە پیاوی چەکدار لەسەر بانی پەرلەمانەوە پەیدابوون و دەستیان بە تەقە کرد.

کۆلۆنێل لیاخۆف خۆی دایە بەر پاشـــا و بردییە پەنا تۆپەکە تا گوللە نەیگرێتەوە. ئەفسـەرە ڕوسـەکان، کە ئەو کاردانەوەیان ڕەچاونەکردبوو، دەسـتبەجێ سـەربازەکانی خۆیان کشـاندەوە کۆڵانەکانی دەوروبەری ئەوێ، تا لە پشت دیوارەکان خۆیان پەنا بدەن.

شـەڕێکی سـەخت لە دەوروبەری تەلارەکە ڕوویدا. پیاوە چەکدارەکانی سـەر بانی پەرلەمان بێ وەسـتان تەقەیان دەکرد و دەرفەتێکی وەهایان دایە نوێنەرەکان لە حەوشـە و باخی پشـتەوە لە تەلارەکە بچنەدەر و دەربازیان بێ.

کۆلۆنێل لیاخۆف فەرمانی کرد بەسەر تەلارەکە دابدەن و لێی بچنەژوور. جەمال خان بڕوانامەی دەسـتورە پەسـەندکراوەکەی پەرلەمانی نوێ خسـتبووە نێو جانتایەکی چەرمین و هەوڵیدا بەسـەر بانەکەوە بازبدا و دەرباز بێ، بەڵام ئەفسـەرێکی ڕوسـی پێکای. جەمال خان سـەرپەلۆی برد. جانتا چەرمینەکەی لەدەست کەوت. میرزا ڕەزا تەقەی لە ئەفسـەرەکە کرد و بۆ لای جەمال خان ڕایکرد و دەستی دایە جانتاکە و هەڵات.

---

[١١٥] هورمژن: دەنگی تۆپ. دەنگێکی گەورە.

جەمال خان بە سکەخشکێ بەسەر بانەکەدا ڕۆیشت و لە باخیماڵێکی پشتەوەی تەلاری پەرلەمان خۆی فڕێدا.

هەموو دوای نیوەڕۆ لە شارەکەدا هەر شەڕ و هەرا بوو، تا گەیشتە ئێوارە درەنگ، ئەوسا سەربازانی ڕوس توانییان دەست بەسەر ناوجەرگەی شاردا بگرن.

بە درەنگانێکی شەو کۆلۆنێل لیاخۆف ڕاپۆرتی خۆی دایە شا: "بەرەنگاری سەرکوت کرا! ئێستا پەرلەمان هی ئێوەیە."

پاشا بەرەو لای ئاگردانی زۆپاکە ڕۆیشت، دەستی بۆ سندوقێک برد و دایە لیاخۆف و پێیگوت: "ئەمەمان وەک سوپاسنامە لێ وەربگرە!"

کۆلۆنێلەکە لەوەی بینی سەرسام بوو. ئەمە خەنجەرێکی کۆن بوو، بە چەندین بەردەگەوهەری برسیکەدار ڕازابووەوە.

## ٦٣

# شا وێنەی خۆی دەگرێ

ڕۆژی پاشتر، دروشمی دەستە و تاقمی خۆپیشاندەران بە شێوەیەکی نادیارەوە گەیشتبووە کۆشک. پاشاش بە هەندی هەڵنەگرت و یەک دوو ڕۆژ خۆی بینییەوە هەمان دروشم لەبەرخۆیەوە دەڵێتەوە:

*از خون جوانان وطن لاله دمیده*
*از ماتم سرو قدشان سرو خمیده*
له خوێنی لاوانمان لاله سەری دەرهێنا
داریش سەری نەویکرد لەبەر ماتەم و شینا

چەند ڕۆژێکی پێچوو تا ئارامی و تەکوزی بۆ شارەکە گەڕایەوە. سەربازانی ڕوس گەڕانەوە و لەجێگەی ئەواندا سەربازانی ئێرانی پاسەوانیی خاڵە گرنگەکانی شاریان کرد. دوکاندارەکانیش بە کاروباری خۆیانەوە خەریک بوون و خەڵکیش جارێکی دیکە چوونەوە بازاڕ. لە هەراکەدا حەوت پەرلەمانتار کوژران، یەک دووانێکیش بریندار بوون و

ژمارەیەکی بەرچاویشیان گیران. نەشزانرا ئاخۆ چەند سەربازی ڕوسی لەو شەڕەدا سەری تێدا چووبێ. ئایەتوڵڵا و پەرلەمانتارە هەڵاتووەکانیش خۆیان شاردبووەوە.
هەرچی چارەنووسی جەمال خان بوو، لە هیچ کەس دیار نەبوو، دەنگودۆی وەها هەبوو ئەفسەرێکی ڕوسی کوشتبێتی. بەڵام سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان گوتیان گوایە جەمال خان و میرزا ڕەزا بۆ لای دۆستەکانیان لە مۆسکۆ هەڵاتوون.
پاشا هەستیکرد باش و براوەیە. تێلێگرافی لە هەموو شارە گەورەکانەوە بۆ هات کە بازاڕەکان کراونەتەوە و خەڵکیش بە شێوەیەکی ئاسایی دەچێتە مزگەوت و نوێژی خۆیان دەکەن. شتێکی وای نەکرد سووکایەتی پێبکرێ و هەمووان دەیانبینێ ئەو لەکوێ وەستاوە. شا جارێکی دیکە بە توندی پێی خۆی لەسەر زەوی گیرکرد و ویستی سەرکەوتنەکەی بسەلمێنێ. داوای لە وێنەگرەکەی کرد چەند وێنەیەکی لەناو شارەکەدا بۆ کەسانی دوای خۆی بگرێ. "شا بە وێنەگرەکەی گوت: "وێنەیەکم لای تەلارەکەی ئەوێ بگرە."
وێنەگرەکەش پرسی: "مەبەستی ئێوە لای تەلاری پەرلەمانە؟"
شا بە مەبەست نەیدەویست وشەی "پەرلەمان" بەکاربێنێ. ئینجا گوتی: "وێنەیەکی ئێمە لەوێ بگرە لای ئەو کونەی تۆپەکەمان لە دیوارەکەی کرد، بە جۆرێک هەرسێکمان لە وێنەکە دیاربین. ئێمە و تۆپ و کونەکە. ئایا ئەمە دەکرێ؟"
"ئەمە کارێکی سەختە لە یەک وێنەدا ئەو سێیە کۆبکرێنەوە. هەر دەبێ یان تۆپەکە یان سەری تۆی تێدا بێ."
شا پێیگوتەوە: "بەڵام ئێمە دەمانەوێ ئەو کونەی لە دیوارەکە کراوە دەربکەوێ."
"خاوەنشکۆ، هەموو هەوڵێکی خۆم دەدەم."

وێنەگرەکە ڕایســــپارد تۆپەکەی بۆ بگەیەننە لای تەلاری پەرلەمان و لە چەندین گۆشــە و شــوێنی تاقیکردەوە، تەماشــای کرد و جێگۆڕکێ پێکرد تا گۆشــەی خوازراو بدۆزێتەوە. کاتێک گەیشــتە مەبەســتەکەی، ئاگاداری پاشـــای کردەوە، ئامادەیە. وێنەگرەکە پاشـــای لای تۆپەکە وەســـتاند، لەکــاتێکــدا لوولەی تۆپەکە بەرەو کونی دیوارەکەوە بوو. ئەم دیمەنە لەگەڵ یــاریــدەرەکەی لێزانــانە دیــاریــیــان کردبوو. وێنەگرەکە لەچاوی کامیراکەیەوە بە وریاییەوە ســـەیری دەکرد، دیمەنێکی هاوســـەنگ بوو، بەڵام کڵاوە قووچەکەی پاشا بەتەواوی نەدەبینرا.

"خۆ ئەگەر خاوەنشـــکۆ ســـەری خۆی هەندۆکەک[116] بۆ پشـــتەوە ببا. بوەستە، ئاوا زۆر باشە." بەم جۆرە وێنەگرەکە، کە سەری بردبووە نێو هەمبانەی ئامێری وێنەگرتنەکە، بانگی پاشای دەکرد.

وێنەگرەکە بەنیــازبوو وێنەیەکی وەهــای بگرێ لە تــابلۆ نــاودارەکەی نــاپلیۆن بچێ، دیمەنێــک بــای لێدەهــات، هەوریش لەشـــەڕ بوو، تۆپ دووکەڵی لە لوولە دەهــاتەدەرەوە و نــاپلیۆنیش لە دوورەوە ســـەیری گۆڕەپانی جەنگی دەکرد.

وێنەگرەکە بانگیکرد: "کەمێک بوەســـتن. پێموایە کونی دیوارەکە باشـــتر دەردەکەوێ ئەگەر هاتوو پاشـــا ســـەیری کونەکە نەکا، بەڵکو ڕێک بە پێچەوانەوە ســـەیری لایەکەی دیکەی بکا. کەواتە تەماشـــای دارەکەی ئەوێ بکە و چەناگەت کەمێک بەرزتر بکەوە. دەســـتی ڕاســـتت لەســـەر لوولەی تۆپەکە دابنێ. وەهاش نا، هەر وەک ئەوەی لغاوی ئەســـپەکەت بگری، ئێستا زۆر باشە، نایابە."

لەو ســـاتەدا پیاوێک لەپشـــت درەختەکەوە دەرکەوت. ئەو قــاتێکی لەبەردابوو شــەپقەیەکیشـــی لەســـەر بوو. بە ئارامی بەرەو وێنەگرەکە

---

[116] هەندۆکەک: لە هەندێک کەمتر، لە کەمێک کەمتر.

دەهات. شـــا پێیوابوو پێشـــتر ئەو پیاوەی بینیوە. لەوانەیە یاریدەدەری وێنەگرەکە بێ، یان ئەوکەســـەی لای ڕوســـەکان وەرگێڕ بوو. پیاوەکە نزیکتر بووەوە. شا هەستیکرد شتێک لەگۆڕێدایە و تەماشایەکی ئەملا و ئەولای خۆی کرد. بەڵام وێنەگرەکە، کە هێشـــتا ســـەری لەنێو هەمبانە ڕەشەکەدا بوو، خەریکی کاری خۆی بوو، بانگی کرد: "تکایە مەجووڵێ!" شا لەشوێنی خۆی نەجووڵا، هێشتا هەر بیری دەکردەوە: ئەگەر پیاوەکە بۆ لای ئێمە بێ، خۆ دەبێ شـــەپقەکەی دابگرێ. پیاوەکە شـــەپقەکەی دانەگرت. کابرا دەستی بردە بەرکی چاکەتەکەی. شا هەستی بە مەترسی کرد، بەڵام وێنەگرەکە هەر بـانگی دەکرد: "کەمێکی دیکە ئـارام بگرە. مەجووڵێ!" پیاوەکە دەمانچەیەکی دەرهێنا. پیاوەکە میرزا ڕەزا بوو. بەر لەوەی پاشا بزانێ چی قەوما، دەنگی سێ تەقە هات.

وێنەگرەکە تازە لە وێنەگرتنەکەی بووبووەوە.

پاشا ڕاقەنایە سەر زەوی.

## ٦٤



# تاج سوڵتان

حەکایەتخوانانی چیرۆکی پاشـــا کۆنینەکان کۆتاییەکانیان لە دەســـتی خۆیاندایە و هەمیشـــە لە کۆتایی چیرۆکەکەیاندا ترووســـکەیەک بۆ هیوا دەهێڵنەوە. کەســـیش نازانێ ئاخۆ ڕاســـتییان گێڕاوەتەوە یان نا، بەڵام هەموو ئەوە دەزانن، حەکایەتخوانەکان لە مێژوودا ســـەربەســـتییان پێ ڕەوا بینراوە تـا کۆتـایی چیرۆکەکەیـان بەو شـــێوەیە بێنن، کە خۆیـان بەباشی دەزانن.

بەگوێرەی دابە کۆنەکەی ئێرانی بێ، دەکرێ ئەمەی خوارەوە ڕاست بێ.

دوای چلەی شـــا، نوێنەرانی پەرلەمان کۆبوونەوە. ئەوان تاج ســـوڵتانیان وەک ڕاســـپاردە بەســـەر کوڕە بچکۆلەکەی دانا، کە دواتر بچێتە ســـەر تەختی پاشایەتی.

ئەم خاتوونە شازادە کەشخەیە لەبەردەم پەرلەمان لە کەژاوە زێڕینەکەی دابەزی و بە یـاوەریی دەســـتەیەک لە پـاســـەوانـان چووە هۆڵی کۆبوونەوەکە. هەموو نوێنەران لەبەری هەڵســـان و چەپڵەیان بۆ شـــاژنی خاوەنشکۆ لێدا.

کاتێکیش بە فەرمی ســـوێندی خوارد، بەڵگەنامەکانی بەردەســـتی واژۆ کردن. تاج ســـوڵتان دانی بە ئەفغانســـتاندا نا کە دەوڵەتێکی خاوەن سەروەرییە و هێزی ئێرانیشی لە هەرات کێشایەوە.
خانوو و شـــایســـتەیەکی دارایی بۆ ژنانی حەرەمســـەرا دیاریکرد و ناردنیەوە لای ماڵە باوانیان.
تاج ســـوڵتان لە ژیاندا ما تا ئەو کاتەی شـــەمەندەفەر هات و کارەباس هات و شـەوانە هەموو شـەقامەکانی تاران بە گڵۆپە کارەباییە نوێیەکان ڕووناک کران.
حەکایەتی پاشـاکان هەرگیز بەتەواوی کۆتاییان نایەت، چونکە هەمیشـە حەکایەتخوانان شتێکیان هەیە تا بۆ شەوی دادێ بۆی زیاد بکەن.



**سوپاسنامەی ڕۆماننووس:**

سوپاس بۆ:
سوهەیلا سنعەتی بۆ ڕوانینە تیژەکەی.
دانا سەجادی قائیمەقامی بۆ بنەما و بەرپرسیاریێتییە گەورەکەی.
گایدۆ هێلمەرهۆرست بۆ هۆڵەندییە ڕەوانەکەی.
بەهار سەجادی قائیمەقامی بۆ یارمەتییە وشیارانەکەی.
ئاد ڤان دەن کیبۆم (دارێژەرەوە) بۆ کارە سەختەکەی.
ساندەر ڤان فلێرکن (بڵاوکەرەوە) بۆ ڕوانینەکەی.
دەستبارگرتنی ئەوان پاشایان بەپێزتر کرد



**ژێدەرەکان:**

- مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئێران، سەعید نەفیسی.
- مێژووی کۆمەڵایەتیی ئێران، مورتەزا ڕاوەندی
- پاشا یەکەمینەکان، دجلە ئاموزگەر و ئەحمەد تەفەزولی
- با نیگاهی فیردەوسی، باقر پەرهەم
- ناسنامەی ئێرانی، ساروخ مەسکەوب
- ئاوەها زەردەشت تەوجیلیکی باشتری نووسی، پاول مەونن.
- لەسەر شانی شاوە، سەردار ساڵحی.
- نموونەی پیاوی یەکەم و پاشـــای یەکەم لە مێژووی ئێرانییەکاندا، کریستێنن، ستۆکهۆلم ۱۹۱۷.
- مێژووی ۲۵۰۰ ســـاڵەی دەولەتی ئێرانی بەر لە هاتنی ئیســـلام، بەهائەدین پازارگاد.
- هەزار ساڵەی پەخشانی ئێرانی، کەریم کشاوەرز.
- ئێران، خاک و خەڵک، یاکوب ئێدوارد پۆلاک.
- مەلیچک، ڕۆژژمێری غولامحەلی خان، بە داڕشـتنەروەی موحسـین میرزایی.

- گەشتنامەکانی موزەفەر ناسرەدین شا لەبارەی گەشتەکەی بۆ ئەوروپا.
- چەند لاپەڕەیەک لەبارەی کورش لە تەوجیلەوە وەرگێڕدراوە.
- باسوخواسێک لەبارەی خشایارشا Xerxes کاتێک بەرەو ئەسینا کشا کە لەسەر بنەمای وێناکردنەکەی تۆم هۆلاندوە هاتووە لە کتێبەکەی بەناوی ئاگری ئێران.
- یاداشتەکانی تاج سوڵتانی کچی پاشا.
- دەربارەی پاشای ئێرانی داریوش و خشاریارشا و لەبارەی کۆشکەکانی ئێرانی کە لەسەر بنەمای نووسینە مێژووییەکیە هیرۆدۆتەوە وەرگیراوە.
- مونشیت، باسوخواس و نامەکانی وەزیر میرزا عەبدولقاسم قائیمەقامی فەراهانی.
- جەلالینامە، دیوانی شیعری وەزیر میرزا عەبدولقاسم قائیمەقامی فەراهانی.
- قائمەقام لە ئاوێنەی ڕۆژگاردا، بورهان فەلسەفی.
- هەروەها لە نامەکانی ژیاننامەی وەزیر میرزا تەقیخان ئەمیر کەبیریش هەڵێنجراوە.
- یەکەمین شیعری بەندی ١٢ بەشێکە لە "گوڵستانی سەعدی.



- دووەمین شیعری بەندی ١٣ شـیعریکی سـەرنجڕاکێشی ئوسـتادی ئێرانی ڕودەکییە لەبارەی ڕوباری ئاموی لە ئەفغانسـتان. شـیعرە ماکەکە وەها دەسـت پێدەکا: میر ماه اسـت و بخارا آسـمان/ ماه سوی آسمان آید همی
- شیعرەکەی بەندی ٢٤ هی عومەری خەیامە.
- ڕسـتە سـەرەتاکانی نامەکەی وەزیر کە پاشـا خواسـتوویەتەوە هی نامەی ئیبن خەلدونە.
- شـیعرەکەی بەنـدی ٤٠ لە چوارینە ئێرانییەکـانە لەلایەن (یـان سپیردایک دە) دەستکاریکراوە.
- شـیعرەکەی بەندی ٥٧ هی حافزی شـیرازییە، لەلایەن یان دایک دەستکاریکراوە.

## چەند دێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک، لە دۆڵی ڕوســـتێی دەڤەری باڵەکایەتی لەدایکبووە.
- لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٧ـەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەورووپا (هۆڵەندا و بریتانیا) بووە.
- لە پاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزیش دەزانێ.
- لە ١٩٨٦ـــــــەوە هەوڵی نووســینی داوە. زیاتر لە بیســت کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان گوتار و لێکۆڵینەوەی قانونی و سیاسیشی بڵاوکردوونەتەوە.



## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١ - نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەلات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێیەم رۆژهەلات ٢٠١٦.

٢ - مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و رۆژهەلاتی ناوەراست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.

٣ - داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی رۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر. چاپی دووەم ناوەندی ئاوێر ٢٠١٦ هەولێر.

٤ - کوردستان لە نێوان سێڤەر و سنوورە دەستکردەکاندا، نووسینی: میسەر لیهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.

٥ - وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. رۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.

٦ - ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆلدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.

٧ - ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمــان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٨ - شەرەف، ئەلیف شەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.

٩ - یــاخیبوون، منــاحیم بێگن، یــادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.

١٠ - خــانووەکەی مزگەوتێ، قــادر عەبــدوڵڵا، ڕۆمــان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.

١١ - کۆدەکەی داڤینشــی، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٦.

١٢ - خەتی بزماری، ڕۆمان، قادر عەبدوڵڵا، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی ٢٠١٧.

١٣ - کردە هەرەگرنگەکانی مۆساد، میخائیل بار زۆهار و نەسیم میشال، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.

١٤ - لە مەککە، قــادر عەبــدوڵڵا، ڕۆمــان، وەرگێڕان لە هۆڵەنــدییەوە، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٨ سلێمانی.

١٥ - ئەرێ کورد بوونە بەردەبازێ؟! ڕۆبەرت بریان گیبســـــن، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی کوردستان، سلێمانی ٢٠١٩.

١٦- شــــەوە ســــپییەکان، مناحیم بێگن، یادەوەریی، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٩.

١٧ - زۆربای ئێرانی، قادر عەبدوللا، ڕۆمان، لە هۆلەندییەوە، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٢٠.

١٨- ژیانی من، گۆلدا مایەر، یادەوەری، لە ئینگلیزییەوە، چاپێکی نوێی چاککراو، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠٢٠.

١٩- کچانی دووکەڵ و ئاگر، ئاڤا هوما، ڕۆمان، لە ئینگلیزییەوە، سلێمانی چاپخانەی کارۆ، ٢٠٢١.

٢٠ - هێلێک بەنێو لمدا، جێمس بار، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی جەمال عیرفان، سلێمانی ٢٠٢١.

٢١- شـای ئێران؛ کوردی عێراق و شیعەی لوبنان، ئارەش ڕەئیسینەژاد، مێژوو، لە ئینگلیزییەوە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر ٢٠٢٢

٢٢- پاشا، قادر عەبدوللا، ڕۆمان، لە هۆلەندییەوە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر ٢٠٢٢

ئەهلی عیبرەت ماوە گەر، بێ سەیری ناسـر شا بکات
دوو لە دوو سێ کەم شەهی کرد و کشێکی پێ نەهات
هاتی وا سەیـری نەهاتی کـەن کە سـەر تیپـان سـوار
پاسـەوانی بـوون، لـە نـاو بەسـتا پیـادێ کـردی مـات

«مەحوی»





Kader Abdolah

# The King

T. by: Shafiq H. Kheder

2022-Hawler

لە بڵاوکراوەکانی چاپخانەی رۆژهەڵات / هەولێر